# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

## 47 & 48

**کانونی یەکەم**
2006
**ســـــــاڵی هەشتەم**

–ســـەردەم گۆڤارێکــە بــە دوو مــانگ جارێــك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مـافی بڵاونەکردنــەوەی هەیــە و پێشــەکی داوای لێبووردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمـەکان بڵاوبکرێنــەوە یــان نەکرێنــەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هـــەموو پەیوەندییـــەك لـــە ڕێگـــای سەرنووسەرەوە دەبێت.


خاوەنی ئیمتیاز: **شێرکۆ بێکەس**

سەرنووسەر: **ڕەووف بێگەرد**

دەستەی نووسین

| | |
|---|---|
| ڕێبین هەردی | شوان ئەحمەد |
| شاهۆ سەعید | شێرزاد حەسەن |

دەرهێنانی هونەری: **قادر میرخان**

کاری کۆمپیوتەری: **تاڤگە فائق**

هەڵەچنی چاپ: **ساکار ڕەووف**

سەرپەرشتیاری چاپ: **فەرهاد ڕەفیق**

چاپ: **دەزگای حەمدی**



**ناونیشان**

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم *3129609*

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

**Tel - Fax: 0044 7543129839**

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە ( ***14665/615*** و ***14665/616***) تاران

**لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:**

*www.sardam.info*



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەرۆك



## ویستگەکانی سەردەم



**نرخی** (1200) **دیناره**

# مێژوی پەرەسەندنی هوشیاریی دیموکراتی مۆدێرن

ئالان تۆرین

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

## (بەشی دووەم)
## والآکردنی مەیدانی گشتی

**نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیی میللی:**

ناتوانین لیبراڵیزم لەوەدا کورتبکەینەوە کە بریتیە لە بەرگریکردن لە بەرژەوەندیەکانی چینی سەرمایەداری، هەروەك چۆن ناتوانین سۆشیالیزم کورتبکەینەوە بۆ گوزارشتکردن لە بەرژەوەندیی چینە میللیەکان، یان وردتر بەرژەوەندیی چینی کرێکاران. لێکدانەوەیەکی لەمجۆرە کە ژیانی سیاسی، بەتایبەتی ژیانی دیموکراتی، دەکاتە پاشکۆی بەرژەوەندییە کۆمەلآیەتیەکان، شایانی پەسەندکردن نیە. هەمیشە ئەو بیروبۆچوونانەی کە لەگەڵ لیبراڵیزم و کۆماریخوازیدا سەریانهەڵداوە، وەك دەسکەوتی فیکری سیاسی دەژمێردرێن، چونکە دیموکراسی بەبێ سنورداركردنی دەسەلآت و بەبێ دەستەبەرکردنی مافی هاولآتیبوون بوونی نیە. بەلآم بەر لەوەی ئەوە بەیادبێنینەوە کە دیموکراسی بەبێ نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندی زۆرینە بوونی نیە، پێویستە پرسیاربکەین دەربارەی سروشتی مافەکانی تاك کە دەسەلآتی دەوڵەت سنوردار دەکا، هەروەها پرسیاربکەین دەربارەی سروشتی هاولآتیبوون. چونکە گەر مافەکانی تاك بریتی بن لە چەند زەمانەتێکی یاسایی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی تاکەکەس، ئەوا ئازادی سیاسی دەبێتە ئامرازێك بۆ پاراستنی کەسە بەهێزو دەوڵەمەندەکان. بیرۆکەی لیبراڵیزم بیرۆکەیەکی موقنیعە کاتێ هاوتایی دەسازێنێ لەنێوان مافە بنەڕەتیەکان و سەلماندنی لەمپەرە کۆمەلآیەتیەکان و فۆرمەکانی کۆنترۆڵکردن کە ئەو مافانە لەناودەبا، ئەو دۆخەش زۆرجار ڕوویداوە.

ژمارەیەکی زۆر لە بیریارە لیبراڵو سودگەرەکان قسەیان دەربارەی بەرگریکردن لە ماف زۆرینە کردووە لەسەرو هەمووشیانەوە جۆن ستیوارت میل، ئەو پیاوەی کە قسەی زۆری دەربارەی شۆڕشی فەرەنسی کردو پێیوابوو ئەو شۆڕشە حوکمی گەلی دەستەبەرنەکرد، بەڵکو حوکمی ئەو سەرکردانەی سەپاند کە بەناوی گەلەوە قسەیانکرد. میل لە کتێبی (دەربارەی ئازادی 1859)دا دەنوسێ: ئەو هەوڵی زۆریداوە ڕێبگرێ لەوەی کە "ڕای گشتی بۆی هەبێ بەناوی یاساوە دەستوەربداتە سنوری سەربەخۆیی تاکەکەس". هەرچەندە میل لە تەمەنی هەرزەکاریدا دژی راوبۆچوونی پێنتام و راوبۆچوونەکانی (جێمس میل)ی باوکی بوو، بەلام هەڵوێستی ئەو، کە هەڵوێستێکی سوودگەرانە بوو، هانی دا بۆئەوەی بەرگری لە بەرژەوەندی تایبەتی توێژە کلۆڵەکان بکا، وەك ژنان و کرێکاران، ئەڵبەتە ئەو لەپێشەنگی ئەو کەسانەوە بوو کە بەرگریی لە مافەکانیان دەکرد. هەربۆیە هەندێ خەڵك ئەویان بەکەسێکی سۆشیالیست لەقەڵەمدەدا. بەلام ئۆگەست کۆنت، کە پێیوابوو دەبێ کۆمەڵگا سانسۆری رەهای هەڵسوکەوتی مرۆڤ بکا، دژی میل بوو. بۆیە لەشوێنێکدا دەنوسێو دەڵێ: "تاقە هۆکارێکی رەوا کە پاساو دەبەخشێ بەو تاقمانەی هێز دژی یەکێك لە رۆڵەکانی خۆیان بەکاردێنن بۆ ئەوەیە ئەو کەسە ئازاری کەسانی تر نەدا". هەر لەسەر ئەو بنەمایە رەوایەتی بەخشرایە دەوڵەت دەست وەرداتە کاروباری تایبەتی هاولاتیانەوە، بەتایبەتی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا. واتە پرسی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانیش هاتەگۆڕێو ئیدی ئازادی بووە بەهایەك بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو دەسەلاتە سیاسییەی کە هەندێ جار خاوەن ئەدگاری سیاسیو هەندێ جاریش خاوەن ئەدگاری کۆمەلایەتی بوو.

جۆن ستیوارت میل پێیوایە رووداوە سیاسییەکان لەبەرترن تا رووداوە کۆمەلایەتیەکان. هەروەها بەرگری لە یەکێتی نەتەوەیی دەکا، بەئەندازەیەك ئارەزودەکا لەو پێناوەدا دەزگایەکی وەزیفی بالا دابمەزرێ، کە خاوەن مۆرکێکی پیشەیی و دارایی سەربەخۆ بێو پەیوەندیی بەپارتی سیاسییەوە نەبێ. بەلام هەر لە کتێبێکی تریدا بەناونیشانی "بابەتگەلێك دەربارەی حوکمی نوێنەرایەتیکردن"، سەرباری بایەخدانی بە تاکگەری، چەند شیکردنەوەیەکی سیاسیی پەتی و ئارەزوویەکی ریشەیی نیشاندەدا بۆ خەباتکردن دژی ئۆرستۆکراتیەت. جۆن ستیوارت میل لەدایکبوونی سیاسەتێکی بۆرجوازیی لیبراڵ رادەگەیەنێ، کە لە ئەوروپاو پاشان لە ئەمریکای لاتینیش ناچاربووە هاوپەیمانی لەگەڵ چەند توێژێکی میللیدا دژی ئۆلیگارشی دابمەزرێنێ. بەمجۆرە باڵی چەپی حیزبە رادیکاڵەکانبوونە باڵی رادیکاڵی- سۆشیالیستی و زەمینەیان خۆشکرد بۆ پێڕەو کردنی پێشوەختی یاسا کۆمەلایەتیەکان، وەك لە چیلی ڕوویدا بۆ نمونە، بەلام لە بەریتانیای مەزن وەرچەرخان لە لیبراڵیزمەوە بۆ بزاوتی کرێکاران وەرچەرخانێکی یەکلاکەرەوە بوو.

ئەم گەشەکردنە لە شیکردنەوەیەکی سیاسیی پەتییەوە بۆ شیکردنەوەیەکی

کۆمەڵایەتی و ئابوری، بووە هۆی گۆڕان لە بیرۆکەی هاوڵاتیبوونیشدا. چونکە زۆر جار جەخت لەسەر (بایەخی) هاوڵاتیو نەتەوە دەکرایەوە دژی سیستێمی شانشینی، لە حاڵەتی شۆڕشی فەرەنسیشدا جەخت لەسەر هەمان شت دەکرایەوە دژی داگیرکاریی دەرەکی. ئیتر چۆن ناوی گەل ناکرێتە هاوتا کۆمەڵایەتیەکەی نەتەوە، واتە هاوتای زۆرینەی هاوڵاتیان کە هێندە نابا بەهۆی هەژاریو پاشکۆیەتی لەکاردا ناوی پرۆلیتاریایان دەخرێتە پاڵ؟ فەرەنسا ئەو وڵاتە بوو کە تیایدا نەتەوە کرایە گەل و پاش ماوەیەکیش زۆر بەڕوونی گەل کورتکرایەوە بۆ چینی کرێکاران. بۆ ماوەیەکی درێژ پرسی ململانێی چینایەتی لای بیریارانی سیاسی، بەتایبەتی لای جان جۆریس، هاوتای پرسی کۆماریخوازیو پرسی نەتەوە بوو. لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، کاتێ دەسەڵاتی ڕەها دارماو زەینیەتی کۆماریخوازی سەرکەوت –ئەڵبەتە زۆرجاریش لەسایەی شانشینی دەستوریدا بوو–، هەروەها کاتێ قەیرانە کۆمەڵایەتیەکانی ناوخۆی وڵاتە میلیتاریەکان بەسەر سیاسەتی داگیرکاریو تەعبیەو سازدانی میللیدا زاڵ بوو، دەبوو لە ژیانی سیاسیدا بەرگری لە بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی بکرێ. ئەو دۆخە بە ئەندازەیەك بوو زۆرجار باڵی راستڕەوی کۆنزەرڤاتیڤ سەری هەڵدەدا، کە باڵێك بوو پەیوەست بوو بە بەرژەوەندیە بانکیو پیشەسازیەکانەوە. هاوزەمان لە چەند شوێنێکی تر، شەپۆلی سۆشیال دیموکرات پەرەیسەند کە پێیوابوو حیزب باڵی سیاسیی چینی کرێکارانو سەندیکاکانی ئەو چینەیە. لەفەرەنسا حاڵەتێکی لەو جۆرە ڕوویدا، چونکە ڕەوتی زەینیەتی کۆماریخوازی بەئاراستەی چەپدا بووەهۆی سەرکەوتنی بزاوتی سەندیکایی کە لەسەر بنەمای کاری راستەوخۆ دامەزرابوو. بەڵام ئەو سەرکەوتنە هێندەی نەخایاند کاتێ بزاوتی ناوبراو ترسی ئەوەی لێنیشت جارێکی تر پەنابەرێ بۆ کاری سیاسی.

ئێستا ئەو قۆناغە مێژوییە وەك قۆناغێکی دوور دێتەپێشچاو، دوای ئەو قۆناغە درێژەی تۆتالیتاریزمی پاش شۆڕش کە مەرجەعیەتی چین و میللەتی کردبوە ئامرازی گەمەکردن پێیان، لە خزمەتی ڕژێمێکی ستەمگەرو سیستێمێکی تۆتالیتاریدا بە مانای وشە. بەڵام سەرباری خەباتی کۆمەڵایەتی دورودرێژ کە ماوەیەکە ژیانی سیاسیی جڵەوکرد، ناتوانین بەتەواوی دەسبەرداری کەلەپوری کۆماریخوازیو لیبراڵی ببین، هەروەك چۆن ناتوانین جیاوازی بخەینە نێوان بنەماکانی دیموکراسیو ئەو دارمانەی بەسەر وەزیفەی نوێنەرایەتیکردندا هاتووە. بەڵکو پێویستە بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێین کە وایکرد سیاسەتی چینایەتی هەندێ جار لەخزمەتی چەسپاندنی دیموکراسیو هەندێ جاریش ببێتەهۆی لەناوبردنی دیموکراسی. وەڵامدانەوەی پرسیارێکی لەمجۆرە، کە باڵی بەسەر مێژوی هزرو مێژووی پارتە سۆشیالیستەکاندا کێشاوە، زادەی ئەو شیکارییەیە کە تائێستا ئەنجاممان داوە. چونکە سیاسەتی چینایەتی سیاسەتێکی دیموکراتی نیە ئەگەر تەریب نەبێ لەگەڵ دان–

نان بەو مافە بنەڕەتیانەی کە دەسەڵاتی دەوڵەت سنوردارردەکەن و بەرگری لە مافی هاولاتیبوون دەکەن، واتە مافی ئینتما بۆ گروپێکی سیاسی کە دەسەڵاتی یاسادانان و یاساگۆڕینی هەبێ. هەربۆیە دیموکراسی، بەدیویێکی تردا، بەندە بە پەیوەندیی یەکتەواوکەری نێوان سێ شتەوە: سنوردارکردنی دەسەڵات، سیفەتی نوێنەرایەتیکردن، هاولاتیبوون. نابێ هەر یەکێکیش لەو سیانە زاڵ بکرێ بەسەر دوانەکەی تردا.

ئەڵبەتە لەڕووی مێژوییەوە یەکەمیان گرنگترە، چونکە کاتێ باس لە پەیوەندییە چینایەتیەکان و چەوساندنەوەی کرێکاران دەکرێ بەوەی رۆڵیان بریتیە لە بەرهەمهێنانی زێدە بایی (القیمة الزائدة)و سەرفکردنی هێزی جەستەیی بەرامبەر کرێیەکی کەم..، ئەوا مەبەست رێکخستنی کارو ماف کرێکاران نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی کار لەبنەوە هەڵبتەکێندرێ بەناوی ئازادکردنی هێزەکانی بەرهەمهێنانەوە کە کۆتکراوی ئەو پەیوەندییە کۆمەلایەتیانەن. ئەم پاساوە هیچ دەرفەتێك لەبەردەم دیموکراسیدا ناهێڵێتەوە، بگرە دەرفەت دەرەخسێنێ بۆ شۆرش و دەستبەسەراگرتنی دەوڵەت، کە -گوایا- قەڵغانی دەسەڵاتی سەرمایەدارییە. واتە بۆ کۆتاییهێنان بەو توندوتیژییەی دژی کرێکاران دەخرایەگەڕ، جۆرێکی تر لە توندوتیژی پاساودەدرا. بەلام هەرگیز مرۆۋ ناتوانێ دیموکراسیەتێك بنیات بنێ کە رۆڵی گەل تیایدا نێگەتیڤ بێ. هەموو ئەو کەسانەش کە لەگۆشەنیگای چەوساندنەوەوە پەرچەکرداری دەسەلاتیان سەپاندوە، پشتیان وەرگێڕاوە لە دیموکراسیو باسیان لە دۆخی چینێك لە چینەکان، یان نەتەوەیەك لە نەتەوەکان، یان تەنها رەگەزێك لە دوو رەگەزەکە کردووە. چونکە دیموکراسی بەبێ بەشداریی پۆزەتیڤی چەوساوەکان، کە خۆیان دەبێ کۆمەڵگا بگۆڕن، دروشمێکی مردووە. واتە دەبێ کرێکاران خۆیان بەشێوەیەکی هوشیارانە ئینتما بۆ شوناسی کرێکاربوون هەڵبژێرن، نەك بەشێوەیەکی پەتی بەزۆر بکرێن بەچینی پرۆلیتاریا. بۆ دووجارە، جاری یەکەم بەر لە بیست ساڵ بوو،کە ئەوەم سەلماند هوشیاریی چینی کرێکاران لەنێو گروپە ساویلکەو کلۆڵەکاندا کە خاوەن لێهاتویی پیشەیی نین ئامادەیی نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەو نێوەندانەدا گەیشتۆتە لوتکە کە کرێکاران خاوەن لێهاتوییو سەربەخۆیی پیشەیی بوون. ئەو کرێکارە خاوەن لێهاتوییە پیشەییانە دژی ئەوە بوون سەربەخۆییان لێ دابماڵدرێو دژی ئەو سیستێمە دەسەلاتگەرە بوون کە بەشێوەیەکی مەرکەزی کارو پاشکۆیەتی بەسەریاندا دابەشکردوە. ئەوەی ناونراوە چینی کرێکاران لە دوو هێز پێکدێ کە بەدوو ئاراستەی جیاوازدا یەکتری رادەکێشن: لەلایەکەوە سۆشیالیستە شۆڕشگێڕەکان رایاندەکێشن بەمەبەستی گرتنەدەستی دەسەلات بەناوی ئازادکردنی کرێکارانی چەوساوەو گەلی ستەمدیدەوە، بەلام دواجار رژێمێکی دەسەلاتگەر دێتەسەر حوکم. لەلایەکی ترەوە بزاوتە کرێکاریەکان ئامادەییان هەیە بە کردەوە بەرگری لە مافی کرێکاران بکەن و کارو

زیرەکی و لێهاتویی پێشکەش بە پرۆسەی بەرهەمهێنان بکەن. کەواتە ناکۆکییەك لەنێوان لۆجیکی مێژوییو ئەو لۆجیکەدا هەیە کە دەکرێ ناوی بنێین لۆجیکی دیموکراتی، چونکە لۆجیکی دووەم لەیەك کاتدا بانگەواز بۆ مافەکان، هوشیاریی هاوڵاتیبوون و پاراستنی بەرژەوەندیەکانیش دەکا.

ئامانجی بزاوتی بەرگریکردن لە مافی کرێکاران بریتیە لەو شتەی کە ئینگلیز ناوی ناوە دیموکراسیەتی پیشەسازیی. فابیەکان پرنسیپەکانی ئەو دیموکراسیەتەیان راگەیاندو "تی. ئێچ. مارشاڵ" لەڕووی سۆسیۆلۆجییەوە تیۆرەکەی داڕشت. بەڵام نابێ دژبوون بخەینە نێوان کاری سەندیکایی (لەسەر شێوازی ئینگلیزی)و کاری سیاسی (لەسەر شێوازی فەرەنسی). دژبوونی راستەقینەو بنەڕەتی لەنێوان کاری دیموکراتیو کاری شۆڕشگێڕانەدا هەیە. چونکە یەکەمیان پشتئەستورە بە بیرۆکەیەك کە کرێکاران خاوەن مافگەلێکن و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بریتیە لە سەلماندنی ئەو مافانە. واتە کۆکردنەوە لەنێوان بیرۆکەی سەربەخۆیی کرێکاران و بیرۆکەی بەرگریکردنی سیاسی لە بەرژەوەندیی زۆرینە. بەڵام پرۆگرامی شۆڕشگێڕانە، بەپێچەوانەوە، کۆکردنەوە دەسازێنێ لەنێوان پێناسەیەکی سەلبی بۆ بەرژەوەندی کرێکاران کەدەبێ پارێزگارییان لێبکرێ چونکە بێبەش و چەوساوەو دوورخراوەن و.. بایەخدان بە دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی لەلایەن هێزە میللیەکانەوە کە پێشەنگی رێکخراوی کرێکارانن. بە گوزارشتێکی تر کە ئێستا کەم بەکاردێ، بەڵام لەسەردەمی دەسەڵاتی پارتە کۆمۆنیستەکاندا بەشێك بوو لە ئەدەبیاتی ئەو پارتانە، رەوتی شۆڕشگێڕانە جیاکاریی تەواو دەخاتە نێوان هەردوو چەمکی "چین وەك خۆی"و "چین لەپێناو خۆیدا"، بەڵام ئەم چەمکەی دووەم دەکاتە بەشێك لە شوناسی حیزب. لە حاڵەتێکی ئاوهادا رێچکەی دیموکراتی ئەوە رەتدەکاتەوە کە جیاکاری بکرێ لەنێوان دۆخ و کاردا، هەروەها ئەوەش رەتدەکاتەوە کە چینێك یان نەتەوەیەك یان توێژێکی کۆمەڵایەتی کورتبکرێتەوە بۆ وێنەی (قوربانییەك) کە نامۆدەکرێ بەخۆیو ئیستغلال دەکرێ.

ئەمە مانای ئەوە نیە کاتێ کاری سیاسی بەسەر خەباتی کۆمەڵایەتیدا زاڵدەبێ دیموکراسیش سەردەکەوێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە، مانای ئەوەیە سەرکەوتنی دیموکراسی بەندە بە چالاککردنی هێزی چینایەتی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ (کە خۆی خۆی ڕێکبخا نەك حزب)و بەشداری بکا لە سەرکردایەتیکردنی کاری سیاسی، هەروەها لەسەر بنەمای مافە بنەڕەتیەکان و پێڕەوکردنی شێوازێکی نوێ لە هاوڵاتیبوون کە رەوایەتی ببەخشێ بە کارو چالاکیەکانی.

هێنانەکایەی سیستێمە گەورەکانی دەستەبەری (ضمان)ی کۆمەڵایەتی، کە لە نیو سەدەی رابردوودا لە هەر بڕیارێکی سیاسی زیاتر کۆمەڵگای ئەوروپای خۆرئاوای گۆڕی، گوزارشتێکی سەنتراڵ بوو لە دیموکراسیی پیشەسازیی. لە بەریتانیای مەزن و سویدو فەرەنسا ئامانجی سەرەکی بریتی بوو لە

پەخشکردنی سەرەتای دیموکراسی بە جۆرێك کایەی ئابوریش بگرێتەوە، بەوەش هاولاتیبوونی ئابوری دامەزراو سەندیکاکان بوونە شەریکی کۆمەڵایەتی حوکم و بڕیارەکانیان هاوتای بڕیاری خاوەن کارەکان بوو. ئینگلیزو سکۆندناڤیەکان لە دوای گرێبەستی سویدەوە، کە سەندیکاو خاوەن کارەکان ساڵی 1938 لەسەری رێککەوتن، جەختی تایبەتیان لەسەر دیموکراسی پیشەسازی کرد. بەڵام بڕیاری دەستەبەریی‌و زەمانەتی کۆمەڵایەتی فەرەنسا کە جەنەراڵ دیگۆڵ، بەهاوکاری سەندیکای سی. جی. تی- یەکگرتو لەگەڵ حزبی کۆمەنیستدا، دەریکرد..، زیاتر لە خواستێکی کۆماریخوازی دەچوو. چونکە مەبەستی ئەو بڕیارە لەئامێزگرتنی چینی کرێکاران بوو لەلایەن نەتەوەوە پاش بەشداریکردنیان لە بەرەنگاریی داگیرکەردا لەکاتێکدا خاوەن کارەکان بەوە تاوانبارکران کە مامەڵەیان لەگەڵ داگیرکەردا کردووە. بەڵام ئەم جیاوازیانە بایەخێکی ئەوتۆیان نیە لەچاو ئەو جیاوازیانەدا کە داهێنانی دیموکراسی دەکاتە نەیاری فۆرمەکانی کارو بەرگریکردن لەمافی کرێکاران و تێکشکاندنی ئەو زنجیرانەی دانیشتوانیان کۆتکردووە. شۆڕشە مەزنەکان هەمیشە قۆناغێکی بەرخۆریی‌و ئیستهلاکیان بەخۆیانەوە بینیوە کە هەردوو ئاراستەکەی تێدا تێکەڵ کراوە. بەڵام لۆجیکی دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات، کە پشتئەستور بوو بە پلانی ستراتیجیی، زاڵ بوو بەسەر لۆجیکی مافەکاندا. لەو دەمانەشدا کە پاشکۆیەتی باو بوو، دینامیەتی شۆڕشگێڕانە پشتئەستور بوو بە تیۆرەی پێشەنگێتی کە لینینیزم گوزارشتی لێدەکرد. هەروەها تیۆرەی "کەتیبە شۆڕشگێڕەکان"[1]. کە لەسەر شێوازی بزاوتی جیفارایی بوو گوزارشتیکردنێکی ریشەیی بوو لەو تیۆرەیە، کە پێیوایە دەبێ جەماوەری گەمژە جیابکرێتەوە لە شەڕی پارتیزانی کە شەڕێکی بزۆکەو لە شوێنێکی دیاریکراودا گیرناخوا بەڵکو دەبێ هەمیشە لە جوڵەی بەردەوامدا بێ لەپێناو گرتنەدەستی دەسەڵاتدا کە دواجار جۆرێکە لە کودەتای بەردەوام. بەڵام سوپای میللی شۆڕش لە بابەتی "خەمیرە سورەکان"[2]..، ئەو دامەزراوانەن کە بەشێوەیەکی ریشەیی پەیوەندیی نێوان کاری سیاسی‌و هێزە کۆمەڵایەتییە چالاکەکانیان پچڕاندووە، قەوارەیەکی یاساییان نیەو بوونیان قەدەغەکراوە، کورتکراونەتەوە بۆ کەرەستەو ئامرازگەلێك کە فەرماندە سیاسییە-سەربازیەکان بەکاریان دێنن.

بەڵام سەبارەت بە سۆشیال- دیموکراتەکان، خاڵی لاوازییان لەوەدایە کە پێگەی خۆیان بەڕوونی دیاری ناکەن و نازانرێ سەر بە چ بەرەیەکی دیاریکراون. ئەوان هەرچەندە بایەخ بە کاری سەندیکایی دەدەن، بەڵام باس لە رۆڵی مەرکەزیی دەوڵەتیش دەکەن کە بۆی هەیە دەستوەرداتە هەندێ کاروبار، کە بەلێکدانەوەیەکی تر بۆیان هەیە دەستبگرن بەسەر دەوڵەتدا. ئەو کەرتبوونەی کەوتە نێوان سۆشیال-ئەنتەرناشناڵی یەکەم و سۆشیال-ئەنتەرناشناڵی دووەم ئەوەی دەرخست کە بیرۆکەی سۆشیال- دیموکرات هەڵگری چەندین ئاڵۆزیی‌و ناکۆکیی ناوەکییە.

**پارتەکان و سەندیکاکان:**

بەڵام ئەو ئاڵۆزیو ناکۆکیانەی سۆشیال- دیموکرات هاوشانی چەند خاڵێکی پۆزەتیڤە. "کیڵسن" بە خۆبەخشی بەرگری لە پارتن شتات (واتە دەوڵەتی پارتەکان)[3] کرد، ئەوەی دوپاتکردەوە کە مەحاڵە دیموکراسی بوونی هەبێ گەر دیموکراسیەتێکی پارلەمانی نەبێ. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە تا مێژویەکی نزیك رۆڵی مەرکەزیی پارتەکان لکێندرا بە دان- نان بە خەباتی کۆمەڵایەتیدا وەك بنەمای ژیانی سیاسی. هەروەها پارتەکان دەرفەتیان رەخساند بۆ دەنگدەران تا چاودێریو سانسۆری ئەو کەسانە بکەن کە دەنگیان پێداون. هەرچەندە ئەو سانسۆرە لە لایەن مەرجەعیەتی سەرۆك پارتەکانەوە سنورداردەکرا، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ کۆماری پیاوماقوڵاندا لەئاستێکی بەرزدا بوو.

ئەوانەی بەرگری لە بیرۆکەی مافی کۆمەڵایەتی دەکەن، لەسەرو هەمووشیانەوە جۆرج گۆرڤیچ، هەنگاوی گەورەتریان ناوە کاتێ قسەیان لە فرە یاسایی کردوە. چونکە وێنەی سیستێمی یاسایی کامڵ، کە "کیڵسن"یش باسیکردووە، بەشێوەیەکی هەرەمی لەسەرەوە بۆ خوارەوە فەرمانەکان رێکدەخاو خاوەن دیسپلینێکی بنەڕەتییە، ماف یەکسان دەکاتەوە بە دەوڵەت، کە دەشێ دەوڵەتێکی نەتەوەیی یان کۆماری یان دەسەڵاتگەر بێ. بەڵام ئەو دەوڵەتە دوا خاوەنی سەروەرییەو بەرژەوەندی باڵای ئەو بریتیە لە بەرگریکردن لە یەکێتی خاك و یەکێتی کۆمەڵگا. بەڵام بیرۆکەی مافی کۆمەڵایەتی، بەمانا گشتییەکەی، وێنەیەك بۆ ماف و سیاسەت پێشکەش دەکا کە دەروشاوەترە لەو وێنەیەی باسکرا. چونکە لەبری سیستێم زیاتر تیشك دەخرێتە سەر هێزە چالاکەکان، تێگەیشتنی پێودانگی (معیاری)یش بۆ ماف پاشەکشێ دەکا لەئاست تێگەیشتنی واقعیدا بۆ ماف. پاشان فرەیی لە مەڵبەندەکانی دەسەڵات و دەسپێشخەریی یاسایی دەسەڵاتێکی ناڕاستەوخو دەبەخشێ، نەك تەنها بە هێزە کۆمەڵایەتییە بکەرەکان، بەڵکو بە کۆمەڵەو رێکخراوەکان و سەرکردەکانیشیان. نوێنەرایەتیکردنی "بەرژەوەندیی زۆرینە" بووە هۆی دروستبوونی کۆمەڵەو رێکخراوەکان، وەك سەندیکاکان و پارتەکان، بەڵام لەهەمان کاتدا بووە هۆی پەیدابوونی کۆمپانیا گشتیو کۆمەڵە هەرەوەزیەکانیش کە مەبەستیان قازانج نەبوو، بەڵکو دەرفەتیان بەخشییە "جەماوەر" تا داخڵی ململانێی ژیانی سیاسی بێ، کە تا ئەو دەمە لەژێر رکێفی پیاوماقوڵو میرەکاندا بوو. ئیدی لەو کاتەوە پارت و سەندیکاکان بوونەتە ئەو توخمانەی کە بۆ دیموکراسی پێویستن. چونکە تا کۆمەڵگا ئاڵۆزتر بێ، گروپەکانی بەرژەوەندیش زیاتر دەبن و داواکاریەکانیان لەلایەن ئەو کەسانەوە بەرزدەکرێنەوە کە دەبنە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگەی سیاسیو کۆمەڵگەی مەدەنی. ئیدی مەحاڵە وێنای دیموکراسی بکەین بەبێ بوونی پارت، چونکە دیموکراسی لەلایەن دیدوبۆچوونی زۆرینەوە جڵەودەکرێ کە لە گۆڕانی بەردەوامدایە. ئەزموونی هەندێ لە وڵاتان، وەك فەرەنسا بۆ

نمونـه، کـه سـەندیکاکانی دووچاری لاوازبـوون هـاتن، ئـەوەی دەرخسـت کـە کـارێکی سـەختە گۆڕانی ئابووریو نەتەوەیی گرنگ ئەنجامبدرێ گەر دەوڵەت توانای دانوستانی لەگەڵ شـەریکی کۆمەڵایـەتی بـاوەڕپێکراودا نـەبێ، جـا ئـیتر پەیوەندیی بە دامەزراوەکانەوە بێ یان بەوانەوە کە بەرامبەر کرێ ئیشدەکەن.

ڕێکخسـتنی پـارت قۆنـاغی سیاسـەتی پیاوماقوڵانی تێپەڕان کە لە بەریتانیای مەزن تا ماوەیەکی درێژیش گوزارشتی لێدەکرا، چونکە هەرچـەندە لـەو وڵاتـەدا دژایـەتی سیسـتێمی شانشـینی ڕەهـا کـرا، بـەڵام زەینیـەتی ئۆرستۆکراتی بە پتـەویو بەهێزی مایـەوە. گەر مەسـەلەکە بەدەسـت "لمـۆیزی ئۆستڕۆگۆرسـکی"یەوە بـا، ئـەوە تـا ماوەیـەکی درێژ پرۆسـەی وەرچەرخانی بەریتانیای مـەزنی رادەگـرت، ئـەو پرۆسـەیەی کـە وڵاتـی لـە نوخبەگـەریی (وێـگ)ەوە بـەرەو لـەدایکبوونی قۆنـاغی سـێیەمی حزبـی لیبراڵـی بـرد، لـەڕێگای کـۆنگرەی "کۆکـۆس بەرمەنگهامـەوە"[4]، یـان بـەرەو لـەدایکبوونی پەیوەندییـە مەزنـەکان لـەپێناو بـەرگریکردن لـە مافـە کاتۆلیکیـەکان و ریفـۆرم لـە هەڵبژاردنـەکان و بەتاڵکردنـەوەی یاسای خۆپاراستنی پێشوەخت.

بەڵام چۆن بـوو خۆسازدان بۆ تـەنها پرسێك بووەهـۆی ڕێکخسـتن و هەڵبـژاردنی فـەرمانڕەواکان و یەکخسـتنی گروپـە جیاوازەکـانی بەرژەوەنـدی؟ بەهـەرحاڵ، بیرکردنـەوە دەربـارەی حزبـەکان پڕبـەپڕی خـۆی نـەبوو تـا ئـەو کاتـەی حزبـە سۆشیالیسـتەکان دامەزران، کە ئیدعای ئەوەیان کـرد نوێنەرایـەتی چینی زۆرینـە دەکـەن و هەوڵـدەدەن ڕێکخسـتنە کۆمەڵایەتیـەکان قڵـپ بکەنـەوە، بـەڵام کاریگەریـەکانی کـارێکی لـەو جۆرە بوونـە هـۆی گۆڕینی ڕوخسـاری تـەواوی ژیـانی کۆمەڵایـەتی، لەڕێگەی قۆرخکردنی دەسەڵاتەوە.

بەر لە ساڵی 1914، واتە ئەو کاتەی هەریەك لە ئۆستڕۆگۆرسکی، مایکلز، مۆسکاو پاریتۆ.. نوسـینەکانیان بڵاوکـردەوە، بینیمـان کـە دوو جـۆر ڕەخنـە ڕوبـەڕووی پارتـەکان دەکرانـەوە: یەکەمیان، ڕەخنەیەکی لیبراڵی تۆکڤیلی بوو، کە ئۆستڕۆگۆرسکی لەڕێگەیەوە هێرشی کردە سـەر ئـەو شتـەی دەکـرێ نـاوبنرێ (یاسـای پـۆلاییـنی ئۆلیگارشـی)، کـە لـە گرێـدانی کۆنفرانسـە ئینگلیزیو ئەمریکیەکانـدا دەرکـەوت. بـەڵام ڕەخنەی دووەمیـان لەسـەر دەسـتی مـایکلز بـوو، کـە بەتایبـەتی ڕەخنـە لـەوە دەگـرێ دەسـەڵات لەدەستی حزب- دەوڵەتدا چڕببێتەوە. ڕەخنـەی یەکـەم ڕوبـەڕووی حزبـە دیارەکـانی مەیـدانی سیاسـی کرایـەوە، هەرچـی ڕەخنـەی دووەمـە هەنـدێ جـار دژی دیکتاتۆریـەتی پرۆلیتاریـاو هەنـدێ جـاریش لـە بەرژەوەنـدی ئـەو دیکتاتۆریەتـە لێکدرایـەوە. ئەڵبەتـە پارتـە کۆمەنیست و فاشیست و ناسیۆنالیستەکانیش بەشـێوەیەکی درامـاتیکی بایـەخیان دەدا بەمجۆرە ڕەخنەیە.

خاڵی لاواز لە ڕەخنەی یەکەمدا لەوەدایە کە ئـیعتراف ناکـا بـە شـێوازی نوێنەرایـەتیکردنی فـەرمانڕەوا سیاسـیەکان. واتـە هەڵوێسـتێکی تـەواو لیـبراڵ وەردەگـرێ. لـە کتێبـی (دیموکراسـیو پارتـە سیاسـیەکان، ل665-666)دا ئۆستڕۆگۆرسـکی دەڵـێ: "وەزیفـەی

سیاسی جەماوەر لە رژێمی دیموکراتیدا، مانای ئەوە نیە کە جەماوەر خۆی حوکم بکا، چونکە لە رژێمێکدا دیموکرات بێ یان ئۆتۆکرات، جەماوەر توانایەکی لەوجۆرەی نیە بەڵکو تەنها کەمینەیەکی بچوك توانای فەرمانڕەوایی هەیە. خەسڵەتی دەسەڵات، هەر جۆرێك بێ، بریتیە لە مەرکەزیەت، هەروەك رژێمی کۆمەڵایەتیش یاسای کێشکردن پێڕەودەکا. بەڵام پێویستە بەرامبەر کەمینەی فەرمانڕەوا بوەستینەوە، چونکە ئەرکی لە رژێمی دیموکراتدا حوکمکردن نیە بەڵکو ترساندنی حکومەتە". پاشان دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە گروپەکانی بەرژەوەندی تا ئامانجیان سنوردارتر بێ توانای فشاریان زیاتر دەبێ. بەنیشتمانیکردنی ئابوری وڵاتان جۆرە هێزێکی تری دروستکرد، چونکە ئەرکی سەرەکیی دەوڵەت بووە بەرگریکردنی زیاتر لە ئابوری وڵات لە بازاڕە نێودەوڵەتیەکاندا، کارێکی لەوجۆرەش دەوڵەت لە ئەرکی بەجێهێنانی داخوازییە کۆمەڵایەتیەکان دەبەخشێ، ئەو داخوازیانەی کە دەبێ قۆناغ بە قۆناغ جێبەجێ بکرێن.

دیموکراسی دووچاری گەندەڵی دەبێتەوەو رێی خۆی وندەکا کاتێ سیستێمی سیاسی پەلاماری دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنی دەدا، تووشی هەمان ئەو دوو دەردە دەبێت کاتێ دەوڵەت ئەو سیستێمە لەناودەباو ئیدعای نوێنەرایەتیکردنی گەل دەکاو خۆی بە قسەکەری راستەوخۆی داواکاریە میللیەکان دەزانێ. خەتەری یەکەم لە بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی پارتەکاندا بەرجەستەدەبێو زیاتر لەو وڵاتانەدا سەرهەڵدەدا کە بە دیموکرات لەقەڵەم دەدرێن. بەڵام مەترسیی دووەم لە سەدەی بیستەمدا بەشێکی زۆری جیهانی تەنی، کاتێ کۆمۆنیزم و فاشیزم بەرگرییان لە نوێنەرایەتیکردنی راستەوخۆی کرێکاران کرد دژی دیموکراسیی پارلەمانی. لە کتێبی "دەوڵەت و شۆڕش"دا لینین دژی سیستێمی پارلەمانی قسەدەکا، وەك درێژبوونەوەی رەخنەی مارکس لە "وەهمی سیاسی"ی جاکوبیزمی فەرەنسی. لەو کتێبەدا داوای دیموکراسیەتی راستەوخۆ دەکاو پێشنیازدەکا هەرەمێك لە ئەنجومەنەکان پێکبهێنرێ کە دەسەڵات ببەخشێ بە کرێکاران –تەنها کرێکاران– تا چاودێری تەواوی دەسەڵاتی سیاسی بکەن. بە هەمان شێوە فیدراسیۆنە پیشەگەرییە[5] مۆسۆلۆنیەکان، فرانکۆفۆنیەکان، سالازاریەکان.. ناکۆکیان خستەوە لەنێوان دیموکراسیەتی واقعیو میللی لەلایەك و دەسەڵاتی ئەو نوێنەرانەی کە بەشێوەیەکی پارلەمانی هەڵدەبژێردرێن لەلایەکی ترەوە. ئەڵبەتە ئۆگەست کۆنت دەسەڵاتی دووەمی ناونابوو میتافیزیکی.

بەڵام لەراستیدا ئەو رژێمانەی دژایەتی سیستێمی پارلەمانی دەکەن، شایەنی ئەوە نین بەشێوەیەکی تیۆری وەڵام بدرێنەوە، چونکە رەفتارو هەڵسوکەوتەکانی ئەو رژێمانە ئەوەیان دەرخست کە ئەوان خۆیان تەرخانکردووە بۆ سەپاندنی سانسۆر لەسەر گروپە کۆمەڵایەتیەکان لەرێگەی حزب–دەوڵەتەوە نەك لەرێگەی گوزارشتی ئازادانە لە داواکارییە میللیەکان. پێویستە مرۆڤ لەسەر ئەوە پێدابگرێ کە پەیوەندیی راستەوخۆ لەنێوان

دەوڵەت و هێزە کۆمەڵایەتییە چالاکەکاندا کارێکی مەحاڵە، ئەمەش ئەوە پێویست دەکا سیستێمێکی سیاسی لەسەر پێی خۆی، لەسەر بنەمای پتەوو گەشەسەندوی دیموکراسی، لەئارادا بێ. چونکە هەروەك چۆن پێویستە داواکارییە کۆمەڵایەتیەکان لەبەرتر بن تا پێداویستیەکانی فەرمانڕەوایی ناوخۆ یان تا "گەمە سیاسیەکان"، بەهەمان شێوە بۆ هیچ بزاوتێکی کۆمەڵایەتی نیە باز بەسەر گرووپی بەرژەوەندییە تایبەتەکاندا بدا، چونکە توێژی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ هەن کە پرسەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییان خستۆتە ئەستۆی خۆیان. ئیدی نەبوونی چەند دامەزراوێکی سیاسیی ئازاد دەبێتەهۆی دروستنەبوونی هێزە کۆمەڵایەتیە چالاکەکان و ڕێگەخۆشدەکا لەبەردەم سانسۆر و چاودێریی داپڵۆسێنەرانە، کە دەزگای دەوڵەت لەسەر داخوازی‌و بزاوتە کۆمەڵایەتیەکان پێڕەوی دەکا.

بەڵام خەتەری پێچەوانە کە لەخەتەری دەوڵەتی تۆتالیتاری، یان لە دەوڵەتی فیدراسیۆنە پیشەگەریەکان، دەکەوێتەوە، ئەو کاتە دەردەکەوێ کە سیستێمی سیاسی دەسەڵات دەگرێ بەسەر کایەی دەوڵەتدا، یان ئەو کاتەی کایەی کۆمەڵگەی مەدەنی داگیردەکا.

بینیمان دەوڵەت لەسایەی ڕژێمە دیموکراتیە پارلەمانیە ئەوروپییەکاندا زۆر جار توشی لاوازی‌و لەبەریەکهەڵوەشان بۆوە. ئیتالیا لەسەرەتای نەوەدەکاندا نمونەیەکی ئاشکرای ئەم ڕاستییە بوو کە تووڕەبوونێکی گەورەی لە ڕای گشتیدا لێکەوتەوە. خەباتی دادوەران دژی تەمویلکردنی حزب بەشێوازی ناشەرعی هانی ئەو ڕای گشتییەی دا دژی پرۆژە گشتییە – ناشەرعیەکان– یان دژی ئەو سەرکردانەی خۆیان دەوڵەمەند دەکرد. داگیرکردنی کۆمەڵگەی مەدەنیش لەلایەن حزبەکانەوە هەڵگری مەترسییەکە، لەو مەترسییەی باسمانکرد کەمتر نیە. ئەمریکای لاتین نمونەی دیاری ئەو شوێنەیە کە ئەو دۆخەی تێدا چڕدەبێتەوە، بەتایبەتی کاتێ چالاکیی کۆمەڵایەتی دەبێتە کەرەستەگەلێکی سیاسی ساکار، کە حزبەکان و سەرکردەکانیان سوودیان لێوەردەگرن. ئەلبێرت هێرشمان ئاماژەی بۆ مەترسیی ئەو حزبە جەماوەریە گەورانە کرد کە جێگەی کاری کۆمەڵایەتی دەگرنەوە، جا ئیتر کاری سەندیکایی بێ یان کاری کۆمەڵایەتیی تر. من بۆ خۆم شیکردنەوەم پێشکەشکردووە دەربارەی تێکەڵاوبوون و تواندنەوەی ڕێکخراوە میللیەکان لەناو دامودەزگاکانی حزب و دەوڵەتدا لە کیشوەری ئەمریکای لاتین. بەڵام لێرەدا نمونەی کلاسیکی لە حزبی (***PRI***)[6]ی مەکسیکیدا دەردەکەوێ، کە بۆ نیو سەدەیە حزبی دەوڵەتەو سەرکردایەتی ڕاستەوخۆی سەندیکاکانی کرێکاران و جوتیاران و تەواوی ڕێکخراوە مەدەنیەکان دەکا.

سروشتی حزبەکان تەنها پەیوەندیدار نیە بەخودی حزبەکانەوە، یان بە نەریتەکانی دەوڵەتەوە، بەڵکو بەهەمان شێوە پەیوەندیدارە بە شێوازی دروستبوون و گەڵاڵەبوونی داواکاریە میللیەکان و ڕێکخستنیان. کاتێ وڵاتە زۆر پێشکەوتوەکان قۆناغی کۆمەڵگەی پیشەسازی تێدەپەڕێنن، ناکۆکیی نێوان

بۆرجوازیــەت و چــینی کرێکــارانیش بایــەخی خـۆی لەدەسـت دەدات، پـاش ئـەوەی پرنسـیپی سـەرەکیی ڕێکخسـتنی ژیـانی سیاسـیی ئـەو وڵاتانـە بـوو. لـە دۆخیکـی ئاوهـادا حزبـەکان ئاراسـتەی یـەکگرتوی خۆیـان لەدەسـت دەدەن، تووشــی پــەرتبوون و ململانــێ دەبـن بــەهۆی زیــادبوونی مەحســوبیەت و دەســتەگەرییەوە. دیـارترین نمونـە لەمبارەیـەوە نمونـەی حزبـی دیمـوکرات لیبراڵـی ژاپۆنییـە کـە سـاڵی 1993 چارەنوسـی لەسـەر دەسـتی کوتلـەی "هاتـا" بـە تەقینــەوەو دابەشــبوون کۆتــایی هــات، پــاش حیکایــەتێکی دورو درێــژ لــە ململانێــی نێــوان کوتلـە ڕێکخراوەکـان. لـە هیندسـتانیش کۆمەڵـە دەســتەیەکی حزبیــی دەســتیان گــرت بەســەر ژیــانی دیموکراســیدا. بــەڵام دەشــێ تەفســیری دەســـتەگەری بکـــەین بـــەوەی کـــە لـــەپێناو هێشـــتنەوەی پلەبەنـــدیی کۆمەڵایەتیدایـــە، بەتایبەتی ئەو پلەبەندییەی پەیوەندیی بە چینە داخراوەکانـەوە هەیـە، یـان پەیوەنـدیی بـە فـرە ناوچەیی ئەو کۆمەڵگایەوە هەیە کە هەرچەندە گشـــتگیرە بـــەڵام یـــەکێتی تـــەواو لـــەنێوان پارچـــەکانیدا نیـــە. لـــە فەرەنســـا حزبـــی سۆشیالیست کەوتـە قـەیرانێکی قووڵـەوە پـاش ئەوەی یەکێتی حزب کەوتە بەر مەترسی بەهۆی ململانێــی نێــوان دەســتەکان بەتایبــەتی لــەو کۆنفرانسـەدا کە لـە شـاری (ریـن) بەسـترا. پـاش قەیرانی نوێنەرایەتیکردن، کاتێ دۆخە نالەبارە دەرەکــی و ناوخۆییــە دراماتیکیــەکان کۆتاییــان پێدێ، ئـیتر ڕژێمـە دیموکراتیـەکانیش دەرفـەتی ژیانیــان لەبەردەمــدا زیــاتر واڵادەبــێ. بــەڵام زۆرجـــار کورتدەکرێنـــەوە بـــۆ بازاڕگـــەلێکی سیاسیی کراوە کە هاوڵاتیان، وەك مەسرەفکەرو بـەرخۆری سیاسـی، رووی تێدەکـەن. زۆر کـەس ڕازییــە بــەو دۆخــە، بــەڵام لەواقعــدا دۆخێکــە دیموکراسـی پەکـدەخا، چـونکە وادەکـا خـەڵکی ئینتمای چالاکیان بۆ ئەو دیموکراسییەتە نەبێ، زۆر جـــاریش ئاســـتی بەشـــداریی لـــە ژیـــانی سیاسیدا، تەنانەت لە پرۆسەی هەڵبژاردنیشدا، نزم دەکاتەوە.

**تۆتالیتاریزم:**

کاتێ حیزبێکـی پێشـەنگ هەسـت ناکـا دەبـێ ملکەچــی ئــیرادەی بکــەری کۆمەڵایــەتی بــێ..، کاتـــێ ئـــەو حزبـــە بـــەناوی ئـــەو بکـــەرە کۆمەڵایەتییەوە هەڵسوکەوت دەکاو پێدادەگرێ لەسەر بوونی توێژێك کە چەوسێنەرو ئیستغلال کـەرە، یـان پـەنا بـۆ پێناسـەیەکی ناکۆمەڵایـەتیی ئـەو بکـەرە دەبـا، وەك پێناسـەی بـایۆلۆجی بـۆ نمونــە...، لــە کــاتێکی ئاوهــادا دیموکراســی لەبەیندەچـێو ئـەو کەسـانەش کـە دیموکراسـی وەك مەرجــەع تەماشــادەکەن دەبنــە قوربــانیی یەکـەمی دەسـەڵاتی تۆتالیتـاریی. کـاتی خـۆی بینیمان چۆن تۆتالیتاریزم لەگەڵ نازیزدا تێکەڵ بــوون، بینیشــمان چــۆن لەگــەڵ کۆمۆنیزمــدا هەرەســی هێنــا، بەئەندازەیــەك چــیتر دووداڵــین لــەوەی ئــەو چــەمکە جـارێکی تـر بـەکار بێـنین. لەلایـەکی تـرەوە چـەمکی تۆتالیتـاریزم هـەڵگری ئاڵۆزییــــــەکی زۆرە، بەئەندازەیـــــەك رەنگـــــە بـەکارهێنانی یارمەتییـەکی ئـەوتۆمان نـەدا بـۆ شیکردنەوەی نازیزم، یان ئەو شتەی ناونراوە سـتالینیزم، کـە ئەڵبەتـە دەبـێ وریـا بـین لـەو

ناونانـــــەدا. کەســـــانێکی زۆر پێیانوایـــــە سیسـتێمێکی دەسـەڵاتگەرو نـادیموکراتیی لـەو جۆرە، دەبێ وەك خـۆی باسـبکرێ، وەك ئـەوەی کە هەیە. ئیتر پێویست ناکا خۆمان بە چەمکی ئەبسـتراکتەوە ماندووبکـەین، کـە دەمامـك دەکـا بەبەری جیاوازیەکانداو وەك خاڵی لێکچوونی – نێـوان رژێمـە تۆتالیتارەکـان– نیشـانی دەدا. زۆرجـار سیسـتێمی نـازیزم وەك "شـەڕ"ی رەهـا وێنادەکەین، کە جەوهەری خۆی لـە هۆڵۆکۆست (جینۆسـایدی جولەکـەکان) دا ئاشـکراکرد، پاشان لە قەتڵوعامی چەند گروپێکی مرۆیی تر کە بە نزمتر لەقەڵەم دران، وەك قەرەجەکان. بەڵام مەترسیی ئەو تاوانانەی کە لە "ئۆشفیتس"و لە چــەند ســەربازگەیەکی تــری کۆچــپێکردن و قـەتڵوعام، لـە هـەموو کۆمەڵگـەکانی ژێـر زەبـری داگیرکـەر، پێڕەوکـران..، بـەجۆرێك گـەورەو بـێ وێنـە بـوون کـە گـەر بەگشـتیو لەگـەڵ چـەند پرسـێکی تـردا باسـیان بکـەین، رەنگـە مـاف نـەدەین بـەو مەترسییەی خسـتیانەوەو سـووك نیشانیان بدەین. تەنانـەت هەندێ لـە لێکۆڵیارە نایابـەکان هەوڵـدەدەن قەناعـەتمان پـێ بێـنن کـە هـەردوو رژێمـی کۆمۆنیسـتی، روسـیاو چـین، بەئانقەست ژمارەی قوربانیەکانیان هێندەی یـەك یـان زیـاتر بـوون. ئێمـە لـە رژێمـە شۆڕشـگێڕییە کۆمۆنیستەکاندا جوڵانەوەیەکی کرێکاران بەدی دەکەین، کە ئەڵبەتـە چارەنوسیان لەناوچوون و پووکانـەوە بـوو، بـەڵام ئـەو رژێمانـە قـابلی تێگەیشـتن نـەبوون گـەر ئـەو بزوتنەوەیـە لـە بنەڕەتدا نەبوایە. هەرچی نازیزمە بریتـی بـوو لـە بزوتنەوەیــــەکی نەتــــەوەیی رەچــــەڵەکخوازو دوژمنکـــار، کـــە بەشـــێوەیەکی نائـــەقڵانی سەرکردەی تەقدیس دەکرد. ئەو رۆشنبیرانەش کـە بەگشـتی دژی فاشـیزم بـوون، چـوونە ژێـر کاریگـەریی بانگەشـەی کۆمۆنیزمـەوە سـەبارەت بە پرنسیپەکانی مێژو، پێشکەوتنی ماتریاڵیو دەوڵەتی میللی، گوایا ئەو هێزانە توانایان هەیـە لەپێناو رزگارکردنی میللەتاندا کۆتایی بێنن بـە کڵۆڵیــو نــەزانیو ســتەم و ئۆلیگارشــیەت و کۆلۆنیـالیزم. لـە راسـتیدا ناچێتە ئەقڵـەوە ئێمـە باس لە یەك جۆری دیاریکراو لە رژێمی سیاسی بکـەین لـەناو رژێمـە فاشیسـتەکاندا، یـان یـەك رژێمــی تایبــەت لــەناو رژێمــە ئیســلامییە سیاسیەکاندا، یان یەك جۆری دیاریکراو لە هـەر رژێمێکی دەسەڵاتگەری تر، بەڵکو دەبێ ئاماژە بــەو رژێمانــەش بــدەین کــە لەیــەك کاتــدا دەسەڵاتگەرو دژ بە شۆڕشیش بوون، کە چەند دیکتاتۆرێـك دایانهێنـا، وەك: فرانکـۆ، سـالازار، پیتــان، بینۆشــێ، جەنەراڵــە یۆنانیــەکان و هاوتاکانیان لە ئەرجەنتین و ئۆرگوایو بەرازیل. لـە کاتێکـدا هەمەچەشـنیی ئـەم رژێمانـە مانـای ئــــەوە نیــــە کــــە هــــەموویان هــــەڵگری خەسڵەتگەلێکی هاوبەشن.

**ریمۆن ئارۆن تێبینیی پێنج تـوخمی سـەرەکیی کرد، کە لە هەموو رژێمە تۆتالیتارەکاندا هەن:**

1. پـاوانکردنی چـالاکیی سیاسـی بـۆ تـەنها حزبێك.
2. هەڵســـوکەوتی ئــــەو حزبــــە بــــەپێی ئایدیۆلۆجیایەك کە دەبێتە هەقیقەتی رەسمیی دەوڵەت.
3. دەوڵــەت کەرەســتەکانی هێــزو قەناعــەت پێهێنان بۆ خۆی پاوان دەکا.

4. زۆربەی چالاکییە ئابوریو پیشەییەکان دەلکێندرێن بە دەوڵەتەوەو ملکەچی هەقیقەتی رەسمی دەکرێن.

5. هەڵەی ئابوری یان پیشەیی بە هەڵەیەکی ئایدیۆلۆجی لە قەڵەمدەدرێ، بۆیە دەبێ سزاکەی تۆقاندنی ئایدیۆلۆجی یان پۆلیسی بێ. (دیموکراسیو تۆتالیتاریزم، ل287-288).

هەروەها ئەلیکساندرۆ بیزۆرنۆ لێکدانەوەیەکی مێژوویی رەسەنی پێشکەشکرد سەبارەت بە بانگەشەی دەسەلاتە ستەمگەرەکان بۆ پرسەکانی مەرگ و ژیانی ئەو دنیا. دواجار دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە هەرچەندە لە ئەوروپای خۆرئاوای مەسیحیدا دەسەلاتی زەمەنی (کاتی) لە دەسەلاتی رۆحی جیاکراوەتەوە {واتە دەسەلاتی دەولەت لەدەسەلاتی ئاین}، بەلام خەلکانی بەهێز لەناو دەسەلاتی زەمەنیدا هەر باسیان لە ئامانجە دوورەکان کردوە {هەروەك چۆن دەسەلاتە ئاینیەکان باسیان لە بایەخی ئەو دنیا کردووە}. {ئەو گوتارە} خەلکە هەژارو بێدەرەتانەکانی هانداوە -وەك نەتەوەو چین و برِاوتەکان- لەبری ئەوەی باس لەحالی خۆیان بکەن، چەند مەبەستێکی دوور خایەنیان پێشنیار کردووە، تا بەشێوەیەکی یەکجارەکی لە لاوازیو کلۆلی رزگاریان ببێ. ئەم لێکدانەوەیە ئەگەری پەیوەندیی بەهێزی نێوان دروستبوونی دەولەت لە چاخەکانی ناوەراستو سیاسەتی رەها {لە دەولەتی مۆدێرندا} دەخاتە روو. ئەم حالەتە سەبارەت بە شۆرشی فەرەنسییش راستە، هەروەك تۆکڤیل روونی کردۆتەوە، بەلام سەبارەت بە رژێمە نەتەوەییە ستەمگەرە هاوچەرخەکان راست نیە، کە وەك پەرچەکردار دەرکەوتن بە رووی قەیرانەکانی مۆدێرنەدا، هەروەها وەك کۆمەلە بەهاو دیسپلینێکی دەستەجەمعی. چینی کرێکاران لەو شوێنەدا نەبوو کە رژێمە ستەمگەرە فاشیستەکان و تەنانەت کۆمۆنیستەکانیش گەشەیانکرد، بەلکو لەو شوێنەدا کۆمەلێك نوخبەی دەسەلاتگەر هەبوون، کە بەناوی نەتەوە یان چین یان ئاینەوە قسەیانکرد. تۆتالیتاریزم دەسەلاتی لاوازەکان نیە، بەلکو دەسەلاتێکە بەهۆی نەبوونی بکەرە چالاکە کۆمەلایەتیەکانەوە دێتەبوون.

ئەم شیکردنەوانە دەمانبەنەوە سەر لێکدانەوەیەکی گشتیتر. ئەگەر باس لە مۆرکی ستەمگەری لە حوکمی تۆتالیتاریدا نەکەین، یان باس لەو دەسەلاتە نەکەین کە ملکەچی چاودێری نوخبەیەکی سەرکردایەتی تەکنۆ-بیرۆکراتی، یان نوخبەیەکی پیشەگەری مەزهەبییە، ئەوا خەسلەتی سەرەکیی دەولەتی تۆتالیتار لەوەدایە کە بەناوی کۆمەلگا یان گەل یان چینەوە قسەدەکا، دوای ئەوەی دەنگ و زمانی بۆ خۆی دەبا. تۆتالیتاریزم -کە بەمانای دەسەلاتی گشتگیر دێ- ناوی خۆی بەخۆیەوە، چونکە دەسەلاتێکی تۆتال دادەمەزرێنێ کە لەهەناویدا هەموو دەزگاکان دەتوێنەوە، وەك دەولەت و سیستێمی سیاسیو هێزە کۆمەلایەتیە چالاکەکان. ئیتر هەموو ئەو دەزگایانە شوناس و تایبەتمەندیی خۆیان دەدۆرێنن و دەبنە کەرەستەگەلێکی کۆنترۆلکردنی رەها بەدەست دەزگای

فەرمانڕەواییـــەوە، ئــەو دەزگایانــە لــە دەوری سەرکردەیەکی ڕەها دەسوڕێنەوە کە دەسەڵاتی ستەمگەرانەی خۆی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، بەهەموو وردەکاریەکانیەوە، پێڕەودەکا. زۆرجار پێناسـەی مۆدێرنیتـە بـەوە دەکـرێ: بریتیـە لـە عەلمانیـــەت و جیاکـــاری لـــەنێوان کایـــە فەرعیەکانی کۆمەڵگا: ئاین، سیاسەت، ئابوری، دادپەروەری، پەروەردەو خێزان و.. هتد. بەڵام خەسـڵەتی تایبــەتی سیســتێمی تۆتالیتــاری لەمبارەیـــــەوە ئەوەیـــــە کـــــە بـــــەناوی ئایدیۆلۆجیایـەکی دیـاریکراوەوە عەلمانیـەتی لـەناوبردوە. ئـەو ئایدیۆلۆجیایـە بەسـەر هـەموو کایەکانی ژیانی گشتیو تایبەتدا پێڕەودەکرێن. هەرچـەندە لـە ڕژێمـی تۆتالیتـاردا پلەبەنـدیی لـەنێوان چـینە کۆمەڵایەتیەکانـدا هەڵـدەگیرێ، بەڵام پلەبەندییەکی تر دێتەگۆڕێ لەسەر بنەمای پەیوەنـدیی شەخسـی لەگـەڵ مـیر یـان حزبـدا. هەرچـی ئـەو کەسانەشـە کـە دژی تۆتالیتـاریزم وەستاونەتەوە، هەمیشـە بـەرگرییان لـە یـەکێك لـەو چـالاکیانە کـردووە کـە ڕژێـم قـووتی داون ماسکی ئەوانی پۆشیوە. هەندێکیان بەرگرییان لە بزاوتـی کۆمەڵایـەتی کـردووە، هەندێکیشـیان بـەرگرییان لـە بزاوتـی نەتـەوەیی کـردووە، واتـە حـوکمی تۆتالیتـاری لـەبری ئـەو دوو بزاوتـە قسـەی کـردووە. هەندێکیشـیان بـەرگرییان لـە سەربەخۆیی ئاین، یان یاسا، یان خێزان و بگرە دەوڵەتیش کردووە.

وڵاتـە دیموکراتـەکان پشتئەسـتور بـوون بـە کۆڵەکـەی کۆمـاریی یـان لیبراڵـی، بۆیـە ڕژێمـە تۆتالیتارەکـان لـەو وڵاتانـەدا سـەریان هەڵنـەدا. چونکە دیموکراسـی لـە بنەڕەتـدا دژی نوخبـەی ئۆلیگارشی یان شانشینی ڕەها بوو، کە سەر بە ڕژێمـی کـۆن بـوون. دیموکراسـی دژی ئەوەیـە کۆمـەڵگاو دەوڵـەت لێـك جیابکرێنـەوە، بـەڵکو داوای حکومـەتێك دەکـا کـە زادەی گـەل بـێ، بـۆ گەل بێو لەڕێگەی گەلەوە بێ. وەرچەرخان لە دیموکراسـیی لیبراڵییـەوە بـۆ دیموکراسـیی کۆمەڵایەتی بەهۆی حکومەتی کرێکارانەوە بوو بە پلەی یەکەم. ئەو وەرچەرخانە جۆرێك بوو لە گەشەســەندنی بیرۆکــەی دیموکراســی کــە بایـەخێکی زۆری هـەبوو، وای لـە چـەپ کـرد لـە گــەڵ بزاوتــی ســەندیکاکان و دوو ئامانجــدا بگونجـێ: پاراسـتنی کرێکـاران و پایـەدارکردنی دادوەریـی کۆمەڵایـەتی. ئـەم حاڵەتـە لـە ئـەوروپا بەتایبـەتیو لـە ئـەمریکای لاتینـیش –بـەجۆرێك لەجۆرەکان– دەرکەوت. ماوەتـەوە بڵێین کـە دوو شــت بوونــە هــۆی کەوتنــەوەی مەترســی لــە جۆرێکی تـر: یەکـەمیان، گەڕانـەوە بـۆ ئـەو هێـزە کۆمەڵایەتیانــەی کــە پێویســتە نوێنەرایــەتی بکرێن. دووەم، ئەو بیرۆکەیەی کە پێیوایە دەبێ دیموکراسی پارلەمانی پرۆسەی سیاسی بخاتە خزمــەتی هەڵســوڕاوە کۆمەڵایەتیــەکان، کــە لێهاتوون بۆ نوێنەرایەتیکردن، بەجۆرێك دەکرێ بڵـــێین بـــوون و هوشـــیارییان لـــەپێش نوێنەرایەتیکردنیانەوەیـــە. ئـــەم دوو خاڵـــە دۆخێکیـــان خســـتەوە کـــە تۆتالیتـــاریزم بەشـــێوەیەکی پێچـــەوانە دەرکەوتـــەوە دژی دیموکراسـیی کۆمەڵایـەتی، بـەڵکو پێچـەوانەی سۆشـــیالیزمیش. بنـــەمای ســـەندیکایی مۆســـۆلێنی ئـــەم ڕاســـتییەمان یاددەخاتـــەوە، بەهـەمان شـێوە ئـەو نـاوەی حیزبـی نەتـەوەیی سۆشیالیست (نازیزم) لە ئەڵمانیا هەڵیگرتبوو،

یـان زمـانی پرۆلیتـاریی حزبـی کۆمۆنیسـتی سۆڤێتی. هـەروەها لـە فەرەنسا حاڵـەتێکی لـەو جۆرەمـان بینـی، بـەڵام بەشـێوەیەکی سـووکتر، کاتــێ ســەرکردە سیاســیی‌و ســەندیکاییە چەپەکان، یان ئەوپەڕی چەپەکان، لـەناو ڕژێمی ڤیشی-دا دەرکەوتن.

تۆتالیتاریزم تـەنها بەوەوە ناوەستێ دەست بگــرێ بەســەر حوکمــدا لــەڕێی تیمێکــی دەســەڵاتگەری تونــدڕەوفتارەوە، چــونکە ئــەو پێیوایــە تــەنها ئــەو کاتــە ســەرکەوتووە، کــە سـەرلەبەری چالاکییە کۆمەڵایـەتی‌و کولتوری‌ـو نەتەوەییـەکان بگـۆڕێ بـە دژە بزاوتێکـی تـەریب لەگــەڵ خۆیــدا. بزوتنــەوە کۆمەڵایەتیــەکان هوشــیاریی خۆیــان تێکــەڵ بــە بەهاگــەلێکی کولتــوری دەکــەن کــە پێیانوایــە گــرنگن بــۆ هێنانــەدیی کۆمــەڵگای مەبەســت، بــەڵام دژە بزاوتەکان نەیارە کۆمەڵایەتیەکانی خۆیان وەك دوژمنی دەرەکی نیشاندەدەن، خۆیان ئـەو بـەها کولتوریانــە دادەهێــنن کــە کۆمــەڵگا وەك یەکەیەکی چونیەك نیشاندەدەن، کە دەبێ لەگەڵ بـەهاکانی ئەواندا بەتـەواوی بگونجێن. ئـەو دژە بزاوتانــە هەنــدێ جــار شــێوەی گرووپێــك وەردەگـرن، بـەڵام بزاوتـە سـەرەکیەکان وێنـەی دەوڵـەت یـان دژە دەوڵـەت وەردەگـرن. دەوڵـەتی تۆتالیتـار دەوڵـەتی تاقمگەرییـە، پێیوایـە دەبـێ دژی دوژمنــە دەرەکیــەکان بجــەنگێ‌و زۆرتــرین حەماسی جەماوەری لـەدەوری خـۆی بوروژێنـێ. ڕژێم گەر تۆتالیتار بوو، ڕەنگە کۆمەڵگە بێدەنگ بکـاو داپیڵۆسـێ. بـەڵام کاتـێ دەوڵـەت -یـەك پارچـە- دەبێتـە دەوڵـەتێکی تۆتالیتـار، ئـەوا بەپێچـەوانەوە هەوڵـدەدا میللـەت قسـەبکا بـەڵام بـەو شـێوەیەی ئـەو سـازی‌دەدا و حەماسـەتی پێدەبەخشـێ‌و دەیخاتـە ئامادەباشـییەوە، ئـیتر ڕژێـم خـۆی دەکـا بەمیللـەت و دەبـێ میللـەتیش ببێتــە ئــەو. گــەر بــەوردی قســەبکەین هــیچ دەوڵــەتێکی تۆتالیتــار و هــیچ کۆمەڵگەیــەکی تۆتالیتــار بوونیــان نیــە، چــونکە دەوڵــەت و کۆمەڵگــەی سیاســی‌و کۆمەڵگــەی مــەدەنی..، هـەموویان لـەناو سیسـتێمی تۆتالیتـاردا لەگـەڵ حـزب و دەزگـای فـەرمانڕەوایی خـاوەن هێـزی گشتگیردا دەتوێنـەوە. تواندنـەوەی ئـەو دەزگـاو کایانە لە چەند ڕژێمێکی ناسیۆنالیستی میللیدا لــە ئــەمریکای لاتــین پێڕەوکــران، بــەڵام تواندنەوەیــەکی بەشــەکی بــوو. بۆیــە ناونـانی ڕژێمی پیرۆن لە ئەرجەنتین یان ڕژێمی ڤیلاسکۆ لـە پـیرۆ بـە ڕژێمـی تۆتالیتـار یـان فاشیسـت، هەرچـەندە سەرنجڕاکێشـە، بـەڵام ڕاسـت نیـە. بەهەمان شێوە دەکەوینە هەڵەوە گەر ئاوەڵناوی تۆتالیتاری بخەینەپاڵ ڕژێمێکی دەسەڵاتگەر کە کۆمەڵگا سازدەدا، لە کاروکردەوەشدا زیاتر پەنا بـۆ داپڵۆسـین دەبـا نـەك پاسـاوی ئایـدیۆلۆجی، ڕژێمـی دیکتـاتۆریی بینۆشـێ لـە چیلی نمونـەی ئەو جۆرە ڕژێمانە بوو.

ڕژێمــی تۆتالیتــار کورتناکرێتــەوە بــۆ ئــەو وێنەیەی کە خۆی بۆ خۆی دەیکێشـێ، وێنەیـەك کە سەرکردەو حـزب و میللـەت تـەریب دەکاتـەوە بەیـەك. ڕژێمـی تۆتالیتـار پێـی گرنگـە هەمیشـە بـاس لـە ئیجمـاعی نـاوخۆ بکـا، بـەڵام ئەوەیشـی پێ گرنگە هەمیشە باس لـە دوژمنێکـی دەرەکـی بکـا، وەك پاسـاوێك بـۆ داپڵۆسـین و سانسـۆری نـاوخۆیی، تـا هـەموو نـەیارەکانی نـاو وڵات وەك خـائن و بـەکرێگیراوی ئـەو دوژمنـە دەرەکییـە

لەقەڵـەم بـدا. هـەروەها کۆمیتـەکانی شـۆڕش و پۆلیسی سیاسیو کەتیبەکانی هەڵکوتانە سەر هاولاتیان و هەڤالانی حزب، هەموویان هەمیشە لە دۆخی ئامادەباشیدان بۆ جەنگێکی بەردەوام دژ بـە دوژمنێـك کـە گەمـە بـە بەرژەوەندیـەکان دەکـاو ویـژدانی هاولاتیـان دەکـرێ. جـەنگ و ئامادەسـازی بـۆ جـەنگ بەشـێکە لـە پێکهاتـەی نـاوەکی رژێمـە تۆتالیتارەکـان. واتـە رژێمـە تۆتالیتارەکـان وەك رژێمـە سـتەمگەرە کۆنـەکان بڕوایـان بـەهێمنیو ئاسـوودەیی نیـە (وەك مـەرجێکی بـەردەوامبوونی دەسـەلاتیان)، ئـەوان لە یەك کاتدا میراتگری بزاوتە کۆمەلایەتیەکان و دامەزرێنەری رەوتێکی دیاریکراویشن، بەردەوام سـەرقاڵی هەڵلوشـینی بزوتنـەوە کۆمەلایەتیـە چالاکەکانن، ئیدعادەکەن کە رژێم زادەی ئەوانە، بـەلام لەهـەمان کاتـدا لەسـەر زەمینـی واقـع لەناویاندەبەن.

ئـەم شـیکردنەوەیە زۆر دوورە لـە شـیکردنەوەی ترۆتسـکییەکان کـە دژی بێرۆکراتیەت بوون وەك چینێکی سەرکردایەتی نوێ لە یەکێتی سۆڤێت، ئەو چینەی –بەبڕوای ئەوان– خەباتی بەرهەمهێنانی دەستەجەمعییان لـەناوبرد. بـەلام بـەڕای ئێمـە ئایدیۆلۆجیایـەکی لەمجۆرە لەگەڵ حوکمی تۆتالیتاردا دەگونجێ، کـە پێیوایـە دەبـێ پێکهاتـەی کۆمـەڵگا ڕوون و ئاشکرا بێـت و واقعـی کۆمەلایـەتیو کـارگێڕی سیاسـی یەکتەواوکـەر بـن، چـونکە دەبێتـە پاسـاوێك بـۆ پاکتـاوکردنی ململانـێ کۆمەلایەتیـەکان. دیموکراسـی بوونی نیـە بـەبێ بـەڕێوەبردنێکی سیاسـی بـۆ ناکۆکیـە کۆمەلایەتیـەکان کە قابلی تێپەڕاندن نین. کلۆد لۆفـۆر زۆر بـە ئاشـکرا ئـەوەی روونکـردەوە کـە شـیکردنەوەی ترۆتسـکیەکان نـەك هـەر لاوازە، بـەڵکو لـە ڕۆحـی تۆتالیتاریزمـەوە زۆر نزیکـە. چـونکە شـیکردنەوەی رەخنەییانـە بـۆ رژێمـە تۆتالیتاریـەکان ئـەوە دەخـوازێ ئـیعتراف بـە سـەربەخۆیی رێـژەیی دەوڵـەت و سیسـتێمی سیاسیو هێزە کۆمەلایەتیە چالاکەکان بکرێ.

سەدەی بیستەم سێ جۆر رژێمی تۆتالیتاری گـەورەو مێـژوویی بـەخۆوە بینـی: یەکـەم، رژێمـە تۆتالیتارە ناسیۆنالیستەکان، کە بانگەوازیان بۆ جەوهـەرێکی نەتـەوەیی یـان ئیتنـی دەکـرد دژی هـەموو ئـەو دیـاردە دەسـتەجەمعییانەی کـە – بـەبڕوای وان–بـێ رەگوڕیشـەن، وەك بـازاڕ، سەرمایەداری، هونەرو تەنانـەت زانستیش، یـان دژایـەتی ئیمپراتۆریـای فـرە نـەژادیان دەکـرد. کۆتاییەکانی سـەدەی بیستەم لـەدایکبوونی ئـەم نەتەوەپەرسـتییەی بـەخۆوە بینـی کـە دژ بـە مۆدێرنیتە (تازەگەری) بوو، دژی ئەو وێناکردنە ئەقلانییە مۆدێرنە بوو کە شۆڕشی فەرەنسی بە چـەمکی نەتـەوەی بەخشـی. رژێمـە فاشـیەکان، هەڵگری هەر تایبەتمەندییەك بن، سەر بەهـەمان رەوتـن، نمونـەی ئـەوان هـەموو رژێمـە ناسیۆنالیست و پیشەوەرو نەریتپارێزەکانی، لە ئەوروپای خۆرهەلات و ناوەراست بەلای خۆیدا راکێشـا. پـاش داڕمـانی یـەکێتی سـۆڤێت و لەبەریەکهەڵوەشـانی یۆگۆسـلافیا، چـەند رژێمێکـی تۆتالیتـاری نەتەوەپەرسـت دروسـتبوون، تونـدڕەوترینیان رژێمەکـەی میلۆسـۆڤیچ بـوو کـە لـە نـەوەدەکانی سـەدەی بیسـتەمدا سیاسـەتی پاکتـاوکردنی رەگـەزیی پێڕەوکـرد. میلۆسـۆڤیچ ئـەو سـەرکردە

کۆمۆنیستە بوو کە بووە نەتەوەپەرستێکی توندڕەو.

هەرچی نمونەی دووەمی تۆتالیتاریزمە پێویستە نزیکی بکەینەوە لە نمونەی یەکەم، چونکە ئەویش پشتئەستورە بە بوونەوەرێکی مێژوویی، بەڵام چیتر ئەو بوونەوەرە نەتەوە نیە بەڵکو ئاینە. لەکاتێکی ئاوهادا دەوڵەت لەگەڵ گروپێکی تایبەت {تاکە مەزهەب}یکدا شوناس دەگۆڕێتەوەو تەواوی کۆمەڵگا دەخاتە ژێر چاودێریو دەسەلاتی خۆی. شۆڕشی ئێرانی ساڵی 1979 لەبنەڕەتدا بزاوتێکی رزگاری کۆمەڵایەتیو دیموکراتی بوو، بەڵام هێندەی نەبرد -بەتایبەتی لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی عێراق/ ئێراندا- وەرچەرخا بۆ رژێمێکی تۆتالیتاری تیۆکراتی. ئەو رژێمە دەستیدایە لەقاڵبدانی میللەت لەناو تۆڕێکی چڕی پیاوانی سانسۆرو چاودێریو ئامادەسازی کە ناویان نرا پاسەوانانی شۆڕش. دەربارەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی بزاوتە ئاینیەکان، جیل کێبڵ باس لەو هاوتەریبییە دەکا کە لەنێوان هەموو بزاوتە ئاینییە دەسەلاتگەراکان لەجیهاندا هەیە، ئیتر مەسیحی بن یان جوولەکە یان ئیسلامی، یان هندۆسی کە بەم دواییانە دەرکەوتن. بەڵام بەو پێیەی ئێمە ناتوانین ئاین، وەك خۆی، بەو بزاوتە تۆتالیتاریانە بشوبهێنین، باشتر وایە وەك رژێمگەلێکی سیاسیی تۆتالیتار پێناسەیان بکەین نەك وەك بزاوتگەلێکی ئاینی.

جۆری سێیەمی تۆتالیتاریزم وەك دوو جۆرەکەی پێشو خودگەر نیە. چونکە بەناوی رەگەزێکی ئیتنی یان نەتەوەیی یان ئایدیۆلۆجیایەکەوە قسەناکا. بەڵکو بەپێچەوانەوە، خۆی وەك هەقیقەتێکی بابەتیو فاکتەرێك لە فاکتەرەکانی پێشکەوتن و ئەقڵو تازەگەری دەخاتەڕوو. رژێمە کۆمۆنیستەکان رژێمگەلێکی تۆتالیتاریزمی تازەگەر بوون و خۆیان وەك خولقێنەری مێژو نیشان دەدا. ئەو رژێمانە نمونەی نوێی رژێمە ستەمگەرە رۆشنگەرەکان نەبوون، چونکە ئەوان بانگەوازیان بۆ خۆسازدانی کۆمەڵایەتیو گوتاری ئایدیۆلۆجییش دەکرد دژی دوژمنی چینی پرۆلیتار. لە هەندێ وڵاتدا ئەو دوژمنە هاوشوناسی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم بوو، کە هێزە کۆمۆنیستەکان لەدژی دەجەنگان و هاوپەیمانێتیان لەگەڵ هێزە ناسیۆنالیستەکاندا دەبەست.

رژێمە تۆتالیتارەکان، سەر بە هەر جۆرێك بن لەو سێ جۆرە، دەتوانن ئامانجی ئابووریو کولتوریی چاك بۆ ماوەیەکی درێژو دیاریکراو بەدەست بێنن. بۆ نمونە نازیزم توانی گوڕوتین ببەخشێ بە ئابوریی ئەڵمانی کە لەژێر کاریگەریی سەختی قەیرانی 1929دا بوو. ئابوریی یەکێتی سۆڤێت پاش جەنگی جیهانیی دووەم توانیی سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بێنێ کە لە سایەیدا یەکەمین هاوڵاتی سۆڤێتی توانی بچێتە سەر مانگ. کۆریای باکور گەشەکردنێکی پیشەسازیی گەورەی بەخۆوە بینی، ئەو وڵاتە بوو توانی ئاستی فێرکردنی هاوڵاتیان بەرز بکاتەوەو چاکسازی لە مەرجە تەندروستیەکاندا ئەنجام بدا، لەکاتێکدا ژمارەیەکی زۆری پزیشکانی ئەو وڵاتە کۆچیان کردبوو. ئێمە لێرە بەدواوە ئەو بیرۆکەیە دەخەینە ڕوو کە لە دوا نەسکی ئەم کتێبەدا

بـــەرگری لێدەكـــەین، ئـــەویش ئەوەیـــە: دیموكراسـیو گەشەسـەندنی ئـابوری لـەڕووی ستراتیجییەوە یەكدەگرنـەوەو لێك جیانابنـەوە، تۆتالیتاریزمیش كۆسپێكە لەسەر ڕێی گەشەی ناوەكیـدا مەحاڵـە {بەشـێوەیەكی دوورخایـەن} لەگەڵیـدا بگونجـێ، چـونكە ڕێگـەنادا بكـەرە ئـابوریو ڕۆشـنبیرییە سـەربەخۆكان داهێنـانی تازەگەرانـە ئـەنجام بـدەن. ڕژێمـی تۆتالیتـار گـەر سـەرقاڵ نـەبێ بـەو جەنگانـەوە كـە خـۆی هەڵیدەگیرسـێنێ، ئـەوا تووشـی هەناسەسـواری دەبـێ لەئاسـت بـوونی سـەربەخۆی كۆمەڵگـەی مـەدەنیو كۆمەڵگـەی سیاسـیداو هـەرگیز ئـەو سەربەخۆییە ناسەلمێنێ.

خەسـڵەتە گشـتیەكانی ڕژێمـی تۆتالیتـار ئەمانـەن: لەهـەموویان گـرنگتر دەوڵـەت كۆمەڵگە قـــووت دەداو بـــەناوی ئـــەوەوە قســـەدەكا. پێناسـەیەكی لـەم جـۆرە لەگـەڵ ئـەو پێناسـەیەدا یەكنایەتـەوە كـە تۆتالیتـاریزم دەكاتـە هاوتـای حومكی عەسكەرتاری. لێرەوە ناتوانین یـەكێتی سـۆڤێتی –پێشـو– بـە عەسـكەرتاری وەسـف بكـەین، چونكە حـوكمی عەسـكەری لـەو وڵاتـەدا هەمیشـە پاشـكۆی حـوكمی سیاسـی بـووە. بەهـــەمان شـــێوە ئیمپریـــالیزمی ژاپـــۆنی كـــە داگیركارییـــەكی ســـەختی دژی كۆریـــاو چـــین ئەنجامـــدا، زیـــاتر لـــەوەی تۆتالیتـــاری بـــێ عەسكەرتاری بـوو. بـەڵام ئەمـە مانـای ئـەوە نیـە لەمبارەیەوە موبالەغە بكەین و عەسكەرتاریەتو تۆتالیتـاریزم بەتـەواوی لەیـەكتر جیابكەینـەوە. دیكتـاتۆرە عەسـكەرییەكان كـە سـاڵی 1964 حوكمیان لە بەرازیل گرتەدەست، سـاڵی 1966 لـە ئەرجـەنتین و پاشـان جـارێكی تـر سـاڵی 1976، بەهـەمان شـێوە لـە چـیلیو ئۆرگـوای سـاڵی 1973 حوكمیـان گرتەدەسـت..، ڕژێمـی تۆتالیتاریـان دروسـت نـەكرد، بـەڵكو حـوكمی دەســەڵاتگەریان دامەزرانــد. لــە بەرامبــەردا دەبیـنین دیكتاتۆریـەتی عەسكەری لـە پاراگوای بەسـەركردایەتی جەنـەراڵ سترۆسـنەر خـاوەنی چـەند ئـەدگارێكی تۆتالیتـاری بـوو، چـونكە میللـــەتی خســـتبۆوە حاڵـــەتی تەعبیـــەو ئامادەباشـیو لەڕێگـەی حزبـی كۆلـۆرادۆ–وە سانسۆرو چاودێری خستبووە سەر هەموان.

هانــا ئارێنــت لــە تێــزە بەناوبانگەكــەی دەربـارەی تۆتالیتـاریزم چـەند هـەنگاوێكی دوورتـر دەنـێ، دوورتـر لـەوەی ئێمـە. ئـەو كاتـێ بـاس لەبـەر ڕۆشـنایی ڕاوبۆچـوونی لۆبـۆن و فرۆیـد دەربـارەی سـایكۆلۆجیای جـەماوەر دەدوێو ڕژێمـی تۆتالیتـار پێناسـەدەكا بـەو ڕژێمـەی كـە لـە هەناویـدا چینەكان دەتوێنـەوەو جـەماوەر –بەگشـتی– مەیدانەكـە داگیردەكـاو سەردەكەوێ. "كەوتنی ئـەو دیـوارو پەرژینانـەی چـینەكان لەیـەك جیادەكاتـەوەو دەیانپـارێزێ، زۆرینـەی خـەڵك كـە لەسـایەی حزبەكانـدا سـپردەبن، بەئاگادێنێتـەوە، دەیانكاتـە تاقـە كوتلەیەك گەورەو قەبە لە خەڵكانی تووڕەو پڕ خـرۆش كـە سـیمایەكی دیاریكراویـان نیـە". (سیستێمی تۆتالیتاری، ل37). هانا ئارێنت لـە شوێنێكی تردا هەمان تێز دادەڕێژێتەوە بەڵام بە شـێوەیەكی مـوقنیعتر، كاتـێ دەڵـێ: ڕژێمـە تۆتالیتارەكـــان لـــە ڕێگـــەی تۆقانـــدن و هاشوهوشەوە هەوڵدەدەن یاسایەك لە یاساكانی سروشـت یـان مێـژو جێبـەجێ بكـەن، كـە دەبێتەهۆی پووچەڵكردنەوەی هێزە چالاكەكانو

سەربەخۆییان. "شەرعیەتی تۆتالیتاری بەربەرەکانێی شەرعیەتی یاسایی دەکاو ئیدعای ئەوە دەکا کە توانای بەرقەرارکردنی دەسەڵاتی راستەوخۆی هەیە بۆ پایەداربوونی دادوەری لەسەر زەمین، بەوەش یاسای سروشت و مێژو جێبەجێدەکا، بەڵام ئەو شەرعیەتە لەسەر ئاستی تاکەکان تەرجەمە ناکرێ بۆ پێودانگی خێرو شەڕ".(ل206).

بەبڕوای من کارێکی ترسناکە گەر جیاکارییەکی لەمجۆرە بکەین لەنێوان هەست و سۆزو داواکارییە میللییەکان لەلایەك و ئایدیۆلۆجیای رژێمی تۆتالیتار لەلایەکی ترەوە، ئەو ئایدیۆلۆجیایەی کە هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگای لەبەریەکهەڵوەشاوو داپڵۆسێنراوەوە نیە، بەڵکو بەئارەزوی خۆی‌و بەپێی بەرژەوەندیەکانی گەمە بەو کۆمەڵگایە دەکا. ئایدیۆلۆجیای رەگەزپەرستی نازیزم، هەر وەك میشێل فیفیۆرکا دەڵێ، وێنەیەکی لنگەوقوچی ناسیۆنالیستی توندڕەوی ئەڵمانی بوو کە پاش شکستی 1918 هەستی بەبرینداربوونی کەرامەتی دەکرد. بەهەمان شێوە رژێمی تۆتالیتاری فیدڵ کاسترۆ پشتی بەست بە بزاوتی نەتەوەپەرستی کە لەژێر کاریگەریی فیکری مارتی-دا دژی ئیمپریالیزم بوو. هەروەها رژێمە کۆمۆنیستەکان ئیرادەی رزگاربوونی کۆمەڵایەتی‌و نەتەوەییان کردە ئامرازێك بۆ کۆنترۆڵکردنی ولات بەهۆی دەزگاگەلێکی تۆتالیتارییەوە. جەماوەری پلیشاوەو هەڵکەندراو، جەماوەری پرۆژە مەزنەکان و شارە گەورەکان، پێکهێنەری کوتلەی بزاوتی نازیزم نەبوون، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەوە توێژە نەریتخواز و نەتەوەییەکان بوون کە هەستیاندەکرد لەژێر هەڕەشەی قەیرانی ئابوری‌و سیاسیدان. ئەو توێژانە هێزەکانی بەرگری نەتەوەییان کردە پاشکۆی بزاوتە میللی‌و نەتەوەیی‌و ئیتنیەکان، کە لەژێر سەرکردایەتی خەڵکانێکی بێ ئینتمادا بوون و هیچ گوتارێکیان نەبوو جگە لەوەی رقیان لە جولەکە بوو، بەوەش خۆیان بە بەرگریکار لە پاکی‌و بێگەردیی رەگەزی ئەڵمان دەزانی. رژێمی نازی، زیاتر لە رژێمی کۆمۆنیست، پێیوابوو جەنگ و توندوتیژیی بەشێکی دانەبڕاوە لە شوناسی وی. نازیزم وەك کۆمۆنیزم دەزگاکانی خۆی بەتەواوی پێکنەهێنا، هەربۆیە لێگەڕا حزب و بیرۆکراتیەت و سوپاو کەرتی پیشەسازی خاوەن سەربەخۆییەکی زاتی‌و رێژەیی بن. فرانس نیومان تێبینی ئەم جیاوازییەی نێوان نازیزم و کۆمۆنیزمی دەکاو پاشان کارڵ براشار بە بەڵگەوە روونی‌دەکاتەوە. بەڵام ئەو کودەتایەی کە بکەرە کۆمەڵایەتیەکانی کردە کوتلەیەك تا ئایدیۆلۆجیا سیاسیەکان یارییان پێبکەن و بیانکەنە ئامرازی تیرۆرو تۆقاندن، کودەتایەك بوو دەکرێ بەشێوەیەکی تر تەفسیری بکەین وەك "لاسکێ" ئاماژەی پێدەدا: لە راستیدا ئەڵمانیا هێزێکی پیشەسازی بوو کە شۆڕشێکی وەك شۆڕشی فەرەنسیی بەخۆوە نەبینی‌بوو، هەروەها بزاوتێکی یەکگرتنی نیشتمانی بەخۆوە نەدیبوو کە لەخوارەوە بەگوڕو تینێکی زۆرەوە هەڵقولابێ، وەك ئەوەی لە بەریتانیاو فەرەنسا روویدا. ئەم حاڵەتە لە ئەڵمانیا بووەهۆی ئەوەی نوخبەی تەقلیدیی دژ بە

مۆدێرنیزم بمێنێتەوەو هێزێکی گەورەتر بدرێ بە ڕەوتی عەسکەرتاری. لە حاڵەتی ڕژێمە کۆمۆنیست و ئیسلامیەکاندا، تەنانەت لە حاڵەتی ئەڵمانیاشدا، مەحاڵە تۆتالیتاریزم لە بزاوتە کۆمەڵایەتیەکان جیابکەینەوە، ئەو بزاوتانە لەلایەن ڕژێمە تۆتالیتارەکانەوە بەکارهێنران و پاشان وێرانکران، بەهەمان شێوە ناتوانین تۆتالیتاریزم لەو هۆکارانە دووربخەینەوە کە بوونە ڕێگر لەبەردەم دروستبوونی چالاکییە کۆمەڵایەتیە سەربەخۆکاندا.

لە هەناوی سیستێمی تۆتالیتاریدا جیاوازی لەنێوان ئەو دوو جۆرەی ڕژێمدا هەیە، کە جیاکارییم لەنێوانیاندا کرد: ڕژێمی تۆتالیتاریی بابەتیو ڕژێمی تۆتالیتاری زاتی. ئەزموونی وڵاتانی پاش کۆمۆنیزم ئەوەی سەلماند کە ئەو ڕژێمە تۆتالیتاریانەی پێشتر ئەو وڵاتانەیان حوکمکردبوو دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان بەسەر کەسایەتیی هێزە چالاکەکانەوە نەبووبوو، ئەمە لەکاتێکدا ئەو ڕژێمانە دەیان ساڵ بوو ڕەگیان داکوتابوو، توانای سەپاندنی دەسەڵاتیان هەبوو. لاوازیی بزاوتە ئایدیۆلۆجییە کۆمۆنیستە نوێیەکان لەو وڵاتانە، تەنانەت لە ڕوسیاش، هەروەها ونبوونی مەرجەعیەتی ڕژێمە کۆنەکان لە ئەوروپای ناوەڕاست و گۆڕینەوەی کۆمۆنیزم بە ناسیۆنالیزم لە سربیاو کرواتیا...، بەڵگەیەکی ئاشکرای ئەم ڕاستییە بوو. لە پۆڵۆنیاو هەنگاریا ئایدیۆلۆجیای ڕەسمیی دەوڵەت زۆر بەئاسانی گۆڕانی بەسەر هات، زیادەڕۆیی لە بایەخی بەها ئابوورییە پەتیەکاندا کراو بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش و پڕبایەخ کەرتی تایبەت بوژایەوە. بەڵام گۆڕانی سیستێمی ئابوری لە ڕوسیا لەبری ئەوەی بەڵێندەری بازرگانیو ئابوریی ڕاستەقینە بەرهەم بێنێ، بووەهۆی بڵاوبوونەوەی خێرای ئاڵوگۆڕی بازرگانیو باندەکانی مافیاو فراوانبوونی بازاڕی ڕەش، کە نارەزاییو پەرچەکرداری میللی لێکەوتەوە.

ڕژێمە تۆتالیتارییە زاتیەکان، بەپێچەوانەوە، زیاتر هەوڵدەدەن مرۆڤەکان جڵەوبکەن و بەتوندی بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، ئەوەش وادەکا ئەگەری تەقینەوەی لایەنە چەپێنراوەکان بێتەگۆڕێ. پاش شکستی هەردوو ڕژێمی ئەڵمانیای نازیو ژاپۆن لە جەنگی جیهانی دووەمدا لەسەر دەستی ئەمریکاو سۆڤێت و ئنگلتەراو فەرەنسا، دەبوو لایەنی داگیرکەرو سەرکەوتو کۆمەڵگاو کولتور لەو دوو وڵاتەدا سەرلەنوێ بنیات بنێتەوەو لە ڕەگوڕیشەوە بیانگۆڕێ، چونکە ترس لەوە هەبوو سەرلەنوێ تۆتالیتاریزم بژێتەوەو بگەڕێتەوە سەر حوکم.

بۆ منێك کە لەم کتێبەدا باس لە دیموکراسی دەکەم، پێویستە پێناسەیەك بۆ تۆتالیتاریزم پێشکەش بکەم، چونکە لە نیوسەدەی رابردوودا دیموکراسی وەك هێزی بەرەنگاربوونەوەی تۆتالیتاریزم دەرکەوت. ئەمەش وادەکا فیکری ئینگلیزی، بەتایبەتی فیکری بێرلین و فیکری کارڵ پۆپەر، بایەخێکی مەرکەزییان هەبێ کە بایەخی ئازادی نەرێخواز تێدەپەڕێنێ. هەر لێرەوە دەکرێ کاریگەریی "سارتۆری"و "دال" روونبکەینەوە لە ئەمریکاو ئەوروپا. داخۆ کێ بێ لەرۆژی ئەمڕۆدا، وەك

مۆنتیسکیۆ-ی ناوەڕاستی سەدەی هەژدە، بایەخ بدا بەو ناکۆکییەی لە نێوان دیموکراسیو ئۆرستۆکراتیەتدا لە هەناوی رژێمە کۆماریەکاندا هەیە؟ کێ وەك وی باس لەناکۆکیی نێوان رژێمە کۆماریەکان و رژێمە شانشینییە ستەمگەرەکان دەکا؟ لەبەرامبەردا دەبینین مێژووی دوورو درێژی نیوسەدە، لە قەیرانی ئابوری 1929وە، تا راپەرینی سۆلیدارنۆسك (سەندیکاکانی هاوکاری)، لەوێشەوە تا بێرۆسترۆیکای گۆرباچۆڤ..، مێژوویەکی مەحکوم بوو بە خەباتی رژێمە دیموکراتەکان دژی رژێمە تۆتالیتارە فاشیستەکان، پاشان تۆتالیتارییە کۆمۆنیستەکان. بەلام ئەمە حوکمێکە دەبێ بەڕوونی جیای بکەینەوە لەو حوکمەی کە باس لە دارمانی ئیمپراتۆریا کۆلۆنیالیستەکان و باس لە دەرکەوتنی بزاوتەکانی رزگاریی نیشتمانی دەکا لەهەمان ماوەدا. ئەڵبەتە ئێمە کەوتنی ئیمپراتۆریا کۆلۆنیالیستەکان کەمبایەخ تەماشا ناکەین، بەلام ئەمە ئەوە ناشارێتەوە کە لە جیهانی سێیەمدا سەرباری ئازادبوون و -سەرباری کەوتنی ئیمپراتۆریاکان- دیاردەی تۆتالیتاریزم سەری هەڵدا، لە پێشیشەوە لە چین. لێرەوە دەبێ ئەوە بسەلمێنین کە دیاردەیەکی سیاسی پەتی لەو قۆناغەدا بەسەر هەموو گۆڕانکارییە کۆمەلایەتیەکاندا زاڵ بوو. بیریارە لیبراڵەکان کە هەمیشە پێ لەسەر ئەم خاڵە دادەگرن، ئیتر بیریارە ئینگلیزەکان بن کە باسمان کردن یان ریمۆن ئارۆن-ی فەرەنسی بێ، سەرکەوتنێکی فیکرییان بەسەر هەموو مارکسیەکاندا بەدەست

هێنا، کە تێدەکۆشان بۆ ئەوەی پراکتیزەکردنی بیرۆکەی مارکس بسەلمێنن. ئەڵبەتە گەر ئەو بیرۆکەیەی مارکس بۆ سەردەمی خۆی، بەجۆرێك لە جۆرەکان، راست بووبێ..، ئەوا بۆ سەردەمی ئێمە هەڵەیە. بیرۆکەکەش دەڵێ: کایەی سیاسی ملکەچی پەیوەندییە کۆمەلایەتیو ئابوورییە بابەتیەکانە. فیکری سیاسی، بەتایبەتی بەهۆی هانا ئارێنت-ەوە، پێگەیەکی سەرەکی بەخشیە بیرۆکەی دیموکراسی دژ بە بیرۆکەی شۆڕش، چونکە دیموکراسی رکابەری واقعیی تۆتالیتاریزم بوو. قسەکانی ترۆتسکی-یش کە پێیوابوو شۆڕشی کۆمۆنیستی خیانەتی لێکراوە دادمان نادەن و پەشیمانمان ناکەنەوە، بەڵکو دەبێ لە هەر نمونەیەکی سیاسی بەدوور بین کە بەرەو تۆتالیتاریزم فریومان دەدەن.

**پەراوێزەکان:**

(1) لە دەقەکەدا بە ئیسپانی هاتووە *Foce revolutionarioi*، واتە چەقی شۆڕشگێڕانە، یان کەتیبە شۆڕشگێڕەکان.

(2) لە دەقەکەدا بە ئیسپانی هاتووە *Sendero Luminoso*، واتە رێگەی رووناك.

(3) لە دەقەکەدا بە ئەڵمانی هاتووە *Parteienstaat*، واتە دەوڵەتی حزبەکان.

(4) لە دەقەکەدا بەئینگلیزی هاتووە *Caucus*، واتە کۆنفرانسی حزب کە بۆ هەڵبژاردنی پاڵێوراوان و بڕیاردان لەسەر سیاسەتی گشتی سازدەدرێ.

(5) پیشەگەریی: تیۆرەیەکی ئایدیۆلۆجییە، پێیوایە

دەبێ دەزگاگەلێکی سەندیکایی پیشەیی هەبن، کە خاوەن دەسەڵاتی ئابوریو کۆمەڵایەتی و سیاسیی بن.

(6) پارتی شۆڕشگێڕی دەستوری، ساڵی 1929 جەنەراڵ کالیس دایمەزراندو تائێستا دەسەڵاتی لە مەکسیک قۆرخکردووە. لەکاتی دامەزراندندا ناوی حزبی نەتەوەیی شۆڕشگێڕ بوو، ساڵی 1938 ناوی خۆی گۆڕی بۆ حزبی شۆڕشی مەکسیکی، ساڵی 1946یش ئەو ناوەی گۆڕی بۆ حزبی شۆڕشگێڕی دەستوریی.

**سەرچاوە:**

آلان تورين، ماهي الديموقراطية؟ حكم الأكثرية أم ضمانات الأقلية. ت: حسن قبيسي. ط1، بيروت: دار الساقي،1995، ص121-139.

بەبەراورد لەگەڵ چاپێکی تری هەمان کتێبدا، لە وەرگێڕانی: عبود كاسوحة. دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 2000، ص155-180.

# رۆسۆ و گەڕانەوە بۆ دەوڵەتشاری دێرین

مۆریس باربیە

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

ئەو دەوڵەتەی رۆسۆ مەبەستی بوو وەك ئەو دەوڵەتە کۆمارییەی جێی مەبەستی هۆبز بوو – تەنانەت رونتر لەویش– دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەتی پێشمۆدێرن. تێڕوانینی رۆسۆ لەمبارەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی کە وەك بناغەی دەوڵەت وایە، لە کاتێکدا لای هۆبز تاکەکان مافەکانی خۆیان بە فەرمانڕەوایەك دەسپێرن کە حوکمیان دەکات. لە دیدی رۆسۆوە تاکەکان مافەکانی خۆیان بە دەوڵەت یان خەڵکانێك دەسپێرن کە خاوەنی حوکمدارێتین. لێرە بەدواوە تاك وەك رەگەزێکی چوارچێوەی کۆمەڵگا یا ئەندامێکی دەوڵەت دەردەکەوێت. دیارە پانتاییەکی شەخسی هەیە، بەڵام بێ سیما و بێ بایەخە. لە راستیدا رۆسۆ لەسەرتربوونی هەمەکی بەسەر بەشەکان و لەسەرتربوونی دەوڵەتشار بەسەر هاوڵاتیاندا دەسەلمێنێ و لێرەوە لە بنەڕەتدا بیروڕا سیاسییەکەی رۆسۆ هەمەکی باوەڕە نەك تاکباوەڕ. لێرەوە جیاوازی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا و هاوڵاتی و تاکەکەس ناناسێت. لە ئەنجامدا دیدی رۆسۆ رووی لە دەوڵەتشاری دێرینە و بە پێچەوانەی ئەوەی کە باوە، رۆسۆ رێگایەك بۆ مۆدێرنەی سیاسی ناکاتەوە.

## 1-پەیمانی کۆمەڵایەتی و شکڵوەرگرتنی دەوڵەت

پەیمانی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیەی رۆسۆ تێیدەگات، بە ئاشکرا بە دروستبوونی دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن دەگات. لە دیدی رۆسۆوە تاکەکان کە لە دۆخی سروشتیدا ئازاد و یەکسانن، بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی پەیمان بەیەکەوە دەبەستن و هەموو مافەکانی خۆیان بەو (چوارچێوە کۆمەڵایەتیە) دەسپێرن. بەمشێوەیە تاك لە رێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە لە دۆخی سروشتی دێتە دەرێ و بۆ بەدەستهێنانی چوارچێوەیەکی گشتی و بەدەستهێنانی (ئازادیەکی رێکەوتنامەیی) یان (ئازادی مەدەنی) دەست لە (ئازادی سروشتی)

خۆیان وەردەگرن. بەمشێوەیە تاك لە بوونی فەردی خۆی دەست هەڵدەگرێت و دەبێتە بەشێك لە هەمەکی کۆمەڵگا و خۆی بە تەواوی دەخاتە خزمەتییەوە. پەیمانی کۆمەڵایەتی بە "سپاردنی هەموو مافەکانی هاوپەیمانان بە هەمەکی کۆمەڵگا) بەدی دێت. لە راستیدا هەر کەسێك "بەشێوەیەکی تەواو" خۆی دەکاتە وەکیل و سپاردنی "بێ قەید و شەرت" ئەنجامدەدرێ. چونکە لەم حاڵەتەدا نەبێت، دۆخی سروشتی دەتوانێت بەردەوام بێت. لێرەوە تاکەکان کە بەتەواوی یەکسانن بەیەك، هیچ مافێك ناپارێزن. بەمشێوەیە هەموو هاوپەیمانان سەبارەت بەیەکدی ماف یەکسانیان دەبێت. لێرەوە لە رێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە "هەرکەسێك لە ئێمە کەسایەتی خۆی و هەموو تواناکانی بە هاوبەشی دەسپێرێت" و هەر ئەندامێك دەبێت بە "بەشێکی دابەشنەکراوی هەمەکی". تاکە تایبەتیەکان چیدی بەم ناونیشانە بونیان نیە و دەبن بە ئەندامانی "چوارچێوەیەکی یاسایی و گشتی" کە سەردەمێك ناوی دەوڵەتشار بوو، هەنوکەش ناوی کۆمار، یان چوارچێوەی سیاسی یان دەوڵەتە. لێرە بەدواوە ئەم ئەندامانە بەپێی ئەوەی بەشدارن لە دەسەڵاتی حوکمڕانیدا، هاوڵاتی و بەپێی ئەوەی ملکەچی یاساکانی دەوڵەتن، بە فەرمانبەر دەژمێررێن.

بەمشێوەیە پێکەوەستان یان چوارچێوەی سیاسی کە بە پەیمانی کۆمەڵایەتی دروستدەبێت، هەمەکیەکی یەکتا و دابەشنەبووە کە رێك لە دەوڵەتی پێشمۆدێرن دەچێت. بەڵێ لە دیدی رۆسۆدا جیاوازیەك لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا نیە و لە راستیدا دەوڵەت و کۆمەڵگا تێکئالاون. لێرەوە کۆمەڵگای مەدەنی جیا لە دەوڵەت کە تاکەکان بتوانن تیایدا خاوەن کۆمەڵێك ماف تایبەت بن، بوونی نیە، چونکە هەموو ئەمانە مافەکانی خۆیان بە کۆمەڵگا سپاردووە. لە دیدی رۆسۆوە لەو ڕووەوە کە ئەگەرێکی وا دەشێت ببێتە هۆی گەڕانەوەی دۆخی سروشتی، کەوا بوو جیابوونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بەیەکجاری دەخاتە لاوەو لێرەوە مۆدێرنەی سیاسی بەهیچ شێوەیەك لە روانگەی رۆسۆدا روونادات. بە تێبینیکردنی ئەم قسانە ئاشکرایە دەوڵەتی جێی مەبەستی پەیمانی کۆمەڵایەتی تەنها دەتوانێت دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن بێت.

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا رۆسۆ لەخۆی دەپرسێت ئایا لە نێوان دەوڵەت و ئەندامەکانیدا ماوەیەك هەیە؟ لەسەری دەڕوات و دەڵێت دەکرێ ئەمانە بەرژەوەندی جیاواز و تەنانەت پێچەوانەی یەکدیان هەبێت، بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بە لەسەرتر لە بەرژەوەندی هاوبەش بژمێرن: "هەر تاکێك دەتوانێت وەك مرۆڤ، ئیرادەیەکی تایبەتی هەبێت پێچەوانە یان نەگونجاو لەگەڵ ئیرادەی گشتیدا کە وەك هاوڵاتیەك خاوەنداریێتی". ئەم جیاوازیەی نێوان مرۆڤ و هاوڵاتی دەتوانێت بە قبوڵکردنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان لە پاڵ بەرژەوەندی گشتیدا بگات، کۆمەڵگای مەدەنی جیا لە دەوڵەت دروستبکات. بەڵام رۆسۆ یەکسەر لەسەری دەڕوات و دەڵێت کارێکی لەم چەشنە لە کرداردا دەتوانێت ببێتە هۆی "وێرانبوونی چوارچێوەی سیاسی" کە بەهەر بەهایەك بووە

دەبێت ڕێگری لێبکرێت. لە ئەنجامدا دەبێت بەرژەوەندیە تایبەتیەکان ملکەچی بەرژەوەندییە گشتیەکان بکات و بەمشێوەیە یەکەمبوون و لەسەرتربوونی، زامنبکات: "هەر کەسێك ملکەچی ئیرادەی گشتی نەبێت، بە ناچار هەموو چوارچێوەکە ناچار بە ملکەچی دەکەن". واتە "ناچاری دەکەن کە ئازاد بێت". ئەم پەرەگرافە سەرسوڕهێنەر و ناکۆکانە بە باشی لە چوارچێوەی دەوڵەتی پێشمۆدێرندا دەرك دەکرێن و ئەوە دەسەلمێنن کە ڕۆسۆ دەوڵەتی پێشمۆدێرنی بە هەموو دەرئەنجامەکانیەوە، پێباشترە.

## 2-دەرئەنجامەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی

سەرەتا دەبێت تێبینی ئەوە بکەین کە ئەو دەوڵەتەی بناغەکەی لەسەر پەیمانی کۆمەڵایەتی دامەزراوە، تاکەکان بەشێوەیەك لە چوارچێوەی سیاسیدا یەکێتیان وەرگرتووە کە بەتەواوی بەستراون پێوەی و چارەنوسیشیان بەستراوە بە چارەنوسیەوە: "ناکرێ ئازار بە یەکێك بگەیەنرێت بێ ئەوەی پەلاماری چوارچێوەکە بدرێت" و بە پێچەوانەشەوە "ناکرێ زیان بە چوارچێوە بگەیەنرێ و تاکەکان هەست بە هیچ نەکەن". بە هەمان شێوە پاش دروستبوونی نەتەوە هەر تاکێك کە تا ئەو کاتەی بۆ خۆی "هەمەکیەکی تەواو و گۆشەگیر بوو" دەبێت بە "بەشێك لە هەمەکیەکی گەورەتر کە لە ڕاستیدا تاك بەشێوەیەك لە شێوەکان ژیان و بوونی خۆی لەوەوە وەردەگرێت". لێرە بەدواوە لە بری "بونێکی هەقیقی و سەربەخۆ" کە تاك لە سروشتدا خاوەنێتی، "بوونێکی لاوەکی و یاسایی" دادەنیشێ کە تاك لە دەوڵەتەوە وەریدەگرێت. لێرەوە هێزە سروشتیەکانی تاك، بە قازانجی هێزگەلێکی تازە کە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی پێیدەبەخشێ، لەناو دەچێت. کاتێك "هەر هاوڵاتیەك نەتوانێت بەبێ هاوکاری ئەوانی دی شتێك بێت یان کارێك ئەنجامبدات" و "هێزی بەدەستهاتووی هەمەکی، یەکسان بێت بە زیاد لە کۆی هێزە سروشتیەکانی تاکەکان"، ئەو کات دەکرێ بگوترێت بینای کۆمەڵگا بە کەماڵی خۆی گەیشتووە. لە ڕاستیدا ڕۆسۆ لەسەرتربوون و یەکەمینی هەمەکی کۆمەڵایەتی یان چوارچێوەی سیاسی بەسەر تاکەکاندا ڕادەگەیەنێت کە جگە لە بەشەکان هیچی دی نین. بەمشێوەیە ڕۆسۆ خەسڵەتی هەمەکیباوەڕانەی بیرکردنەوە سیاسیەکەی خۆی بەروونی دەردەخات.

بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی هاوڵاتی بوونێکی کۆمەڵایەتی و مەدەنی هەیە، نەك بونێکی سروشتی و لە ڕاستیدا حاڵەتی یەکەم لە بری حاڵەتی دووهەم دانیشتووە: "ژیانی هاوڵاتی بە مەوهبەتێکی مەرجداری دەوڵەت دەژمێرێت، نەك بەرهەمی باشی سروشت". لە ئەنجامدا ژیانی تاك بەستراوە بە بەرژەوەندی باڵای دەوڵەتەوە و دەوڵەت خاوەن مافی ژیان و مردنی ئەندامەکانێتی. هەر لەبەرئەمەش هەندێکجار لەبەر پێویستی، هاوڵاتی دەبێت گیانی خۆی لە پێناوی دەوڵەتدا ببەخشێت. هەروەها دەوڵەت دەتوانێت تاوانباران لە سێدارە بدات و "هەر گوناهبارێك کە مافە کۆمەڵایەتیەکان پێشێلبکات، دەربکات، چونکە کەسێکی وا بە دوژمنی وڵات دەژمێرێت و بە

خستنه ژێرپێی یاساکانی دەوڵەت، لە ڕاستیدا دەستی لە ئەندامبوون لە دەوڵەتدا کێشاوەتەوە". "پاراستنی دەوڵەت لەگەڵ پاراستنی کەسێکی لەمچەشنەدا ناگونجێت و یەکێك لەم دوانە دەبێت نەمێنن". لەو ڕووەوە کە گوناهبار پەیمانی کۆمەڵایەتی شکاندووە، چیدی بە ئەندامی دەوڵەت ناژمێرێت و لە ئەنجامدا "دەبێت وەك پەیمانشکێنێك ڕووبەڕووی سزای دوورخستنەوەیان وەك دوژمنی خەڵك بەسزادانی مەرگ، لە چوارچێوەی دەوڵەت هەڵکەنرێت".

لەو دەوڵەتەدا کە ڕۆسۆ مەبەستێتی، تاك بە ملکەچی چوارچێوەی سیاسی دەژمێرێت کە سەر بەوەو و گەرچی لە هەموو جۆرە ملکەچیەکی شەخسیەوە بە کەسانی دیەوە ئازادبووە، بەڵام خۆی بەستراوە بە چوارچێوەی سیاسیەوە. لە ڕاستیدا پەیمانی کۆمەڵایەتی "بە گۆڕانی هەر هاوڵاتییەك بۆ نیشتمان، لە هەموو جۆرە ملکەچییەکی شەخسی دەیپارێزێت". لە دیدی ڕۆسۆوە "هەر هاوڵاتیەك دەبێ لە ناملکەچی تەواودا بۆ کەسانی دی و ملکەچی تەواو بۆ دەوڵەتدا بژی". ئەو ئازادیەی هاوڵاتی خاوەنی دەبێت، هەمان ئەو ئازادیەی چوارچێوەی سیاسیە کە خەسڵەتێکی گشتی هەیە، نەك ئازادی تاکەکەسی کە (وەك بینیمان) وازی لێهێناوە. لە ڕاستیدا مرۆڤ لە ڕێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە "ئازادی سروشتی" خۆی کە تەنها "زۆر و هێزەکانی تاك سنورداری" دەکات، لەدەستدەدات و لە بەرامبەردا "ئازادی مەدەنی" بەدەست دێنێت کە "ئیرادەی گشتی سنورداری دەکات". ئازادی یەکەم بریتییە لە ئازادی تاکەکەسی ئەو کاتەی لە دۆخی سروشتیدایە، و ئازادی دوهەمیش بریتیە لە ئازادی تاکەسی کە هەمان ئازادی چوارچێوەی سیاسیە". بەمشێوەیە پەیمانی کۆمەڵایەتی "ئازادی یاسایی دروستدەکات و تەنهاش ئەم ئازادیەیە کە بە ڕاستی مرۆڤ دەکاتە ئاغای خۆی". لە کاتێکدا ئارەزووە غەریزیەکان بە کۆیلەیەتی دەگات. بەڵێ "ئازادی بریتیە لە پەیڕەویکردنی یاسایەك کە مرۆڤەکان بۆ خۆیان دایانناوە".

تاکەکەس لە ڕێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە کە دۆخی سروشتی دەکات بە دۆخی مەدەنی، واز لە ئازادی سروشتی خۆی دێنێت و بە ئازادی کۆیی دەگات. لەو دەوڵەتەدا کە ڕۆسۆ مەبەستێتی، جێگەیەك بۆ ئازادی فەردی نابێتەوە و تەنها ئازادی کۆمەڵایەتی هەیە کە ئەویش هەمان ئازادی چوارچێوەی سیاسیە و ئیرادەی گشتی دەربڕێتی. ئەم ئازادیە لەگەڵ ئازادی دەستەجەمعی دەوڵەتشاری دێریندا وێکدەچێت و سەلماندنێکە بۆ گەڕانەوەی ڕۆسۆ بۆ نمونەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن.

هەروەها لە بارەی ئەوەی پەیوەندی بە دارایی و سامانی تاکەوە هەیە، دەبێ بگوترێت لە ڕاستیدا لە ڕێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوەیە کە تاك لە موڵکایەتی واقعیەوە بە موڵکایەتی یاسایی دەگات. بەڵام ئەم موڵکایەتیە بە مافێکی بەراستی تاکەکەسی ناژمێرێت و تەنها لە چوارچێوەی دەوڵەتدا مانای هەیە کە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم سامانەیە. لە ڕاستیدا هەر تاکێك "بوون و تواناکانی – لەوانەش ئەو

داراییانەی خاوەنێتی – بە کۆمەڵگا دەسپێرێت". ئەم داراییانە لە ژێر سێبەری "موڵکایەتی گشتیدان" کە "بەهێزتر و قابیلی نەگەڕانەوەترن" لە موڵکایەتی تایبەتی. چونکە "لە ڕێگەی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە دەوڵەت دەبێتە خاوەنی کۆنترۆڵی داراییەکانی ئەندامەکانی خۆی". لە راستیدا کۆمەڵگا یان پێکەوەبوونستان بە کۆنترۆڵکردنی دارایی ئەندامەکانی "موڵکایەتی ڕەوا"، واتە موڵکایەتی ئەندامەکانی زامندەکات، نەك ئەوەی لە داراییەکانیان بێبەشیان بکات. لێرەوە خاوەنانی سامان بە هەمان "ئەمیندارانی سامان و دارایی گشتی" دەژمێرێن. دەوڵەتیش بە شێوەیەکی کاریگەر مافەکانیان دەپارێزێت. بەمشێوەیە تاك بە سپاردنی دارایی و سامانەکەی بە دەوڵەت، دەستی بە موڵکایەتیان دەگات. بەلاَم دەبێ تێبینی ئەوە بکرێت کە ئەم موڵکایەتیە تەنها دەوڵەت پێی سپاردووە و لەمڕووەوە تەنها لە پەیوەندیدا بە دەوڵەتەوە دەتوانێت بوونی هەبێت. کەوابوو باس، باسی موڵکایەتی تایبەتی نیە کە لەسەر بناغەی ماڧ تاکەکەسی دامەزراوە، بەڵکو باسی موڵکایەتیەکە کە دروستکراوی دەوڵەتە و زامنکراو لە ڕێگەی دەوڵەتەوە، کەوابوو ملکەچی دەوڵەتە. لە ئەنجامدا لە دیدی ڕۆسۆدا ڕێك وەك هۆبز، موڵکایەتی لە دەرەوەی دەوڵەت بوونی نیە و ئەم تێڕوانینەش لەگەڵ نمونەی دەوڵەتی پێشمۆدێرندا دەگونجێت.

نمونەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن ئیلهامبەخشی هەڵوێستی ڕۆسۆیە سەبارەت بە دینیش. دیارە ئەم هەڵوێستە هاوڕێی کۆمەڵێك سێبەری ڕوونە. ڕۆسۆ "دینی مرۆڤ" واتە مەسیحیەتی دامەزراو لەسەر ئەنجیل لەبەرئەوە ڕەتدەکاتەوە کە دینێکی تەواو مەعنەویە و مرۆڤەکان لە کۆمەڵگا دوور دەخاتەوە. ئەم دینە نەك تەنیا "هیچ پەیوەندیەکی تایبەتی بە چوارچێوەی سیاسیەوە" نیە، بەڵکو "لەگەڵ ڕۆحیەتی کۆمەڵایەتیشدا ناگونجێت". بەڵێ ڕۆسۆ بە بیرۆکەی دینێکی شەخسی کە پەیوەندی بە ویژدانی تاکەکەس و بواری تایبەتیەوە هەبێت، نامۆیە. ڕۆسۆ بۆچونێکی هاوشێوەی لە بارەی ئازادی دینیەوە هەیە، چونکە دین نەك بە مەسەلەیەکی تایبەتی، بەڵکو بە مەسەلەیەکی پەیوەندیدار بە کۆمەڵگاوە دەزانێت.

ڕۆسۆ "دینی هاولاَتی" واتە دینی دەوڵەتشاری دێرین بەهۆی کەموکوڕیە زۆرەکانیەوە، دەخاتە لاوە. لەوانە لەبەرئەوەی ئەم دینە تەنها تایبەت بوو بە دەوڵەتشارێك و بە کردەوە لەگەڵ دەوڵەتشاردا هاوشوناس بوو. لەو ڕووەوە کە دینی خودایی لەگەڵ خزمەتکردنی دەوڵەت و خۆشەویستی یاسادا بەیەك شت دەزانی، کەوابوو دینەکەش "دیکتاتۆرانە و نەفیکەر" دەردەچوو. پەیڕەوانی خۆی، "خوێنڕێژ و نالێبوردوو" دەکرد و لە "دۆخی سروشتی جەنگکردن لەگەڵ ئەوانی دیدا" دایدەنا. لێرەوە دینێکی لەمچەشنە خۆی لە خۆیدا نەویستراو و بۆ دەوڵەت ترسناکە.

بە تێبینیکردنی ئەم کێشانە، ڕۆسۆ پێشنیاری "دینی مەدەنی" دەکات کە ئەگەرچی لە "دینی هاولاَتی"ەوە نزیکە، بەلاَم کەموکوڕیەکانی ئەوی تێدا نییە. لە ڕاستیدا بۆ

دەوڵەت گرنگە هەر هاولاَتیەك دینێكی هەبێت كە بۆ حەزكردن لە ئەركەكانی، پاڵی پێوەبنێت". بەلاَم ئەم دینە تەنها لەبەرئەوەی پەیوەندی بە ئەخلاق و ئەركەكان لە بەرامبەر كەسانی دیدا هەیە، دەبێتە جێگەی سەرنجی دەوڵەت. لێرەوە دەكرێ بگوترێت باسی دینێكی "تەواو مەدەنیە" كە دەوڵەت هیمەت بۆ دەستنیشانكردنی دەكات. بنەماكانی سادە و كەمئەژمار و زۆرتر بە مانای "هەستی بە كۆمەلاَیەتیبوون" كە بۆ ئەوەی مرۆڤ "هاولاَتیەكی باش" "و فەرمانبەرێكی وەفادار" بێت، بە پێویست دەردەكەوێت. لێرەوە دەوڵەت دەتوانێت كەسێك كە سەرپێچی لە قبوڵكردنی ئەم بنەمایانە بكات و بەمشێوەیە خۆی "دژ بە كۆمەلاَیەتیبوون" و بێهودە بەرامبەر بە یاسا پیشانبدات، دووربخاتەوە. دەوڵەت تەنانەت دەتوانێت كەسێك كە پاش قبوڵكردنی ئەم بنەمایانە، بە رەفتارەكانی خۆی بە كردەوە ئەو بنەمایانە پێشێلبكات، بە سزادانی مەرگ تەمێی بكات. چونكە كەسێكی وا "لە بەرامبەر یاسادا درۆیكردووە". بەڵێ گەرچی دینی مەدەنی "پیرۆزی پەیمانی كۆمەلاَیەتی و یاسا دەسەلمێنێت، بەلاَم نالێبوردەییەك كە خەسڵەتی دینی هاولاَتیە لەبەر دەرئەنجامە كۆمەلاَیەتیە نێگەتیڤ و ناچارەكانی، قبوڵناكات. دینی مەدەنی كە رۆسۆ پێشنیاری دەكرد، لەگەڵ ئەوەشدا كە دورە لە كەموكوریەكانی دینی دێرینەوە، واتە دەركردن و نالێبوردەیی، بەلاَم هەر لە دینی دەوڵەتشاری دێرین دەچێت. لێرەوە دەكرێت لەم خاڵەشدا گەڕانەوە بۆ دەوڵەتی پێشمۆدێرن بەروونی ببینرێت.

### 3-سنوری پەیمانی كۆمەلاَیەتی

رۆسۆ بەشێوەیەكی لۆژیكی وا بیردەكاتەوە دەوڵەت پێویستی بە دەسەلاَتێكی كارا هەیە، بۆ ئەوەی هەر بەشێك بە ئاراستەی بەرژەوەندی گشتی پاڵ پێوەنێت. كەوابوو وا پێویست دەكات فەرمانڕەوایەتیەكی رەها سەبارەت بە ئەندامەكانی بە دەوڵەت بسپێرێت. "وەك چۆن سروشت دەسەلاَتێكی رەهای بە مرۆڤ سەبارەت بە ئەندامەكانی جەستەی بەخشیوە ، پەیمانی كۆمەلاَیەتیش دەسەلاَتێكی رەها بە دەوڵەت لە بەرامبەر ئەندامەكانیدا دەبەخشێت". بەلاَم رۆسۆ بە هوشیاری بەرامبەر بە مەترسیەكانی ئەم تێڕوانینە، یەكسەر دەڵێت دەبێ جیاكاری لە نێوان "كەسی گشتی" و "كەسایەتیە تاكەكاندا" بكەین كە لە بنەڕەتدا بە دروستكەرانی دەژمێرێن و ژیان و ئازادیان بە سروشت سەربەخۆیە لەو". لە ئەنجامدا دەبێ لە نێوان هاولاَتیان كە وەك فەرمانبەرانێك ئەركگەلێكیان هەیە و تاكەكان جیاوازی بكەین كە وەك مرۆڤ دەبێ خاوەن ماف سروشتی بن. ئاشكرایە ئەم جیاكاریانە دەتوانن ببنە هۆی جیابونەوەی كۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەت و لێرەوە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی ئاراستە وەربگرن. لە كاتێكدا كە پەیمانی كۆمەلاَیەتی بە ئاشكرا بۆ نمونەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن دەگەڕێتەوە.

هەر لەبەر ئەمەش بوو کە رۆسۆ دەستیکرد بــە چــەند رونکردنــەوە و راســتکردنەوەیەکی گرنگی بیرو بۆچونەکانی. لەوانە بە پێچەوانەی قسەکانی پێشـویەوە رایگەیانـد تاکـەکان تـەنها ئەو شتەی کە بۆ چوارچێوەی سیاسی پێویست بێــت یــان بــە قســەیەکی وردتــر ئــەوەی کــە چوارچێوەی سیاسی بە پێویستی دەزانێت، بە دەوڵەت دەبەخشن، نەك هـەموو شـتێك. "ئـەوەی هەرکەسێك لـە دەسـەڵات و دارایـی و ئـازادی لـە رێگەی پـەیمانی کۆمەڵایەتیـەوە دایـدەنێت، نـەك هەموویان، بەڵکو ئەو بەشانەیە کە سودوەرگرتن لێیـان بـۆ کۆمـەڵگا گرنگـە.. دەستنیشـانکردنی ئەم گرنگیە تەنها لە دەستی فەرمانڕەوادایە". لە ئەنجامدا پـەیمانی کۆمەڵایـەتی سنوری هەیـە و رۆسۆ "سنورەکانی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی" بەمشــێوەیە دیاریــدەکات کــە لەگــەڵ بــوونی رەهایەتیـــــدا "ناتوانێـــــت ســـــــنورەکانی رێکەوتننامـەی گشـتی، تێپـەڕێنێت". لـەمڕووەوە "هـەر مرۆڤێك دەتوانێت بەشێوەیەکی کامڵ لە دارایی و ئەو ئازادیانە بەهرەمەند بێت کە ئەم رێکەوتننامەیە بۆی دەستەبەر کردووە".

رۆسـۆ هـەروەها رایدەگەیـەنێت "ئـەو مافـەی پەیمانی کۆمەڵایەتی لە بارەی فەرمانبەرانەوە بە فـــــەرمانڕەوای دەبەخشـــــێت.. ناتوانێـــــت ســـنورەکانی بەرژەوەنـدی گشـتی تێپـەڕێنی". رۆســۆ هــەمان ئــەم بنەمایــە لــە بــارەی هــەر بروایەکـــەوە بـــە تایبـــەتی بـــڕوای دینیـــەوە بەکاردێنێ، بەو شێوەیەی کە بڕواکـان تـا ئـەو شوێنەی پەیوەندیان بە دەوڵەتەوە نییە ئازادن: "لێـرەوە فەرمانبـەران لـە بـارەی بڕواکانیانـەوە تەنها کاتێك لەبەردەم فەرمانڕەوادا بەرپرسیارن کــە ئــەم بڕوایانــە گرنگیــەکیان بــۆ کۆمــەڵگا هەبێت". لەمڕووەوە بنەماکانی دین لـەو شوێنەدا کــە پەیوەنــدی بــە ئــەخلاق و ئەرکەکانــەوە سەبارەت بە کەسانی دیـەوە هەیـە، بۆ دەوڵـەت گرنگ دەبن، بەڵام لە دەرەوەی ئەم بوارە هـەموو بڕوایـەکی دینـی ئـازادە "هـەر کـەس دەتوانێـت بــڕوای تایبــەتی خــۆی هــەبێت و فــەرمانڕەوا لەمڕووەوە دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی لـەم بوارەدا نیـە" کـە لـە دەرەوەی دەسـەڵاتێتی. بەمشێوەیە ئـازادی بیرکردنـەوە و لەوانـەش ئـازادی دیـنی پارێزراوە.

ئـەم رونکردنەوانـە تێڕوانینـەکانی پێشـووی رۆسـۆ راسـتدەکەنەوە، واتـە لـەو شـوێنەدا کـە دەیگـوت پـەیمانی کۆمەڵایـەتی پێویسـتی بـە "سپاردنی تـەواوی هـەر هاوپـەیمانێك (بەهـەموو مافەکانیەوە) بە کۆمەڵگایە". لەگـەڵ ئەمانەشدا دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە ئەم رونکردنەوانە بەس نین و دوو کێشەی گـرنگ دەهێننە پێشێ: یەکــەمیان هــەر کاتێــك کۆمــەڵگا بــە تــەنها هەڵسەنگێنەر بزانین لە بارەی ئەوەی چی دەبێت پـێ بسپێرین، نـە شـتێك ناچار بـە سنوردانانی دەکــات و نــە شــتێك ســنوری ئــەم ســنورە دیاردەکـات. دووهــەم رۆســۆ بــە وردی رونــی ناکاتــەوە کــە تاکــەکان لــە کــاتی بەســتنی پــــەیمانی کۆمەڵایەتیـــدا چ شـــتێك دەتـــوانن بپـارێزن (مافـەکانی ئازادیـەکان و داراییـەکان و سـامانەکانیان). لـە راستیدا دیـاریکردنی ئـەم شـــتانە بەدەســـت پـــەیمانی کۆمەڵایەتیـــەو دەرئـــــەنجامی رێکەوتننامـــــەی نێـــــوان تاکــەکان و کۆمەڵگایــە، نــەك هەڵســەنگاندنی فەرمانڕەوا.

دیاره وەك بینیمان رۆسۆ پاشان بە پرۆژەی سنوری پەیمانی کۆمەڵایەتی بە راگەیاندنی روونی ئەوەی کە تاکەکان هەموو شتێکی خۆیان بە کۆمەڵگا ناسپێرن، بوونی بوارێکی تایبەتی و سەربەخۆ لە دەوڵەتی شیاو کرد کە تاکەکان تیایدا ئازادن و لێرەوە دەیتوانی بنەمای کۆمەڵگای مەدەنی جیاواز لە دەوڵەت قبوڵ بکات و مافەکانی تاکەکان لەم کۆمەڵگایەدا بسەلمێنێ. بەڵام لەبەرئەوەی رۆسۆ کۆمەڵگا و دەوڵەتی بە یەك شت دەزانی و بەهیچ شێوەیەك جیابونەوەی ئەو دوانەی لەبەرچاو نەبوو، ئەمە رووی نەدا. لە راستیدا رۆسۆ پتر نیگەرانی زامنکردنی بوونی دەوڵەت بوو تا پاراستنی مافەکانی تاکەکان و بڕوای وابوو لەبەرئەوەی تاکەکان وەڵامی هەموو پێویستیەکانی خۆیان لە دەوڵەتدا دەدۆزنەوە، کەوابوو مەسەلەی سەرەکی لەم زامنکردنەدایە. رۆسۆ بە درێژەپێدانی ئەو بیرۆکەیەی کە پێشتر ئاشکرامان کرد، پەنجە دەخاتە سەر ئەوەی کە پەیمانی کۆمەڵایەتی پێویستی بە "هیچ جۆرە چاوپۆشیەکی واقعی" لەلایەن تاکەکانەوە نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەنگاونان لە دۆخی سروشتیەوە بۆ دۆخی مەدەنی، هەلومەرجیان باش و پڕ بەهاتر دەکات: "ئەوان لە رێگەی ئەم چاوپۆشینەوە، لە راستیدا تەنها داد و ستەدێکی سودبەخشیان لە نێوان شێوەی ژیانێکی ناپایەدار و ناسەقامگیر لەگەڵ شێوەی ژیانێکی باشتر و سەقامگیرتر، لە نێوان سەربەخۆی سروشتی و ئازادیدا کردووە".

رۆسۆ بە راگەیاندنی ئەوەی پەیمانی کۆمەڵایەتی هیچ زیانێکی واقعی بۆ تاکەکان نییە، مەسەلەی مافەکان و ئەو سامانەی کە تاکەکان دەتوانن بیپارێزن، رێژەیی و تەنانەت دەتوانرێ بگوترێت ئازاد دەکات. لەو ڕووەوە کە سپاردنی مافەکان و سامانەکان بە کۆمەڵگا لەلایەن تاکەکانەوە — کە هەندێکجار دەبێ گیانی خۆشیان لە پێناویدا ببەخشن — جگە لە سود هیچی دی نییە، کەوا بوو خواستی پاراستنی هەندێك لەم ماف و دارایانە بێهودە دەردەکەوێت. لەبەرئەمە رۆسۆ وا بیر دەکاتەوە کە پەیمانی کۆمەڵایەتی لە راستیدا "سپاردنی تەواو" و "بێ قەید و شەرت" بەدی دێنێت. بەڵێ هەرچەندە رۆسۆ بونی بوارێکی تایبەتی و جیا لە دەوڵەت دەهێنێتە ئاراوە، بەڵام لەم تێزەوە نە دەرئەنجامێکی پراکتیکی و کارا وەردەگرێت و نە ئەگەری بوونی کۆمەڵگای مەدەنی جیا لەدەوڵەت لەبەرچاو دەگرێت. رۆسۆ هەروەها قسەیەك لەسەر مافەکانی مرۆڤ ناکات و بەم چەمك و زاراوەیە ئاشنا نییە. هەموو ئەمانە بە روونی پیشانی دەدەن رۆسۆ هەروەها لە چوارچێوەی دەوڵەتی پێشمۆدێرندا ماوەتەوە و دەوڵەتی دامەزراو لەسەر پەیمانی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ ئەم نمونەیەدا چونیەکن.

### 4-گەڕانەوە بۆ دەوڵەتشاری دێرین

رۆسۆ بۆ ئەناتۆمیکردن و ئاراستەکردنی تێڕوانینە سیاسیەکانی، زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ نمونەکانی یۆنان و رۆمی دێرین و نمونە و بەدیهاتنی دەوڵەتە پێشنیارکراوەکەی خۆی لە دەوڵەتشاری دێرینی ئەسینا، رۆم و بە تایبەتی سپارتدا، دەدۆزێتەوە. ئەم گەڕانەوە مێژووییانە

دەریدەخەن کە بیرۆکەکانی نە خەیاڵین و نە ناواقعی. رۆسۆ سیستەمی نوێنەرایەتیکردن رەت دەکاتەوە و وا بیر دەکاتەوە کە خەڵکی دەبێت راستەوخۆ یاسا دابرێژن و لە ئەنجامدا لەو بڕوایەدایە ئەگەری یاسارێژی تەنها کاتێك دەشێت کە خەڵکی لە دەوری یەك کۆببنەوە. هەر کاتێك رەخنە بگرن کە تێڕوانینێکی وا هەڵەیە، وەڵام دەداتەوە: "دوو هەزار ساڵ پێش تێڕوانینێکی هەڵە نەبووە" و "کۆمارە دێرینەکانی یۆنانی" و هەروەها کۆماری رۆم بە بیردا دێنێتەوە کە خەڵکی بەردەوام تیاییدا کۆدەبونەوە تا مافەکان و فەرمانڕەوایەتی خۆیان بەکاربهێنن و مەسەلە گشتیەکان بپشکنن. رۆسۆ لەم راستیانە ئەو دەرئەنجامە وەردەگرێت کە ئەوەی لە رابردوودا مومکین بوو، هەنوکەش مومکینە و دەبێت درێژە بە نەریتی کارکردنی دەوڵەتشارە دێرینەکان بدرێت.

رۆسۆ لە بارەی مەسەلەی نوێنەرەکانەوە، بە ئاشکرا تێڕوانینی خۆی بە قازانجی دەوڵەتە پێشمۆدێرنەکان رادەگەیەنێت. بە بڕوای ئەو لە دەوڵەتێکدا کە بەباشی دروستکرابێت، مەسەلە گشتیەکان لە مەسەلە تایبەتیەکان لەسەرترن و هاولاتیان زۆرتر دڵنیگەرانی مەسەلە گشتیەکانن تا مەسەلە تایبەتیەکانی خۆیان. بەڵێ رۆسۆ مەسەلەی نوێنەرایەتی رەت دەکاتەوە، چونکە بە بڕوای ئەو بیرۆکەیەکی "مۆدێرن"ە واتە لە "حکومەتێکی فیۆدالی"ەوە هاتووە کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك ئەنجومەنی چینایەتی کە "بە بێویژدانی و بێهودەیی" وەسفدەکران. لە کاتێکدا بە پێچەوانەوە "لە کۆمارە دێرینەکاندا.. خەڵکی هەرگیز نوێنەریان نەبووە". لەمبارەیەوە رۆسۆ نمونەگەلێك لە رۆم و یۆنان (و بەتایبەت سپارت) دەهێنێتەوە. رۆسۆ هەروەها ئەو خاڵە پیشاندەداتەوە کە "خەڵکانی پێشوو" بە پێچەوانەی "خەڵکانی مۆدێرنەوە" نوێنەریان نەبوو. چونکە ئازادی خۆیان خۆشدەویست و نوێنەرایەتی دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئازادی: "لەو کاتەوەی خەڵکی نوێنەر بۆ خۆیان دیاریدەکەن، چیدی ئازاد نین، چیدی بونیان نییە".

دیارە دەبێ تێبینی ئەوە بکەین هەرچەندە رۆسۆ نوێنەرایەتیکردن کە دەوڵەتشارە دێرینەکان نەیاندەناسی، رەت دەکاتەوە، بەلاَم سەرنجێکی تایبەتی لە هەندێك خەسڵەتی دەدات. بە تایبەتی سەرنج لە شورا رۆمیەکان (ئەنجومەنگەلێك کە فەسڵێکی درێژی کتێبەکەی خۆی بۆ تەرخانکردووە)، تریبۆنا، دیکتاتۆری (کە لە رۆمدا بەکاردەهات) و سانسۆر (کە لە سپارت و رۆمدا بەکاردەهات) رۆسۆ بە وردی کارکردنی ئەم دەزگایانە شیدەکاتەوە و بە ئاشکرا ئارەزووی لاسایکردنەوە یان لانیکەم ئیلهامبەخشیان لێدەکات.

رۆسۆ لە کتێبی پەیمانی کۆمەلاَیەتیدا وەك تێوریزەنی دەوڵەتی پێشمۆدێرن دەردەکەوێت و نمونەکەشی دەوڵەتشاری دێرینە. رۆسۆ لە جیابوونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی – وەك شوناسی مۆدێرنەی سیاسی – بێئاگایە و لێرەوە بە پێچەوانەی ئەوەی بە زۆر وا دەزانرێت، نەدەتوانێت بە تیوریزەنی دەوڵەتی مۆدێرن بژمێرێت و نە بیریاری سیاسی مۆدێرن. نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت رۆسۆ دەیویست

دەوڵەتشاری دێرینی سەرلەنوێ بەرپابکاتەوە و یان لانیکەم بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن لەسەردەمی مۆدێرندا، ئیلهامی لێوە وەربگرێت. پرۆژەیەکی وا بەدەر لە هەر شتێك گرفتئامێز بوو، و بە تێبینیکردنی ناکۆکیە دەرونیەکەی، دەبێ لە خۆمان بپرسین ئایا لە بنەڕەتدا دەیتوانی بێتەدی یا نا. لە راستیدا رۆسۆ پێشنیاری نمونەیەکی سیاسی دەکرد کە ئیلهامی لە سەردەمی دێرینەوە وەرگرتووە و لەگەڵ سەردەمی خۆشیدا نەدەگونجا. بەڵێ لە سەردەمی شۆڕشی مەزنی فەرەنسیدا و بەهۆی کاریگەری تێڕوانینەکانی رۆسۆوە، هەندێك هەوڵیاندا نمونە سیاسیە پێشنیارکراوەکەی رۆسۆ، بهێننە دی و وەك دەزانین بە کۆمەڵێك دەرئەنجامی کارەساتاوی گەیشتن بەمشێوەیە لە بەرامبەر دیدی هەمواندا ئەم ناکۆکیە ئاشکرابوو کە مومکین نیە هاوکات دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن بەرپابکرێت و بەمۆدێرنەی سیاسیی, واتە بەدروستکردنی دەوڵەتێکی مۆدێرن، بگەیت.

ناسینی رۆسۆ وەك تیورەزەنی دەوڵەتی پێشمۆدێرن، دەرئەنجامگەلێکی گرنگی بۆ تەفسیری بیرکردنەوەی سیاسی رۆسۆ هەیە کە دەکرێ ئاماژە بۆ ئەم سێ خاڵەی خوارەوە بکرێت.

یەکەمیان پەیوەندی بە مەسەلەی ئازادیەوە هەیە. رۆسۆ لە بنەڕەتەوە دەیەوێت ئازادی گشتی چوارچێوەی سیاسی،واتە ئازادی دێرینەکان زامنبکات و نیگەرانی ئازادی تاکەکەسی هاوڵاتیان, واتە ئازادی مۆدێرنەکان نییە. ئەو بڕوای وایە هەر کاتێك ئازادی گشتی بەشێوەیەکی تەواو بوونی هەبێت، ئازادی تاکیش بە باشی دەپارێزرێت و لە راستیدا ناوەڕۆکی کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتی هەر ئەمەیە. بە دەربڕینێکی دی تاك لە دەوڵەت و لە رێگەی دەوڵەتەوە بە ئازادی واقعی دەگات. لێرەوە ناکرێت بیرکردنەوەی رۆسۆ بە بیرکردنەوەیەکی تاکباوەڕانە بزانرێت. سەرەڕای ئەمە چەمکی ماف مرۆڤیش لەو ڕوەوە نامۆیە لای کە چەمکێکی لەمچەشنە لە بنەڕەتدا لە سیستەمی بیرکردنەوەی رۆسۆدا بە بێهودە دەردەکەوێت.

خاڵی دوهەم ئەوەیە ئەو دیموکراسیەی رۆسۆ پێشنیاری دەکات، دیموکراسی دەوڵەتشاری دێرین بە بیردا دەهێنێتەوە. باسەکە لەسەر دیموکراسی راستەوخۆیە، نەك دیموکراسی نوێنەرایەتی. چونکە حوکمڕانی بەشێوەیەکی راستەوخۆ و بەشێوەیەکی دەستەجەمعی بەدەستی خەڵکی ئەنجامدەدرێت کە ئیرادە گشتیەکان لە رێگەی یاساوە دەردەبڕن. دەزانین هەموو هاوڵاتیان لە دروستکردنی ئیرادەی گشتیدا بەشدارن و "ئیرادەی گشتیش تەنها بەرژەوەندی هاوبەشی" لەبەرچاوە و ئەم ئیرادەیەش دەرئەنجامی کۆی ئیرادە تایبەتیەکان نییە. ئیرادەی گشتی لە "ژمارەیەکی زۆری جیاوازییە وردەکانی" نێوان ئیرادە تایبەتیەکانەوە دروستدەبێت. چونکە بەرهەمی کۆی جیاوازیە زۆرەکانی ئیرادە تایبەتیەکانە. کەوابوو لە ئەنجامدا هەموو خەڵك و هەموو هاوڵاتیان، ئیرادەی گشتیان دروستکردووە. دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە ئیرادەی گشتی، کاری زۆرینە

نییە. هەمان ئەو زۆرینەیەی کە کەمایەتی بتوانێت لەگەڵیدا نەبێت. چونکە ئەم چەمکانە، وەك چەمکی ئۆپۆزسیۆن لای رۆسۆ نامۆن. لێرەوە لە دیدی رۆسۆوە تەنانەت گەر گروپێك خاوەن زۆرینەش بن، دیسان هەر نوێنەری ئیرادەی تایبەتین، نەك ئیرادەی گشتی. لێرەوە ئەو دیموکراسیەی رۆسۆ مەبەستێتی "کۆمەڵە بچوکەکان لە رێگەی کۆمەڵە گەورەکاندا" دەردەکات و ئەوە بە گریمانە وەردەگرێت کە هاولاّتیان بێ "هیچ پەیوەندییەك بەیەکەوە" خۆیان بڕیار دەدەن: "کەوابوو بۆ ئەوەی نیشانەی ئیرادەی گشتی رووبدات، گرنگ ئەوەیە لە دەوڵەتدا کۆمەڵی بچوك نەبێت و هەموو هاولاّتیەك هاودەنگ لەگەڵ دەوڵەتدا بیروبۆچونی خۆی دەربڕێت".

دواجار لەبەرئەوەی رۆسۆ لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا جیاکاری ناکات، هەندێکجار وەك سەرچاوەی تۆتالیتاریزم – کە خەسڵەتی نەبوونی جیاوازی کۆمەڵگا و دەوڵەتە – سەرزەنشتی دەکەن. لێرەدا بەتایبەتی دەبێت ئاماژە بۆ ژ. ل. تالمۆن و لۆیی هارتز بکەین کە وا بیردەکەنەوە. هارتز بڕوای وایە رۆسۆ "یارمەتی تۆتالیتاریزمی"داو "وێنایەکی بۆ دەوڵەتی تۆتالیتار" دروستکرد. بەلاّم درێژەی پێدەدات و دەڵێت "رۆسۆ بەمانای مۆدێرنی ئەم وشەیە تۆتالیتار" نەبوو. لەمبارەیەوە دەبێ بڵێین گەرچی رۆسۆ دەوڵەت و کۆمەڵگا بەیەك شت دەزانێ، بەلاّم ناونانی بیرکردنەوەکەی بە تۆتالیتاریزم، ئەویش بە ماناکانی ئەم زاراوەیە لە سەدەی بیستدا، راست نیە و لەجێی خۆیدانیە.

بەڵێ دەبێ بگوترێت کە گەڕانەوەی رۆسۆ بۆ دەوڵەتی پێشمۆدێرن لەم مەسەلەیەدا زۆر روونە و لە راستیدا ئەگەری چارەسەرێکی بڕاوەی باسێکی هەرچەند پڕ خرۆش، بەلاّم بێهودە بەدەستەوە دەدات. راستە گەرچی بیرکردنەوەی رۆسۆ تاکباوەڕی نییە، بەلاّم ناکرێ بە تۆتالیتار ناوببرێت. لە راستیدا باسی بیرکردنەوەیەکی هەمەکیباوەڕە کە لەسەرتربوونی هەمەکی بەسەر بەشەکاندا و پێکەوەبستان بەسەر ئەندامەکانیدا، دەسەلمێنێت. خەسڵەتی ئەم بیرکردنەوەیە – رێك وەك دەوڵەتشاری دێرین – هەمان هەمەکیباوەڕیە، نەك تۆتالیتاریزم.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نابێت ئەو خاڵە لە بیر بکرێت کە ئەگەرچی رۆسۆ بە تیوریزەنی دەوڵەتی پێشمۆدێرن دەژمێررا و رووی لە دەوڵەتی مۆدێرن کە لە دۆخی لەدایکبوندا بوو، وەردەگێرا، بەلاّم بێئەوەی بزانێت و بیەوێت لە بنەڕەتدا مۆدێرنەی سیاسی بە دوو شێوە راگەیاند و ئامادەی کرد. لە لایەکەوە بەرەدکردنەوەی کۆمەڵە بچوکەکان "دەزگا مامناوەندیەکان، پلە و چینەکان" تاکی لە کۆیلەیەتی ئەو بونیادە گوشارانەی رژێمی پێش شۆڕش رزگارکرد و ئەوەی بۆ رەخساند وەك تاکێك لە کۆمەڵگای گەورەدا بوونی هەبێت. بەمشێوەیە رۆسۆ لە پەیدابوونی تاکی مۆدێرندا بەشدار بوو، تاکێك کە بتوانێت راستەوخۆ و بێ هیچ ناوەندێك، ئەندامی دەوڵەت و لێرەوە هاولاّتی بێت. بە دەربڕینێکی دی رۆسۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە دەگەڕایەوە بۆ نمونەی دەوڵەتشاری دێرین، گواستنەوە لە دەوڵەتی

فیودالیەوە بۆ دەوڵەتی مۆدێرنی مومکین کرد. گەڕانەوە بۆ دەوڵەتشاری دێرین ناراستەوخۆ دەرکەوتنی قۆناغێك بوو کە بە مۆدێرنەی سیاسی دەگات.

لەلایەکی دیەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە رۆسۆ بڕوای وابوو پەیمانی کۆمەلأیەتی پێویستی بە سپاردنی تەواوی مافە فەردیەکانە بە کۆمەڵگا، بەلأم بە ئاگاداریەکی زۆرەوە دەیگوت تەنها مافە پێویستەکان بۆ کۆمەڵگا، بە کۆمەڵگا دەسپێرێت، نەك هەموو مافەکان. راستە رۆسۆ لە راگەیاندنی ئاشکرای ئەو مافانەی کە تاك دەیپاراست، رایدەکرد و گرنگیەکی ئەوتۆی پێنەدەدا، بەلأم بنەمای بوونی بوارێکی تایبەتی جیا و سەربەخۆ لە دەوڵەتی، هێنایە ئاراوە. ئەم بوارانە هەمان جێگەی ئازادیە فەردیەکان بوو کە دەبوو دەربکەون، هەروەها ناوك و تۆوی کۆمەڵگای مەدەنی بوو کە دەبوو پەرەبسێنێ و گەشە بکات. بەڵێ رۆسۆ بەمشێوەیە بە ناویست رێگەی بۆ مۆدێرنەی سیاسی کە ماوەیەکی دواتر دەرکەوت، خۆشکرد.

### سەرچاوە

وەرگێڕانی فەسڵی شەشەمی کتێبی: (مۆریس بارییە: مدرنیتەی سیاسی. ترجمە: عبدالوهاب احمدی. تهران. اگه 1383.

# ئەوانەی زەمینەیان بۆ رۆشنگەری خۆشکرد
## بایل، گالیلۆ، بوسوێ

هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**پییر بایل** (1706-1647):

"پیر بایل" نموونەی دیاری ئەو قەیرانە بەناوبانگەی هۆشیاری ئەوروپاییە کە لەو قۆناغە مێژوییەی دەکەوێتە نێوان سەدەی حەڤدەهەم و سەدەی هەژدەهەم، رویدا. ئەم هۆشیارییە نوێیە کەوتە گومانکردن لەو بیروباوەڕە ئایینییەی بەناوییەوە چەندین قەسابخانە و جەنگی ناوخۆیی دروست بوو، بەلاّم سەرەڕای ئەوەش نەیتوانی یەکبینە دەستبەرداری بێت، لەبەرئەوەی بەناخیدا شۆڕبوو بووەوو ڕیشەکێشکردنی هەروا کارێکی ئاسان نەبوو. ئەمەش وایلێکرد ماوەیەکی زۆر وێڵ و سەرگەردان بێت و ئازار بخوات، تا دواجار گەیشتە تێگەشتنێکی دی لە پەیامی ئایینی، تێگەیشتنێك جیاواز لەوەی سەدان ساڵ بوو لە ئارەدا بوو. پێویستە بەم پێیە لە قەیرانی بیریارانی ئەوروپایی لەو قۆناغەدا تێبگەین و کۆششە نەبڕاوەکانیشیان لە پێناو گەیشتن بە حەقیقەت و ڕۆشنایی، هەڵبسەنگێنین.

"پیربایل" یەکێکە لەو بیرمەندانە و پێشتریش باسمان لێکرد. ئەم پیاوە ئەگەرچی بە ئیعترافی هەمووان ڕێگە خۆشکەر بووە لە بەردەم هاتنی "ڤۆڵتێر"دا، بەلاّم لە ئێستادا فەرەنساییەکان کەم تا زۆر لەبیریان کردووە. بەلاّم ئاخۆ هۆی چییە کە لەیادکراوە؟ لە ڕاستیدا هۆکەی ئەوەیە کە مشتومڕی مەزهەبی نێوان پرۆتستانت و کاتۆلیکەکان بۆ هاولاّتیەکی فەرەنسایی ئەم سەردەمە، شتێك نییە جێی بایەخی ئەوبێت، لەبەرئەوەی ئەو کێشەیەی تێپەڕاندووەو بەلایەوە بۆتە ڕابردوو.

ئێمە بۆ ئەوەی بەو نەوەیە بگەین کە بە دەست کێشەی فێندەمێنتالیزمەوە گیرۆدە بووە،

پێویسته سێ سەدەیەك بگەڕێینەوە دواوە. هەر لەبەرئەمەیە من زیاد لە شوێنێكدا وتوومە: (من ئەوەندەی خۆم لەو بیریارە ئەوروپاییانەی بەر لە سێ سەدە مردوون بە نزیك دەزانم، ئەوەندە لەگەڵ ئەوانەی ئێستادا وانیم). لە نێوان هاوسەردەمێتی فیكری و هاوسەردەمێتی زەمەنیدا جیاوازی هەیە. لێرەوە ئێمە لە ڕووی هاوسەردەمێتی فیكرییەوە لە "پیربایل"ەوە نزیكین، تەنانەت ئەگەر سێ سەدەیەكیشمان لە نێواندا بێت، بەڵام زۆر لە "سارتەر و دێریدا و فۆكۆ و دۆلۆز و هابرماس"ەوە دووریین، هەرچەندە هاوسەردەمین لەگەڵیانداو هەنووكەش لەناوماندا دەژین.

"پیربایل" لە شارۆچكەیەكی باشووری فەرەنسادا لەدایك بووە كە زۆر لە پاریسی پایتەختەوە دوورە. مرۆڤێكی سەرسەخت بووەو لە پێناو بەدەستهێنانی زانست و ڕۆشنبیریدا پشتی بەخۆی بەستووە، حەزێكی زۆری لە خوێندنەوە بووەو بە عەشقەوە بەرهەمی "مۆنتێنی" فەیلەسوف و "بلۆتارك"ی شاعیر و نوسینی تیۆلۆژیستە پرۆتستانتییەكانی سەدەی شازدەهەمی خوێندۆتەوە. هەر لە سەرەتاوە هەستی كردووە سەر بە كەمینەیەكی چەوساوەو سەركوتكراوی وەك كەمینەی پرۆتستانتییە، بەڵام ساڵی 1669 هەموانی توشی شۆك كرد، كاتێك ڕوویكردە شاری تۆلۆز و ناوی خۆی لە كۆلێژی یەسوعییەكان (واتا برایانی توندڕەوی كاتۆلیك)دا تۆمار كرد. ئەوەی زۆر سەیر بوو، ئەوە بوو ئاینزاكەی خۆی گۆڕی و چووە سەر ئاینزای كاتۆلیكی. ئاخۆ ئەمەی بە چ مەبەستێك كردبێت؟ تۆ بڵێی لە ترسی چەوساندنەوەو پەراوێز خستن بوو بێت، یاخود قەناعەتی بە بەڵگەو بەهانەی زانا كاتۆلیكیەكان كردبێت، پاش ئەوەی گفتوگۆ و مشتومڕەكانیانی لەگەڵ پرۆتستانتەكاندا خوێندبێتەوە؟

هەندێك پێیان وایە ئەو كارەی لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا كردووە، چونكە چونەسەر ئاینزای زۆرینە زوڵم وستەمكاری لەسەر هەڵدەگرێت و دەرگاكانی داهاتوشی لەبەردەمدا والا دەكات، بەڵام لە بەرامبەریشدا لە خێزان و بنەماڵەكەی دایدەبڕێت، بە تایبەت لەو سەردەمەدا كە جەنگی ئایینی و مەزهەبی تاوی سەندبوو. هەرچۆنێك بێت و ئەو هۆكارانەش هەرچییەك بووبێت كە ناچاریان كردبێت ئاینزاكەی بگۆڕێت، بەڵام لە پەیمانگای یەسوعییەكان لە شاری تۆلۆزدا دەستی كرد بە خوێندنی فەلسەفە. لەوێدا ئاشنایەتی لەگەڵ فەلسەفەی سیكولائیدا پەیدا كرد، ئەمەش فەلسەفەی قوتابخانەكانی سەدەكانی ناوەڕاست بوو كە تا ئەو كاتەش لە هەموو ناوەندەكانی خوێندنی فەرەنسادا بەردەوام بوو، هەرچەندە فەلسەفەی دیكارتیزمی نوێیش هاتبووە ئاراوە.. ئەستەمە لە پڕێكدا فەلسەفەی نوێ جێگەی فەلسەفەی كۆن بگرێتەوە كەسەدان ساڵە ڕەگی داكوتیوەو ئامادەگی هەیە.

شایەنی باسە فەلسەفەی سیكولائی بریتییە لە فەلسەفەی ئەرستۆتالیسی، بەڵام پاش ئەوەی لەلایەن ئایینی مەسیحی سەدەكانی ناوەڕاستو لەسەر دەستی قەشە "تۆما ئەكوینی" شەنوكەوكرا. ئەم فەلسەفەیە خوێندكاری فێری هونەری گفتوگۆ و مشتومڕ دەكرد وئەمەش بۆ

خـۆی شـتێکی کـەم نـەبوو.. لەلایـەکی تـرەوە مامۆستاکانی "بایل" لە تۆلـۆز، کەم تا کورتێك گرنگییـان بـە فەلسـەفەی مـۆدێرنیش دەدا، واتـە بە "کۆپەرنیکۆس و دیکارت". ئەگەرچی ئەوانە بەشـێوەیەکی ڕەسمـی قەدەغـە کرابـوون. بـۆ نموونـە کتێبـەکانی "دیکـارت" بـە بڕیـارێکی تیۆلۆژی لە ساڵی 1666 دا قەدەغە کران.

"بایل"بـــە دەســـــتبەرداربوونی لــــە پرۆتستانتیەت و بوونی بە کاتۆلیکی بەختەوەر بوو، هەر بۆیە کەوتە بانگەشەکردنی "یاکوب"ی برای تاوەك ئەو بکات، بۆئەوەی لە دەست گرێی کەمایـەتی و دۆزەخـی چەوسـاندنەوە ڕزگـاری بێت.. بەڵام لە پڕێکداو دوای کـەمتر لـە ساڵ و نیوێك، لە مەزهـەبی کاتۆلیکی هەڵدەگەڕێتەوەو دەگەڕێتەوە سەر ئاینزا ئەسڵیەکەی خۆی. بەڵام چی ڕوویدا و ئەم گۆڕانە خێراو بەپەلانە یانی چـی؟ پێدەچـێت فشـاری زۆری خانەوادەکـەی، کاریگـەری زۆری هـەبووبێت تـا دەسـتبەرداری کاتۆلیکیـــەت بێــت. بـــەڵام ئاشـــنابوونی بـــە فەلسەفەش ڕۆڵی خۆی هەبوو، چونکە فەلسـەفە وایلێکـرد گومـان لـە تـەواوی ئاینزاکـان بکـات. بـەمجۆرە ناچـار بـوو سـەری خـۆی هـەڵبگرێت و ئـاوارەی ئـەورووپا بێـت، تـا دواجـار لـە هۆڵەنـدا گیرسـایەوە کە وڵاتێکـی لیبرالـی و پرۆتستـانتی بوو. "بایل" وای لێهات کاتۆلیکەکان بە خوێنی سـەری تینـو بـوون و پرۆتسـتانتەکانیش بـە گومـان بـوون لێـی. لێـرەوە فەلسـەفەی کـردە نیشتمان و پەناگەیەك کە لە دەست توندو تیژی مەزهەبـــەکان دەیپاراســـت. پرۆتســـــتانت مەزهەبـەکان لـەو کردەوەیـەی خـۆش نـەبوون، چـونکە پێیـانوابوو دوای ئـەوەی چـۆتە سـەر ئـاینزای کـاتۆلیکی پـیس بـووە. واتـە ئەگـەر هەرچـی بکـات لـە نـەزەری ئەوانـدا گـڵاوەو پـاك نابێتـەوە..کاتێکیش گەڕایـەوە سـەر ئـاینزای خۆی بە نا بە دڵی وەریانگرتەوە، بە تایبـەت کە زانیـان کاتۆلیکـەکان بەدوایـەوەن و دەیانـەوێت بیکـــوژن. شـــایەنی باســـە دوای ئـــەم ڕوداوە، "بایل"زیــــاتر مـــــەیلی بــــەلای ڕێچـــــکای ئەقڵانیـــدا دەچـــوو کـــە هـــەموو مەزهـــەب و تایەفەگیرییـــەك تێدەپـــەڕێنێت.. ئاینزاکـــانی مەســیحیەت لــە ڕوی عەقیــدەو ســروتەوە لــە یەکـــدی جیـــاوازن و هەریەکـــەیان لاف ئـــەوە لێـــدەدات کـــە خـــۆی ڕاســـت و دروســـتەو نوێنەرایەتی بیروباوەڕی مەسیح دەکات.

"بایـــل" دوای ئـــەوەی بـــوو بەمامۆســـتای فەلسەفە، دەستی کرد بە خوێندنەوەیەکی قوڵی فەلســـــەفەی "مـــــالبرانش" و "ســــــپینۆزا" و دیکارتییـەکانی دیکـە. بـەمجۆرە لـەو ناوەندانـە نزیك دەبووەوە کە خۆیان لە بیروباوەڕ و سروتە ئایینیـەکان قوتـار کردبـوو، لەبەرئـەوەی ئـەم ناوەندانـە زۆر لـە ناوەنـدە میللییـەکان کـراوەو لێبـــوردەتر بـــوون و وەك ئـــەوان تونـــدڕەو و دەمارگیر نەبوون.

ساڵی 1681 گۆڕانێکی گەورەو کاریگەر لە ژیـانی "بایـل"دا ڕوودەدات. لـەو ساڵەدا ئـەوەی بـۆ دەرەخسـێت بچـێتە شـاری ڕۆتـردام لــە هۆڵەندا، تا بە یەکجاری تێیدا نیشتەجێ بێت و لــە دەســـت ڕاوەدوونـــانی لەلایـــەن کاتۆلیـــك مەزهەبەکانیشـەوە ڕزگـاری بێـت. لـەو شـارەدا هەســت بــە ئــازادی دەکـات و دەســت دەداتــە نوسینی بەرهەمە سەرەکیەکانی کە سەرکۆنەی دەمـارگیری مەزهـەبی دەکـات و دواتـر دەبێتـە

زادی سەرجەم فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، هەر لە "ڤـــــۆڵتێر"ەوە بـــــۆ "دیــــــدرۆ" و ئینسیکلۆپیدیاییەکان و "ڕۆسۆ" و.. هتد. ئەو پرۆتستانت مەزهەبە فەرەنساییانەی لە دەست زوڵم و ستەمی کاتۆلیك مەزهەبەکان و "لویسی چوارده" هـەڵهاتبوون، "بایـل" یـان بـانگ کـرد بۆئـەوەی لـە ڕۆتـردام و لـەو قوتابخانـە نوێیـەی تـازە بـە تـازە کردبوویانـەوە وانـەی فەلسـەفە و مێژوو بڵێتەوە.

ئاشکرایە ئەو پرۆتستانتیانەی لە فەرەنسا ڕایانکردو چوونە هۆڵەندا، دەیان هـەزار کـەس دەبـــوون و هـــەر هەموشـــیان لـــە دوو شـــاری ســـــەرەکیدا گیرســـــابوونەوە، ئـــــەوانیش: ئەمســـتردامو ڕۆتــردام بــوو.. لــەو ســەردەمە و زەمانـــەدا هۆڵەنـــدا ســـەرقاڵی ململانێیـــەکی ئایــدیۆلۆژی تونــد بــوو، لــە نێــوان پــارتی موحـافیزین و پـارتی کۆماریـدا. بۆرژوازیـەتی هۆڵەندی، چینێکی لیبرالی و ڕۆشنگەربوو، بە پێچـەوانەی چـینە میللیـەکان کـە تونـدڕەو و دەمـــــارگیربوون.. بۆرژوازیـــــەتی هۆڵەنـــــدی پێشوازیەکی گەرمی لە "پیربایل" کرد، هەروەك چـۆن پێشـتر پێشـوازی لـە "سـپینۆزا"کرد و ئـامێزی بـۆ گرتـــەوە. هاوکـات بۆرژوازیـــەتی هۆڵەنـدی گـوێی بـەو پڕوپاگەندانـە نـەدا کـە هەنـدێ ناوەنـدی دۆگمـا و دەمـارگیر، لەسـەر "بایـــل" بلاویانـــدەکردەوەو وەك کەســـێکی بێبـــاوەڕو گـــومڕاو ئەقڵانیـــەکی پـــەتی باسیاندەکرد.

"بایـل" بـەهۆی پەیوەنـدی دۆسـتایەتی و بیرکردنەوەی تایبەتی خۆی کە دژ بە دەمارگیری بـوو، بەرەبـەرە لـەکۆماریخوازە ڕۆشـنگەرەکان نزیـك دەبـوەوە، تـا پەیوەنـدی پێـوەکردن. بەمجۆرە تێز و تیورەی بۆرژوازیـەتی لیبرالی لـە نوســـینەکانیدا ڕەنگیاندایـــەوە، وەك چـــۆن ڕەنگدانــەوەیان لەســەر کارەکــانی "ســپینۆزا" هــەبوو، ئــەو تێزانــەش بــە ئومێـدی ئــەوەبوون بگەنـە یەکلایکردنـەوەی کێشـەی نێـوان تـەواوی ئایینزاکان بەشێوەیەکی گونجاو.

سـاڵی $1684$ یەکـەمین ژمـارەی ڕۆژنامـەی *Nouvellesde La republique des Lettres* دەرچـوو، "بایـل" ڕاسـپێردرا تـا سەرپەرشـتی لاپــەڕە ڕۆشــنبیریەکانی بکــات. لەبەرئــەوەی کێشـەی مـادی هـەبوو، کارەکـەی پەسـەند کـرد. بـەلاّم بـە بەهانـەی ئـەوەی ڕۆژنامەیـەکی مـادی و ئیلحادیە، ڕێگەی پێنەدرا بچێتە ناو فەرەنساوە. هەنـدێك پێیـان وایـە ڕاسـتی ئـەم مەسـەلەیە وانییەو بەم شێوەیەیە: سەرنوسەری یەکێك لە ڕۆژنامـە فەرەنسـییەکان ترسـی هـەبوو لـەوەی ڕۆژنامەکـــەی "بایــل" ببێتــە ڕکابــەری و بــۆ ئەمـەش، داوای لـە هەنـدێك لەوانـە کـرد کـە لـە کۆشـکی پاشـادا دەسترۆیشـتوو بـوون، بڕیارێك دەربکـەن کـە نابێـت ئـەو ڕۆژنامەیـە بێتـە نـاو فەرەنســاوەو ئــەم کــارەش چووەســەر. لــەم ســەروبەندەدا چەوســاندنەوە و ڕاوەدوونــانی پرۆتســـتانت مەزهەبـــەکان لـــەناو فەرەنســـادا بــــەردەوام بوو..هاوکـــات هـــەوڵی کـــوژرانی "یـــاکوب"ی بـــرای پێگەیشـــت کـــە دوای زیندانیکردنی لە شاری بۆردۆ، لە ژێر لێدانـدا و بـە تۆمـەتی گـومڕایی گیـانی لەدەسـت دابـوو. لەگـەڵ ئەوەشـدا بـە چـاوی خـۆی کۆچـی بـە لێشـــاوی پرۆتســـتانتەکانی دەبـــینی، لـــە فەرەنسـاوە بـەرەو ولاّتـانی دیکـەی ئـەوروپا.

هــەروەها گــوێ بیســتی هــەواڵی ئــەو ســزا درِندانەیــــەش دەبــــوو، کــــە لــــە پێنــــاو دەستبەرداربوونی ئاینزای پرۆتستانتی و چونە سەر مەزهەبی کاتۆلیکی دەدران. لە پای ئەم کۆچــە بەلێشاوەشــدا، فەرەنســا چــاکترین هاوڵاتیانی خۆی لەو سەردەمەدا لەدەستدا. کاتێـک بـە چـاوی خـۆی مەرگەسـاتی ئـەو پەنابەرانـەی دەبـینی، تـا سـەر ئێسـقان تـورە دەبـوو. هـەر بۆیـە دەسـتی کـرد بـە نوسـینی کتێبگەلێکی توند لە دژی دەمارگیری کاتۆلیکی، لەوانە: (مانای داوەشانی فەرەنسای کاتۆلیکی لـە سـایەی لویسـی مەزنـدا – 1686، لەگـەڵ شـرۆڤەیەکی فەلسـەفی بـۆ ئـەو دەسـتەواژەیەی دەدرێتە پاڵ مەسیح و دەڵێت: ناچاریان بکەن بێنــەناوەوە). ئەمــە دەســتەواژەیەك بــوو، فێندەمێنتالیزمــە کاتۆلیکیــەکان دەیانوتــەوە، بۆئەوەی مەشروعیەت بدەن بە پرۆسەی گۆرِینی پرۆتستانتەکان و ناچارکردنیان تا بە زەبری هێـز بچـنە نـاو ئـاینزای کاتۆلیکیـەوە. مانـای تەواوی ئەم دەستەواژەیە ئەوەیە: (ئەگەر ئەوانە بــە خۆشــی و بەخواســتی خۆیــان نەبوونــە کاتۆلیکی، ناچاریان بکەن و بە زۆر بیانهێنن).

"بایل" دەرهەق بەم بۆچوونە دەڵێت: (ئەو ئیمانــەی بــە زەبــرو زۆر دەهێنرێــت، هــیچ مانایـەکی نییـە. لاقـەکردنی ویـژدان هیچـی لـە لاقـەکردنی جەســتە کـەمتر نییــە). ئەمــە بــۆ یەکەمجار بوو باس لە ئیمانداری ئازاد بکرێت یـاخود جـەخت لـە ئـازادی لـە بـواری ئـایین و بیروبـاوەرِدا بکرێتـەوە. لە رِابردوودا ئیمان بە شێوەی بۆماوەیی بە مرۆڤ دەگەیشت یاخود لە رِێگـای شـکۆی ئــەو دەسـەڵاتە ئایینیــەی رِێپێدراو بوو، یان لەرِێی کۆدەنگی کۆمەڵگەوە.. مرۆڤ بە زەبری هێز و بێ هیچ ئاگاییەکی خۆی ئیمانـدار بـوو، بـەلاّم "بایـل" دێـت بـۆ ئـەوەی بڵێـت: (ئەگـەر مـرۆڤ بـە قەناعەتـەوە بـرِوا بـە بیروباوەرِێك نەهێنێت، ئەوا ئەو ئیمان هێنانەی هـیچ مانایـەکی نابێـت). کەواتـە مـافی ویـژدان هەیـەو پێویســتە رِێــزی لێبگیرێــت، ئەمــەش یەکــەمین مافــە. بــەمجۆرە ئــازادی ویــژدان و هۆشـیاری لـە رِۆشـنبیری خۆرئـاوادا دامـەزرا، ئــــەویش لــــە رِێگــــای بەگژاچـــــوونەوەی فێندەمێنتالیزمێك کە لەسەر دەمارگیری و زەبرو زۆری ئایینی دروست بووبوو.

لێرە ئیستێك دەکەم بۆ ئەوەی بڵێم: نابێت ئەقڵیـەتی توندرِەوانـەی خـەڵکی ئـەو رِۆژگـارە کۆنانـە بـە بـەهاو چـەمکەکانی سـەدەی بیسـتەم بپێـوین، چونکە ئەمە رِاست نییە و هەڵەیەکی مێژوویـیــە. واتــە دەبێــت لــە چوارچــێوەی هەلومــەرجی ســەدەی حەڤدەهەمــدا ســەیریان بکەین، ئەمەش بەو مانایە نایەت پاساو بۆ ئەو شــتانە بهێنینــەوە کــە رِوویانــداوە. ئــەوەی هەنووکـە بـەلای ئێمـەوە کـارێکی بەربـەری و نەشـیاوە، بـەلای خـەڵکی ئـەو سـەردەمانەوە ئاسـایی بـووە. چـەمکی پلـورالیزمی رِۆحـی و ئـایینی و رِێزگـرتنی بیروبـاوەرِ و مەسـەلەی مافـەکانی مـرۆڤ، هـەر هـەموویان دواتـر هاتنـە ئاراوە لە سەدەی حەڤدەهەمدا ئەم شتانە نەبوو. تەنانـەت بـە بـیری کەسیشـدا نـەدەهات، مەگـەر "پیربایـل"و کارەکتـەرە فیکرییـە ناسـراوەکانی دی بیریــان لێکردبێتــەوە. تەنانــەت ئــەم بــەهاو بۆچــوونانە بــەلای زۆربــەی زۆری میللــەتانی دنیــاوە، جگــە لــە ئــەورووپای

شارســتانی و پێشــكەوتوو، شــتێكی نامۆیــە و پێی ئاشنا نین.

لەلایــەكی تــرەوە ڕەخنــەگرتنی "بایــل" لــە كاتۆلیكیەكان و دەمارگیریان، مانای ئەوە نەبوو كە بەهــەموو شــتێكی پرۆتســتانتیەكان ڕازییــە. بەڵكو ڕەخنەی ئەو لە هەموو شتێكی نادروست بــوو، ئــیتر سەرچــاوەكەی هــەر هێــز و لایــەنێك بوایــە.. ئــەو بــۆ ئــەوە نەدەكۆشــا تــا لــە بــری توندڕەوی و دەمارگیری كاتۆلیكی، توندڕەوی پرۆتستانتی دابنێت، بەڵكو بۆئەوە بوو بگاتە ئاستێكی دی كە لەسەروو هەموو دەمارگیریەكی مەزهەبیــــەوە بێــــت. بــــەم پێیــــە "بایــــل" یەكێكــــە لەوانــــەی ســــەرەتاكانی ســــەردەمە نوێیەكانی دارشت، لەگەڵ "سپینۆزا" و چەند كەسانێكی دیكەدا.

"بایــل" هــەموو كــاتی خــۆی بەخشــی بــە زانســت و مشــتومڕە فیكرییــەكان و پێیوابــوو پــەیامێكی پێیــە و ئــەركێكی لەســەر شــانە. ئەگەرچی ئەو مامۆستای فەلسەفە و مێژوو بوو لە قوتابخانەی ڕۆتردام، بەڵام كاری سەرەكی لە ڕۆژنامەدا بوو، لەبەرئەوەی ڕۆژنامە بواری دەدا بــیرو بۆچــوونەكانی بڵاوبكاتــەوە. "بایــل" دەیویست خەڵك بەرەو ئەوە بەرێت كە ڕاستیە تاڵەكان كەشف بكەن. دەربارەی "بایل"، "پۆل هازار" دەڵێت: (پێویستە ئاوا مەزندەی بكەین لە ژوورەكەیدا لە شاری ڕۆتردام: لاواز، زاهید، دوور لە ئافرەت و حەز و ئارەزوو.. ئەو پیاوێك بوو نە ژنی هێناو نە وەچەی خستەوە، ئەوەی هەموو ژیانی خۆی بۆتەرخانكرد یەك شت بوو: نوسین و هۆشیاركردنەوەی خەڵك و نەهێشتنی تاریكی دەمارگیری و داوەشان.ماڵەكەی پڕاو پڕ بوو لە كتێب، كتێب و شتێكی تر نا.. جگە لە باس و خواسی فیكری و ڕۆشنبیری، هیچ شتێكی تر لە ژیانیدا نەبوو. دەیخوێندەوە و دەینوسی و دیالۆگی دەكرد و دەیووت: من لە خوێندنەوەدا چێژێكی زۆر دەبینم، ئەمەش بەو چێژە دەچێت كە كەسانی تر لە ڕابواردن و گەمەكردن و سەرگەرمكردندا دەیبیننەوە)[1].

شەهوەتی مەعریفە لای ئەو بەسەر شەهوەتی جنسیدا زاڵ بوو، وەكو "فرۆید" دەڵێت. دەیویست هەموو شت بزانێت، بۆ ئەوەی ڕەخنەی هەموو شت بكات..

ڕاستیەكەی "بایل" بە هۆی ئەو ڕووداوە تایبەتی و گشتیانەی لێی ڕویدا، لە ناخەوە بریندار بوو. هەر ئەم برینەش وایلێكرد ببێتە بیریار و تەواوی ژیانی خۆی بۆ یەك شت تەرخان بكات: ئەركی بیر و گۆڕینی بیر. دەیویست تۆڵە لەو واقیعە تفت و تاڵە بكاتەوە، واقعێك كە بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانیت سوار شانت دەبێت و قەبرغەت دەگرێت. نوسینەكانی ڕستێك بۆمبی چێنراو بوون، دەیانویست بنەماكانی ئەو واقیعە مەزهەبیە دزێوە هەڵتەكێنن. ئەمە وایكرد بە گژ هەموو لایەكدا بچێتەوە. وەختێك لە هۆڵەندا بوو، پرۆتستانتە توندڕەوەكان كێشەی گەورەیان لەگەڵ حكومەتی هۆڵەندیدا بۆ دروست كرد، چونكە قسەی ئەوەیان بۆ هەڵبەستن گوایە سیخوڕی بۆ پادشای فەرەنسای كاتۆلیكی دەكات!... بەمجۆرە هەموو پلە و پایەیەكی فێركردن و ڕۆژنامەوانیان لێسەندەوە و هیچ سەرچاوەیەكی بژێوی نەما. واتە بوو بە قوربانی دەمارگیری كاتۆلیكەكان و پرۆتستانتەكان.

وای لێهات نەیدەزانی چی بکات.. ئایا هۆڵەندا جێبهێڵێت و سەرلەنوێ روبکاتەوە وڵاتێکی تر؟ بەڵام بەرەو کوێ بچێت؟ ئەوەتا هەموو دەرگاکانی بەڕوودا داخراوە و دەرەتانێك شك نابات.. بەڵام لە پڕێکدا یەکێك لە خاوەنی دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی هۆڵەندا لەو تەنگەیە قوتاری دەکات.. ئەو کەسە داوای لێدەکات بە نوسینی ئینسیکلۆپیدیایەکەوە خەریك بێت و ئەویش لەبەرامبەردا هەرسێ مانگ جارێك برێك پارەی وەك موچە بۆ ببڕێتەوە. سەرەنجام ئەمکارەی نوسینی گرنگترین کتێبی لێکەوتەوە کە "بایل" بە درێژایی ژیانی خۆی بەرهەمی هێنابێت، ئەمەش ئەو کتێبە بوو کە ناوی ئەوی بە نەمری هێشتەوەو دواتریش فەیلەسوفانی رۆشنگەری کردیانە مەرجەعێك بۆ بەگژاچوونەوەی فێندەمێنتالستەکان. ئەم کتێبە قەوارە گەورەیەش: فەرهەنگی مێژویی و رەخنەییە (کە لەساڵی 1697 دا بە بێ کەموکورتی بڵاوکرایەوە)[2]، بێگومان لە مێژبوو "بایل" خەونی بەوەوە دەبینی کە کتێبێکی لەو جۆرە بنووسێت.

### گالیلۆ، گونجانێك لە نێوان زانست و ئیماندا دروست دەکات:

کڵێسای کاتۆلیکی (واتە فێندەمێنتالیزمی مەسیحی)، دەیویست ئازادی زاناکان سنوردار بکات، ئەویش لە ڕێگای چاودێری کردنی ئەو لێکدانەوانەی بۆ کتێبی سروشتییان دەکرد. هەروەها لە ڕێی چاودێریکردنی ئەو لێکدانەوانەی بۆ تێکستە پیرۆزەکانیان دەکرد، ئازادی مێژوو نوسانیشیان بەرتەسك کردبووەوە. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا، ئامانجی یەك شت بوو: کۆنترۆڵکردنی حەقیقەت بەشێوەیەکی تۆتالیتاریانەی ڕەها. چونکە کڵێسای کاتۆلیکی کە مەڵبەندەکەی لە شاری ڕۆمابوو، حەقیقەتی بە موڵکی تایبەتی خۆی دەزانی. بەڵام بەم کارەی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی بووە مایەی گاڵتەجاڕی، لەبەرئەوەی خۆی لە مەسەلەگەلێك هەڵدەقورتاند کە پەیوەندیان بەوەوە نەبوو، وەك مەسەلەی زانست و تیۆریا زانستیەکان. فێندەمێنتالیزمی مەسیحی ئەگەر هەر خواستی پاوانکردنی کایەی ئایینی بوایە، ئەوا ڕێزی خۆی نەدەدۆڕاند و ئەو پێکدادانە ترسناکەش لە نێوان زانست و ئاییندا دروست نەدەبوو.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا فێندەمێنتالیزمی مەسیحی، خەڵکیان ناچار دەکرد ملکەچی "پاپا"بن و ڕۆڵێکی گەورەشیان لە چەسپاندنی ئەرسۆدەکسی ئایینیدا گێڕا. لێرەدا مەبەستمان لە ئەرسۆدەکسی، مۆنۆپۆڵکردنی لێکدانەوەی ڕاست و دروستە بۆ ئایین و جگە لەو لێکدانەوەشی خۆیان بە ڕاستی دەزانن، ئەوانی تر بە بیدعە و جادو حساب دەکەن. ئەوانە تەنها لێکدانەوەی خۆیان بۆ ئایین بەڕاست دەزانی و هەرچی شرۆڤە و لێکدانەوەی ئەوانی ترە وەك: (پرۆتستانتی و فەیلەسوفان و زانایان)، بیدعەو گومڕای بوو. واتە فێندەمێنتالیزم پێیوایە بە تەنها خۆی خاوەنی لێکدانەوەی ڕاست و دروستە بۆ تێکستە ئایینیەکان و هەرکەسێکیش هێندەی تۆزێك لێی لابدات،

پێویستە تەکفیر بکرێت. تەنانەت ئەگەر کراش دەبێت ئەو کەسە بسوتێنرێت، یاخود بکوژرێت یان تیرۆر بکرێت. ئەمە ئایینی و ئیمانداری سەدەکانی ناوەڕاست بوو: واتە ئیمانداریێەك کە خەڵك دەکوژێت و ڕەوایەتی تیۆلۆژی بە پرۆسەی کوشتن و پاکتاوکردنی جەستەیی دەبەخشێت. لە تێکڕای ئەوروپادا، دەیان و بگرە سەدان زانا و بیریار بوونە قوربانی ئەم بۆچوونە.

بەلاَم لەو سەردەم و زەمانەشدا هەندێك تیۆلۆژیستی ژێر هەبوون کە هەڵوێستێکی شێلگیرانە و کراوەیان لە زانست هەبوو، چونکە هەموو پیاوانی ئایینی وەك یەك داخراوو دەمارگیر نین، بەڵکو داناو بیریاری وایان تێدایە کە وەك یەك لە یەزدان و زانست دەترسن: (انما یخشی الله من عبادە العلماء). لەوانە دەتوانین باس لە تیۆلۆژیستێکی وەك "بیلارمان" بکەین، ئەم پیاوە لە ساڵی 1571 دا دەنووسێت و دەڵێت: (گەر لە داهاتوودا کەسێك توانی دروستی تیۆریاکەی کۆپەر نیکۆس بسەلمێنێت، ئەوا پێویستە لەسەرمان سەرلەنوێ تەئویلی ئینجیل بکەینەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو تیۆریایەدا هەنگاو بنێ و لەگەڵ حەقیقەتێکی زانستی حاشا هەڵنەگردا ناکۆك نەبێت. چونکە ناکرێت مانای ڕاستەقینەی کتێبە پیرۆزەکان، لەگەڵ هیچ حەقیقەتێکی دیکەدا ناکۆك بێت، ئیتر ئەو حەقیقەتە فەلسەفی بێت یاخود زانستی – گەردونی بێت)[3].

"گالیلۆ" زیاد لە هەر کەسێکی دی لەم مەسەلەیە حاڵی بووبوو، ئەگەرچی پێشتر "کیپلەر" درکی پێکرد بوو. لە پێشەکی کتێبە بەناوبانگەکەیدا (گەردونناسی نوێ)، ئەم زانا پرۆتستانتیە (واتە کیپلەر)، دەڵێت: (ئینجیل باس لە شتە زانستیەکان ناکات، بەڵکو لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەو وێنانەی هەست دەدوێنن، هەقیقەتە ڕوحیەکانمان فێردەکات.. ئینجیل بەشێوەیەکی ئینسانی و بە ستایلێك کە مرۆڤ تێی بگات، باس لە شتەکان دەکات. تەنانەت قەشەکانیش دەرهەق بە زانست کەوتنە هەڵەی زۆرو زەوەندەوە، بۆ نمونە یەکێکیان ئەوەی ڕەتدەکردەوە کە زەوی خڕ بێت. تەنانەت قەشە ئۆگەستین یەکێك لە قەشە گەورەو دیارەکانی کڵێسا، بوونی دوو جەمسەری ڕەتدەکردەوە. بەلاَم ئەو حەقیقەتەی بەلای منەوە زۆر پیرۆزە، ئەوەیە کە بەشێوەیەکی زۆر زانستیانە دەیسەلمێنێت زەوی خڕەو دوو جەمسەریشی هەیە، یەکێك لە باکور و ئەویتریان لە باشور. هەروەها زۆر لەوەش بچوکترە کە ئێمە پێمان وایە و لە ئاسمانیشدا دەخولێتەوە.. کە ئەمانەش دەڵێم، ڕێزم بۆ قەشە و پیاوانی کڵێسا هەیە کە بە پێچەوانەوە لەم شتانە گەیشتبوون و قەناعەتیان بە شتێکی دیکە هەبوو)[4].

"گالیلۆ" هەمان ڕێگای "کیپلەر"ی گرتەبەرو لە دوو تێکستی سەرەکی خۆیدا، باسی لەم مەسەلەیە کردووە. تێکستی یەکەم ساڵی 1613 نوسیویەتی و بریتییە لە نامەیەك کە ئاڕاستەی قەشە "کاستیلی"کردووەو تیایدا باسی تێگەیشتنی خۆی بۆ دەکات، دەربارەی چۆنیەتی شرۆڤەکردنی تێکستە پیرۆزەکان. گرنگترین شتێك لەو تێکستەیدا وتبێتی ئەوەیە:

(شــرۆڤەکردنی حــەرفیی تێکســتە پیرۆزەکــان شـتێکی پـوچ و بێمانایـە، ئینجیـل دەخوازێـت و دەیەوێت لە ڕێی وێنەی میتافۆرییەوە حەقیقەتە روحیەکانمان پێ بڵێت. کەواتە بۆ هیچ کەسێك نییـە پشـت بـەم وێنـە میتافۆریانـە ببەسـتێت، بۆئــەوەی زانســت بــە درۆ بخاتــەوە و ڕەتــی بکاتـەوە). هـەر لـە درێـژەی قسـەکانیدا "گـالیلۆ" دەڵێت: (کتێبی پیرۆز ناشێت درۆ بکات یاخود هەڵـە بکـات. حەقیقـەتی ئـەو شـتانەی باسـیان دەکـات جێـی گومـان نییـە و حاشـا هەڵنـەگرە، بەڵام ئەوانەی شرۆڤەی دەکەن و لێکدانەوەی بۆ دەکــەن، ڕەنگــە زۆر جــار بکەونــە هەڵــەوە. هـەرجارێکیش پابەنـدی واتـای حـەرفی وشـەکان بین،ئــــەوا دەکەوینــــە هەڵــــەی کوشــــندەی بێشـومارەوە. ئەمـەش وامـان لێـدەکات خۆمـان لەبـەردەم ناکۆکیـەکی بێشـوماردا ببینینـەوە کـە چارەسـەری نییـە. مـن دەڵێم:سـەبارەت بـەوەی پەیوەنـدی بـە زانسـتە سروشـتیەکانەوە هەیـە، پێویسـتە ئینجیـل لـە دوای دواوە بێـت. دەبێـت بــزانین ئینجیــل و نوســینە سروشــتیەکان، هەریەکــەیان سەرچــاوە لــە قســەی یەزدانــەوە دەگرن. کتێبی پیرۆز لەگەڵ تێگەیشتنی تێکڕای خەڵکدا یەك دێتەوە و زۆر جاران بە پێی ڕواڵەتە دەرەکیـەکان بـاس لـە شـتەکان دەکـات. ناشـێت ئایەتـەکانی کتـێبی پـیرۆز بۆ ڕەتکردنـەوەی ئـەو دەرەنجامـە زانسـتیانە بـەکاربێنین، کـە لـە ڕێـی ئەزموونی زانستیەوە پێیگەیشتووین.. هـەرگیز ئامــانجی ئنجیــل ئــەوە نــەبووە فێرمــان بکــات ئاســمــان وەســتاوە یــان دەجوڵێــت، شــێوەی بازنەییـە یـان هێلکـەیی، زەوی بـەدەوری خـۆردا دەسـوڕێتەوە یـاخود بـە پێچـەوانەوە.. ئەمانـە شــــتگەلێکن پەیوەنــــدییان بــــە تێکســــتە ئایینیەکانــەوە نییــە.. ئەگــەر ڕۆحــی قــودوس بەمەبەســــت بیریشــــی چــــووبێت لــــە مجــــۆرە شـتانەمان فێـر بکـات، ئـەوا لەبەرئەوەیـە لەگـەڵ ئامانجـە سـەرەکیەکەیدا کـە رزگـارکردنی ڕۆح و گیانمانە لە ڕۆژی دوایدا یەك نایەتەوە. کەواتە دەبێت چۆن تێکستەکانی بۆ پاڵپشتی کردنی ئـەم یـان ئـەو بۆچـون لەسـەر ئـەو مەسـەلانە بـەکاربێنین..)[5]. دوو سـاڵ دوای ئـەم نوسـینە "گــالیلۆ" بەشــێوەیەکی بــەهێزتر هەڵوێســتی خـۆی دیـاری دەکـات، ئـەویش لـە ڕێگـای ئـەو دەستەواژە بەناوبانگەیەوە کە دەڵێت: (ئامانجی ڕۆحی قودوس لە تێکستە ئایینیەکاندا، ئەوەیە فێرمانکات چۆن بچین بەرەو ئاسمان، نەك پێمان بڵێت ئاسمان چۆن دروستکراوە!). واتا کتێبە ئایینیــــەکان فێرمــــان دەکــــەن چــــۆن بتــــوانین ڕەزامەنــــدی خــــوا بەدەســــت بێــــنین و بچــــینە بەهەشت، نەك پێمان بڵێن پێکهاتەی فیزیایی و گەردونی ئاسمان چۆنە، چونکە ئەمە پەیوەندی بە زانستە سروشتی و گەردونییەکانەوە هەیە.

پاشان "گالیلۆ" تیۆریای هـەردوو کتێبەکە، واتــە کتــێبی سروشــت و کتــێبی وەحــی بــاس دەکات و داوا دەکات هەرەیەکەیان سەربەخۆیی خۆیانیان هەبێت. چونکە هەریەکەیان شێوازی تێگەیشتنی تایبەتیان هەیە و زانایانی ئایینی مافی ئەوەیان نییە، دەست لە کاروباری زانستی وەربـدەن کـە تـەنها بـواری زانایـانی سروشـتە و ئەوان بۆیان هەیە قسەی تێدا بکەن. دەرهەق بەم مەســــەلەیە بەوپــــەڕی نــــاڕەزایی و توڕەییــــەوە دەڵێـت: (هـیچ تیۆلۆژسـتێك ناتوانێـت ئیـدیعای ئـەوە بکـات کـە زانسـتی ئەنـدازە یـان گـەردون

یاخود میکانیك یان پزیشکی، ناوەڕۆکەکەی لە کتێبی پیرۆزدا هەیە، چاکتر لەوەی کە لە کتێبی ئەرخەمیدس یان بەتلیمۆس یاخود بۆیسی و گالینۆسدا هەیە).. کەواتە گەر تیۆلۆژیا سەرقاڵی تێڕامانە ئەبستراکتەکانی بێت دەربارەی یەزدان، ئەو یەزدانەی بەهۆی شکۆ و مەزنییەوە لەسەر تەختی شاهنشاهی دانیشتووە، ئەوا ناتوانێت سازش بکات یاخود دابەزێت بۆ ئەو ئاستە نزمەی زانستە سروشتیەکان. بەو پێیەشی تیۆلۆژیا هەرگیز بایەخ بەم زانستانە نادات و بە شتێکی نامۆیان دەزانێت، کەواتە پێویستە تیۆلۆژیستەکان دەربارەی ئەم زانستە سروشتیانەی هیچی لە بارەوە نازانن و بە درێژایی تەمەنیان ئەزمونیان نەکردووە، هیچ بڕیارێك نەدەن و هیچ نەڵێن)[6].

دواجار بەم شێوەیە "گالیلۆ" لە ڕێگای جیاکردنەوەی نێوان ئەم دووکایەیە لە یەکتری، مەسەلەکەی یەکلایکردەوە. بەلاّم فێندەمێنتالیزمی مەسیحی دوای سێ سەدە لە خەبات و ململانێ، ئینجا ڕێگە دەدات زانست ئازاد بێت و دەست لەو کایەیە هەڵدەگرێت. لێرەوە ئیتر زانستی نوێ لە دەرەوەی کڵێسا و دژ بە فێندەمێنتالیزمی ئەرسۆدەکسی دروست دەبێت. ئەمە کێشەی ئەو مرۆڤە پێشەنگانەیە کە پێشوەخت دێن و کەس تێیان ناگات، بۆیە سوکایەتیان پێدەکرێت و پەراوێز دەخرێن. "گالیلۆ" نمونەی یەکێکە لەوانەی باجێکی گەورەیاندا، بۆئەوەی ڕۆژێك بێت و حەقیقەت سەرکەوێ و مرۆڤایەتی بەرەو پێش بچێت. شایەنی باسە کڵێسای مەسیحی ماوەی سێ سەدەی ویست بۆ ئەوەی بۆچونەکانی قبوڵ بکات.

ساڵی 1893 پاپا "لیۆنی سیازدەهەم" باسی لەم بابەتە کرد و هەمان هەڵوێستی "گالیلۆ"ی وەرگرت، بەلاّم بێئەوەی دان بەوەدا بنێت کە "گالیلۆ" لەسەردەم و ڕۆژگاری خۆیدا لەسەر هەق بووە. لەو نامەیەدا سەرنج دەدەین "پاپا" کەم تا زۆر هەمان ئەو زمانە بەکار دەبات کە "گالیلۆ" بەر لە سێ سەدە بەکاری هێنابوو. بۆ نمونە نامەکەی دەڵێت: (لە نێوان کایەی تیۆلۆژیا و کایەی فیزیادا هەرگیز هیچ ناکۆکیەکی هەقیقی ڕونادات، مادامەکی هەریەکەیان بە بواری تایبەتی خۆیەوە خەریکە. کاتێك ئەمەش دەڵێین ئەو هۆشدارییەی قەشە ئۆگەستینیش لەبەرچاو دەگرین کە دەڵێت: نابێت بە شێوەیەکی سەرەڕۆ تەئکید لە ڕاستی و دروستی هیچ شتێك بکەینەوە یان بەشتێکی نادیار بڵێین دیار و ناسراو.. ئەگەر هاتوو لە نێوان ئەو دووکایەدا ناکۆکی دروست بوو، ئەوا ڕێسایەکی گشتی هەیە پێویستە تیۆلۆژیست پەیڕەوی بکات و خودی قەشە ئۆگەستین تەئکیدی لێدەکاتەوە. ئەوەتا لەم بارەیەوە دەڵێت: هەموو ئەو شتانەی فەیلەسوفە بێبڕواکان دەتوانن بیسەلمێنن، بائێمە هەوڵبدەین بیسەلمێنین کە لەگەڵ ئینجیلدا ناکۆك نییە.. پێویستە ئەوە بزانین کتێبی پیرۆز نایەوێت ئەو شتانە فێری خەڵك بکات کە بە کەڵکی ئەوە دنیا نایەت – مەبەست لەو شتانەش، پێکهاتەی جیهانی سروشتی و دیاردە فیزیاییەکانە. لەبەرئەوە سەرنج

دەدەین کتێبی پیرۆز لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ بە کەشفکردنی سروشتەوە خەریك بێت، بە زمانی وێنەو میتافۆر یان بە زمانێك کە لەو سەردەمانەدا باو بووە، باس لەو دیاردانە دەکات)[7].

چیرۆکی "گالیلۆ" کاریگەری زۆری کردە سەر فێندەمێنتالیزمی مەسیحی و لە بەهای هێنایە خوارەوە. کلێساش تا سورتر بوایە لەسەر ئەوەی دان بە هەڵەی خۆیدا نەنێت، بەدحاڵی بوونی زیاتری لەسەر ئەو مەسەلەیە دروست دەکرد. ئەو سەرسەختی نیشاندانەی کلێسا، زیاد لە دادگایکردنەکەی "گالیلۆ" خەڵکی دووچاری شۆککرد.. لەم سەروبەندەدا یەسوعییەکان بەیەداخی داکۆکیکردن لە فێندەمێنتالیزمیان بەرزکردەوەو، بەم کارەشیان بوونە مایەی قەدەغەکردنی بلاوبوونەوەی تیۆریاکانی "کۆپەرنیکۆس" و "گالیلۆ" و "نیوتن"، بە درێژایی سەدەیەکی تەواو. هەموو ئەمەش بەهۆی ئەوەی، بەشێوەیەکی کوێرانە پابەندی ڤاتیکان بوون. بەمجۆرە فێندەمێنتالیزمی مەسیحی بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی "گالیلۆ" و "کۆپەرنیکۆس" بە گومڕا بداتە قەڵەم، لەبەرئەوەی بڕوایان وایە زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکان کە هەموو ساڵێك کلێسا ڕێکی دەخست، بەردەوام بوو لەسەر قەدەغەکردنی دەستاو دەست کردنی ئەو کتێبانەی باس لەوە دەکەن کە: زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە. لەمبارەیەوە "جۆرج گۆسدۆرف" دەڵێت: (بە درێژایی سەدەی هەژدەو بەهۆی هەژمونی بیروباوەڕی ئایینیەوە، زانکۆکانی فەرەنسا لە پێشکەوتنی زانستی فیزیا بێئاگابوون)[8]، وەك ئەوەی پەیبردن بە یاساکانی سروشت سوکایەتیکردن بێت بە هێز و دەسەڵاتی ئیلاهی!...

لەمبارەیەوە وڵاتانی ئیتاڵیا و ئیسپانیا خراپتر بوون، چونکە ئەرسۆدەکسی ئایینی دەسەڵاتی زۆر زیاتر بوو. ئەمەش وایکرد بزاوتی زانستی بە درێژایی دوو سەدە، لەو وڵاتانەدا بوەستێت.. ئیتاڵیا کە لە ماوەی سەردەمی ڕێنیسانسدا لە ڕیزی پێشەوەی وڵاتانی ئەوروپادا بوو، کەوتە دواوە. هەرچی ئیسپانیاشە لەگەڵ پرتوگالدا، وەك دوو دواکەوتووترین وڵاتانی ئەوروپایی مانەوە، هەموو ئەمانەش بەهۆی هەژمونی دەسەڵاتی فێندەمێنتالیزم بوو بەسەریانەوە. بەڵام دوای مردنی "فرانکۆ"، ئیسپانیا توانی کۆت و بەندی فێندەمێنتالیزم و دیکتاتۆریەت تێك بشکێنێت و لە بیست ساڵەی ڕابردووشدا هەنگاوی زۆر گەورەی نا، بۆ ئەوەی بە وڵاتانی پێشکەوتووی دیکەی ئەوروپا بگاتەوە.

شایەنی باسە فێندەمێنتالیزمی مەسیحی تەنها دوای بەستنی کۆڕی (ڤاتیکانی دووەم) لە ساڵی 1962، هەڵوێستی خۆی لەگەڵ "گالیلۆ"و زانستی مۆدێرندا ڕاستکردەوە. ئەوکات چەندین پیاوی ڕۆشنگەری ئایینی خوازیار بوون کلێسا داوای لێبوردن بکات یان پەشیمانی نیشان بدات، بەرامبەر بەو هەڵانەی دەرهەق بە دامەزرێنەری زانستی مۆدێرن کردی.. هەروەها داوایانکرد ئیعتیبار بگێڕێتەوە بۆ "گالیلۆ" و تۆمەتی کوفر و

بێباوەڕی لەسەر هەڵبگیرێت.. بەڵام ئەم کارانە هیچی نەکرا، تەنها لە ساڵی 1982دا نەبێت. واتە دوای تێپەڕبوونی سێ سەدەو نیو بەسەر دادگایکردن و تاوانبارکردنی "گالیلۆ"دا.

شایەنی باسە ساڵی 1979 و بە بۆنەی تێپەڕبوونی سەدەیەك بەسەر لەدایکبوونی "ئەنشتاین"دا، پاپا "یۆحەنا پۆلسی دووەم" ڕایگەیاند کە: (شکۆمەندی و مەزنی گالیلۆ لای هەموان ئاشکرایە، تەواو وەك گەورەی و مەزنی ئەنشتاین. بەڵام جیاوازی نێوانیان ئەوەیە گالیلۆ زۆری چەشت بەدەست کڵێساو پیاوانی کڵێساوە. ئەمەش شتێکە ناتوانین نکوڵی لێبکەین و بیشارینەوە)[9]. بەمجۆرە و سەرەنجام هەقیقەت گرەوی بردەوەو دوای ململانێیەکی تاڵ و تولانی، مەسیحیەتی ئەوروپایی لەگەڵ مۆدێرنەدا ئاشت بوونەوە.

**بوسوێ، ڕابەری فێندەمێنتالیزمی فەرەنسایی:**

بەدرێژایی ئەم کتێبە زیاد لە جارێك ناوی "جاك بنینی بوسوێ" (1627-1704) هاتووە، لە ڕاستیشدا "بوسوێ" نمونەی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی بووە لەوپەڕی کامڵی خۆیدا. دەتوانین بڵێین ئەو لە کارەکتەری خۆیدا، بلیمەتێکی فێندەمێنتالیزم بەرجەستە دەکات. ئەم پیاوە بەشی زۆری تەمەنی لەسەردەمی "لویسی چواردەهەمدا" بردە سەر کە نازناوەکەی پادشای - خۆر بوو، لەبەر زۆری هێز و دەسەڵاتی. مامۆستای شازادەی کۆشکی پاشایەتی بوو، هەروەها ڕاوێژکاری کۆشك بوو. "بوسوێ" ژیرییە دەگمەنەکەیی و ئیمانە کۆنکرێتیەکەی خستە خزمەت دەسەڵات و ئەرسۆدەکسیەتی مەسیحیەوە. خەمی سەرەکی ئەوەبوو حەقیقەتی سەرمەدی ئایینی مەسیحی، نیشانی خەڵك بدات.

بە بۆچوونی ئەویش ئەوەی نوێنەرایەتی ئەو حەقیقەتەی دەکرد، تەنها ئاینزای کاتۆلیکی بوو. ئەو پێی وابوو کڵێسای کاتۆلیکی پارێزەری ئایینی مەسیحیە. بۆیە نابێت هیچ شتێك بۆ ئەو ئاینزایە زیاد بکەین یاخود لێی کەم بکەینەوە، چونکە ئەوە ئاینزایەکی نەمر و هەمیشەیی و سەرمەدییەو نەدەگۆڕێت و نەگەشەش دەکات.. حەقیقەت گەشە ناکات، بەڵکو تا دنیا دنیایە وەکو خۆی دەمێنێتەوە. گاڵتەو لاقرتەکردنی بە کڵێسای پرۆتستانتی کە دەچێتە ژێر باری گۆڕانکاری و مودارای سەردەم و شتە تازەکان دەکات، لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. "بوسوێ" فێندەمێنتالستێکی تەواو بوو، هەوڵێکی زۆری بە خەرج دا تا بیروباوەڕی مەسیحیەت لە کاریگەری زانستی مۆدێرن بپارێزێت.. ئەو لە شوێنێکدا بەوپەڕی شانازییەوە دەڵێت: (من دەربارەی هەر مەسەلەیەك ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆمم نییە، بەڵکو هێندەم بەسە کە دەرهەق بە کۆی کێشەکان، پەیڕەوی بۆچونەکانی کڵێسای کاتۆلیکی دەکەم و بەموو لێیان لانادەم. ئەویش لەبەریەك هۆی سادەو ساکار: کڵێسای کاتۆلیکی بە تەنها خاوەنی حەقیقەتی ڕەهایە و بەدەر لەویش هەرچی ئایین و ئاینزایەکی دیکە هەیە، گومڕاو سەرلێشێواون).

بەمجۆرە "بوسوێ" بەو هەموو بلیمەتی و ڕەوانبێژییەوە کە کەس شانی لە شان نەدەدا،

دژی ئەو شۆڕشە زانستی و فەلسەفی و ئەدەبی و ئایینیــە وەســتایەوە کــە لەســەردەمی ئــەودا سەرەتاکانی بەدەرکەوتبوو. واتە سەرسەختانە دژی وەستایەوەو دەیویست هەر بە ساوایی لە باری بەرێت، بەڵام سەرەنجام شکستی هێنا. چونکە شتەکان کە دەستیان بە گۆڕانکرد دەگــۆڕێن و بزاوتــی مێــژویش بــە کــەس راناگیرێت، بەڵکو هەر کەسێك بەری پێبگرێت رایــدەماڵێت، تەنانــەت گــەر لــە ئاســتی "بوسویێ"شدا بێت.

بەڵام لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە ئەو کەم تا کورتێك توانی کۆسپ بخاتە بەردەم بزاوتی مێژوو یان ڕەوتی مێژوو خاو بکاتەوە. بۆ نمونە توانی لە ئاستێکدا دەنگی "ڕیچارد ســیمۆن" خەفــە بکــات و تەشەنەســەندنی فەلســەفەی دیکــارتیزم ڕابگرێــت. دەربــارەی "بوسـوێ"، "ئەرنسـت ڕینیـان" دەڵێـت: (دوای ئــەوەی بەســەر ڕیچــارد ســیمۆندا ســەرکەوت و فەرمانیـــدا بـــە قەدەغـــەکردن و ســـوتاندنی کتێبــەکانی، بـۆ ماوەیــەکی زۆر لــە فەرەنســادا بـــووە مایـــەی پاشەکشـــەی لێکۆڵینـــەوە مێژوویـیــەکان دەربــارەی تــەورات و ئینجیــل. پاشــان هەڵوەشــاندنەوەی بڕیارنامــەی نانــت، گــورزێکی گــەورە بــوو لــە ڕۆحــی زانســتی. پرۆتسـتانتیەکان تـا ئـەو وەختـە هێزێـك بـوون کاتۆلیکیــەکانیان ناچــار دەکــرد بــە خۆیــان بکــەون و بیربکەنــەوە، بــەڵام دوای ئــەوەی بــە تۆمــەتی کــوفر و گــومڕایی ســەرکوتکران و بــە کۆمــەڵ شــاربەدەرکران، فەرەنســیەکان کــە هــەموویان کاتۆلیـك بـوون تەمبــەڵی دایگــرتن. وایــان لێهــات پێویســتیان بــە بیرکردنــەوە و مشــتومڕ و دیــالۆگ کــردن نــەبوو لەگــەڵ نەیارەکانیانــدا، ئــەویش لەبەرئــەوەی هــیچ ڕکابەرێکیان نەمابوو تا ئەو پرۆسەیەی لەگەڵدا ئەنجام بدەن. بەمجۆرە لێکۆڵینەوە مێژووییەکان تــەواو پــەکیان کــەوت. ســۆربۆنیش کــە تــا ئــەو وەختە کۆلێژێکی تیۆلۆژی ئەرسۆدەکسی بوو، بــەردەوام بــوو لەســەر دژایــەتیکردنی تونــدی لێکۆڵینــەوە مێژوویــەکان)[10]. لێــرەوە ئــیتر کڵێســای کــاتۆلیکی خــۆی لــە بزاوتــی زانسـتی مـۆدێرن دابــڕی و وەك قەڵایــەکی گــەمارۆدراوی لێهــات.. پێیوابــوو بــە داخســتنی دەرگاکــان لەســـەرخۆی، دەتوانێــت بزاوتـــی زانســـت و ســەردەم فــەرامۆش بکــات و بــە ئــارامی پــاڵی لێبداتەوە. بەڵام لەو وەرچەرخانە مێژووییەی لە نێوان سەدەی حەڤدەهەم و سەدەی هەژدەدا ڕویــدا، هۆشــیاری مەســیحی لــە ئــەوروپا قەیرانێکی توندوترسناکی بەخۆیەوە بینی. لەو قۆناغەدا مەسیحیەکان کەوتنە نێوان بەرداشی زانســـت و بەرداشـــی فێنـــدەمێنتالیزم و نەیاندەزانی باوەڕ بە کامیان بهێنن و متمانە بە کامیان بکەن. ئەگەر متمانەی خۆیان بدایەتە زانســت ، ترســی ئــەوەیان هــەبوو دینەکــەیان بـدۆڕێنن، گــەر بــە ئسوڵیەتیشیان بدایــە، ئــەوا دەترسان لە ڕۆحی سەردەم و ڕۆشنایی زانست دابڕێن. بەمجۆرە دوچاری قەیرانێکی گەورە هــاتن کــە بەقــەیرانی هۆشــیاری ئــەوروپایی ناودەبرێــت. کــارێکی هــەروا ئاســان نییــە دەســتبەرداری شــتێك بیــت کــە لــە بــاب و باپیرانتــەوە بــۆت مابێتــەوە، بۆئــەوەی پــەیڕەوی ئەقڵیــەت و بــیرو بۆچــونێکی نــوێ بکــەیت. گۆڕانکــاری لــەمجۆرە ماوەیــەکی دوورو درێــژی

دەوێت و لە شەوڕۆژێکدا ڕوونادات، وەك پێمان وایە.. دابڕان لەگەڵ ڕابردوودا قورس و گران و بەسوێیە، دابڕانی ئەوروپاییەکانیش لەگەڵ فێندەمێنتالیزم و سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر بەسوێ بوو.

پێویستە دابڕانی زانستی مۆدێرن لە ئەوروپا بخەینە چوارچێوەی ئەم سیاقە گشتیەوە، تا تێبگەین کە گەلانی ئەوروپی دوای ژان و ژارێکی زۆر توانیان دەستبەرداری ڕابردوو بن و ئەقڵیەتی نوێ پەسەند بکەن. ئەم دابڕانە بووە مایەی سەرهەڵدانی چەندین ئاقاری وەك: (ماتریالی، پۆزەتڤستی، بێبڕوایی و.. هتد)، لەگەڵ ئاقارێکی ئیمانداری مۆدێرن یاخود مەسیحیەتێکی ئەقڵانی کە لەگەڵ دەسکەوتەکانی سەردەمی ڕۆشنگەریدا خۆی گونجاندبوو. لێرەدا نابێت ئەم ئاقارە بە هێند نەگرین بە بیانووی هەژمون و دەسەڵاتی ئاقاری پۆزەتڤستی، چونکە تاهەنووکەش بەشێکی زۆری ئەوروپاییەکان باوەڕییان پێیەتی و پارتەکانی دیموکرات مەسیحی و حیزبەکانی ناوەند نوێنەرایەتی دەکەن. جگە لەمانەش ئاقاری فێندەمێنتالیزمی ئەرسۆدەکسیش هەرماوە، ئەگەرچی ئەو قەوارە جەماوەرییە زۆرەی جارانی نەماوە. لە ڕووی سیاسییەوە ئەم ئاقارە بە باڵی ڕاستی توندڕەوەوە گرێدراوە (بۆ نمونە بڕوانە پەیوەندی کاتۆلیکە توندڕەوەکان بە ڕاسیستەکان لە فەرەنسادا). ئەمانە ئەو ئاقارە سەرەکیانەن کە بەدرێژایی سێ سەدەی ڕابردوو، بکەری سەرەکی ململانێ فیکرییەکانی ناو ئەوروپا بوون. "بوسوێ" دەیویست بەگژ ئاقاری مۆدێرنەو زانستدا بچێتەوە، بەڵام سەرەنجام شکستی هێنا. ڕاستە بۆماوەیەك و بەهۆی ئەو ڕێسا سۆسیۆلۆژیە گەورانەی فێندەمێنتالیزم لەو ماوەیەدا خاوەنی بوو سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەڵام بەرەبەرە و لە ماوەی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا ڕۆشنگەری پێگەی خۆی قایمدەکرد. تا لەسەر ئاستی میللیش ڕۆشنگەری لایەنگری زیاتر بوایە، فێندەمێنتالیزم دەوری چۆڵتر دەبوو، تا گەیشتینە ئەوەی لەمڕۆدا دەیبینین[11].

لە دەوروبەری ساڵی 1680دا، "بوسوێ" دەقاودەق دەنوسێت: (تەواوی زانستی مرۆڤایەتی لای خوا بەتاڵە. لێرەشدا نابێت جیاوازی لە نێوان زانایەکی ژیر و زانایەکی دەبەنگدا بکەین، لەبەرئەوەی مەزنترین زیرەکی ئینسانی لەسەر ڕوی زەوی لای یەزدان جەهلێکی ڕوتە)[12]. هەروەها دەڵێت: (تەواوی زانست و زانیاری مرۆڤی مەسیحی، لە خاچەکەی یەسوعدایە)[13]. "بوسوێ" تەنانەت "مالبرانش"یشی بەدڵ نییە، ئەگەرچی ئەویش وەك خۆی ئیماندارێکی مەسیحی بوو. بەڵام بۆچی؟ لەبەرئەوەی "مالبرانش" زیاد لە پێویست دەرگیری فەلەسەفەی دیکارتیزم بوو، لە هەوڵی ئەوەشدا بوو لەگەڵ عەقیدەی مەسیحیدا بیگونجێنێت، واتە بەکورتیەکەی دەیویست ئیمانی مەسیحی ئەقڵانی بکات. لێرەوە کەوتە سۆراخکردنی هۆکاری سروشتی و لێکدانەوەی زانستی بۆ ئەو پەیجورانەی لە تەورات و ئینجیلدا هاتبوون. "بوسوێ" ئەمانەی بۆ قوت نەدەچوو، لەبەرئەوە زۆر بە توندی دابەزییە سەر "مالبرانش".

"بوسویێ" ڕاستەوخۆ لەبەرامبەر دوو بەرەدا خۆی بینییەوە: زانستی میکانیکی و لێکدانەوەی مێژوویی بۆ تێکستە پیرۆزەکان. هەریەك لەم دوو ئاقارە دەیانویست موعجیزەکان بە درۆ بخەنەوەو هەموو شتەکان بگێڕنەوە بۆ لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی سروشتی و مێژوویی. ئەو دوو ئاقارە بەم کارەیان لە هەژموون و دەسەڵاتی زانستی یەزدانی کەم دەکەنەوە. بۆیە "بوسویێ" هۆشداری دەدات کە ئەم مرۆڤە لوت بەرز و لە خۆباییە، دەست وەردەداتە کاری یەزدان و دەیەوێت هەموو شتێك بزانێت و هەموو شتێکیش شرۆڤە بکات.

لێرەدا پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان ئاینزای کاتۆلیکی و ئاینزای پرۆتستانتی، لەناو ئایینی مەسیحیدا. پرۆتستانتیەت زیاتر کراوەترو خوازیاری زانست بوو، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەم ڕاستیانەی لای خوارەوەیە:

-لە کاتێکدا زانای پرۆتستانت مەزهەب "ئیسحاق نیوتن"، کتێبە گرنگەکەی (پرانسیپەکانی فەلسەفەی سروشتی) بلاودەکردەوە، "بوسویێ" ڕابەری فێندەمێنتالیزمی کاتۆلیکی کتێبی (مێژوی ڕاپەڕی و ناجێگیری کلێسا پرۆتستانتیەکان)ی چاپدەکرد، تیایدا ئەوە بۆ پرۆتستانتیەکان بە نەنگی لەقەڵەم دەدات کە بەردەوام دەگۆڕێن و بەتەنگ گۆڕانکاری و بەرەو پێشچونەکانی زانستەوەن و هەوڵدەدەن لەگەڵ ئاییندا بیگونجێنن. واتە "بوسویێ" گۆڕان و نوێبونەوە، بەلاوازی و ڕسوایی دەزانێت.

-هەروەها سەروەختێك کتێبەکانی "کۆپەر نیکۆس" و "گالیلۆ" و "دیکارت"، بە شێوەیەکی فەرمی لە ولاتانی کاتۆلیکیدا قەدەغەبوون، ولاتانی پرۆتستانتی بە گەرمی پێشوازییان لە تیۆریا زانستیە مۆدێرنەکان دەکرد، لەوانەش تیۆریای کێشکردنی گەردونی.

-لەلایەکی ترەوە، کاتێك ولاتانی کاتۆلیکی کتێبی زاناکانیان قەدەغەدەکرد و ناچاریان دەکردن دوو ڕووبن و خۆیان بخۆنەوەو درۆ بکەن، هەر کاتێکیش کەشفێکی زانستیانەیان کرد هەست بە تاوانێك بکەن، لەم کاتەدا ولاتانی پرۆتستانتی ڕێزی لە زاناکانی دەنا و توێژینەوەکانی بۆ بلاودەکردنەوە. پرۆتستانتەکان وەکو کاتۆلیکیەکان وا لە زانست نەگەیشتبوون کە دژی ئایین بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە. با بۆ ئەمە ئینگلتەرا بە نمونە بێنینەوە. ئینگلتەرا چاکترین نمونەیە بۆ هاوکاریکردنی نێوان زانست و ئایین. زۆرینەی ئەو ولاتە پرۆتستانت مەزهەبن و پیاوانی ئایینی لەوێ، لەو کەسانەبوون کە هانی بزاوتی زانستیان دەدا. واتە ئەوان ترسی ئەوەیان نەبوو، گەر زانست بەهێز بێت و بلاوبێتەوە ئیتر ئیمان کالدەبێتەوەو نامێنێت. دیارترین نمونەش لەمبارەیەوە، قەشەی ئەنگلیکانی "جۆن ویلکنز"ە (1614-1672). ئەم پیاوە لەگەڵ "بوسویێ"دا هاوسەردەم بوون و لەیەك قۆناغدا ژیاون. بەمەبەستی ئاسانکردنی تیۆریا فیزیای و گەردونییەکانی "گالیلۆ"، چەند کتێبێکی بلاوکردۆتەوە. یەکێك لە کتێبە گرنگەکانی لە ساڵی 1638 دا بە چاپ

گەیانـدووه، واتـه تـەنها پێـنج سـاڵ دوای سـەرکۆنەکردنی "گـالیلۆ" لەلایـەن کلێسـای کاتۆلیکیەوه. هەروەها قەشەیەکی تر هەیە بە ناوی "تۆماس سبرات" کە لە هەمان سەردەمدا ژیاوەو ساڵی 1667 کتێبێکی بەناونیشانی (مێژوی کۆمەڵەی پاشایەتی لە لەندەن) بڵاوکردۆتەوه، تیایدا خەڵك دڵنیا دەکاتەوە لەوەی ترسیان لە ناکۆکی نێوان زانستی نوێ و ئیمان نەبێت. لەم کتێبەدا پێیان دەڵێت: (ئەو زانستەی جێی پەیجورەکان دەگرێتەوە، زۆر لە موعجیزەکان زیاتر مەزنی و دەسەڵاتی یەزدان دەسەلمێنێت). هەروەها دەڵێت: (زانایان بەشێوەیەکی قوڵتر و توند بڕوا دەهێنن).

شایانی باسە بۆچونی ئەم پیاوە ئایینییە، لەگەڵ "فرانسیس بیکۆن"ی ڕابەری زانستی نوێ لە ئینگلتەراو تەواوی ئەوروپادا هاوجووت بوو. ئەم فەیلەسوفە (واتە – فرانسیس بیکۆن)، دوو کتێبی گرنگی بڵاوکردەوە: (پێشکەوتنی زانست – ساڵی 1604، یاسای زانستی نوێ – 1620)، هەردوو ئەم کتێبە وەکو مانیفێستی ڕۆحی زانستی نوێ سەیر دەکران. "بیکۆن" هەموو دەستتێوەردانێکی کلێسا لە کایەی زانستی ڕەتدەکاتەوەو تەواوی کۆسپ و تەگەرە تیۆلۆژیەکانیش ئافەرۆز دەکات. بە بۆچوونی ئەو تەنها شتێك بتوانێت خۆی لە بواری زانستدا بسەپێنێت، ئەو شتەیە کە لەسەر ئەزموون و تێبینی و بەڵگەی ئەقڵی دامەزرابێت.. هەروەها دەڵێت: (لەمڕۆ بەدواوە نابێت شکۆ و دەسەڵاتی ئەرستۆ[14] یاخود کتێبە پیرۆزەکان بەکاربێنین، بۆ کۆسپ خستنە بەردەم پێشکەوتنی زانستی). ئەمە بۆ کاتی خۆی هەڵوێستێکی زۆر بوێرانەبوو کە هیچ زانایەکی کاتۆلیکی نەیدەوێرا بە ئاشکرا باسی لێبکات، (بۆ نمونە بڕوانە حاڵی دیکارت کە هاوسەردەمی فرانسیس بیکۆن بوو، چۆن چۆنی لە ترسی تۆڵەی فێندەمێنتالیستە کاتۆلیکیەکان، بۆچونە هەقیقیەکانی خۆی دەشاردەوەو بەوریاییەوە باسی لێدەکردن).

### فەیلەسوفە مەزنەکان چۆن لە مێژوودا دەردەکەون، سپینۆزا وەك نمونەیەك:

"سپینۆزا" ساڵی 1632 لە بنەماڵەیەکی یەهودی و لە شاری ئەمستردامی پایتەختی هۆڵەندا هاتۆتە دنیاوە. دوای ئەوەی یەهودیەکان لەو سەردەمەدا دوچاری چەوساندنەوەیەکی زۆر دڕ بوون لە لایەن مەسیحیەکانەوە لە ئیسپانیاو پورتوگال، بنەماڵەکەی "سپینۆزا" پورتوگال جێدێڵن و ڕودەکەنە هۆڵەندا. هۆڵەنداش لە هەموو وڵاتە ئەوروپیەکانی دیکە لیبراڵی تر و سنگ فراوانتر بوو بەرامبەر بە ئاینەکانی دیکە. لەبەرئەوە ڕێگایان بەو جالیە یەهودیەی ناو ئەمستردام دا بۆ ئەوەی پەرستگاو خوێندنگای تایبەتی خۆیان هەبێت و ڕێوڕەسم و سروتە ئاینیەکانی خۆشیان جێبەجێبکەن. "سپینۆزا" لەنێو ترادسیۆنی یەهودیدا پەروەردە بوو، تەوراتیشی بە زمانی ئەسڵی (واتە بە عیبرانی) خوێندو تەنانەت ئامادەشیان دەکرد بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا ببێتە حاخامێك! بەڵام بێئاگا بوون لەوەی دواتر لە هەموو ئەوانە هەڵدەگەڕێتەوەو فەلسەفە دەکاتە ئاینی خۆی.

جێـی باسـە "سـپینۆزا" لـە سـەرەتادا گوێڕایـەڵی پیاوانی ئـاینی بـوو، بـە مەبەسـتی بەجێگەیانـدنی سـروتە ئاینیـەکانیش لەگـەڵ هاودینەکانیـدا سـەردانی (کنـێس)ی دەکـرد. پاشان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەستی کرد بە خوێنـدنی فەلسـەفەی یـەهودی و بـە تایبـەتی کەوتـە خوێندنـەوەی کتێبـەکانی فەیلەسـوفی یـەهودی عـەرەبی "ئـیبن مـەیمون". "سـپینوزا" تینـوی زانـین بـوو دەیویسـت هەرچـی زوە فێـر ببێـت، بۆیـە شـتێکی چـاوەڕوانکراو بـوو کـە درەنگ یان زوو خـۆی لـەو ترادسیۆنە یەهودیە قوتار بکات کە دەیانویست لە ناویدا زیندانی بکـەن، وەك ئـەوەی سـەرجەم ئـاین و ئاینزاکـان دەرهـەق بـە شـوێنکەوتوانی خۆیـان دەیکـەن. حاخامـە جولەکـەکان لـە ڕووی سـەختی و توندڕەویـەوە هیچیان لـە قەشـە مەسـیحیەکانی ئیسپانیا کـەمتر نـەبوو! بـەڵام یەهودیـەکانی نـاو ئەمسـتردام نەیانـدەتوانی لـەو شـارەدا بـە تەواوەتی بەسەر خۆیاندا دابخرێن، چونکە کەم تـا زۆر کاریگـەریـە دەرەکیـەکان دەسـتیان پێیـان دەگەیشـت و کاریگـەریان لەسـەر جێـدەهێڵان.. بەتایبـەت لـەو سـەردەمەدا هۆڵەندا پڕی بوو لـە ئـاین و مەزهـەبی جۆراوجـۆرو دەوڵـەتی هۆڵەنـدی ئازادیـەکی زۆری دابـوە هـەموو ئاینەکانی ناو ئەو وڵاتە.

ڕاستە ئـەو ئـاینزا ڕەسمیـەی باڵادەست بـوو ئاینزای پرۆستانتی بوو، بەڵام لە هـەمان کاتـدا مەزهـەبی کـاتۆلیکیش ڕێگـای پێـدرابوو، واتـە کڵێساکانی ئەمانیش کراوە بوون و دەیانتوانی بـە ئاشـکرا سـروت و ڕێـو ڕەسمـە ئاینیـەکانی خۆیـان جێبەجێبکـەن، بـەڵام لەوکاتەدا ئازادی مەزهەبی لە فەرەنسادا مـەحاڵ بـوو. بـوونی فـرە ئـاینی و فـرە مەزهـەبی لـە هۆڵەنـدادا، دەسـتی لـە هێورکردنـەوەی ئـەو توندوتیژیە دۆگماتیستیە ئاینیە تاك مەودایەدا هەبوو کە زۆرجار لەو وڵاتانەدا هەیە کە خاوەن یـەك ئـاین و یـەك ئـاینزان و خۆیـان وەکـی حەقیقەتی ڕەها نیشان دەدەن.

لـەو هۆکارانـەی دەسـتی لـە ئـازادی فیکـری "سـپینۆزا"دا هـەبوو، هامشـۆکردنی قوتابخانەیـەکی مەسـیحی بـوو لـە شـاری ئەمستردام. وەکـی لێـی دەگێڕنـەوە "سـپینۆزا" لەوێـدا دەکەوێتـە داوی خۆشەویسـتی کچـی بەڕێوەبـەری ئـەو قوتابخانەیـە، بـەڵام کاتێـك دەچێتە خوازبێنی نایدەنێ و دەست دەنێن بە ڕوویـەوە. دواتـر ئـەم کچـە دەبێـت بـە نسـیبی پیـاوێکی پرۆتسـتانت مەزهـەب کـە واز لـە ئاینزاکەی خۆی دێنێ و دەچێتە سەر مەزهەبی کاتۆلیکی کە مەزهەبی ئاینی کچەکەیە، هەموو ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو کچەی لە کیس نەچێت! هەر لەم قوتابخانەیەدا "سپینۆزا" فێری زمانی لاتینـی دەبێـت کـە لـەو دەورو زەمانـەدا زمـانی زانسـت بـوو. ئەمـەش دەرفـەتی ئـەوەی بـۆ ڕەخساند تا لە بەرهەمی فەیلەسوفە نوێیەکانی وەك "فرانسـیس بیکـۆن"(1561–1626) و "تۆماس هـۆبز" (1596–1650) ئاگـادار بێـت. وەك ئاشکراشـە لـەو سـەردەمەدا لایـەنگران و نـەیارانی فەلسـەفەی دیکـارتیزم لـە شـەڕو ململانێیـەکی تونـددا بـوون لەگـەڵ یەکتریـدا، هۆڵەنـداش مەڵبەنـدی بـەپیترین مشـتومڕی فەلسـەفی بـوو. زمـانی لاتینـی یارمـەتی "سـپینۆزا"ی دا بـۆ ئـەوەی لـەو ترادسـیۆنە

تیۆلۆژیــە بەرتەســکەی خــۆی بچــێتە دەرێ و هاوکات دەرگاکانی زانست و فەلسەفەی نوێشی بـە ڕودا کـردەوە، بـەڵام هامشـۆی لەگـەڵ ئـەو ژینگـە فەلسـەفیانەدا وایلێکـرد ببێتـە جێگـە گومـانی "کنـێس"ی یـەهودی و یەهودیـەکانی هۆڵەندا بە گشتی. یەهودیەکانی هۆڵەندا هـەر هـەموویان لـە دەوری (کنـێس) کۆبووبوونـەوە، چونکە ئەو دەیتوانی ڕێکیان بخات و یەکڕیزیو پەیوەندی نێوانیان بپارێزێت، هەروەها (کنێس) دەیتوانی بیروباوەڕی تەقلیدی لە نەوەی کۆنەوە بگوازێتەوە بۆ نـەوەی نوێ. "سپینۆزا" بەهۆی خۆخـەریکردنی بـە مەسـەلە فەلسـەفیەکانەوە، جارجارە نـەبێت هامشـۆی (کنـێس)ی نـەدەکرد. چەندێ زیاتریش لە فەلسـەفەدا قوڵ بوایەتـەوە، هێندە لە ئاین دوردەکەوتـەوە. ئەمـەش سـەرانی ئــاینی یــەهودی نیگــەران کــردو بــەر لــە تـەکفیرکردنو دەرکردنـی لـە ڕیزەکـانی خۆیـان، چەند جارێك ئاگاداریان کردەوە.

پێدەچێت ئـەم تەکفیرکردنـەی زۆر ناڕەحـەتی نــەکردبێت، بــەڵکو بــەلای ئــەوەوە ئــامرازی ڕزگــــاربوون بووبێـــــت تـــــا لەدەســــــت ئەرسۆدەکسـیـەتی ئـاینی قوتـاری بێـت و بـای بـاڵی خـۆی بـدات لـە پێنـاو گـەڕان بـەدوای حەقیقەتـدا، ئـەویش تـەنها بـە وزەو توانـا تایبەتیـەکانی خـۆی. دوای ئـەوەی لـە سـاڵی 1656دا فـەتوای تـەکفیرکردنیان دەرکـرد، مـافی میراتــی بنەماڵەکــەی لەدەســت داو تەنانــەت مانـەوەی لـە ئەمستردامیشـدا زەحمـەت بـوو، بـە تایبەت دوای ئەوەی سەرانی ئاینی مەسیحی و یەهودی لەو شارەدا ڕێکەوتن لەسەر دەرکردن و وەدەرنـانی. پێدەچـێت لـەو کاتـەدا دوچـاری هەنـدێ کێشـەی مـادی بووبێـت و خـۆی فێـری پیشەی چاویلکەسازی کردبێت بۆ ئەوەی بژی، بەڵام وەکی "کارل یاسبەرز" باسی دەکات ئەو کـارە بەشـی گـوزەرانی نـەکردوەو نـەیتوانیوە لەسەری بژی، بەڵکو بەو یارمەتیانە ژیاوە کە لـە هەنـدێ هـاوڕێی پـارەدار و دەوڵەمەندیـەوە بـە دەستی گەیشتوە.

ساڵی 1660 ڕودەکاتە گوندێکی دەوروبەری شــاری (لایــدن) و بەرلــەوەش چــوار ســاڵ لــە گەڕەکــەکانی ئەمســـتردامدا ژیــاوە. (لایـــدن) مەڵبەنــــدی مەســــیحیە لیبرالیـــەکان بـــوو، پــاش ئــەوەی بلیمــەتییان تێــدا بــەدی کــرد پێشـوازیان لێکـردو گرتیانـە خۆیـان. ئەوانـەی لـەو سـەردەمەدا لـە هـەموو چین و توێـژەکانی مەســـیحیەت ڕادیکـــاڵتر و ئـــازادتر بـــوون و بڕوایـان بـە عەقیـدەو سروتە ئاینیـەکان نـەبوو، بــــەڵکو تـــــەنها مومارەســــەی دینداریـــــەکی نـاوکۆیی ئازادیـان دەکـرد کـە لەسـەر فیکـر و ئاکـــــار و ڕۆحانیـــــەتێکی پـــــاك و بێگـــــەرد دامـەزرابوو.. بۆیـە ئاسـایی بـوو "سـپینۆزا" لەگەڵیانـدا هـەڵبکات و بـەنزیکترین کەسـیان بزانێـت. تـا سـاڵی 1663 (بـەرواری دەرچـونی یەکـەمین کتێبـی) لـە (لایـدن) مایـەوە، ئەمـەش تـەنها کتێبێکیـەتی نـاوی خـۆی لەسـەر بێـت و ناونیشانەکەشـی (پرانسـیپەکانی فەلسـەفەی ڕینیـە دیکـارت)ە. بڵاوبونـەوەی ئـەم کتێبـە لـە شــاری ئەمســتردام بــوە مایــەی ناوبــانگ دەرکردنی، چونکە تا ئەوکاتە ژمارەیەکی کەمی هاوڕێی خـۆی نـەبێت کەسی دیکە نەیدەناسی. سـاڵی 1663 (لایـدن) جێـدێڵێت و ڕودەکاتـە (لاهای) کە لـەو سـەردەمەدا پایتـەختی هۆڵەندا

یـان لانـی کـەم مەڵبەنـدی بارەگـای حکومـەتی ئەو وڵاتە بوو.

بـە نیشـتەجێبونی لـە (لاهـای)، "سـپینۆزا" کەوتە پەیوەندی بەستن و نامەگۆڕینـەوە لەگـەڵ زانـــای مـــەزنی بـــواری فیزیـــا "هـــۆیگین" و "ئۆڵدینبێرگ"ی سکرتێری کۆمەڵەی پاشایەتی بـەریتانی و ناوەنـدە سیاسـیەکان. هـەر لـەم سـەروبەندەدا لەگـەڵ "جـان دۆڤیـت"ی سـەرکردەی حیزبـی لیبرالـەکان و فـەرمانڕەوای هۆڵەنـدا ئاشـنایەتی پەیـداکرد. "دۆڤیـت" موچـەیەکی مانگانـەی بـۆ بڕیـەوە تـا بتوانێـت لەسـەر توێژینـەوەو تێڕامانـە فەلسـەفیەکانی بـەردەوام بێـت. لەوکاتـەدا بۆ ماوەیـەك وازی لـە نوسینەوەی کتێبە سەرەکیەکەی (ئاکار) هێنا، بۆ ئەوەی خۆی بۆ نوسینی ئەو بابەتانە تەرخان بکـات کـە زیـاتر پەیوەنـدیان بـە کێشـە سیاسیەکانەوە هەبوو. سەرەنجامیش ئەوە بوو کتێبـە بەناوبانگەکـەی (وتارێـك دەربـارەی تیۆلۆژیـای سیاسـی)* بـەبێ نـاوی خـۆی و بەناوێکی ساختەی بڵاوکەرەکەیەوە لە چاپدا.. بۆ ئـەوەی خـۆی لـە دەستدرێژی و ڕاوەدونـانی نـەیارەکانی بپارێزێـت، پـەنای بـردە بـەر "جـان دۆڤیـت"ی هـاوڕێی کـە لـەو سـەردەمەدا سـەرۆکی حکومـەتی هۆڵەنـدا بـوو, بـەڵام تیرۆرکردنی "دۆڤیت" و براکەی لە ناوجەرگەی (لاهـای)دا لەلایـەن هەنـدێك ئاژاوەچـی دەمارگیرەوە، "سـپینۆزا"ی کەلـەیی کـردو ئـەو کارە بـۆ ئـەو نەهامـەتی و نشوستیەکی گـەورە بـوو. دوای ئـەوە زیـاتر گۆشـەگیر بـوو بەسـەرخۆیدا داخـراو تـەواوی تواناکـانی خـۆی تـەرخانکرد بـۆ تـەواوکردنی کتێبـی (ئاکـار) و داڕشـتنەوەی فەلسـەفەکەی بـۆ دوایـن جـار. لەبەرئـەوە داوایـەکی زۆر گـەورەی یەکێك لە ئەمیرەکانی ئەڵمانیای ڕەتکردەوە، بۆ ئەوەی لە زانکۆی (هایدڵبێرگ)دا وانە بڵێتەوە و لـە بەرامبـەردا ژیـانی زاهیـدی و ئاسایی بـەلاوە باشتر بوو.

هەرچـەندە ئەڵمانـەکان بـەڵێنی ئـازادی زۆریـان پێدابوو لـە کـاتی وتنەوەی وانەکانیـدا، بـەڵام ئـەو لـە وەڵامـدا پێـی وتبـوون: (ئـازادی فەلسـەفی سـنوری بـۆ نیـە، یـان دەبێـت زۆر ئازادانـە بیربکەینـەوە یـان هـەرگیز بیرنەکەینـەوە..) سـاڵی 1675 بـە مەبەسـتی چـاپکردنی کتێبـی (ئاکـار) ڕودەکاتـە شـاری ئەمسـتردام، بـەڵام کـە دەزانێـت پیـاوانی ئـاینی لـەخۆ ئامادەکردنـدان بـۆ ئـەوەی بـە تۆمـەتی ئیلحـادو بێبـاوەڕی فەتوایـەکی لـە دژ دەربکـەن، کتێبەکـەی لـە چـاپخانە دەکێشـێتەوە. سـاڵی 1677 و لـە تەمـەنی چل و پێنج ساڵی و پـاش نیوەڕۆی ڕۆژی یـەك شـەممە، بە نەخۆشی سیل کە زۆر لە زوەوە توشی بووبوو ژیان جێدێڵێت.. ئەگەرچـی "سـپینۆزا" تەمـەنی لـە چـل و پێـنج سـاڵێك تێپـەڕی نـەکردبوو، بـەڵام مێـژوو وەکـی یەکێك لە گەورە فەیلەسوفانی دنیا ناوی تۆمار کـرد. نیـو سـەدە دوای مردنـی یـەکێك لـە تیۆلۆژیسـتە مەسـیحیەکان ئـەم دەسـتەواژەیەی نوسـی تـا وەکـی بەڵگەیـەك لەسـەر گۆڕەکـەی دابنرێـت: (سپینۆزا لێرەدا نێژراوە، تـف بکەنـە سەر گۆڕەکەی!..).

جێـی باسـە پیـاوانی ئـاینی لـە کتێبەکـەی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیای سیاسی)، خۆش نەبوون و یەکێکیان بەم جۆرە وەسفی دەکات و

دەڵێــت: (ئــەم کتێبــە گــەورەترین کــوفرە لــە مێژوودا! چونکە نوسەرەکەی تیایدا سوکایەتی بە پێغەمبەرو حەوارییەکان دەکات). "سپینۆزا" پێیوایــە هــەرگیزاو هــەرگیز مــوعجیزە ڕوی نەداوەو مەحاڵیشە ڕوبدات، چونکە سستمێکی توندوتۆکمەی وا لە سروشتدا هەیە کەس لە دەستی دەرباز نابێت. لە ڕاستیدا "سپینۆزا" سکانداڵی سەردەمێك بوو، بەڵام هاوسەردەمانی خــۆی تــەنها وەك بێبــاوەڕێکی دەمامکــدار سەیریان دەکرد. تەنانەت دوای دوو سەد ساڵ لە مردنیشی هەر بە ڕیسوایی سەردەمەکانی دیکەش مایەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی وشەی (یەزدان) لە هیچ کتێبێکی فەلسەفی تردا بەو زۆری و بەردەوامیــە دووبــارە نەبۆتــەوە، وەك ئەوەی لە کتێبی (ئاکار)دا هاتوە! بەڵام دوای ئەوەی هۆڵەندیەکان لە سەنگ و قورسایی "ســـپینۆزا" گەیشـــتن, پەیکـــەرێکیان لـــە بەناوبانگترین گۆڕەپانە گشتیەکان و لە نزیك ئەو خانوەی لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا تیایدا بوو بۆ دروستکرد.

پرۆفیســـۆر "جـــۆزیڤ مـــۆرۆ"[15] لـــە کتێبەکەیدا کە ئێمە لە ئامادەکردنی ئەو کورتە باسە مێژووییەدا دەربارەی ژیانی "سپینۆزا" سودمان لێبینیوە، دەڵێت: "ئەرنست ڕینان" لەو وتارەیدا کە بە بۆنەی پەردەلادان لەسەر پەیکەرەکەی "سپینۆزا" پێشکەشی کرد و ژمارەیەکی زۆری زاناو بیریار ئامادەی بوون، ستایشێکی گەرمی کرد و بەم چەند وشەیەش وتارەکەی کۆتایی پێهێنا. ڕەنگە کەس لە نزیکەوە یەزدانی نەدیبێت وەکی ئەوەی لەوەوبەر و لێرەدا "سپینۆزا" بینیویەتی!! ئەم مرۆڤەی بە ئیلحادو بێباوەڕی تاوانبار کرا، گومانی تێدا نیە لە زۆربەی زۆری پیاوانی ئاینی سەردەمی خۆی لە یەزدان (واتە لە حەقیقەت)ەوە نزیکتر بوو..

"سپینۆزا" لە پاکی و سەرڕاستی و زاهیدی لە ژیاندا، نمونەی بەرزی فیکری فەلسەفی بوو.. ئەو قسەیەی "ڕینان" جوانەو زۆر لە جێی خۆیدایە، لەبەرئەوەی کێشەی یەزدان خەمی گەورەی "سپینۆزا" بوو. ڕاستە تێڕوانینی ئەو بۆ یەزدان جیاواز بوو لە دیدگای تیۆلۆژی تەقلیـــدی، بـــەڵام تێڕوانینێکـــە شایســـتەی لێقوڵبونـــەوەو تێڕامانـــە. ســـەرەڕای ئـــەوەش بەرگریکردنی "سپینۆزا" وەکی فەیلەسوفێك لە ئازادی بیروڕاو فیکر و باوەڕ و بانگەشەکردنی بۆ جیاکردنەوەی ئاین و پیاوانی ئاینی لە سیاسەت و شکۆبەخشینی بە ئەقڵ و فیکری فەلسەفی، دواتر دەبنە یەکێك لە دەسکەوتە سەرەکیەکانی مۆدێرنەی خۆرئاوا.

**سپینۆزا لە ئاوێنەی هاوسەردەمەکانیدا:**

"سپینۆزا" گەورەترین بیریاری ڕادیکالی بـــووە لـــە ســـەردەم و ڕۆژگـــاری خۆیـــدا، ڕادیکالیەتەکەی بە ئەندازەیەك بووە کەس نەیتوانییوە لە حەقیقەتی تێبگات. تەنانەت چەند سەدەیەکی ویست تا خەڵك تێی بگەن و لێـی حـاڵی بـن.. ئەمــەش وا دەکــات ئــەو بیریارانەی پێشوەختی خۆیان دێن، ئازارێکی زۆر بچێژن و هەســت بەنامۆییــەکی کوشــندە بکەن. ئەوانە وا هەستدەکەن وەك ئەوەی لە بیابانێکدا بژین، چونکە نەکەس بە دەنگیانەوە

دەچێت و نەکەس گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات و نەکەسیش دەگاتە ئاستیان. لە پای ئەمەدا "سپینۆزا" ژیانێکی نهێنی و گۆشەگیرانە ژیا. لە ناو تەواوی ئەو دیکارتیزمانەی لە سەدەی حەڤدەدا ژیان و بەتایبەتیش "مالبرانش" (1638-1715)، "لایبنتز" (1646-1716) لە هەموویان ئەقڵانیتر بوو. تەنانەت زۆر لە "دیکارت" زیاتریش ئەقڵانی تر بوو، لەبەرئەوەی "دیکارت" زاتی ئەوەی نەکرد میتۆدی ئەقڵانی بەسەرترادسیۆنی ئایینیدا پراکتیزە بکات، بەڵام "سپینۆزا" پرکێشی کردو ئەقڵانیەتی بەسەر ئایینی یەهودی و مەسیحیدا پراکتیزە کرد.

"سپینۆزا" تەواو ئەقڵانی بوو، واتە متمانەیەکی بێئەندازەی بە ئەقڵ هەبوو. هەر لەبەرئەمەش هاوسەردەمەکانی لێی تۆقیبوون. ئەوان پێیان وابوو ئەم پیاوە گەورەترین سکاندالە لە مێژووی فیکردا، تەنانەت دوو سەدەش دوای مردنی هەروا مایەوە. ئەو بۆمبێکی چێنراو بوو، بۆمبی فیکری بە هەموو لاکاندا تەقاندەوەو تەڕو وشکی لە ڕێی خۆیدا سوتاند، بۆ ئەوەی لە هیچەوە دەست پێبکات. بە گژ تەواوی ئەو ئایین و ئاینزایانەدا چووەوە کە لە سەر چەمکی (ئایینی هەق) شەڕی دەستەو یەخەیانبوو، ئەمەشی بۆ ئەوە کرد تا لە دەرەوەی هەرچی ئایین و ئاینزا هەیە پانتاییەکی فیکری بۆ خۆی چێ بکات.

"سپینۆزا" لە هەلومەرجی ململانێی تیۆلۆژی و مەزهەبی و دەستەگەری وەڕس بووبوو، دەیویست بەیەکجارەکی لەو دۆخە پڕ لە کین و بوغزە تیۆلۆژیە قوتاری بێت و کەشێکی فیکری دیکە بۆ خۆی دروست بکات.

ئەم ئایین و ئاینزایانەی بەردەوام باس لە یەزدان و مۆراڵ و فەزیلەت دەکەن، هەر ئەوانن شەڕی ناوخۆیی و مەزهەبی لە نێوان ئەندامانی یەك میللەتدا بەرپا دەکەن. نەك تەنها لە هۆڵەنددادا، بەڵکو لە سەرجەم کیشوەری ئەوروپادا!! پیاوانی ئایینی لایەنگرانی مەزهەب و ئایینی خۆیان پڕ دەکرد، لە دژی ئەوانی دیکە کە سەر بە ئایین و ئاینزای جیاواز بوون. بۆ نمونە بە ناوی ئایینی ڕاستەقینەوە، یەهودی مەسیحی بە نەفرەت دەکرد و مەسیحیش هەمان شتی لەگەڵ یەهودیدا دووبارە دەکردەوە!! بەمجۆرە کاتۆلیکیەکان پرۆتستانتەکانیان تەکفیر دەکرد و پرۆتستانتەکانیش، کاتۆلیکەکانیان بە گومڕاو سەرلێشێواو ناوزەد دەکرد. لە نێوان ئەمانەدا شەڕ و شۆڕی خوێناوی و بێئامان قەوما کە ئەوروپای پارچە پارچە کرد و لاوان و ئابووری و داهاتووی ئەو وڵاتانەی لەناو برد. لەوەها هەلومەرجێکدا "سپینۆزا" کتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت)ی نوسی. ئەم کتێبە لە مێژووی فیکری خۆرئاوا و تەنانەت فیکری مرۆڤایەتیشدا دابڕانێك دروست دەکات، لەبەرئەوەی بۆ یەکەمجار پرکێشی ئەوەی کرد لە گۆشە نیگایەکی مێژووییەوە تاوتوێی ئایینەکان بکات. ئەوە بۆ یەکەمجار بوو لە مێژووی خۆرئاوادا، کتێبێك دەربچێت کە تەنانەت پیرۆزی لەبەر تێکستە پیرۆزەکان دابماڵێت!!... ئەو "سپینۆزا"یە دڕندەیەکی فەلسەفی بوو، لە ژێر پەردەی ئەو سیما هێمن و ئارامەیدا گڕکان یان

زەمین لەرزە یاخود بۆمبێکی چێنراو خۆی مەڵاس دابوو.

کەواتە سەیرنییە کە هاوسەردەمەکانی بە کافر و بێباوەڕیان زانیووەو فەلسەفەکەشیان بەتێکو پێکدەری بنەما تەقلیدیەکانی ئایین و مۆراڵ و دەوڵەت داوەتە قەڵەم، لەبەرئەوە تەرێزیان لێکردو و لێی تەکینەوە.. تەنانەت دیکارتیستەکانیش حاشایان لێکرد، تالەناو خەڵکیدا بەدناونەبن و ناوبانگیان نەزڕێت. هەرکەسێکیش بێلایەنانە باسی کردبێت و نەچوبێتە ژێر باری ئەوەی سوکایەتی پێبکات، ئەوا بە گومانکردن لە دامەزراوی بیروباوەڕی کەوتوونەتە ڕاوەدونان و ئازاردانی.

"سپینۆزا" وەکو خەڵك و خوا دەیانوت، پیاوێکە بیروباوەڕ لە دڵیدا نییە، کەواتە هیچ نرخێکی نییە و هیچ ناهێنێت. ئەگەر چی پیاوێکی زاهید و هەژار و دەست پاك بوو، بەلأم پیاوانی ئایینی و خەڵك و خوا کەوتنە نەفرەت کردنی، بە بیانوی ئەوەی گەورەترین بێ — مۆراڵی سەردەمەکەیەتی.. چۆن دەبێت مرۆڤێك بێبڕوا بێت و بە ئەخلاقیش بێت؟! لەو سەردەمەدا ئەوروپاییەکان لەمە تێنەدەگەیشتن و بۆیان قوت نەدەچوو، بەلأم هەنوکە ئاساییەو یەکلایی بۆتەوە.

خەڵکانی ڕۆژگاری خۆی نەیاندەزانی گەورەترین ئایین لە مێژوودا (ئاینێك کە تێکڕای مرۆڤایەتی دەگرێتەوە) لە ناخیدایە، ئەو ئایینەش ئایینی خۆشەویستی و خواپەرستی و هەستکردن بە ئێش و ئازارەکانی مرۆڤ، ئیتر سەر بەهەر ئایین و ئاینزاو تاقمێك بێت. ئەقڵە بەرتەسکو داخراوەکانی ئەو کاتە، لەمە تێنەدەگەیشتن و بۆیان قوت نەدەچوو. لەبەرئەوە "سپینۆزا" وەك کەسێکی تەنها و نامۆ ژیا، تەنانەت دەتوانین بڵێین نەش ژیا. هەر ئەوەندە ژیانی کرد کە فەلسەفەکەی بنوسێتەوە، پاشان هەر زوو ماڵئاوایی کرد و لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا کۆچی دوایکرد. "سپینۆزا" پەیوەندی خۆی بە ژیانەوە پچڕاند بوو: بە ژن و منداڵ و پلە و پایە و دەسکەوت و سەروەت و سامانەوە، هەر بۆئەوەی خۆی بۆ تەنها شتێك تەرخان بکات. ئەو دەیزانی لە ژێر هەڕەشەدایەو کەسانی وەك ئەو بەهەڵەیەك لە هەڵەکانی مێژوو دادەنرێن. هاوکات دەیزانی ئەو بۆ ڕاپەڕاندنی تەنها ئەرکێك دروستکراوە، ئەویش : رزگارکردنی ئەقڵی مرۆڤەکانە لە ڕێی فەلسەفەو فیکرەوە. لە پێناو ئەم ئەرکەدا ئامادەبوو هەرچی هەیە لە دەستی بدات و هەرواشی کرد. لە وتارێکی زۆر گرنگ و قەشەنگدا "جێڵ دولۆز" ئاوا باسی "سپینۆزا" دەکات: (هیچ فەیلەسوفێك لەم دنیایەدا هێندەی ئەو جوامێر و سەنگین نەبووە، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا هیچ فەیلەسوفێك هێندەی ئەو سەرکۆنە نەکراوە و قسەی پێنەوتراوە).

ئێمە بۆ ئەوەی تەواو لەم کێشەیە حاڵی بین، پێویستمان بەوەیە بگەڕێینەوە بۆ سەردەم و ڕۆژگاری خۆی، واتە بۆ سەدەی حەڤدەهەمی ئەوروپا. لەو قۆناغەدا پیاوانی ئایینی دادو بێدادیان بوو لە دەست ئەوەی خەڵکی وەك پێویست دینداری ناکەن و ڕێوڕەسمە ئایینیەکان جێبەجێ ناکەن. لە پای ئەمەشدا کتێب گەلێکی زۆر دەرچوو کە باسیان لە مەترسی ئەو حاڵەتە دەکرد و لە مەترسیەکانی

دەدوان. یەکێك لەو کتێبانە کتێبێکی قەشە "ماران مێرسین" بوو، بە ناونیشانی (کوفری ئەوانەی تەنها بڕوایان بە خوایە و فەرزەکانی دیکەی ئایین بە ڕاست نازانن، هەروەها کوفری بێباوەڕان و وەڵامدانەوەیان لە دیدگایەکی فەلسەفی و ئایینیەوە). کتێبەکە ساڵی 1624 چاپ بووە. ئەم ناونیشانە زۆر دوور و درێژە، بەڵام تێگەیشتنێکی تەواومان دەربارەی ناوەڕۆکی کتێبەکە دەداتێ. ئەوەی سەیرە لەم کتێبەدا ئەوەیە تەنانەت ئەوانەش تەکفیر دەکات کە بڕوایان بە یەزدان هەیە، بەڵام ڕێو ڕەسمە ئایینیەکان جێبەجێ ناکەن و بڕوایان بە سەرجەم بنەماکانی ئایین نییە. ئەمەش شتێکی زۆر سەیر نییە، گەر بزانین مرۆڤی ئەو سەردەمە ئایینیان تەنها بە مومارەسەکردنی ڕێو ڕەسمە ئایینیەکان دەزانی. قەشە "میرسین" پەلاماری تەواوی ئەو ئاقارە بێباوەڕیانەی دا کە لە فەرەنسادا هەبوون و باس لەوە دەکات کە تەنها لە شارێکی وەك پاریسدا، لانی کەمی پەنجا هەزار بێباوەڕ هەیە! ئەمەش بۆ ئەو کاتە ژمارەیەکی پێوانەیی بوو، بەڵام نازانین چۆن توانیویەتی بگاتە ئەو ژمارەیەو بە چ شێوەیەك سەرژمێری ئەوانەی کردووە!

لەلایەکی ترەوە قەشە "بوسێ" (یەکێك لە پیاوە ئایینیە گەورەکان)، پڕکێشی زیاتر دەکات و دەڵێت: (زیاد لە نیو ملیۆن ڕۆحی سەرگەردان لە فەرەنسادا هەیە!). ئەمەش تووڕەی دەکات و بڕستی لەبەر دەبڕێ و هاوار دەکات: (کارەساتێك بەڕێوەیە..).هەر لە ناو هۆڵەندادا قەشە "ڤۆیت" کەوتە سەرکۆنەکردنی زیادبوونی ژمارەی گومڕا و بێباوەڕەکان لە ناو کۆمەڵگەی هۆڵەندیدا. هێرشەکەشی زیاتر بۆ سەر ئاقاری دیکارتیزم بوو کە لەناو زانکۆکان و ناوەندەکانی خوێندندا تەشەنەیان کردبوو. هەرچی "جان باسیت ستوبا"ی فەرەنسایشە کە لە لاهای چاوی بە "سپینۆزا" دەکەوێت و ڕاپۆرتێك دەربارەی ئەو مشتومڕە ئایینی و مەزهەبییەی ئەو کات لەو وڵاتەدا تاوی سەندبوو، ئاڕاستەی وڵاتەکەی خۆی دەکاتو "سپینۆزا" بەمجۆرە وەسف دەکات: (پیاوێکە بێ هیچ سازشکردن و بێگوێدانە هیچ شتێك، ڕەخنە لە تەواوی ئایینەکان دەگرێت..کەسێکی زانا و بەناونگەو لایەنگر و هەوادارێکی زۆری هەیە. نە لەسەر بیروباوەڕی ئایینی یەهودی بەردەوام بووەو نە بۆتە مەسیحیش. لەبەرئەوە ناکرێت نە بە یەهودیەکی پیاو چاکی دابنێین و نە مەسیحیەکی بەڕێزیشە. کتێبەکەشی – وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسیەت – ئامانجی تارومارکردنی هەموو دەستەوتاقمێکە، ئیتر یەهودی بێت یان مەسیحی. هەروەها دەیەوێت تۆوی بێباوەڕی بچێنێت و مرۆڤەکان تەرێز لە هەموو ئایینێك بکەن.. دواجار ئەم پیاوە کەسێکی زۆر ترسناکە). بە کورتیەکەی ئەمە ناوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتەیە کە ناوبراو دوای بینینی "سپینۆزا" و حاڵی بوونی گوزەرانی لە هۆڵەندا، ڕەوانەی وڵاتەکەی کردووە. سەرەڕای ئەوەش ئەم ڕاپۆرتە زۆر بە توندی دادەبەزێتە سەر هۆڵەندییەکانیش، لەبەرئەوەی مەسیحیەتەکەیان زۆر لاوازە.. دەوڵەتی هۆڵەندی کە ئیعتراف بە سەرجەم ئایینەکان دەکات، لە ڕاستیدا خۆی هیچ ئایینێکی نییە، نە خاسمە مەگەر ئایینی بازرگانی نەبێت!..

هۆڵەندییەکان کەسانێکن لە پێناو قازانج و بازرگانیدا، قوربانی بە ئایین دەدەن و دەستبەرداری بیروباوەڕیان دەبن.واتە ئەمانە وەکو "سپینۆزا"وان کە بڕوای بە پەرستن و ڕێو ڕەسمی ئایینی نییە، ئیتر مەسیحی بێت یان یەهودی، بەڵکو بە شتێکی ڕوکەش و بێبەهایان دەزانین. چونکە بە بۆچونی ئەو ئایینی ڕاستەقینە ئەوەیە کە تەنها مرۆڤ فێری چاکە و دادپەروەری و فەزیلەت دەکات.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کتێبەکەیدا (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت)، فێندەمێنتالیستەکان هێرشێکی توندیان بۆ سەر "سپینۆزا" دەستپێکرد. ئەگەرچی کتێبەکەی بەناوی خۆیەوە بڵاونەکردەوە، بەڵام هەموو زانیان کە ئەو نوسیویەتی. پرۆتستانتیەکان بۆ ئەوەی خۆیان لە تانە و تۆمەتی کاتۆلیك مەزهەبەکان لابدەن، یەکەم کەس بوون پەلاماریاندا. لەبەرئەوەی "سپینۆزا" لەسەر زەمینی پرۆتستانتی هاتە دنیاوەو ژیاو نوسی، ئەوا پرۆتستانتیەکان بەرپرسیاربوون بەرامبەر سەرهەڵدانی ئەم کافرە مەزنە. لە چەندین وڵاتی جیاجیاو لە یەککاتدا شاڵاوی کرایە سەر: (هەر لە هۆڵەنداوە بۆ ئەڵەمانیا و فەرەنسا و.. هتد).

لەم سەروبەندەدا بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕەخنەکانی "سپینۆزا"، چەند کتێبێك بڵاوکرایەوە کە بەو پەڕی ڕێز و ستایشەوە داکۆکیان لە ئایینی مەسیحی دەکرد. لەوانە: وتارێك دەربارەی ڕاستی و دروستی ئایینی مەسیحی – 1684، هەروەها وتارێك دەربارەی بوونی خودا – 1697.. هەرچی پەیوەندی بە کاتۆلیکەکانیشەوە هەیە، ئەوا ڕابەری ئەو ئاینزایە لە فەرەنسا "بوسوێ"، دەست بەجێ خۆی بە خوێندنەوەی کتێبەکەی "سپینۆزا" وە خەریککرد. دوای ئەوەی لە مەغزای کتێبەکە گەیشت و هەستی بە مەترسیەکانی کرد بۆ سەر تێکستە پیرۆزەکان، بڕیاریدا بێدەنگی لێبکرێت. چونکە ئەو بە زیرەکی زۆری خۆی هەستیکرد، بەکارهێنانی میتۆدی فیلۆلۆگی و مێژویی و پراکتیزەکردنیان بەسەر تەورات و ئینجیلدا، درەنگ یان زوو دەبێتە مایەی ئاشکراکردنی مێژوویيەتی ئەو تێکستانەی وا خۆیان نیشان دەدەن، وەك ئەوەی تەواو لەسەر واقیع و مێژووەوە بن. ئەگەر مێژویی بوونی ئەو تێکستانە ئاشکرا بوو، ئەوا پیرۆزییان لەبەردادەماڵرێت و ئەمەش بۆ ئیماندارانی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە شتێکی بێئەندازە ترسناك بوو، (بەڵام ئێستا ئیماندارانی ئەوروپا ئەوە قبوڵ دەکەن، دوای تێپەڕبوونی سێ سەدە بەسەر چاپ بوونی کتێبەکەی سپینۆزادا!!). شایەنی باسە کتێبەکەی تێڕوانینێك بۆ ئایین دێنێتە ئارا، تەواو جیاواز لە دیدگای فێندەمێنتالیستەکان و خەڵکانی ئیمانداری ئەو سەردەمە، بەڵام ڕەنگە لەگەڵ بۆچونی ڕۆشنگەرو ئەقڵانییەکاندا لە هەندێ خاڵی سەرەکیدا یەکبگرنەوە. بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەندێ پیاوانی ئایینی زۆربەی تێزەکانیان پەیڕەو کرد و تەنانەت سەروەختێکیش وایان نیشاندەدا کە بەرپەرچی دەدەنەوە، داکۆکیان لەو تێزانە و خودی "سپینۆزا" دەکرد. ئەم کتێبەی "سپینۆزا" جەخت لەسەر بوونی خوا

دەكاتـەوەو بـە پێچـەوانەی ئەوەشـەوە كـە باسـی لێـدەكرا، هـیچ پەیوەندییـەكی بـە بێباوەڕییـەوە نـەبوو. تەنانـەت ئـەم كتێبـە ڕێگـا لەبـەردەم ئیمـانێكی ئەقڵانیـدا خـۆش دەكـات كـە دواتـر و لەسـەر دەسـتی كەسـانی وەك "ڤۆڵتێر" و "جـان جاك ڕۆسۆ"، لە سەردەمی ڕۆشنگەریا دێتەئارا.

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا تـەواوی خـەڵكی، "سپینۆزا" بەبێباوەڕی تاوانبار دەكەن. تۆ بڵێی هۆكـاری ئەمـە چـی بێـت؟ هۆكارەكـەی ئـەو كتێبەیـەتی كـە پـاش (تیۆلۆژیـاو سیاسـەت) بڵاویكردەوە. مەبەستمان لەو كتێبەشی شاكارە فەلسـەفیەكەیەتی بـەناوی (مـۆراڵ). ئـەم كتێبـە بۆچونێك دەربارەی یەزدان پێشكەش دەكات كە تەواو جیاوازە لە بۆچونی یەهودیو مەسیحی و تێكـــــڕای شـــــوێنكەوتوانی ئایینـــــە یەكتاپەرسـتیەكان. واتـە خـوا لـەم كتێبـەدا بریتییـە لـە سروشـت یـاخود سـەراپای بـوون و ئـەو خوایـە نییـە كـە دروسـتكەرە و لـە دروسـتكراوەكەی دابـڕاوە و لـە شـوێنگەی ئاسمانە بەرزەكانـە. لەسـەر دەسـتی "سـپینۆزا" خـوا دەبێـت بـە یاسـاكانی سروشـت و ئـەو ئەقڵانیەتـە ڕەهایـەی ئاراسـتەی بـوون دەكـات، واتـە بـوو بـە گـەردون و تـەواو ئـەو شـتانەی لـە گەردونداپە. بـوو بـەو هێـزە زینـدوو بزۆزەی لـە گەردونداپە. ڕەنگـە ئـەم بۆچـوونە سـەیرە بـوو بێـت، ئـەوروپای مەسـیحی والێكردبێـت "سپینۆزا" ڕەتبكاتـەوەو بـۆ مـاوەی سـێ سـەدە تەرێزی لێبكات و ئەو كات بە كەسێكی مادی و بێباوەڕ تاوانباری بكەن.

"سـپینۆزا" ئـەم بۆچـونانەی لـە یەكـەمین كتێبیدا ئاشكرا نەكرد، نەبادا هاوسـەردەمەكانی توشی شۆك بكات. بەڵام لە دووەمین كتێبیدا كە دوای مردنی بڵاوكرایەوە، ئەم بۆچوونە نوێیەی دەربـارەی یـەزدان تێدایـە. ئـەوەش بۆچـونێكە هاوسـەردەمەكانی و خـەڵكانێكی زۆری دیكـەی تۆقانـد كـە سـاڵانێكی دوور و درێـژی دوای مردنی خۆی هاتن.

### سپینۆزا، نەهامەتی فیكر:

دەتـوانین بڵـێین "سـپینۆزا" پێگەیـەكی سـەرەكی و تایبـەتی لـە مێـژووی فیكـری خۆرئاواو مرۆڤایەتیدا هەیە. ئەم بیریارە لەسەر گشـت ئاسـتەكان كەسـێكی بێـزراوو تەرێزلێكراوە.. بۆ نمونە ئەو وەكو یەهودییەك كـە لـە كۆمەڵگەیـەكی مەسـیحیدا دەژیـا و لـە سەدەی حەڤدەهەمیشدا، ئایین لەو كۆمەڵگەیەدا بایـەخ و گرنگیـەكی زۆری هـەبوو، كەسـێكی بێـزراوو نەویسـتراو بـوو. هاوكـات لەلایـەن جولەكـەكان خۆشـیانەوە نەویسـتراو بـوو، لەبەرئەوەی نوێژی لە پەرستگاكانیاندا نەدەكرد و هەر لە تەمەنی بیست ساڵیەوە بڕوای بە هیچ بیروبـاوەڕ و سـروت و ڕێـوڕەسمێكی ئـایینی نـەما. تەنانـەت لـە نێـوان ئـەو فەیلەسوفانەشـدا بێـزراو بـوو كـە بـە ڕواڵـەت مـودارای پیـاوانی ئایینیـان دەكـرد و بـەم پێیـەش دوور بـە دوور نەبوایە، نـەیان دەوێـرا لێـی نزیك ببنـەوە. بگـرە هەنـدێ جـاریش ئـەو فەیلەسـوفانە پـەلاماری "سپینۆزا" یان دەدا، بۆ ئەوەی پیاوانی ئایینی لێیان ڕازی بن یان لانی كەم بۆ ئەوەی خۆیان لـە شـەڕ و بـەڵایان لابـدەن. هـەروەها لـەناو خانەوادەكەی خۆشیدا هەروا بوو، چونكە دوای

ئەوەی حاخامەکانی جولەکە سەرکۆنەیان کرد، لە هەموو میراتیەك بێبەشیانکرد و حاشایان لێکرد.. دەکرێت بڵێین بەشێوەیەکی گشتی ئەو پیاوێکی نەویستراو بوو، پیاوێك بوو تینوو بۆ ئازادی. بەلاّم با لێرەدا ئیستێك بکەین و بزانین چۆن پیاوانی ئاینی سەرکۆنەیان کرد، لە کاتێکدا کە ئەو لە تاڤی لاویەتیدا بوو، بەمەش چارەنوسی فەلسەفی یەکلابووەوە.

لە 27 ی تەموزی 1656دا ئەم فتوا ئایینیە لەلایەن کنێسی یەهودی لە ئەمستردام دەرچوو کە تێیدا هاتووە: (ماوەیەکە پیاوانی ئایینی یەهودی گوێ بیستی ئەو بۆچونە خراپانە دەبن کە سپینۆزا پەیڕەویان دەکات. هەرچەندە بە هەموو شێوەیەك هەوڵیاندا بیهێننەوە سەر ڕێگای ڕاست، بەلاّم بێهودەبوو. ئێمە ڕۆژانە هەواڵی تازەمان پێدەگات دەربارەی ئەو کوفر و گومڕاییانەی بانگەشەی بۆ دەکات و دەیدات بە گوێی خەڵکیدا. لەم بارەیەوە شایەدگەلێکی شوێن بڕواو جێمتمانە، هەواڵی ئەویان پێگەیاندوین کە هیچ گومانی تێدا نییە و دەیسەلمێنن بە فیعلی کەسێکی گومڕاو گوناهبارە. پاش ئەوەی ڕاوبۆچونی حاخامە بەڕێزەکانمان وەرگرت، بڕیارماندا بە دەرکردنی ئەم پیاوە لەناو ئومەتی نەوەی ئیسرائیل. لێرەوە دەرهەق بەو ئەم بڕیارەماندا: بە ناوی فریشتە و پیاوچاکانەوە ئێمە بڕیارماندا بە دەرکردن و نەفرەتکردنی ئەم کەسەی ناوی سپینۆزایە. ئێمە بەر هەموو ئەو نەفرەتە تیۆلۆژیانەی دەخەین کە لە شەریعەتدا هەیە. بەر نەفرەت کەویت لە ڕۆژداو لە شەویشدا. بەرنەفرەت کەوێت کاتێك دەخەوێت و کاتێکیش بەخەبەردێت. نەفرەتی یەزدان، نەفرەتێکی سەرمەدی و هەتاهەتاییە و تا ئەبەد لاناچێت. با یەزدان توڕەیی خۆی بۆ نازڵ کات و بێبەشی کات لە لوتف و لێبوردەیی خۆی).. (ئێمە بە هەموانی ڕادەگەیەنین بۆ هیچ کەسێك نییە، قسەی لەگەڵدا بکات یان بە نامە نوسین پەیوەندی لەگەڵدا بگرێت. نابێت هیچ کەسێك پەیوەندی پێوە بکات یان هیچ جۆرە یارمەتیەکی پێشکەش بکات. هەروەها هیچ کەس بۆی نییە لەگەڵیدا بژی یان هیچ وتارو کتێبێکی بۆ بخوێنێتەوە)[16].

ماوەیەکی کەم دوای دەرچوونی ئەم فتوایە، یەکێك لە جولەکە توندڕەوەکان پەلاماریداو ویستی بە خەنجەر بیکوژێت، بەلاّم خۆشبەختانە "سپینۆزا ڕزگاری بوو، لەبەرئەوەی پاڵتۆیەکی بەرگ ئەستوری قورسی لەبەردا بوو، ئەمەش وایکردبوو دەمی خەنجەرەکە نەگاتە سەر گۆشت. دەڵێن ماوەیەکی زۆر ئەو پاڵتۆ موقەدەسەی هەر هەڵگرتبوو، بۆ ئەوەی بیری نەچێت کە باجی فیکر قورس و گرانە. ڕاستیەکەی هەوڵی تیرۆرکردنی دوای بلاّوبوونەوەی ئەو فتوا ئایینیە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، چونکە فتوادان بریتییە لە تیرۆرێکی مەعنەوی و ڕوحی، لە جەوهەریشدا زەمینە سازییەکە بۆ تیرۆری جەستەیی. ئیتر لەو کاتەوە "سپینۆزا" بوو بە دوژمنێکی سەرسەختی هەموو فێندەمێنتالیستەکان، نەك تەنها لە سەردەمەکەی خۆیدا، بەڵکو لە هەموو سەردەمێکدا.. دوای ئەم هەوڵی تیرۆرکردنەی دەستبەجێ شاری ئەمستردامی بەجێهێشت و

پەنای بردە بەر هاورێکانی (کە مەسیحی لیبرالی بوون) لە شارێکی دیکەی هۆڵەنداد‌ا، بەلاّم ئەمە وای لێنەکرد تا ببێتە مەسیحی. چونکە ئەو بۆ ئەوە دەستبەرداری ئایینی خۆی نەبوو تا بچێتە سەر ئاینێکی تر، ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگ بوو تەنها ئایینی فەلسەفە و فیکری ئەقلاّنی ئازاد بوو.

بێگومان ئەو زیاتر دڵخوازی ئیماندارە ئەقلاّنییەکان بوو، هەر ئەوانیش توانیان زیاد لە جارێك بیپارێزن و داڵدەی بدەن.. "سپینۆزا" بەو پێیەی ژنی نەهێناو منداڵی نەبوو، ئەوا پارەیەکی کەم بەشیدەکرد بۆ ئەوەی بژی. هەروەکو "جیل دولۆز" دەڵێت: (ژیانی خاکی و هەژاری و زاهیدانە، زۆر بۆ فەلسەفە گونجاوە. ئەگەر پشت لەم جیهانە هەڵنەکەیت و تەرێز لە حەز و ئارەزوو پلە و پایەکانی نەکەیت، فەلسەفە گەشە ناکات). "سپینۆزا"ش لای خۆیەوە تەواوی دەسکەوت و سەرکەوتنەکانی سەرزەوی ڕەتکردەوە بۆ ئەوەی تاکە یەك سەرکەوتنی دەسگیر بێت، ئەویش ژیانی نەمریی بوو لە فەلسەفەدا.

ئەو پێویستی بە برینێکی قوڵ هەبوو، بۆ ئەوەی ببێتە فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە. ئەو فتوا ئایینیەشی لە ڕیزی یەهودیەکاندا دەریکرد، ئەو زەبری خەنجەرە بوو تا ئەوەی بۆ بێنێتە دی کە ویستی بوو. لە مێژوودا بیریارێکی ڕاستەقینە و فەیلەسوفێکی مەزنمان نییە، قەیران و کێشەیەکی قوڵی تایبەتی نەبوو بێت. "سپینۆزا"ش لە دەرەوەی ئەم ڕێسایەدا نییە. ئەوانەی لەم ڕێسایە بەدەرن، یان ئەکادیمیستن یاخود لە زانستدا زۆر شارەزان. بەلاّم بیریاری قوڵ پێویستی بە برینێکی قوڵ یان زەبرێکی توند هەیە تا لە ناخەوە بیهەژێنێت، "سپینۆزا"ش لەوانەبوو. ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە چۆن توانی لە تەمەنێکی وا کورتدا، ببێتە یەکێك لە گەورە فەیلەسوفانی مێژوو.

ڕاستیەکەی نەیدەخواست چارەنوسی وەها بێت و دەستی لە دیاریکردنیدا نەبوو، بەلاّم ئەو بەرپرسیارێتیەی هەڵگرت، بەو پێیەی چارەنوسێکی حەتمیە و دەرباز بوون لێی مەحاڵە. قەدەری بوو کە لە هەموو دەستەو گروپێك جیا بێتەوە، ئیتر ئایین بێت یان ڕەگەز یان خێزان.. ئەو تەنها بەیەك گروپەوە پەیوەست بوو: ئەویش گروپی هاولاّتیە ئازادیخوازە هۆڵەندییەکان بوو کە لەو کاتەدا لە قۆناغی دروستبوندا بوو. وەك ئەوەی "سپینۆزا" بە ماوەیەکی زۆر پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو پێیان بڵێت: (بە مرۆڤم دابنێن و وەك هاولاّتیەکی ئاسایی سەیرم بکەن، بۆ ئایین و بنەچەم مەڕوانن. بەر لە هەر شتێك من مرۆڤم، کاتێك لە دایك بووم دەستم لە دیاریکردنی ئەم یان ئەو ئایینەدا نەبوو. کەس سەر پشکی نەکردووم بۆ ئەوەی لە بنەماڵەیەکی یەهودی یان مەسیحی لە دایك بم. کەواتە لەسەر کاروکردەوەو هاولاّتیبونیان لێپێچینەوە لەگەڵ خەڵکدا بکەن، واتە لەسەر شتێك خۆیان دەستیان تێیدا هەبێت). بەمجۆرە "سپینۆزا" بە

چەندین ساڵ پێش ئایدیای مۆدێرنەو عەلمانیەت و مافی هاولاّتی بوون و دەوڵەتی یاسا دەکەوێت.. ئەو یەکەمین فەیلەسوفی عەلمانییە لە مێژودا. لەبەرئەوە لە سەردەمی خۆیدا تەنها و نامۆ و گۆشەگیر بوو، تەنها شتێك دڵی بدایەتەوەو سەر شانی سوك بكردایە، فەلسەفە بوو.

بەلاّم ئاخۆ "سپینۆزا" بەچی دەژیا؟ هەندێك دەڵێن خەریكی پیشەی چاویلكەسازی بووەو زۆر دەست ڕەنگین بووە تێیدا، بەلاّم زۆر لەسەر ئەم كارەی بەردەوام نەبووە. شایەنی باسە هاوڕێكانی و ئەوانەی بە بلیمەتی فەلسەفی ئەو سەرسامبوون، یارمەتیان داوەو دەسگیرۆییان كردووە. وەرگرتنی پارەو یارمەتی لە زۆر لاوە ڕەتكردۆتەوە، بەلاّم لە هاوڕێیەكی دەوڵەمەندی بەناوی "سیمۆن دوفریٚ"وە، ئەو یارمەتیە وەردەگرێت. سەرەڕای ئەوە سەرۆكی ئەو كاتەی هۆڵەندا "یان دۆڤیت" كە لە كۆماریخوازەكان بوو حەزی بە بیرو بۆچونەكانی بوو، موچەیەكی هاكەزایی ساڵانەی بۆ بڕیبووەوە. لەبەرئەوەی شتێكی كەمی بەس بوو، بۆیە مانەوەی لە ژیاندا ئەوەند قورس نەبوو. ڕاستە ئەو جل و بەرگی زۆر پاكی دەپۆشی، بەلاّم زۆر سادەبوو. لەمبارەیەوە دەڵێت: (بۆ زیاد لە پێویست بایەخ بە ڕواڵەت و جل و بەرگ دەدەین؟ بۆچی ئەم جەستە كاتیە بەم بەرگە گران و بە نرخە داپۆشین؟ بەرگی بە بریق و باق، پیاو دروست ناكات). تاكە بوارێك كە هەموو شتێكی بۆ بە خەرجدەدا كتێب بوو، هەر بۆیە لە دوای خۆی كتێبخانەیەكی گەورەو هەڵبژاردەی بەجێهێشت.

"سپینۆزا" دوو دڵ نەبوو لەوەی بەشداری لە كێشە و مەسەلەكانی سەردەمەكەیدا بكات. كتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت)ی بۆ ئەوە نوسی تا داكۆكی پیٚ لە ڕێبازی ڕێبەری گەورەی هۆڵەندی "یان دۆڤیت" بكات. شایەنی باسە "یان دۆڤیت" بەراورد بە كڵێسا و فێندەمێنتالستەكان، نمونەی بەهای ئەقلاّنی و ڕێزگرتن لە ئازادی ویژدان و سەربەخۆیی دەوڵەت بوو. بەلاّم زۆر بە توندی لەلایەن پارتی پارێزگاران و كۆنە پەرستەكانەوە دژایەتی دەكراو سەرەنجامیش توانیان بیكوژن. ئەمە "سپینۆزا"ی شێتكرد و وەختە بوو بێتە سەر شەقام بۆ بەر پەرچدانەوەیان، بەلاّم هاوڕێكانی ڕێگەیان نەدا، لە ترسی ئەوەی ئەمیش نە كوژرێت و بەدەردی ئەو نەچێت. لەو كاتەدا هەمووان داخ لە دڵ بوون و شەڕ لە نێوان حیزبی كۆماریخوازە ڕۆشنگەرەكان و حیزبی پارێزگاران و فێندەمێنتالیستەكاندا تاوی سەندبوو.

لێرەدا دەتوانین بڵێین شۆڕشی فەلسەفی "سپینۆزا"، پێش زۆرێك لە ئاقارە مەزنەكانی نوێبونەوەی ئەوروپی دەكەوێت، بە تایبەتی عەلمانییەت و ڕەخنەی مێژویی كتێبە پیرۆزەكان و گورانی زانستە سروشتیەكان و هاتنە ئارای سەردەمی ڕۆشنگەری و پەیدابوونی دەوڵەتی دیموكراسی لیبرالی. تەواوی ئەم شتانە "سپینۆزا" خەونی پێوە بینیوون و لە بیركردنەوەی ئەودا ئامادەگیان هەبووە. دواتر تەواوی ئەم شتانە گەشەیانكردووە لە ئەوروپای مۆدێرندا بوونە واقیع.

"سپینۆزا" لە ڕێی بنج و بناوان و بونی لە خانەوادەیەکی خانەداندا هۆڵەندی نەبوو، بەڵکو ئەو لە ڕێی ماف هاوڵاتی بوونەوە هۆڵەندی بوو. ئەو لەبەرئەوەی پەیوەندی بە مەحشەری جولەکەوە نەمابوو، جگە لە دەوڵەت و پاسا پشتی بە چیتر ببەستایە؟ دوای ئەوەی گروپەکەی لێی بێبەری بوون، جگە لەوەی کە مرۆڤێکە هیچی دیکەی بۆ نەمایەوە. ئەو لەبەرئەوەی خۆی بە بوونەوەرێکی سەربەخۆ دەزانی، ئەوا دەرگیری هەموو ئەوانە بوو کە لە ناو کۆمەڵگەدا لە خۆی دەچوون، ئەویش لە ڕێی پەیوەندی هاولاتی بوونەوە کە لەسەرو مەسەلەی ڕەگەز و ئایین و خزم خواهیەوەیە. بەڵگە نەویستی ئەقڵیش ئەوەی بۆ دەسەلمێنێت. فەیلەسوفی ئەڵەمانی "کارڵ یاسبەرز"[17] لە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێشیدا دەربارەی "سپینۆزا" دەڵێت: (فیکری ئەو بووە پەناگە و شوێن دالدەی هەموو ئەو چەوساوەو تەریککراوانەی، جگە لە خۆیان زیاتر ناتوانن پشت بە هیچی دیکە ببەستن. هەروەها بیرو بۆچوونەکانی بووە چراوگی دەستی هەموو ئەوانەی عەودالی ئازادی و سەربەخۆیی بوون، چونکە ئەو خۆشی دڵنیایی ئەقڵانی لە فەلسەفەدا بینیەوە کە ژیانی بۆ ڕۆشندەکاتەوەو ئاراستەی دەکات). شایەنی باسە "سپینۆزا" بە فەلسەفەی (یەکیەتی بوون) نێو بانگی دەرکرد. ئەمەش مانای وایە ئەو پێیوا بووە جیهانی واقعی تاکە جیهانی مومکینە و هیچ شتێکیش لە دوایەوە نییە. نهێنی ئەوەی لەلایەن هەندێکەوە بە بێباوەڕ تۆمەتبار دەکرێت لێرەدایە، ئەگەرچی هیچ

فەیلەسوفێکی تر وەکی ئەو باسی لە یەزدان نەکردووە. فەلسەفەی (یەکیەتی بوون) لە دواتر دا تەشەنەی سەند و کاریگەر لەسەر ڕێبەرانی فیکری مۆدێرن بەجێهێشت، لەوانە: (گۆتە، هیگل، هاینێ، مارکس، نیچە، فرۆید، ئەنیشتاین). تەواو ئەم بیریارانە لە ساتەوەختێکی ژیانیاندا دانیان بەوەدا ناوە کە کەوتونەتە ژێر کاریگەری "سپینۆزا"وە. کەواتە بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەو باوکی فیکری مۆدێرنە، یاخود باوکی یەکێك لە ئاقارە سەرەکیەکانیەتی. هیچ کەس هێندەی "سپینۆزا" لە مێژووی فیکردا، بەر نەفرەت نەکەوتووەو پەلامار نەدراوە. ئەگەرچی ژیانێکی زاهیدانەو بێگەردانە ژیاو هەر هەموشی تەرخانکرد بۆ فەلسەفە و سۆراخکردنی حەقیقەت، بەلام بەم کارەی پایە سەرەکیەکانی ئایین و سیاسەتی لەقکرد، بەمەش خەڵکی توشی هێستریا کرد.. وەکو "کارل یاسبەرز" دەڵێت: (خانەدانی ڕۆحی ئەو لە ژیان و نوسین و بەرهەمەکانیدا بەرجەستە بوو بوو. ئەو جیاوازی لە نێوان تیۆرەو پراکتیکدا نەدەکرد و داوای دەکرد قسە و کردار وەك یەك بێت، ئەگەر نا ئەوا بیریار ڕاستگۆیی خۆی دەدۆڕێنێت).

"سپینۆزا" لە بەرئەوەی لە ژیانیدا زۆری بە دەست پڕوپاگەندەو ڕاوەدونانەوە چەشت، بۆیە زۆر بە وریایی هەڵسوکەوتی دەکرد و بە ئاسانیش متمانەی خۆی نەدەدا بە خەڵکی، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە لە ژیانیدا یەك کتێبی لە کتێبەکانی خۆی بلاوکردەوە (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیاو سیاسەت)[18]، ئەویش بە ناوێکی خوازراوەوە بوو. وەکو ئاماژەشمان بۆ

کرد ئەم کتێبەی بۆ ئەوە بڵاو کردەوە، تا شەڕی لە دژی حیزبی تەقلیدییەکان پێبکات و داکۆکی لە هاوڕێ پێشکەوتنخوازەکانی بکات کە بە تەنگ هاتبوون. لە کۆتایی ژیانیدا کاتێك بیری لەوە کردەوە کتێبە فەلسەفیە بەناوبانگەکەی (مۆراڵ) بڵاو بکاتەوە، هەڕەشە و پڕو پاگەندەیەکی وای بیست، هەرزوو پەشیمانی کردەوە. بۆیە تا لە ژیاندا بوو ئەو کتێبەی چاپ نەکرا.

"سپینۆزا" پێیوابوو پێویست بە وروژاندن و دنەدان ناکات، چونکە مرۆڤ زۆر بە ئاسانی تەسلیمی کەفوکوڵی ویژدانی دەبێت و ڕەنگە جارێکی دی کەسێکی تری بۆ بنێرنەوە تا بیکوژن، بەر لەوەی ئەرکەکەی تەواو بکات و گورزی گرانی فەلسەفی خۆی بووەشێنێت. "سپینۆزا" خۆی لە هەموو پەیوەندی و ئینتیمایەك ڕاپسکان و تەنها شتێك کە دەرگیری بوو ئینتیماکردن بوو بۆ حەقیقەت و فیکر. دوای ئەوەی هەموو دەرگاکانی لەبەردەمدا داخرا، فیکر بووە مەنزڵی یەکەم و کۆتایی. ئەو دەیویست بەر لە مردنی، حەقیقەت بۆ خەڵك و خوا ئاشکرا بکات. لەم هەلومەرجەدا تێدەگەین بۆچی زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوتی کردووەو بۆچی داوای لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی کردووە، نوسینەکانی بۆ هیچ کەسێك ئاشکرا نەکەن تا لێی دڵنیا نەبن.

سەروەختێك بلیمەتێکی وەك "لایبنتز" داوا دەکات خۆی پێبناسێنێت و لەماڵەوە سەردانی بکات، "سپینۆزا" دەست بەجێ داواکەی پەسەند ناکات، بەڵکو خوێندکارەکانی ڕادەسپێرێ پرسیاری تەواوی لە بارەوە بکەن.

ئەو کەسە کێیە؟ چی لێم دەوێت؟ بۆچی چووە بۆ فەرەنسا؟ پەیوەندیەکانی لەوێ چۆنبووە؟.. پێدەچێت ترسی لەوە هەبووبێت ئەمەش تەڵەیەکی نوێ بێت، دوای ئەو هەموو تەڵەو کەپکانەی بۆیان نایەوە.

**سپینۆزا و شەڕی یەکلایکەرەوە دژ بە فێندەمێنتالیزم:**

"دیدرۆ" دەڵێت: (لە سەردەمی لویسی چواردەدا کەسانێك هەبوون هاوسەردەمی ئێمە بوون). بێگومان ڕاست دەکات، چونکە بەماوەیەکی زۆر بەر لە سەردەمی ڕۆشنگەری بیریاری ڕۆشنگەر هەبوون. مەبەستیشی ئەو بیریارانەیە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەو سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمدا بە دەرکەوتن، نمونەکانیان وەك: (مالبرانش، سپینۆزا، پییر بایل، لایبنتز، جۆن لۆك و.. هتد). بۆ نمونە کتێبە بەناوبانگەکەی "سپینۆزا"، (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت) لە ساڵی 1670دا بڵاوکرایەوە، واتە لانی کەم سەدەیەك بەر لە هاتنە ئارای نوسینە مەزنەکانی ڕۆشنگەری لەسەر دەستی "ڤۆڵتێر"و "دیدرۆ" و "ڕۆسۆ"..

"سپینۆزا" لەو کتێبەدا قسەی زۆر ترسناکی کردبوو، بە جۆرێك بووبووە مایەی هەژاندنی ئەو کۆمەڵگە مەسیحیەی تێیدا دەژیا. لەبەرئەوە نەبە ناوی خۆیەوە بڵاویکردەوەو نەناوی ڕاستەقینەی ئەو کەسەشی لەسەر بەرگەکەی نوسی کە کتێبەکەی بۆ لە چاپ دابوو. پوختەی ئەوەی لەو کتێبەدا نوسیبوی ئەمە بوو: (پێویستە تەواوی بیروباوەڕە

تەقلیدیەکان وەلاوە بنێین و سەرەتایەکی تازەی بیرکردنەوە دەست پێبکەین). هەروەها دەڵێت: (کار گەشتۆتە ئاستێك ناتوانین لە نێوان فێندەمێنتالستێکی مەسیحی یان جولەکە یان ئیسلام یاخود بتپەرستدا جیاوازی بکەین، چونکە تەواوی ئەوانە توندڕەوانە بیردەکەنەوەو لنگەوقوچ لە ئایین دەگەن. بەو پێیەشی بیروباوەڕ ئەو کاریگەریەی لەسەر مۆراڵ نەماوە، ئەوا ڕۆح دوچاری گەندەڵبوون هاتووە).

بەڵام هۆکارەکەی چییە؟ هۆکارەکەی ئەوەیە ئایین وەك پەیوەندیەکی ناوکۆیی و ڕۆحانی لەگەڵ یەزداندا وەرناگرین و ڕێگەشمان نەداوە بە چاوێکی ڕەخنەیی پشکنینی بۆ بکەین، تا خەڵك بە خواست و ویستی خۆی باوەڕی پێ بێنێت، بەڵکو وەکو ڕستێك سروشت و ڕێوڕەسمی ڕواڵەتی لە ئایین تێگەیشتوین کە بەشێوەیەکی میکانیکی مومارەسەی دەکەین و هیچ کاریگەریەکی ئەخلاقیش بەسەرمانەوە جێناهێڵێت. ڕەنگە یەکێك تەواوی ڕێو ڕەسمەکان جێبەجێ بکات، بەڵام دواتر دەکەوێتە دزی و فێڵکردن و ڕقهەڵگرتن لە دراوسێکەی، لەبەئەوەی لەسەر ئەو ئایین و بیروباوەڕە نییە کە ئەو ئیمانی پێیەتی.. کەواتە لەم حاڵەتەدا ئایین چ سودێکی دەبێت و بە کەڵکی چی دێت؟ ئێمە وەها لە ئایین گەیشتبووین کە ملکەچی و گوێڕایەڵیکردنی بێقەیدو مەرجە بۆ پیاوانی ئایینی، پیاوانی ئایینیش پاوانی بیروباوەڕیانکرد و کردیانە دەسوێژێك بۆ تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانی خۆیان. تەنانەت ئایینیان بەلاڕێدا برد و خەڵکیان بەسەر گروپ و ئاینزاو دەستەی ناکۆك و دژ بە یەکدا دابەشکرد. بەمجۆرە ئیرەیی و دووڕویی و ڕك و کینە باڵی بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەدا کێشا کە ئایین تیایاندا بالاْ دەست بوو. تەنها شتێك کە لە ئایینی مەسیحی مایەوە، ڕواڵەتەکەی و ئەو حوکم بڕیارە بەسەرچوانە بوو کە مرۆڤیان لە ڕێی توندڕەوی دەمارگیرییەوە دەکرد بە دڕندە[19]، چونکە مرۆڤیان بێبەشدەکرد لەوەی ئەقڵ و بیرکردنەوەیان بەشێوەیەکی ئازاد بهێنن.

"سپینۆزا" دەڵێت: (پێویستە لە ئەقڵەوە دەست پێبکەین، بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەکی دیکە دروست بکەین کە ئازادتر و مرۆڤانەتر بێت. بۆ ئەوەی بگەینە ئەوەش پێویستە ئەو سستەمەی لە ئارەدایە لە ڕووی ئایینی و سیاسیەوە تێکوپێك بدەین). بە بڕوای ئەو تیۆلۆژیای مەسیحی تەقلیدی ڕەوایەتی بە سستەمە گەندەڵەکان دەبەخشێت و گەر لە داهاتووشدا بە نیازی گۆڕینی بین، ئەوا پێویستمان بەوەیە لەبەریەکی هەڵوەشێنین. دوای لەبەریەك هەڵوەشاندنی سستمی تیۆلۆژی تەقلیدی، دێتە سەر لەبەریەك هەڵوەشاندنی سستمی ستەمکاری سیاسی کە لە ڕووی مێژووییەوە پشت بە سستمی تیۆلۆژی تەقلیدی دەبەستێت و ڕەوایەتی لەوەوە وەردەگرێت. خەسڵەتی ڕادیکالی و شۆڕشگێڕانەی فیکری "سپینۆزا" لێرەدایە. چونکە پادشاکانی ئەوروپا توانیبویان ئایینی مەسیحی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربێنن و لە تەفرەدانی جەماوەردا لێهاتوو بوون، بەڵام چۆن؟ لە ڕێی بەکارهێنانی ئایینەوە بۆ تۆقاندنی خەڵك، بۆ ئەوەی تا ئەبەد ملکەچ و گوێڕایەڵی ئیرادەی ئەوان بن.

لەمبارەیەوە "جێل دولۆز" دەڵێت: (یەکێك لەو پرسیارە سەرەکیانەی سپینۆزا لە کتێبەکەیدا دەربارەی تیۆلۆژیای سیاسی دەیوروژێنێت ئەمەیە: بۆچی گەل خەبات لە پێناو کۆیلایەتیدا دەکات وەك ئەوەی ئازادی بێت[20]؟ بە مانایەکی دی: بۆچی سەرکردەی فێندەمێنتالیستەکان دەتوانن یاری بە ئەقڵی میللەت بکەن و بە هەزاران کەسیش شوێنیان دەکەون؟ بۆچی میللەت بەم ئاستە نائەقڵانییە؟ ئەمە ئەو شتە بوو سپینۆزای نیگەران کردبوو). لەبەرئەوە "سپینۆزا" ترسێکی زۆری لە ڕەشە خەڵکی هەبوو، چونکە دەیزانی ئەوان زۆر زوو هەڵدەچن و لەوەها حاڵەتێکیشدا ئامادەن تەڕو وشك پێکەوە بسوتێنن.. ئەمانە کەسانی وەك خۆیان هەژار و نەدار دەکوژن، چونکە سەربە ئایین و ئاینزایەکی دیکەن.. کەواتە ئەمانە بێئەوەی بە خۆیان بزانن دوژمنی خۆیانن.

"سپینۆزا" دەڵێت: (خەڵکی گەر بیانەوێت لەم دۆخە دەربازیان بێت، ئەوا پێویستە میتۆدی ئەقڵانی بەسەر تێکستە ئایینیەکاندا پراکتیزە بکەن تا لە دەست وەهم و نەزانین قوتاریان بێت.. دواتر دەبێت ئەو میتۆدە بەسەر سروشت و ئامانجی دام و دەزگای سیاسیشدا پراکتیزە بکرێت، بەمجۆرە سیاسەت و ئایین پێکەوە رزگار دەکرێن. بۆ ئەوەی ئەمەش مەیسەر بێت، پێویستە بە ئازادی دەست بە بیرکردنەوە بکەن. ئەو کات لەوە تێدەگەن دەوڵەت لە پێناو تاکە کەسێکی ستەمکارو زاڵمدا دروست نەبووە، بەڵکو لە پێناو تەواوی میللەتدایە. هەروەها حاڵی دەبن لەوەی دەسەلاَت شتێکە گەل بەو بەرپرسانەی دەدات کە حوکمڕانی دەکەن. کەواتە دیموکراسی چاکترین فۆرمی حوکمڕانیکردنە، لەبەرئەوەی لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت. بەهەرحاڵ ئامانجی دام و دەزگا سیاسیەکان ئەوەیە، ئازادی بیروباوەڕ و ڕادەربڕین و هەڵسوکەوتکردن بۆ تاکەکەس مسۆگەر بکات).

ئەمە بیروبۆچونی "سپینۆزا" بووە کە لێرەدا بە کورتی باسمان لێکرد. بەلاَم ئەم شتانە لە ئێستادا ئاساییە، ئەگەرچی بۆ کاتی خۆی زۆر ڕادیکالی و شۆڕشگێڕانەبووە. "سپینۆزا" بەلای هاوسەردەمەکانیەوە وێرانکارو روخێنەر بوو، بۆیە بە نەفرەتکراو تەرێزیان لێکرد.. هەرچەندە ئەو لەسەردەمەکەیدا بێزراو بوو، بەلاَم سەدەکانی دواتر ئیعتیباریان بۆ گەڕاندەوە و وەك بونیادنەرێك نەك وەك تێکدەرێك باسدەکرێت. سەدەکانی دواتر پەییان بەوە برد، "سپینۆزا" ئەو ئەندازیارە بلیمەتەیە کە فەلسەفەی مۆدێرنی بۆ خۆرئاوا فۆرمەلەکرد، واتە فەلسەفەی ئازادی و عەلمانیەت و دیموکراسی.ئەو تا لە ژیاندا مابوو دەیویست بیسەلمێنێت تێکدەر و ڕوخێنەر نییە، بەلاَم هەیهات کەس باوەڕی پێنەکرد.. لە ڕاستیشدا لێی تێنەدەگەیشتن، بۆیە باوەڕیان پێنەدەکرد. پێویستی بەوە بوو دووسەدە بەسەریدا تێپەڕێت، بۆ ئەوەی خەڵکی حاڵی بن لێی و تێیبگەن. تراژیدیای "سپینۆزا" ئەوە بوو وەك هەموو پێشەنگەکانی دیکە بەر لە وادەی خۆی هات و یەکێك بوو لەوانەی ئەوەی چاندی، کەسانی تر بەروبوومەکەیان دوورییەوە..

هەندێك کتێبی (مۆراڵ) یان بە چرکەساتێکی چارەنوسساز لە مێژووی فەلسەفی خۆرئاوادا

دایــە قەڵــەم (بڕوانــە لیــۆن براونشــڤایك)[21].
ســەروەختێك ئــەم کتێبــە لــە ســاڵی 1677دا بڵاوکرایــەوە، واتــە بــە ماوەیــەکی کــورت دوای مردنی، هێشتا هەر بۆ تێگەیشتن قورس و گران بــوو. ســاڵی 1665 "ســپینۆزا" نامەیــەك بــۆ یــەکێك لــە هاوڕێکــانی دەنێرێــت و تێیــدا بــاس لــەوە دەکــات کــە بــە نوســینەوەی کتێبێکــەوە خەریکــە دەربــارەی ئــایین (کتــێبی وتارێــك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت)، لـەو نامەیـەدا دەڵێت: (هەنوکە بە نوسینی لێکۆڵینەوەیەکەوە خــەریکم کــە تیایــدا بۆچــونی خــۆم دەربــارەی تێکســــتە پیرۆزەکــــان دەخەمــــە ڕوو. ئــــەو هۆکارانەشی وایانلێکردم خەریکی ئەم کارەبم، ئەمانەن:

**یەکەم**/ بۆچونی پێشوەخت و دەمارگیرانەی پیــاوانی ئــایینی. ئەمــە بــۆ خــۆی گــەورەترین کۆسپە لەبەردەم خوێندنی فەلسەفەدا. لێرەوە من دەمەوێت بیروبۆچونی تیۆلۆژیستەکان لێك شیتاڵ بکەم و ئـەقڵی خـەڵك و ڕۆشـنبیرانی لـێ ڕزگار بکەم.

**دووەم**/ دەمەوێت ئەو بۆچونە باوەی خەڵك لەسەر من هەیانە بگۆڕم. ئەوانە بەردەوام بە بێبــاوەڕی تاوانبــارم دەکــەن و منــیش ناچــارم داکۆکی لە خۆم بکەم و هەڵوێستم ڕونبکەمەوە.

**سێیەم**/ ئارەزووم بۆ داکۆکیکردن لە ئازادی بــیروڕا دەربــڕین بــە هــەموو شــێوەیەك. وەکــو ئاشکرایە دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی بەسەر خەڵکدا زۆرەو ئەمەش هەڕەشەیەکە بۆ سەر ئازادی لەم وڵاتەدا)[22].

"سپینۆزا" ئەمەی بەر لە زیاتر لە سێ سەد ساڵ نوسیووە. ئایا ڕۆشنبیری ئێمە خۆی تێدا نابینێتــەوە و ئــەو شــتانە بــە قســەی خــۆی نازانێــت؟ کاتێــك دەڵــێم ئــەو مــاوە مێژووییــەی دەکەوێتە نێوان فیکری ئێمەو فیکری ئەوروپی سێ سەدەیەك زیاتر دەبێت و کە دەشڵێم من هاوســـەردەمی "ســـپینۆزا"م زیـــاد لـــەوەی هاوسەردەمی "میشێل فۆکۆ" یان "سارتەر" بم، ئەوا گاڵتەیان پێدێت و توڕە دەبن. چونکە بەناو ڕۆشنبیرانی ئێمە نایەنەوێت ڕووبەڕوی کێشەکان ببنــەوە و دەســت بخەنــە ســەر قەیرانــەکان. هەروەها نایانەوێت بەرپرسیارێتی مێژویی ئەم ساتەوەختە بگرنە ئەستۆ. بە کورتیەکەی ئەوانە بــاس لــە هــەموو شــتێك دەکــەن، تــەنها ئــەو شتەنەبێت کە پێویستە قسەی لەسەر بکرێت.
"سپینۆزا" وازی لە نوسینی کتێبە فەلسەفەیە قــەوارە گەورەکــەی هێنــا (مــۆراڵ)، تــا خــۆی تەرخانکات بۆ ئەو کتێبەی باس لە پەیوەندی نێوان تیۆلۆژیا و سیاسەت دەکات.

دەستبەرداربوونی ئەو کتێبە و دەستکردن بە نوسینی کتێبێکی نوێ، مانای وایە دۆخەکە هێندە ناهەموار بووە کە پێویستی بە نوسینی کتێبێکی لەو جۆرە بووە. شایەنی باسە حیزبی ئسولی هۆڵەندی لەو قۆناغەدا هەڕەشەی ئەوەی دەکــرد کــە دەســەڵات دەگرێتــە دەســت و ئــەو ئازادیە فیکرییە کۆتایی پێدێنێت کە هۆڵەندا بەراورد بە وڵاتانی دیکەی ئەوروپایی (بێجگە لە ئنگلتــەرا)، خــاوەنی بــوو. حیزبــی کۆمــاری لــەو دەمەدا هەڵوێستێکی بەرگریکاری، بەرامبەر بە هێـــرش و پـــەلاماری فێندەمێنتالیســـت و تیۆلۆژیستە توندڕەوەکان وەرگرتبوو. لەبەرئەوە "ســپینۆزا" کەوتــە خــۆی و دەســتیکرد بــە نوســینی ئــەو کتێبــە ترســناکەی، چــونکە ئــەو

دەیویست داکۆکی لە لێکبوردەیی ئایینی و ئازادی ڕادەربڕین بکات و نەهێلێت هۆڵەندا هەڵخلیسکێتە ناو زەلکاوی توندڕەوی ئایینیەوە. بەڵام کتێبەکەی وەك هەر کتێبێکی فەلسەفی قوڵ، ئەو بۆنەو هەلومەرجە تێدەپەڕێنێت کە تێیدا نوسراوە. بۆ نمونە ئەو باس لە ئازادی بیرکردنەوە ناکات لە کات و شوێنێکی تایبەت و دیاریکراودا، بەڵکو بۆ هەموو کات و سەردەمێکە. ئەو لە سەرو لایەنە بەشەڕ هاتووەکانەوە باس لەو کێشانە دەکات، بۆ ئەوەی بگاتە کرۆکی مەسەلەکەو بۆ ئەوەی تیۆریایەکی نوێ دەربارەی دەوڵەت و یاسا پێشکەش بکات کە سەر لەبەر لە سستمی زوڵم و ستەم جیاوازە.

خاڵێکی دیکە هەیە کە "سپینۆزا" بلیمەتی خۆی تێدا سەلماندووە: ئەویش ئەوەیە پێش میتۆدی مێژویی نوێ کەوتووە لە تاوتوێکردنی تێکستە ئایینیەکاندا، بۆ نمونە یەکەمین لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی لەسەر تەورات کردووە. یەکێك لە زانا پسپۆڕەکانی ئەم بوارە لەمبارەیەوە دەڵێت: (سپینۆزا زانیویەتی چۆن کێشەکە دەخاتە ڕوو، چۆن چۆنیش ئامانجی لێکۆڵینەوەکە دیاری دەکات. بەهۆی لێهاتوی و بلیمەتی خۆیەوە گەیشتە کۆمەڵە دەرەنجامێك کە زانایان لە سەدەی نۆزدەهەمدا پێیگەیشتن). ئەمەش مانای وایە کە بە دوو سەدساڵ پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتووە. تەنانەت "ڕیچارد سیمۆن"یش کە بەڕێبەری میتۆدی مێژویی لە تاوتوێکردنی تێکستە ئایینیەکاندا دادەنرێت، سودێکی زۆری لە "سپینۆزا" بینیووە، زیاد لەوەی خۆی ویستویەتی ئیعتراف پێبکات. مەبەستی کۆتایی "سپینۆزا" لە نوسینی ئەم کتێبە ئەوە بوو بیسەلمێنێت، کتێبە پیرۆزەکان ئەگەر بەچاکی تێیان بگەین فێری توندڕەویمان ناکەن، بەڵکو فێری لێبوردەیی و خۆشەویستیمان دەکەن.

کەواتە نابێت لە پێناو ئەو فتوا ئایینیانەدا بەکاریان بێنین کە کوشتن و تیرۆر و توندڕەوی‌و جەنگی ناوخۆی و ئایینی حەڵاڵ دەکەن. ئەو کتێبانە هەندێ حەقیقەتی بنەڕەتیمان فێردەکەن کە بۆ ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ژیانمان پێویستە. فێرماندەکەن کە خودا هەیە، ئیتر بۆچونمان دەربارەی هەبوونی هەر چۆنێك بێت. هەروەها پێمان دەڵێن خوا دەربایسی چارەنوسی مرۆڤەو سۆز و بەزەیی خۆییان بەشدەدات و فەرمانیان پێدەکات یەکتریان خۆش بوێت. ئەی حەزرەتی مەسیح لە ئینجیلدا ناڵێت: (ئەوەی زللەیەکی دا بە ڕوومەتتا، ڕوومەتەکەی تریشی بۆ ڕاگرە؟. ئایا لێبوردەیی لەمە زیاتر هەیە؟ئەی چۆن پیاوانی ئایینی، ئەم پەیامەی مەسیحیان گۆڕی بۆ دەمارگیری و دادگاکانی پشکنین و بانگەشەکردن بۆ توند و تیژی و ڕاوەدوونانی هەموو بیریار و زانایەك؟ چۆن پرانسیپە پیرۆز و باڵاکانی ئایینیان شێواند؟ ڕاستیەکەی ئایین بەلای "سپینۆزا" وە بریتییە لە خۆشەویستی و مامەڵەی چاك و ڕەفتاری بەجێ. گرنگ بەلای ئەوەوە سروت و ڕێو ڕەسمەکان نییە، بەڵکو ئەو پەیامە ڕۆحیەیە کە ئایینەکان پێمانی دەڵێن و لە بنەڕەتیشدا داوای خوا پەرستی و کاری چاکە دەکەن.

لەلایەکی ترەوە "سپینۆزا" پێیوایە فەلسەفە مەبەستی گەیشتنە بەهەمان حەقیقەت، بەڵام لە ڕێگەی ئیمان و خۆبەدەستدانەوە نا، بەڵکو لە ڕێگای ئەقڵ و بەڵگەوە.کەواتە دوو ڕێگا بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و سەرفرازی هەیە: ڕێگەی فەلسەفە و ڕێگەی ئایین. یەکەمیان تەنها تایبەتە بە روناکبیران، بەڵام ڕێگەی دووەمیان بۆ تەواوی میللەتە، ئەوانەی ناتوانن لە ڕێی ئەقڵەوە پەی بە حەقیقەت بەرن. ئەم قسەیە بە قسەی "ئیبن روشد" دەچێت. بە بۆچونی "سپینۆزا" دوو ڕێگا بۆ وێناکردنی خوا لە ئارەدایە: ڕێگەی ئایین کە یەزدان بە شێوەیەکی گشتی لە ڕێی موسا و عیسا و پێغەمبەرانەوە، خەیاڵ و ویژدانی مرۆڤ دەدوێنێت. لەگەڵ ئەو خوایەدا کە بە دیدگای فەلسەفی و ئەقڵانی هاوتای سروشتە. بەمجۆرە تێکستە ئایینیەکان ناتوانن هیچ شتێکمان دەربارەی سروشتی ئەم دیدگا فەلسەفیە بۆ یەزدان بەردەست بخەن و هیچمان دەربارەی خەسڵەت و پەیوەندیەکانی بە مرۆڤەوە پێ بڵێن، چونکە شت گەلێکی وا بە تەنها تایبەتمەندی فەلسەفەیە[23].

بە کورتی ئامانجی "سپینۆزا" لە نوسینی کتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت)، خستنە ڕوی تەفسیرێکی ئەقڵانی بوو بۆ تێکستە پیرۆزەکان، بۆ ئەوەی بەر بەو شرۆڤە نا ئەقڵانیەی تیۆلۆژیستە توندڕەوەکان بگرێت. کەواتە شەڕی شەڕێکی کراوە بوو لەگەڵ ئەو توندڕەوە ئایینیەدا کە هەر هێندەی سەری دەرهێنا، ئیتر دەبێتە بەلایەکی گەورە و تەڕووشك پێکەوە دەسوتێنێت.

**سپینۆزا لە نێوان ئایین و فەلسەفەدا:**

کێشەی سەرەکی لە سەردەمی "سپینۆزا"دا چی بوو؟ یاخود کێشەی سەرەکی بە درێژایی سێ سەد ساڵ لە درووستبونی مۆدێرنەی ئەوروپایی چی بووە؟بێگومان کێشەی ئایین و فێندەمێنتالیزمی ئایینی بووە. ئەگەر لەم خاڵە تێنەگەین و گرنگی تەواوەتی پێنەدەین، ئەوا هەرگیز لە ناوەڕۆکی مۆدێرنە و شەڕە گەورەکانی حاڵی نابین. کاتێك "سپینۆزا" کتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت)[24]ی نوسی، ئەمە مانای وابوو چۆتە نێو یەکێك لەو شەڕە بێئامانانەی لە پاش خۆی بۆ ماوەی دوو سەدە و زیاتریش بەردەوام بوو. ویستی ئەو لە نوسینی ئەم کتێبە ئەوە بوو، پەیوەندی نێوان ئایین و سیاسەت یاخود نێوان پیاوی ئایینی و فەرمانڕەوا دیاری بکات. هەروەها دەیویست شتێکی گرنگ و سەرەکیش بسەلمێنێت، ئەویش ئەوەیکە: ئازادی فەلسەفاندن و ویژدان و بیروڕاو قسەکردن، هەرگیز ئاشتی و ئاسایشی گشتی دەوڵەت ناشێوێنێ و وەکو تیۆلۆژیستەکانیش دەڵێن:نابێتە مایەی ئاشوب و بەرەڵلایی. بە پێچەوانەوە ئازادی ئەو شتانە، مەرجە بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئاشتیە و بۆ چەسپاندنی سەر ڕاستی و مەیلی مۆراڵخوازی لە کۆمەڵگەدا. کەواتە نابێت ئاستەنگ بۆ ئازادی فیکری و فەلسەفی دروست بکرێت، مادامەکی لە سنور و چوارچێوەی یاسادا ڕەفتار دەکات. شایەنی باسە ئەم کتێبە یەکەم خۆ تێهەڵقورتاندنی "سپینۆزا" یە لە کاروباری ئایینی و سیاسی

سەردەمەکەیدا. لەبەرئەوە پێگەیەکی تایبەتی هەیە لە چاو کارەکانی دیکەیدا.

ئەم کتێبە لە قۆناغێکی زۆر دژواری مێژوی ولاتی هۆڵەندادا بلاوکرایەوە. لەو ساتەوەختەدا گفتوگۆ و مشتومڕێکی تیۆلۆژی لە نێوان تێکڕای دەستەو تاقمە مەسیحیەکاندا لەوپەڕیدا بوو، بە تایبەت ئاینزای پرۆتستانتی کالڤنیزم کە ئاینزای زۆرینەی دانیشتوانی ولاتی هۆڵەندا بوو، ئەمەش بە پێچەوانەی فەرەنسا و ئیسپانیا و ئیتاڵیاوە بوو،چونکە لەو ولاتانەدا کاتۆلیک مەزهەبەکان زۆرینە بوون. ململانێ تیۆلۆژیەکانی نێوان دەستەو گروپە جیاجیاکانی پرۆتستانتی لە هۆڵەندا، بووە مایە سەرکەوتنی لایەنگرانی "کالڤن" و دواتر ئاشتەوایی لە نێوان تەواوی لایەنە ناکۆکەکاندا دروست بوو کە بۆ ئەوسای ئەوروپا شتێکی سەیر و سەرنج ڕاکێش بوو.

جگە لە ململانێی ئاییني، ململانێی سیاسیش لەسەر دەسەلات،خەسڵەتێکی دیکەی ئەو قۆناغەی مێژووی ولاتی هۆڵەندا بوو. ئەم کێشەیەش لە نێوان بنەماڵەی پاشایەتی ئۆرانج و ئەو ئەنجومەنە لۆکاڵیانەدا دروست بوو کە حوکمڕانی شار و هەرێمەکانیان دەکرد. دوای مردنی شا "گیۆم"ی دووەم، کەسێکی ڕۆشنگەری بەناوی "یان دۆڤیت"ەوە دەسەلاتی گرتە دەست و لەسەردەمی حوکمڕانیکردنیشیدا هۆڵەندا لە بواری زانست و زانکۆدا گەشەی بەرچاوی کرد. هەروەها فەلسەفەی مۆدێرن داخڵ بەو ولاتە بوو، واتە فەلسەفەی "فرانسیس بیکۆن" و "دیکارت" و "هۆبز" هاتنە ناو هۆڵەنداوە. بە هاتنی ئەمانەش ژیانی

ڕۆشنبیری بوژایەوەو دەزگاکانی چاپ و بلاوکردنەوە کەوتنەوەگەڕ. بەمجۆرە هۆڵەندا بوو بە قیبلەگای فیکر و ئەدەب لە تەواوی ئەوروپادا. ئەی کەواتە "سپینۆزا" بۆچی ئەو کتێبەی نوسی؟ بۆچی سەرسەختانە کەوتە داکۆکیکردن لە ئازادی بیر لە یەکێك لەو ولاتانەی لە هەمووان لیبرالیترو کراوەتر بوو؟ لەبەرئەوەی تۆلێرانس و کرانەوە هەمەلایەن وگشتی نەبوو. "سپینۆزا" و هاوڕێکانی دەیانزانی ئەوەی هەیە ئازادیەکی سنوردار و دیاریکراوە و باجی ئەوەشیان دا. هەروەها لەبەرئەوەبوو کە تەنها دەوڵەت لێبوردە بوو، بەلام کڵێسا وانەبوو.سەرەنجام ئەمەش بووە مایەی تیرۆرکردنی "یان دۆڤیت". دواجار دەبێت باس لەوەش بکەین کە ئەو فەزای تۆلێرانسەی هۆڵەندا تێیدا دەژیا، مەترسی لەسەر بوو، "سپینۆزا"ش بەر لە هەر کەسێکی دی ئەمەی چاك دەزانی. وەکو ئاشکرایە پرۆتستانتە توندڕەوەکانی هۆڵەندا لەو قۆناغەدا، لایەنگری حوکمی پاشایەتی بوون و خوازیاری ئەوە بوون پاشایەتی حوکم بکات، لەبەرئەوەی بەو فەزای ئازادی و لێکبوردنە جاڕس بوون و لەگەڵ ئەو دۆخەدا هەڵیان نەدەکرد!

ڕاستە سەروەختێك "سپینۆزا" ئەو کتێبەی نوسی، سستمی لیبرالی وەها دەهاتە پێش چاو کە لەسەرپێی خۆی وەستابێت، چونکە "یان دۆڤێت"ی هاوڕێی سەرکردایەتی ولاتێکی دەکرد کە لە ڕووی بازرگانیەوە گەشەی کرد بوو، هەروەها لە ڕوکەشدا وەها دیار بوو کە خاوەنی دام و دەزگایەکی پتەو و کۆنکرێتیە،

بەلاّم تەنها دوای دوو ساڵ لەو مێژووە، هێرش و پەلاماری فەرەنساییەکان بۆ سەر هۆڵەندا دەستی پێکرد و کۆتایی بە حوکمڕانی لیبرالی هات، لە بەرامبەردا سستمی پاشایەتی ئسولّی گەڕایەوە سەر دەسەلاّت. بەمجۆرە هەموو خەونەکانی یوکایەوە وپێشبینیە رەشبینەکانی، دەرهەق بە ئسولّی و تیۆلۆژیستەکان هاتە دی. چونکە ئەو پێیوابوو ئەوان سەرچاوەی هەموو دەرد و بەلاّیەکن، واتە سەرچاوەی ستەمکاری و پاکتاوکردنی ئازادی فەلسەفین.

بەلاّم کتێبەکەی "سپینۆزا"، وەك هەر کتێبێکی فەلسەفی مەزن، هەلومەرجی هۆڵەندا تێدەپەڕێنێت و باس لە هەلومەرجی ئەوروپا و تەواوی دنیا دەکات. دەتوانین بڵێین ئەو کتێبە رەنگدانەوەی چەندین ئاستی کێشە و ململانێیە:

**یەکەم**/ ململانێی نێوان تیۆلۆژیا و سیاسەت. هەر بۆیە ناونیشانی کتێبەکەش بەم جۆرەیە،وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت.

**دووەم**/ ئەو کێشەیەی لەسەردەمی رێنیسانسەوە لە نێوان ئینجیل و زانستی فیلۆلۆگی لە ئەوروپادا هەیە.. وەکو دەزانرێت لە سەدەی شانزەهەمەوە هەندێك لە رابەرانی رێنیسانس داوای ئەوەیان دەکرد ئینجیل لە روی زمانەوانی و مێژووییەوە تاوتوێ بکرێت، بۆ ساخکردنەوەی ئەوەی کام دانەیان راست و دروستە. بێگومان کارێکی لەمجۆرەش کاریگەری لەسەر لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی دەبێت، لەبەرئەوە نارەزایی لەناو پیاوانی ئاینی و موحافیزکارەکاندا دروست کرد. دواجار ئەو کێشە و ململانێ نەبڕاوەیەش هەیە لە نێوان فەلسەفە و تیۆلۆژیادا و ئەمەش هەر بە تەنها تایبەت نییە بە ئایینی مەسیحی، بەڵکو وەك یەك ئیسلام و ئەرسۆدەکسیەتی خۆرهەلاّتیش دەگرێتەوە. بەم پێیە دەتوانین بڵێین کتێبەکەی "سپینۆزا" کتێبێکی یۆنیڤێرسالیە یاخود باس لە مەسەلەگەلێکی یۆنیڤێرسالی دەکات. بۆیە بۆ ئێستای ئایینی ئیسلام شتێکی گرنگ و پێویستە[25].

شایەنی باسە "سپینۆزا" لەم کتێبەیدا خۆی لە باس و خواسی مەسەلەگەلێکی واداوە کە "دیکارت" بەر لە سی چل ساڵ و لە ترسی پیاوانی ئایینی، نەیوێراوە خۆی لێیان بدات و باسیان بکات. بوێری و جدیەتی "سپینۆزا" بە بەراورد لەگەڵ "دیکارت"دا، لێرەدایە. راستە ئەو بە یەکێك لە قوتابیانی فەلسەفەی دیکارتیزم ئەژمار دەکرێت وەکو "لایبنتز" و "مالبرانش"، بەلاّم مامۆستاکەی لەوەدا بەجێدیلێت کە میتۆدە ئەقلاّنیەکەی بەسەر کایەیەکدا پراکتیزە دەکات، مامۆستاکەی زاتی ئەوەی نەکردووە بیکات. بالێرەدا گوێ بۆ یەکێك لە گەورە مێژوونوسانی فەلسەفە لە فەرەنسادا بگرین کە ئەویش "فێردیناند ئەلکێیە"، بزانین چی دەڵێت: (وەکو ئاشکرایە دیکارت زۆر گرنگی بەوە دەدا کە دوو کایەی حەقیقەت لە یەکتری جیا بکاتەوە: کایەی کتێبە پیرۆزەکان کە دەبنە مایەی سەرفرازیمان لەوە دنیا، لەگەڵ کایەی سروشتی فیزیایی. بەمجۆرەش دەتوانین دیاردەکان بەشێوەیەکی زانستی تاوتوێ بکەین، لە پێناو کۆنترۆڵکردنی

سروشت و بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ. بە بۆچونی دیکارت ئەم دوو کایەیە ئەگەر چی جیاوازیشن لە یەکتری، بەلأم هەرگیز پێك ناکۆك نین. بەمجۆرە و بەوپەڕی فێڵ و زۆرزانییەوە دیکارت خۆی لە دەست تورەیی ئەو تیۆلۆژیستانە قوتار کرد کە لە سەنگەردا بوون بۆی، گەر هاتوو قەرەی ئایین کەوت یاخود ویستی میتۆدە ئەقلأنیەکەی بەسەر ئاییندا پراکتیزە بکات)[26].

سەروەختێك پێشەکی کتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیا و سیاسەت) دەخوێنینەوە، سەرەتا وا دەزانین هەمان ئەو ڕێگا چارەیە دەگرێتە بەر کە "دیکارت"ی مامۆستای پەیڕەوی کردبوو. بەو پێیەی ئەو زیاتر دەربایسی پاراستنی ئازادی فەلسەفی بوو نەك پاراستنی ئایین، بۆیە هەوڵی دەدا فەلسەفە و ئایین هەریەکەیان لە بواری خۆیاندا بمێننەوە، بۆئەوەی هیچ لایەکیان سنور بەزێنی نەکەن! بۆ نمونە دەڵێت: (قەناعەتی تەواوم هەیە تەورات و ئینجیل کەم تا زۆر پەیوەندییان بە فەلسەفەوە نییە، بەڵکو هەریەکەیان بواری تایبەتی خۆیانیان هەیە. ئەو مەعریفەیەی پشت بە وەحی دەبەستێت تەواو جیاوازە لە مەعریفەی سروشتی و ئەقلأنی، ئیتر لە ڕوی بابەتەوە بێت یان لە ڕوی میتۆد و ئامراز و پرانسیپە سەرەکیەکانیەوە بێت. بە کورتی دەتوانین بڵێین: بەو پێیەی ئەم دوو جۆرە لەمەعریفە جیاوازن لە یەکتری، ئەوا هەریەکەیان دەتوانێت لە بواری تایبەتی خۆیدا کاربکات، بەبێ ئەوەی لەگەڵ کایەکەی تردا ناکۆك بێت یاخود بەشەڕبێن لەگەڵ یەکتریدا)[27].

کاتێك ئەم پەرەگرافە دەخوێنینەوە، هەست دەکەین "سپینۆزا" کێشەکەی بەوە چارەسەر کردووە کە خۆی لە کایەی ئایین بە دوور گرتووە! چونکە فەیلەسوفی ئەقلأنی تاوتوێی سروشت دەکات و پرۆسەی فەلسەفاندنی خۆشی دەکات، بێئەوەی تێکستە پیرۆزەکان بە هێند وەربگرێت. لەلایەکی تریشەوە پیاوی ئایینی و کەسی ئیماندار ئینجیل و تەورات دەخوێنێتەوەو شرۆڤەیان دەکات، بەبێگوێدانە ئەو پرانسیپە فەلسەفی و ئەقلأنیانەی لە دەرەوەی وەحیدان. کەواتە چارەسەرکردنی پەیوەندی نێوان ئەم دوو جەمسەرە مەزنە لە ڕێی دابڕاندن و لێك جیاکردنەوەی تەواوی نێوانیانەوە دەبێت، بەلأم ئایا ئەمە دەبێت؟ئایا پیاوانی ئایینی هێشتیان "گالیلۆ" بە ویستی خۆی تاوتوێی سروشت بکات؟ ئایا ناچاریان نەکرد بەوەی لەو بۆچوونەی پەشیمان بێتەوە کە دەڵێت: (زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە)، لەبەرئەوەی تێکستە پیرۆزەکان پێچەوانەی ئەوە دەڵێن؟ ڕاستیەکەی "سپینۆزا" لە هیچ یەك لەو ڕاستیانە بێئاگانییە، بەلأم دەزانێت بەناو کێڵگەیەکی بەمین چێنراودا ڕێدەکات و دەزانێت هەر هەڵەیەك بکات، ئەوا فێندەمێنتالیستە یەهودی و مەسیحیەکان دەیقۆزنەوەو ئامبازی دەبن. چونکە ئەوان چۆن لە "دیکارت" بە گومان بوون، ئەوا گومانیشیان لەم هەبوو، بگرە زیاتریش. بۆیە دەبوو وریای خۆی بێت و چاوکراوە بێت.

بەلأم کاتێك لەسەر خوێندنەوەی کتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیاو سیاسەت) بەردەوام دەبین، دەبینین بەشەکانی بەهەمان ئەو

هەناسەیەی پێشەکیەکەی نەنوسراوە. ئەگەرچی نوسەر ناچار بووە ئەو هەلومەرجە گشتیەی ئەوکات لەبەرچاو بگرێت. "سپینۆزا" نەسکی یەکەمی کتێبەکەی بە دیاریکردنی پێغەمبەرایەتی دەست پێدەکات و دەڵێت: (مەعریفەیەکی یەقینگەرایە). بەلاٌم لە نەسکی دووەمدا پێمان دەڵێت: (وەحی لە پێغەمبەرێکەوە بۆ پێغەمبەرێکی دی، بە پێی خەسڵەت و خەیاڵ و مەیل و هەلومەرجی سەردەمەکەی دەگۆڕێت.. بۆ نموونە ئەگەر پێغەمبەرێك کەسێکی دڵخۆش و ڕوو بەپێکەنین بوو، ئەوا ئەو وەحیەی بۆی دێت باس لە شتی دڵخۆشکەر و دڵنیایی دەکات. بەلاٌم پێغەمبەرێکی لادێی یان کە لە لادێدا ژیا بێت، ئەوا هەر مانگا و گوێرەکە دەبینێت.. ئەو پێغەمبەرەشی چەکدار و میلیتاری بێت، ئەوا تەنها لەشکر و سەرکردە دەبینێت. کەواتە پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل وەکو ئینسانەکانی دی، کوڕی سەردەم و زەمانی خۆیان بوون، تەنانەت هەندێك لە پێغەمبەران نەیانتوانیووە لە پەیامی ئەو وەحیە بگەن کە بۆیان هاتووە، لەبەرئەوەی کاتی نەبووە. لەبەرئەوە ئێمە ناچارین ڕەخنەی ئەقلانی بەکاربهێنین، بۆ ئەوەی لە مانای قسەکانیان حاڵی ببین).

ئەگەرچی "سپینۆزا" باس لەوە دەکات کە تەنها لە ڕێی خۆیانەوە ئینجیل و تەورات شرۆڤە دەکات و هیچ میتۆدێکیان لە دەرەوەی خۆیاندا بەسەردا ناسەپێنێت، بەلاٌم لە ڕاستیدا میتۆدی دیکارتی (واتە ئەقلانی) بەسەردا پراکتیزە کردن. ئەمە لە کاتێکدا "دیکارت" خۆی زاتی ئەوەی نەبوو کارێکی وا بکات و میتۆدەکەی تایبەت کرد بۆ تاوتوێکردنی دیاردە سروشتیەکان و ڕێگەی نەدا لە بواری ئاییندا پراکتیزە بکرێت.. هەرچۆنێك بێت لە بواری فەلسەفیدا "سپینۆزا" بوێرییەکی زۆری نواند و ڕسکی گەورەی کرد، ئەو بەردەوام جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە فەزڵی ئەقڵ بەسەر ئەو شتانەدا بدەین کە لە تەورات و ئینجیلدا تێیان دەگەین. بەلاٌم ئاخۆ ئەمە بەو مانایە دێت کە "سپینۆزا" بایەخ و گرنگی ئایین فەرامۆش دەکات؟

بێگومان نەخێر، لەبەرئەوەی خەڵك و خوا جگە لە ملکەچی بۆ ئایین، سەرفرازای لە شتێکی دیکەدا نابینین[28]، لە مبارەیەوە ئەم چیرۆکەی لێدەگێڕنەوە: ڕۆژێکیان خاوەن ماڵەکەی لێی دەپرسێت دەکرێت لە ڕێی ئایینێکی دیکەوە سەرفرازی بەدەست بێنم؟ ئەویش لە وەلاٌمدا پێیدەڵێت: خانم ئایینی خۆت چاکە و پێویستت بە ئایینێکی دیکە نییە، بە مەرجێك ئەو دینداریەت خواپەرستی تێدا بێت و ژیانێکی هێمن و ئارام بژیت و زیان بە کەس نەگەیەنیت. ڕاستیەکەی "سپینۆزا" دەیزانی ئایین دڵنیایی بە خەڵکانی ئاسایی دەبەخشێت، دڵنیاییەك کە لە هیچ جێیەکی تر نایدۆزنەوە. بۆیە نابێت لەم دڵنیاییە بێبەشیان بکەین، چونکە مرۆڤ بەبێ ئەوە ناژی. بەلاٌم خۆی دەیتوانی لە ڕێگایەکی ترەوەو بەبێ ئایین بەو دڵنیاییە بگات. ئەو نکۆڵی لەوە نەدەکرد کە ئایین لایەنی ئیجابی تێدایە، بەلاٌم ئەوەی ترسی لێی هەبوو توندڕەوی و دەمارگیری بوو.

سەروەختێك "سپینۆزا" لە هۆڵەندا بوو، مەسیحیەکانی ئەوێ بووبوونە دووبەش.

دەستەیەکیان ئسولّی و دەستەیەکیان لیبرالی. ئسولّیەکان، لیبرالییەکانیان بەوە تاوانبار دەکرد کە شەیتان پەرستن! بەلاّم بۆچی؟ لەبەرئەوەی گوێیان بۆ پیاوانی ئایینی نەدەگرت و ئەنجامدانی سروتە ئایینیەکانیان بە گرنگ نەدەزانی، بۆیە بە کەسانی بێباوەڕو کافر تاوانباریان دەکردن.. مرۆڤی فێندەمێنتالیست ئەوەی بەلایەوە گرنگە، ڕوکار و سروت و ڕێوڕەسمە ئایینیەکانە، نەك جەوهەر و ناوەڕۆکی ئایین. تێگەیشتنی ئەم مرۆڤە بۆ ئایین تێگەشتنێکی وشك و سەرکوتکار و داخراوە، بۆیە ناتوانێت لەگەڵ ئەو کەس و لایەنانەدا هەڵبکات کە کراوە و لیبرالن. بۆ نمونە لە ئینکلتەرادا (کۆیکەرزەکان) هەبوون کە گروهێکی کراوەو لیبرال بوون و "ڤۆلّتێر" سەروەختێك لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا دەچێتە ئینگلترا، ئەمانە دەبینێت و ستایشێکی زۆریان دەکات کە چەند مرۆۋ دۆستن و لێبوردەن بەرامبەر دەستەو تاقمەکانی دی، ئەمەش بە توندڕەوی و دەمارگیری کاتۆلیکەکانی فەرەنسا بەراورد دەکات... بە گشتی زۆربەی دۆست و هاوڕێیانی "سپینۆزا"، سەر بەو ڕێبازە ئایینیانە بوون کە لیبرالی بوون و دوور بوون لە دەمارگیری و توندو تیژی. دەتوانین لێرەدا باس لە ڕێبازی (مەنوینیەکان) بکەین، ئەمانە هەوادار و شوێنکەو توانی قەشەی هۆڵەندی "مەنوسیمۆن" بوون کە لە نێوان سالآنی (1496-1561)دا ژیاون.

هەرچەندە "سپینۆزا" دۆستی ڕێبازە مەسیحیە لیبرالەکان بوو، بەلاّم هەندێك جار بەریەك دەکەوتن، ئەویش بەهۆی ئەو خورافاتەی لەناویاندا بلاّوبووبووەوە. ئەمەش هەروا بە ئاسانی ریشەکێش نەدەکرا، لەبەرئەوەی زۆر بەقوڵی ڕەگی داکوتی بوو لە ناخیاندا. لێرەدا مەبەستمان ئەو بۆچونە باوانەیە کە دەربارەی کتێبە پیرۆزەکان لە ئارەدایە و هەرکاتێك پێویست بکات، ئیمانداران وەکو بەهانەیەك لە دژی ئەقلّ بەکاری دێنن. بەشێوەیەکی گشتی لای کەسی ئیماندار، شکۆ و دەسەلاّتی تێکستە پیرۆزەکان لەسەرو شکۆ و دەسەلاّتی فەلسەفە و فیکری لۆژیکیەوەیە. ئەگەرچی "سپینۆزا" گۆشەگیرانە دەژیا و زۆر بە تەنگ ئەوەوە بوو بیرو بۆچوونەکانی بەناوخەڵکدا بلاّونەبێتەوە، بەلاّم نێوبانگی وەها ڕۆیشتبوو کە کەسێکی بێباوەڕەو بڕوای بە هیچ ئایینێك نییە، تەنانەت ئایینی یەهودیش کە لەسەری پەروەردەبووە. ئەم نێو بانگەش بۆ ئەو سەردەم و زەمانە مەترسیدار بوو، چونکە وشەی بێباوەڕ هاوتای وشەی تاوانبار بوو! یاسای ئەوروپایش توندترین سزای بۆدانابوو، تەواو وەك ئەوەی ئێستا لە ولاّتانی ئیسلامیدا هەیە.. بێگومان "سپینۆزا" بێباوەڕ نەبوو، بەلاّم ئەو تێگەیشتنە بەر فراوانەی ئەو بۆ ئایینی هەبوو، لەسەر و ئاستی تێگەیشتنی خەڵکانی سەردەمەکەیەوە بوو. ئەو نە کەسێکی سەرەڕۆ بوو نە پەلاماری ئایینیشی دا، بەڵکو هێرشی کردە سەر تیۆلۆژیستەکان و شێوازی تەفسیرکردنەکانیان بۆ ئایین. لێرەشدا جیاوازیەکی گەورە هەیە، بەلاّم خەڵك جیاوازی ناکات لە نێوان ئایین و پیاوانی ئایینیدا. هەر بۆیە گەر هێرش بکەیتە سەر پیاوانی ئایینی و فێندەمێنتالیستەکان، ئەوا پێیان وایە پەلاماری

ئایینــت داوە! هەرچــۆنێك بێــت ئامــانجی "ســپینۆزا" لــە نوسـینی کتێبەکـەی (وتارێـك دەربـارەی تیۆلۆژیـا و سیاسـەت)، ئـەوە بـوو لێکدانەوەیـەکی نـویێ بـۆ ئـایین و تێکسـتە پیرۆزەکان بەردەست بخات[29].. هەندێك پێیان وایە بۆچونی "سپینۆزا" سەبارەت بە یەزدان، زۆر لـە بۆچـونی ئایینـە یەکتاپەرسـتیەکانەوە دوورنـەبووە، بەڵام زۆرێکـی تـر بۆچـونی تـەواو پێچـەوانەیان هەیـە و دەڵـێن: (بۆچـونی ئـەو لـە ئاقاری یەکیەتی بوونەوە نزیك بووە).

پێویستە بزانین خاڵی دەسپێك لەو کتێبەیدا مەسـەلەی (وەحی)یـە کـە بـەبێ چـەند و چـون ئـیعترافی پێـدەکات. پێغەمبـەرانی تـەورات و ئینجیل توانیـان بگەنە هەندێ ڕاستی سـەرەکی کە بۆ هیدایەتدانی مرۆڤ لەم ژیانەدا پێویستن. لە ڕێی فەلسەفەشەوە بەم ڕاستیانە نەگەیشتن، بەڵکو لە ڕێگەیەکی ترەوە پێیگەیشتن. یەکەمین حەقیقـەتێکیش ئەوەیەکـە خـودا هەیـە و ئـەو خودایـەش سـۆز و بەزەیی خۆی بەسەر مرۆڤدا دەبـارێنێ و داوایـان لێـدەکات یـەکتریان خـۆش بوێـت. "سـپینۆزا" تـەواوی تیۆلۆژیـای ئـایینی لەم ئایدیا سەرەکیەدا کورتدەکاتەوە. بڕوا بوون بـە ڕاسـتی ئەمـە، مانـای وایـە تـۆ کەسـێکی بـڕواداری و پراکتیزەکردنیشـی لــە ژیــانی ڕۆژانەتـدا دەکاتـە ئـەوەی تـۆ کەسێکی لـە خـوا ترســی.. هــەروەها "ســپینۆزا" پێیوایــە گوێڕایــــەڵیکردنی خــــواو ئیمانــــداری و جێبـەجێکردنی فەرمانـەکانی، هـەر هـەمووی لـە خۆشویستنی کەسانی تردا کۆدەبێتـەوەو بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەوە دنیا ڕۆحی سەرفراز بێت. بـەدەر لەمـەش پێویسـتی بـە شـتێکی تـر نییـە و ئەوەی ناوێت کە مرۆڤ سروت و ڕێو ڕەسمی تر مومارەسە بکات. بە کورتیەکەی ئەو بێئەندازە ئــایین ســادە دەکاتــەوەو دەیگرێتــەوە بــۆ جەوهـەری ڕاسـتەقینەی خـۆی کـە بریتییـە لـە: (خـوا پەرسـتی و سەرڕاسـتی و خۆشویسـتنی کەسـانی دی). بـەڵام ڕێگایـەکی دیکـەش بـۆ ڕزگـاری و سـەرفرازی هەیـە: ئـەویش ڕێگـای فەلسـەفەیە. "گۆتـە" کـە زۆر بـە "سـپینۆزا" سەرسـام بـووە، پێیوایـە خـەڵك و خـوا لــە زانسـتەکان تێناگـەن و چـێژ لـە جـوانی هونـەر نابینن، بۆیە تـەنها ئەوان پێویستیان بە ئایینە لە پێناو ئەوەی ڕۆحیان دڵنیا بێت.

بــەمجۆرە دەگەڕێینــەوە بــۆ ســەر ئــەو دابەشکردنەی کە خەڵك و خوا لە دەستەبژێران و تیۆلۆژیـا لـە فەلسـەفە جـویێ دەکاتـەوە. لـە ڕاسـتیدا مەبەسـتی سـەرەکی ئـەو تەفسـیرە ئەقڵانیـەی "سـپینۆزا" دەربـارەی تێکسـتە پیرۆزەکان پێشکەشیکرد، بۆ ئەوە بوو مۆدێلێك لە مۆراڵی کۆمەڵایەتی پێشنیار بکات کە مرۆڤ لـە بـەلای ململانێـی ئـایینی و دەسـتەگەری بپارێزێت. ئەو پرانسیپە تیۆلۆژیەی "سپینۆزا" پشـتی پێبەسـتبوو هـیچ ئـایین و ئایینزایـەك نەیدەتوانی نکوڵی لێبکات، چونکە هیچ ئایینێك نییە ئـەو پرانسـیپەی قبـوڵ نـەبێت کـە دەڵـێت کەسانی دیتان خۆش بوێت و یارمەتیان بدەن و بەچاکی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن. بەڵام سروت و ڕێـو ڕەسـم و بیروبـاوەڕ کـە لـە دیینێکـەوە بـۆ دینێکی دیەوە دەگۆڕێت، ئەوەیە کە ناکۆکی لە نـاو مرۆڤەکانـدا دروسـت دەکـات و دەیانکـات بەگـژ یەکتریـدا.. کەواتـە "سپینۆزا" هەوڵیـداوە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی ترسناك چارەسەر بکات

کە هەرەشەی لە هۆڵەندا دەکرد، (هۆڵەندا ئەو کات ئاینزا جیاجیاکانی مەسیحی و جولەکەی تێدا بوو). ئەوانە بۆ ئەوەی نەهێڵیت بەیەکدا بدەن و کێشە لە نێوانیاندا دروست بێت، دەبێت لەسەر یەك بنەما کۆیان بکەیتەوە کە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموویان بێت. ئەو کات ئاشتی سەرتاسەری کۆمەڵگە دەگرێتەوە و فەیلەسوفانیش دەتوانن تەرخان بن بۆ خۆیان و تێڕامانەکانیان، بێئەوەی هەراو زەنای خەڵك و خوا رایان بچەڵەکێنێت و دۆخەکەیان لێتێك بدات. شایەنی باسە کێشەی "سپینۆزا" خەڵك و خوا بوو، ئەوانەی زوو هەڵدەچن و تووڕە دەبن و تەڕوو وشك پێکەوە دەسوتێنن. ئەمانە دەستەوستانن لە فەلسەفە تێبگەن یان بگەنە ئاستی مەعریفەی فەلسەفی. لەبەرئەوە چاکتر وایە مۆرالێکی عەمەلیان بەردەست بخەین کە لە ئیمان و ئایینێکی لێبوردەوە سەرچاوە بگرێت. بۆیە "سپینۆزا" هەرگیز هەوڵی ئەوەی نەدا ئەقڵیەتی ئەو دۆست و دراوسێیانەی بگۆڕێت کە دڵنیاییان لە ئایین و دینداریدا دەبینییەوە. ئەو پێیوابوو مادامەکی بێوەین و زیان بە کەس ناگەیەنن، ئەوا دینداریەکەیان شتێکی چاکەو لەلای خوا قبوڵە. بەڵام گەر بیانەوێت خەڵکی ناچار کەن باوەڕ بەو شتانە بێنن کە خۆیان باوەڕیان پێیەتی، ئەوا ئیمانداریەکەیان دەگۆڕێت بۆ دەمارگیری و تەریزی لێدەکرێت. ئەم دەمارگیریەش هەرەشەیە بۆ سەر ئاشتی کۆمەلایەتی، بە تایبەتی لە ولاتێکدا کە دەستەو ئاینزای جیاجیای تێدا بێت.. "سپینۆزا" خۆی هەموو سروت و ڕێو ڕەسمێکی ئایینی بەلاوە پەشم بوو، ئیتر مەسیحی بێت یان یەهودی.

دواجار با ئەم پرسیارە بکەین: ئایا لە کاتی دەرچوونی کتێبی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیاو سیاسەت)دا، هەڵوێستی هاوسەردەمەکانی چۆن بووە؟ هەرچەندە بەناوی خۆشیەوە بلاوینەکردبووەوە، بەلام هەر زانیان کە ئەو نوسیویەتی.. تیۆلۆژیستەکان کوك بوون لەسەر تەکفیرکردنی و سەرکۆنەکردنی بۆچوونە ڕوخێنەرو ترسناکەکانی بۆ سەر ئایین.. ئەوان پێیان وابوو ناکرێت بە تەنها ئایین کورت بکرێتەوە بۆ خواپەرستی و خۆشویستنی کەسانی دی، بەڵکو جگە لەوانە شتگەلێکی دیکە هەیە.. سروت و ڕێو ڕەسم و بیروباوەڕ هەیە. هەروەها وتیان: (بیروبۆچوونی سپینۆزا لەگەڵ ڕێنومایییەکانی کلێسادا ناکۆکە و ناکرێت قبوڵ بکرێت، چونکە گەروا بکەین ئەوا لە ئایین لادەدەین).. بەلام سەرەڕای هەموو ئەم نارەزاییانەی کە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، کتێبەکە بلاوبووەوەو هەرایەکی گەورەشی نایەوە. لەبەرئەوەی بە زمانی لاتینی نوسرابوو (لاتینی لەو کاتەدا زمانی رۆشنبیری بوو لە سەرجەم ئەوروپادا)، بۆیە لە دەرەوەی هۆڵەنداشدا واتە لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئنگلتەرا، بلاوبووەوە. لەگەڵ بلاوبوونەوەشیدا، کەسانێکی زۆر خۆیان بۆ تەرخانکرد. هەندێکیان بۆ شرۆڤەکردن و لێکدانەوەی، هەندێکی کەشیان بۆ بەرپەرچدانەوەی.

ڕاستیەکەی ئەو تێزەیەی ئەو کە دەڵێت: (فەلسەفە هەڕەشە نییە بۆ سەر ئایین، زۆر کەس قەناعەتی پێی نەبوو). ئەو تێگەیشتنە ئەقلانیەشی سەبارەت بە ئایین پێشکەشیکرد،

نەیدەتوانی بەرەنگاری ئەو تێگەیشتنە تەقلیدیە بێتەوە کە سەدان ساڵ بوو ڕەگی داکوتابوو. بەلاّم ئەو تێگەشتنەی ئەو دوای دوو سەد ساڵ سەرکەوتن بەدەست دێنێت، واتە دوای ئەوەی گەلانی ئەوروپایی بەرەو پێش دەچن و فێر دەبن و دەبنە میللەتانێکی رۆشنگەر.. بەڕاستی "سپینۆزا" زۆر بەر لە کاتی خۆی هات.

## ئەقڵ و وەحی لای "سپینۆزا":

فەیلەسوفی ئەڵەمانی "کارل یاسبەرز" دەڵێت: (ئەو دەستەو تاقمە ئایینیانەی لەسەردەمی سپینۆزادا هەبوون، بریتیبوون لە: کاتۆلیك و پرۆتستانت و ئایینی جولەکە و هەر هەمووشیان ڕەوایەتی خۆیان لەسەر بڕوا بوون بەوەحی یەزدانی دارشتبوو). ئایا هەڵوێستی فەیلەسوفێکی ئەقلاّنی وەك "سپینۆزا" لەم مەسەلەیە چی بوو؟ بە پێچەوانەی ئەوەی لێیدەگێڕنەوە، ئەو زۆر بە چاوی ڕێزەوە سەیری کتێبە پیرۆزەکان و وەحی دەکرد، ئەویش لە ڕووی سوود و قازانجی کۆمەلاّیەتیان و گرنگیان بۆ تەواوی میللەت. "سپینۆزا" خەڵك دەکات بە دوو بەشەوە:

بەشێکیان کەمینەن و دەتوانن تەنها بە ڕێنومایی ئەقڵ، ژیانێکی چاك و بێگەرد بژین، بەلاّم بەشەکەی تریان زۆرینەن و توانای ئەوەیان نییە. بۆیە پێویستیان بە یارمەتی وەحی یاخود ئایین هەیە بۆ ئەوەی ژیانێکی بەکەڵك بژین. ئەی کەواتە دەبێت وەحی ڕەتبکەینەوە لەبەرئەوەی ناتوانین بەشێوەیەکی زانستی و ماتماتیکی بیسەلمێنین؟ "سپینۆزا" بەمجۆرە باس لەم مەسەلەیە دەکات، ئەگەرچی لە شوێنێکی تردا دان بەوەدا دەنێت کە وەحی لە ڕوی فەلسەفیەوە مەحاڵە. واتە ئەو تەنها لە ڕووی سودی عەمەلیەوە سەیری وەحی دەکات: واتە سود و قازانجی ئەخلاقی و ڕێنومایکارانەی بۆ زۆرینەو تێکڕای میللەت هەبێت، بەلاّم فەیلەسوف دەتوانێت دەستبەرداری ئەوە بێت، چونکە شتێکی دیکەی هەیە کە ڕێنومایی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست و حەقیقەت، ئەو شتەش ئەقڵە. "سپینۆزا" دەڵێت: (دەتوانم وەحی بەوە پێناسە بکەم کە دیاردەیەکە لە دیاردە جۆراو جۆرەکانی ناوجیهان، بەلاّم ناتوانم ئەوە لێکبدەمەوە کە چۆن هاتووەو چۆن بووە). واتە ئەو پێی وایە وەحی دیاردەیەکی خەیاڵئامێزە و لە خەیاڵێکی بەپیتداو لەلای ئەو کەسە مەزنانە ڕودەدات کە پێیان دەڵێین پێغەمبەران. سەروەختێك "سپینۆزا" دەست بۆ مەسەلەی وەحی دەبات، ئەوا لە گۆشەنیگای ئەو زۆرینەوە تاوتوێی دەکات کە ئیمانێکی کۆنکرێتیان پێی هەیە. ئەم زۆرینەیە ئەو خەڵکە ئاقلاّنەش دەگرێتەوە کە بەرهەمە بەناوبانگەکەی خۆی (وتارێك دەربارەی تیۆلۆژیاو سیاسەت)ی بۆنووسین. بە نوسینی ئەم کتێبە داخلّ بەو شەڕە فیکری و سیاسیە دەبێت کە لە سەردەمەکەیدا لە ئارەدابوو. کەواتە ڕووی دەمی لە زۆرینەی خەڵکە، نەك بە تەنها لە توێژی فەیلەسوفان. بەم کارەی ویستی وا بوو تەفسیرێکی ئەقلاّنی بۆ وەحی و ئایین بکات، بۆئەوەی ڕووبەڕووی تەفسیری ئسوڵی و تاریکخوازی ببێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە "سپینۆزا" کاتێك وەحی بە هێند گرتووە، لەبەرئەوەی بووە کە وەحی پێ لەسەر مەسەلەگەلێکی وەك: (چاکە و دادپەروەری و بەهای ئەخلاقی) دادەگرێت و هەموو ئەمانەش تەواو لەگەڵ پرانسیپەکانی ئەقڵدا دەگونجێن. بۆ نمونە دەڵێت: (پێغەمبەران هیچ بنەمایەکی ئەخلاقیان فێری خەڵك و خوا نەکردووە کە لەگەڵ ئەقڵدا نەگونجێت. لەبەرئەوە ئاساییە ئەو قسانەی خوا کە لە ڕێی پێغەمبەرانیەوە پێمان دەگات، تەواو لەگەڵ ئەو قسانەی خودا یەك بێتەوە کە لە قوڵایی ناخماندا هەستی پێدەکەین)[29]. بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە: چی بکەین گەر هاتوو ناکۆکییەك لە نێوان تێزە فەلسەفیەکان و بیروباوەڕەکانی ئاییندا دروست بوو؟ لێرەدا "سپینۆزا" لایەنگری تەواوی فەلسەفە دەکات و نکوڵی لەوە دەکات تیۆلۆژیا هیچ مەعریفەیەکی ئەقڵانی هەبێت. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە جولەکەو مەسیحیەت (بە پرۆتستانت و کاتۆلیکەوە)، ئەگەرچی هەموویان بڕوایان بە وەحی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەکفیری یەکتر دەکەن و پێکەوە هەڵناکەن. تەنانەت پیاوانی ئایینی ڕك و بەدگومانی لەناو خەڵکدا دەچێنن و کۆمەڵگە دەکەنە دۆزەخستان. ئەمەش لەسەردەمی "سپینۆزا"دا کێشەی سەرەکی بوو. چۆن بتوانین ئەم ناکۆکیە چارەسەر بکەین؟ بۆچی زانایانی جولەکە کتێبی پیرۆز بۆ دژایەتیکردنی مەسیحیەکان و مەسیحیەکانیش هەمان کتێب بۆ دژایەتیکردنی جولەکەکان بەکاردێنن؟ هەر لایەك بەڵگەو بەهانەی پێویست لە تەورات و ئینجیل هەڵدەهێنجێت، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڵوێستی لایەنەکەی دی. تەنانەت ئەم پرۆسەیە لەناو یەك ئایینیشدا ڕوودەدات، وەك ئەو شەڕە بێئامانەی نێوان کاتۆلیك و پرۆتستانتەکان لە ئایینی مەسیحیدا. کەواتە چۆن دەبێت کتێبی پیرۆز ببێتە مایەی تەفرەقەو پێکدادان لە نێوان ئیمانداراندا؟

لێرەدا هەست بە پێویستی ئەوە دەکات کە دەبێت لێکدانەوەیەکی نوێ بۆ تێکستە پیرۆزەکان بکرێت، لێکدانەوەیەك سەر لە بەر جیاواز بێت لە لێکدانەوەی تیۆلۆژیستە دەمارگیرەکان. خەسڵەتی ڕادیکالی و شۆڕشگێڕانەی کتێبەکەی "سپینۆزا"ش لێرەدایە. ئەو لەم کتێبەدا قسەکانی بەمە دەست پێدەکات: (دەکرێت لە دوو بۆچونی تەواو جیاوازەوە دەست پێ بکەین. یەکەمیان دەڵێت کتێبی پیرۆز – واتە تەورات و ئینجیل – قسەی خوایە. کەواتە جیاوازە لە قسەی مرۆڤ. بەم پێیەش نابێت قسەی خوا هەڵە و ناکۆکی تێدا بێت و هەرچییەکی تێدا هاتووە ڕاست و دروستە. هەرچی بۆچونی دووەمە ئەوا دەڵێت: کتێبی پیرۆز کۆمەڵە تێکستێکە لەلایەن چەند کەسانێکەوە نوسراوەتەوە تەنانەت گەر ئەوانە پێغەمبەریش بن. کەواتە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ نوسینێکی دیکەی ئینساندا نییە و وەك هەر دەقێکی کە بە تێکستێکی زمانەوانی دادەنرێت. بۆچونی یەکەم بەر ئەم بەربەستانەی خوارەوە دەکەوێت: چۆن دەکرێت بڵێین ناکۆکی لە کتێبی پیرۆزدا نییە، لە کاتێکدا چاك دەزانین کە پڕیەتی لە ناکۆکی؟ تەنانەت بڕگە و ئایەتی وای تێدایە کە مۆراڵ و هۆشیار و تەنانەت

زەوق و چێژیشمان تێك دەدات.. لێرەدا موفەسیرین پەنا بۆ فێڵێك دەبەن و دەڵێن: (نابێت ئەو برگانە بە شێوەیەکی حەرفی لێکبدرێتەوە، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی مەجازی تەفسیر بکرێت). بەلاّم "سپینۆزا" ئەم مەنهەجیەتە رەتدەکاتەوە. سەروەختێك تێکستێکی خورافی و عەبەسیمان لە کتێبی پیرۆزدا بەرچاو دەکەوێت، ئەوا تیۆلۆژیستەکان پێمان دەڵێن: (ئەوە باس لە نهێنیەکی خواوەند دەکات و ئێمە پەی بە جەوهەری نابەین!). "سپینۆزا" ئەم شتەشی پێ قبوڵ نییە. دواجار تیۆلۆژیستەکان دەیانەوێت لە رێی بەکارهێنانی فەلسەفەی "ئەفلاتۆن" و "ئەرستۆ" وە کتێبی پیرۆز لەگەڵ ئەقڵدا بگونجێنن، ئەمانە دەڵێن: (کتێبی پیرۆز بەو پێیەی قسەی یەزدانە، کەواتە راست ودروستە و نابێت هیچ ناکۆکیەکی تێدا بێت. بۆیە کاتێك تاوتوێی دەکەین، پێویستە ئەوەی تێدا بدۆزینەوە کە پێشتر لە رێی فەلسەفەوە پێیگەیشتبووین). ئەوە پوختەی قسەکانی "سپینۆزا"یە وەك ئەوەی "کارل یاسپەرز" شرۆڤەی کردبوو.

بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین "سپینۆزا" هیچ یەك لەم بۆچوونانەی پێ پەسەند نەبوو، هەر بۆیە بۆ یەکەمجار لە مێژودا ئەو ئازایەتیە دەنوێنێ و ئەو بڕیارە ترسناکە دەدات کە: کتێبی پیرۆز بریتیە لە تێکست گەلێکی نوسراو وەکو هەر دەقێکی ئینسانی تر بە زمانێکی سروشتی نوسراوە! بۆیە پێویستە وەك هەر دیاردەیەکی سروشتی تر، بەشێوەیەکی ئاسایی لێی بڕوانین! ئەم قسانە لەو سەردەمەدا، جۆرێك بوو لە ڕسککردن بە ژیانەوە. بەلاّم ئەوەی وایلێکرد هەڵوێستێکی لەمجۆرە وەربگرێت، رەفتاری ئەو تیۆلۆژیستانە بوو کە دووبەرەکیان نابووەوەو بەناوی ئایین و کتێبی پیرۆزەوە، پاساویان بۆ هەموو ئەو قەسابخانەو جەنگە ناوخۆییانە دەهێنایەوە. "سپینۆزا"ش وەك بیریارێکی مەزنی ناو مێژوو، چارەسەری ئەو هەلومەرجەی تەنها بەم شێوە رادیکالیە پێدەکرێت. سەبارەت بە رێسای میتۆدەکەی بۆ خوێندنەوەو لێکدانەوەی کتێبی پیرۆز رونکردنەوە دەدات و دەڵێت: پێویستە بزانین تێکستەکە کەی سەریهەڵداوەو لە چ شوێنێکدا بووە و وەلاّمی چ پێداویستیەکی مێژوویی بووە؟ کێ نوسیویەتی و بۆ کێ نوسراوە؟ دەبێت بەپێی پێویست ئاگاداری ژیانی نوسەر (واتە پێغەمبەر) بین، پاشان ئەوەش بزانین کە ئامانجی لە نوسینی ئەو تێکستە چی بووە. واتە پێویستە دەست بە توێژینەوەیەکی مێژوویی هەمەلایەن بکەین، بۆ ئەوەی بە وردی ئاشنای پێغەمبەرانی تەورات و سەردەم و ژینگەکانیان ببین. هەروەها پێویستە زمانی عیبری بەشێوەیەکی مێژوویی ورد تاوتوێ بکەین، بۆ ئەوەی لە دەقی کتێبی پیرۆز تێبگەین. چونکە وەك هەر دەقێکی دیکە، ئەمیش تێکستێکە و بەزمانێکی سروشتی واتە بە زمانی مرۆڤ نوسراوە.

بەمجۆرە دەبینین "سپینۆزا" بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، رەخنەی مێژوویی بۆ تێکستە پیرۆزەکان دامەزراندووە و لەسەردەمانی دواتریشدا ئەم میتۆدگەرا مێژووییە بەرەو پێشچونێکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێت، تا لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەگاتە ترۆپك و ئەم

مەسەلەیەش دەبێتە مایەی بێزاری کڵێسا و پیاوانی ئایینیش زۆر بە توندی دەکەونە دژایەتیکردنی، لەبەرئەوەی ئەوەیان بە هەوڵێك دەزانی بۆ داماڵینی قودسیەت لە بەرگی تێکستە پیرۆزەکان. هەموو مێژوی مۆدێرنەی خۆرئاوا لە دوای "سپینۆزا" و بە درێژایی سێ سەدە، ململانێ دەبێت لەسەر ئەم خاڵە جەوهەرییە.

ڕاستیەکەی "سپینۆزا" لەم هەموو هەوڵەیدا ئامانجی ئەوەبوو، کتێبی پیرۆز کورتبکاتەوە بۆ کۆمەڵێك پرانسیپی سادە و ساکاری وەك: خواپەرستی بە دڵ، ئەویش لە ڕێگای پەیڕەوکردنی دادپەروەری و خۆشەویستی و مامەڵەی چاکە لەگەڵ خەڵکانی تردا. بە کورتیەکەی ئایین بریتیە لەمەو لەمەش بەدەر هەرچی هەیە ڕوکەش و شتی لاوەکیە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

1-بڕوانە کتێبەکەی پۆل هازار: ( *La crise dela conscience europeenne, op. cit., p. 91.*)

2-دەربارەی پیربایل و فەرهەنگە مێژویی و ڕەخنەییەکەی کە تیایدا بیروڕا ئایینیە دەمارگیرەکانی لێك - شیتاڵکردبوو، خوێنەر بابگەڕێتەوە بۆ ئەم سەرچاوەیەی لای خوارەوە:

پییر بایل - ویژدان و شایەد حاڵی سەردەمەکەی،
*Antony mackenna (sous la direction de), Pierre bayle: Temoin et Conscience de Son temps, Edi. Honore champion, Paris, 2001.*

3-بڕوانە: *Revue des sciences philosophiques et theologiques (1960), p.77*

4-بڕوانە کتێبەکەی جۆرج گۆسدۆرف:
*La revolutiongalilieenne, Vol. I. P.115.*

5-بڕوانە کتێبەکەی جۆرج مینوا:
*Georges minois, LEglise et la Science: Histoire dumn malentendu, Fayard, Paris, 1990, p. 388.*

6-*Ibid., pp.388-389*.

7-*Ibid., pp. 389-390*.

8- *G.Gusdorf, La revolution galileenne, Vol., I, op. Cit., p. 133*.

9- *G.minois, Leglise et La science, op. cit., p.344*.

10- *G.minois, Leglise et La science,Vol. II, op. cit., p. 84*.

11-لەبەرئەوە بە ڕۆشنگەرانی خۆمان دەڵێم: لەبەردەم ئەو واقیعە تاریك و ئەنگوستە چاوەی ئێستادا چۆك دامەدەن، چونکە شەڕەکە تەواو نەبووەو لە سەرەتادایە. بۆیە پێویستە وەك هاوتا ئەوروپیەکانیان پشودرێژ بن.

12- بڕوانە کۆی بەرهەمەکانی بوسوێ:
*Bossuet, Euvres completes, Vol. I, p. 197*.

13- *Ibid., p. 555*. ئەم دوو پەرەگرافە لەم کتێبەوە وەرگیراون: کڵێساو زانست، لاپەڕە 85.

14-وەکو لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد،زانستی ئەرستۆ دوای سەرهەڵدانی زانستی مۆدێرن لەسەر دەستی کۆپەر نیکۆس و گالیلۆ، پاشەکشەی کرد و جگە لە بەها مێژووییەکەی هیچی لێنەمایەوە. فیزیا و هەروەها زیندەوەرناسی و گەردونناسی و.. هتد، ئەرستۆ کۆتایی هات، بەڵام بەهای ئەو لەسەر ئاستی فەلسەفی وەك خۆی مایەوە و وەك یەکێکی لە گەورە فەیلەسوفانی ناو مێژوو دەمێنێتەوە. لەلایەکی ترەوە پێویستە ئەرستۆی ڕاستەقینە لە ئەرستۆی سەدەکانی ناوەڕاست جیابکەینەوە کە کڵێسا بیروبۆچونەکانی پاوانکرد بۆ خۆیی و خەسڵەتێکی موقەدەسی بە تیۆریا و بیر و بۆچوونەکانی بەخشی.بەمجۆرە بوو بە ڕێگر لەبەردەم پێشکەوتنی زانستدا، بۆیە دیکارت و گالیلۆ و

کەسانی دیش بەگژیداچوونەوە.

*ئەم کتێبەی حەسەن حەنەفی کردوویەتی بەعەرەبی و فواد زەکەریا پێیدا چۆتەوە و ساڵی 1971 لە قاهیرە بۆ یەکەمجار چاپکراوە.

15- *Joseph moreau, Spinoza et le spinozisme, p.u.f., paris, 1991.*

16- بڕوانە:

*Yirmiyahu yovel, Spinoza et autres heretiques, Seuil, Paris, 1991, p. 10ff*

17- *Karl Jaspers, Les granda philosophes, Vol. IV, plon, paris, 1972, p. 222.*

18- هەروەها کتێبێکی دیکەشی هەیە بەناوی: پرانسیپەکانی فەلسەفەی ڕینێیە دیکارت، ئەمەش تاکە کتێبێکی سپینۆزایە کە بە ناوی خۆیەوە بڵاو کردبێتەوە.

19- سپینۆزا کە باس لە ڕەوشی مەسیحیەت دەکات لە سەردەمی خۆیدا، وەکو ئەوە وایە باس لە بارودۆخی ئەمڕۆی ئیسلام و موسڵمانان بکات.

20- *Gilles Deleuze, Spinoza, p.u.f., 1970, p. 14.*

21- *Leon Brunsschricg, Le progress de La Consience dans la philosophie occidenta le, paris, 1927, p. 188*

22- بڕوانە چاپی فەرەنسی کتێبەکەی سپینۆزا:

*Spinoza, Traite Theologico – politiqus, Flammarion, paris, 1965, p. 5.*

23- لێرەدا سپینۆزا بە تەواوەتی ئەیبن ڕوشد جێدێڵێت.

24- لە سەرەتای ئەم کتێبەدا سپینۆزا ئاوا دەڵێت: ئەم کتێبە چەند وتەزایەکی تێدایە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئازادی فەلسەفاندن لەگەڵ خواپەرستی و ئیمان و بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاسایش لە دەوڵەتدا دەگونجێت و هیچ مەترسیەکیشی نییە، تەنانەت نەك لەگەڵ هەموو ئەوانەدا دەگونجێت، بەڵکو ناکرێت ئازادی فەلسەفی نەهێڵێت، مەگەر هاوکات خواپەرستی و ئاسایشی دەوڵەتیش لەگەڵیدا ڕامالێن.

25- ئەوەی لە ئێستادا لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا بالا دەستە تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاستە و هەر ئەمەشە کێشەی مەزهەبی و مەیلی دەستەگەری دروست دەکات و ناهێڵێت یەکیەتی نیشتمانی دەستەبەر بێت، ئەمەش تەواو بە حاڵی مەسیحیەت دەچێت لە سەردەمی سپینۆزادا، بەڵام ئەوروپا توانی لەو دۆخە دەرچێت و رزگاری بێت، بێگومان فەزڵی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سپینۆزا و فەیلەسوفانی دیکەی ڕۆشنگەری.

26- ئەم قسانەم بە هەندێ دەستکارییەوە لەو وەرگێڕان و ڕانانەی کتێبەکەی فێردینان ئەلکیێ وەرگرتووە کە یەکێك بووە لە مامۆستایانی زانکۆکانی فەرەنسا لە پەنجاو شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا. ناونیشانی کتێبەکەش بەمجۆرەیە: ئەقلانیەتی سپینۆزا

*Ferdinand Alquie, Le rationalisme de Spinoza p.u.f., 1981, pp. 26-27.*

*27-Ibid., p. 27.*

28- دەبێت چاوەڕێ بین ئەقڵییان ڕۆشن بێتەوە و ئاستی مادی و فیکرییان بەرز بێتەوە، وەکی ئەوەی ئێستا لە وڵاتانی ئەوروپی پێشکەوتودا دەیبینین. ئەو کات ئەمانە دەتوانن لە جیهانبینی فێندەمێنتالستی بۆ ئایین جیاببنەوە.

29- لێکدانەوەی فێندەمێنتالستی بۆ ئایین لەگەڵ سستمی کۆماری نوێدا ناکۆکە، چونکە سستمی کۆماری بەیەك چاو سەیری تەواوی هاوڵاتیان دەکات بێگوێدانە ئایین و مەزهەبیان.

**سەرچاوە:**

د. هاشم صالح: مدخل الی التنویر الاوروبي – دار الطليعة، بيروت – الطبعة الاولى، 2005.

# ئەپستیمۆلۆجی فێمینستەکان: ئایا پرۆژەیەکی نەشیاوە؟

مارگریتا هۆڵبێرگ

لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

لەم وتارەدا دەمەوێت لەو وەرچەرخانە نوێیەی تیۆری فێمینستەکان بدوێم و هەندێك لەو کێشانەی کە لەم بارەیەوە بەرز دەکرێنەوە. مەبەستی بنچینەیی تیۆرەکانی فێمینستەکان شیکار کردن و (گۆڕینی) پەیوەندییەکانی نێر و مێیە. لەوانەیە بوترێت کە نابێت زاراوەی "ئەپستیمۆلۆجی" لە گوتاری فێمینزمدا زۆر بە تەسکی دەستنیشان بکرێت بە زۆری چەمکێکی گشتگرە و زۆر لایەنی داواکارییەکانی زانست (*Knowlege*) و بنەماکانی زانست دەگرێتەوە، نەك بە تەنها لە زانستدا بەڵکو لە میانەکانی ئاکار و ڕەوشت و ڕامیاریشدا. بەهەرحاڵ، لێکۆڵینەوەکانی ئەم وتارە بە تەنها ئەو مەسەلانەی ئەپستیمۆلۆجی دەگرێتەوە کە پەیوەندییان بە زانستەوە هەیە.

کاتێك ئەپیستمۆلۆجیی فێمینزم پێشنیاز دەکرێت، هەر بە تەنها هەوڵی ڕەواکردنی مەودایەکی نوێی پرسیار کردن نادەن بەڵکو هەموو پرۆژەی زانست و بنەما میتافیزیکییەکانی دەخەنە بەر پرسیار. لە کاتێکدا تیۆری ڕەخنەیی فێمینستەکان زۆر شتی هاوبەشی هەیە لەگەڵ بەرهەڵستکارە رادیکاڵەکانی دیکەدا، بەڵام لە شتێکدا جیاوازە لێیان ئەویش سووربوونیانە لەسەر خەریکبوون بە ئەپیستمۆلۆجییەوە. زاراوەی "ئەپیستیمۆلۆجیی فێمینستەکان" داخوازیی ئەوە دەکات کە ئەپیستیمۆلۆجیی لایەنگری نێر بگۆڕینەوە بە ئەپیستمۆلۆجییەکی مێ / هی فێمێنستەکان، بە بەهانەی ئەوەی کە زانستی باستانی و فەلسەفەی زانست بەلایەنگری نێر دادەنرێن وایدادەنێن کە ئەپیستیمۆلۆجیی فێمینستەکان لایەنگری کەس نییە.

ئەپیستیمۆلۆجیی فێمینستەکان، کە زۆر لێکۆڵینەوەی بەسوودی لەلایەن پێشنیازکەرانی وەکو ساندرا هاردنگی لەسەر کراوە ( ***Harding & Hintikko ,eds 1983, Harding 1986, 1987***) وەکو بنەمایەك بۆ هەردوو ڕەخنەی رادیکالی بۆ فەلسەفەی زانستی باستانی و وەکو جێگرێکی لۆژیکیی یەکگرتوو. دەمەوێت بڵێم کە هەردوو ئەم داوایانە ***Claims*** تەگەرەی زۆریان

لەبەردەمدایــە و کێشــەی زۆرتــر دروســتدەکەن لەوەی کە دەیانـەوێت چارەسـەری بکـەن، خاڵی جیابوونەوەم لـە لێکۆڵینـەوەی ئەم کێشانەدا لـە تیـۆری زانسـتدایە، بـە تایبـەتی ئـەو لقـەی کـە چاودەبڕێتە سـەر پەیوەنـدی و کارلێکردنـەکانی نێوان لایەنەکان (یـان فاکتـەرەکانی) کۆمەڵایـەتی و زانین *Cognitive* لە زانست و لێکۆڵینەوەدا.

سەرەتا دەمـەوێت جـەخت لەسـەر ئـەوە بکـەم کـە، بـەڕای مـن، وەرچـەرخانی ئەپیستیمۆلۆجی نویٚ لە تیۆری فێمینزمدا ئەوەیـە کـە زیادەڕۆیی دەکــەن لــە هەڵســەنگاندنی لایەنــە ســەروو تیۆرییەکانــدا *meta theoretical* لــە هــەردوو حاڵـەتی ڕەخنـەگرتن لـەو زانسـتەی کـە ئێسـتا هەیـە و لـە کـاتی جـاڕدانی ئـەو زانسـتەی کـە لەسەر ئەپیستیمۆلۆجیی فێمینیـزم بنیـاتنراوە. ئـەم زانسـتەی کـە لەسـەر ئـەو ئەپیسـتیمۆلۆجی یـەك –لایەنـە بنیـاتنراوە لەلایـەن زۆر کەسـەوە لێپرسـینەوەی لەسـەر کـراوە، لەوانـە ریچـارد ڕۆرتـی (*Richard Rorty - 1980*) و ڕۆم هـاریٚ (*Rom Harre - 1986*). ئـەم پێشـکەوتنە، هەرچـەند کاریگەرییـەکی بـە ڕێکـەوتی بـوو لـە ڕەخنـەی فێمینیسـتەکان لـە زانسـت، بـە جـۆرە ئەنجامێکی شیاو دادەنرێت.

بێگومان، هەرچەند جیاوازیی گرنگ هەیە لـە نێــوان جــۆری پیشــاندانی ئەپیســتیمۆلۆجیی باســتانی و لێکۆڵینــەوەکانی فێمینســتەکاندا، بــــەڵام چـــــاوتێبڕینی زلکـــــراوی ســــــەر ئەپیستیمۆلۆجی لەوانەیە ببێتە هـۆی ئەنجامی ناڕەواو شلۆق، بەتایبەتی کە دێتە سەر گرنگیی لایەنـەکانی سـەروو تیـۆر *meta theoretical* لـە زانسـتدا.. یـەکێك لـە ئەنجامـەکانی ئەوەیـە کـە جیاکردنەوەی نێوان فاکتـەرە کۆمەڵایەتیـەکان و فاکتەری زانین *cognition* هەرەسدەهێنێت.

پرســـیارکردنی ســـەرەکیم لـــەم وتـــارەدا ئەپیســــتیمۆلۆجییەکانی فێمینیزمــــە. بــــۆم دەرکـــــەوتووە کــــە زۆر مــــیٚ و، بێگومــــان فێمینســــتەکانیش، زانــــا و تیۆردانــــەرەکان (*theorists*) لێکۆڵینــەوە دەکــەن دەربــارەی ئــەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان بە تیۆری زانستەوە هەیە. ئاساییە کە زۆر فێمینست هەن وەکو زانا و فەیلەسووف کاریان کردووە بیٚ لێکدانەوە یان ڕەخنــــەگرتن لــــە بنــــەما گریمانەییــــەکانی پەیڕەوەکانیان. بێگومان هەمیشە لێکۆڵینـەوەی تیۆری هەبووە لـە فێمینزمدا کـە هەندێجار بۆتـە هۆی ناکۆکی لەناو بزوتنەوەی ژناندا، بەڵام ئەم وەرچەرخانە نوێیـەی فەلسـەفە جۆرێکی تـازەی بایەخدان بـە فەلسـەفەی فێمینـزم هێنایـە ئـاراوە کە هەندێجار تـەنها پەیوەندییـەکی دووری هەیـە بە فێمینزمی سیاسییەوە.

ئەپیستیمۆلۆجیی فێمێنستەکان بە جۆرێکی ئــەوتۆ دامــەزراوە کــە ڕەوایــی بــە چــالاکییە فەلسەفیی و زانستییەکانیان بدات و بنەمایـەکی نوێیــان بــداتیٚ بــۆ جــۆرێکی نــوێی فێمێنــزم، ئەمەش پرۆسەیەکە کە دژواریی تایبـەتی خـۆی هەیــە. بەرچــاوترین ئــەم دژوارییانــە ئــەو جیاوازیانەیە کـە لـە نێـوان ژنانـدا هەیـە لـەبارەی بەرژەوەندییـەکان و پلـە و پایـە و ئـەرك و فرمـان لـە کۆمـەڵگادا، کـە بۆتـە هـۆی نـاکۆکی سیاسـی لـەناو بزوتنـەوەی ژنانـدا، کـە بـەرەو داروخـان دەچێت لە لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکانی ژناندا لە ژێـر بیرێکـی بـاوی زۆر خـواردا کـە لەسـەر تـوخم دامەزراوە.

لـەم وتـارەدا لەسـەر هەنـدێك لـەو كێشـانە دەوەسـتم كـە رووبـەرووی پـڕۆژەی ئەپسـتیمۆلۆجیی فێمێنـزم دەبنـەوە، دەشـێت بەشێوەی جیاواز دابڕێژرێن، بەڵام ئەوەی روونـە كە سیٚ جۆرە كۆسپ و گرژی هەن كە پێدەچێت پەیوەندیدار بن لەم لێكۆڵینەوەمدا، ئەویش:

1-گرژی لـە نێوان بیری ماددی *objectivism* و بیری رێژەگەرایی *Relativism*.

2-كێشـەی رەهەنـدی كۆمەڵایەتییـەكان لـە بیركردنەوەی پیاوان و ژناندا.

3-ئـەو بەربەرەكانییـەی كـە هەیـە لـە نێـوان لێكدانەوە جیاوازەكانی چەمكی "جیاوازبوون".

ئەم سیٚ مەسـەلەیە كە پەیوەندییان پێكەوە هەیـە ئەسـتەمە یـەكلایی بكرێنـەوە لـە گوتـاری فێمینزمدا و لەوانەیـە هەریەكەیان كێشـەی نویٚ دروستبكات.

## ماددیەت و رێژەگەرایی

زۆر پێناسـەی ئـاڵۆز هـەن بـۆ دەستنیشـانكردنی ئـەم دوو زاراوەیـە، بـەڵام بـە بۆچـوونی مـن، ریچـارد بێرنشـتاین *Richard Bernestein* پێناسـەیەكی بـە نرخـی داوە لـەو كتێبەی كە بە ناونیشانی (لەودیوی مادییـەت و رێژەگەراییەوە)یە (1984) *Beyond objectivism and Relativism*. بێرنشتاین دەنووسێت:

مەبەسـتم لـە *objectivism* ئـەو دڵنیابوونـە بنەڕەتییەیـە كـە دەبێـت جـۆرە قاڵبێـك یـان چوارچـێوەیەكی نامێـژوویی (*ahistorical*) هەبێت كە بتوانین لە رێگەیەوە دوا داواكردنـی لێبكـەین بـۆ بڕیـاردان لەسـەر سروشتی ئەقلانییـەت، زانست، باشـی، ڕاستی، دروستی.. هتد.

رێژەگـەرایی، لـە بـەهێزترین شـێوەیدا، قـایلبوونێكی بنەڕەتییـە بـەوەی كـە كاتێك ئێمـە لـەو چـەمكانە دەكۆڵینـەوە كـە فەیلەسـووفەكان زۆر بـە بنـەڕەتییان دادەنـێن.. ناچـار دەبـین دان بـەوەدا بنـێین كـە لـە دوا شـیكردنەوەدا بۆمـان دەردەكـەوێت كـە رێـژەیین بـۆ پـەیڕەوێكی تایبەتی، یان بۆ چوارچێوەیەكی تیۆری یان بۆ پەرادایمێك (نموونەیەك)، یان شێوەیەكی ژیـان، یان كۆمەڵگا و فەرهەنگێك.. (*op.cit., pp. 4-5*).

مەبەستی بێرنشتاین لـە ماددیـەكان بـە تـەنها ئەقڵگـەراكان (*rationalists*) و ئەزمونگـەراكان (*empiricists*) نییـە، بـەڵكو بنیادگـەراكان (*foundationalists*) و گەوهـەر گـەراكانیش (*essentialists*) دەگرێتـەوە. لەلایـەكی تـرەوە رێژەگـەرایی وەكـو دژە تێزێكـی (*antithesis*) دایـەلێكتیكی لـە بەرامبـەر مادییەتـدا پێناسـە دەكرێت. لەوانەیە بوترێت كە ئەم پێناسەیە زۆر گشـتگرە (*inclusive*) و هەنـدێك لایـەنی رێژەگـەرایی ناگرێتـەخۆ. لەوانەشـە بوترێـت كـە پێچـەوانەی تـەواوی مادییـەت و رێژەگـەرایی گوتاری باستانیی رۆشنگەرییە (*Enlightement*) و لە دەرەوەی ئەم گوتارەدا هیچ رەواییەك نییە.

زۆربـەی چەمسـەرگەرییەكانیان (*polarity*) لـۆژیكێكی باویـان هەیـە كـە بواریـان پێـدەدات بەرپەرچـی یـەكتری بدەنـەوە. بەهـەرحاڵ، بـۆ مەبەسـتی خـۆم، ئـەم دژبەیـەك راگرتنـەی رێبازەكـان سـوودێكی هەیـە ئـەویش ئەوەیـە كـە ئاگادارم دەكاتەوە لە هەندێك ئەو نەگونجانانەی كە هەیە لە ئەپیستیمۆلۆجیی فێمینستەكاندا.

لەوانەیە کێشەکە بە کورتی بەم شێوەیە وەسفبکرێت: ئەگەر زانستی و باستانی، هەڵە بێت، نەك کەموکوڕی هەبێت، لەبەرئەوەی یەکلایەن بوو، کەواتە دەشێت زانستێکی راستتر هەبێت، هەروەها دەبێت رێگەی تەواو و بەجێ هەبێت کە بۆمان روونبکاتەوە بۆچی زانستی باستانی لایەنگری نێرە بەڵام زانستی فێمینستەکان بێلایەنە. ئەگەر هەردوو جۆرە زانست، هی نێر و هی مێ (یان فێمینستەکان) بە لایەنگر دابنرێن، ئەوا تووشی جۆرە رێژەگەراییەك دەبین کەوا پێویست دەکات وەکو یەك بن یان (هەڵەن) یان (راستن). هەندێك تیۆریستی فێمینستەکان لایەنگری ئەم دیدە دەکەن، بەڵام ئەم بۆچوونە نوێنەرایەتی بزووتنەوەکە ناکات، بەلایەنی کەمەوە لە نێو فەیلەسووفە فێمینستەکاندا.

ئەگەر وایدابنێین کە هەندێك تیۆری لایەنگری نێر جۆرە کەموکوڕییەکیان هەبێت وەکو بە خراپ وەسفکردنی واقع و بە چەوتی پیشاندانی شتەکان، زۆر ئەستەم دەبێت هیچ واتایەك لە رەخنەی فێمینستەکان لە زانست دەربهێنین. بەهەرحاڵ، ئەم گریمانەیە بەرەو جۆرێك لە ماددییەت (*objectivism*) دەمانبات. بەڵام ماددییەتیش پەیوەندی هەیە بە ئەپستیمۆلۆجیی نێرەوە کە فێمێنیزم بەربەرەکانی دەکات. بەمشێوەیە دەکەوینە هەڵوێستێکەوە کە تیایدا دەبێت بەرگری لە جۆرێك لە "ماددییەتی فێمنیستانە" بکەین و نکوڵی لە هەموو جۆرەکانی دیکەی ماددییەت بکەین.

لە ئەنجامدا، ئەپستیمۆلیجستەکانی فێمینزم پێویستیان بە بەڵگە هێنانەوەیەکی بەهێز و سەلمێنەر دەبێت. هەروەها دەبێت توانای وەڵامدانەوەی هەندێك پرسیاری ئاڵۆز هەبێت وەکو پرسیاری: بۆچی ژنان یان فێمینستەکان ئەو مافە تایبەتییەیان هەبێت کە بزانن راستیی شتەکان چییە و بۆچی هەر ئەوان لەو هەڵوێستە تایبەتییەدان.

ئەم کێشانە وا دەکات کە فێمینستەکان بخاتە هەمان ئەو بەلەمەوە کە تیۆریستە مارکسییەکانی تێدا بوون، بۆ نموونە ئەو دیدەی کە جۆرج لوکاش دەریدەبڕێت کاتێك کە هەڵوێستی چینی پرولیتاریا وەکو مافێکی تایبەتی زانینی دادەنێت. جۆرێکی تری جیاوازی لە تێزەکەی کارڵ مانهایم ( *Karl Manheim*) دەبینرێت دەربارەی ئەوەی کە ناوی دەنێت "رۆشنبیرە سەربەستە ناجێگیرەکان "*Free – floating – intellectuals*".

خاڵی باوی جیابوونەوە لەگەڵ هەڵوێستی مافی تایبەتی زانین ئەوەیە کە هەڵوێستی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا ئەوپەڕی گەرەنتییە لە پرۆسە و خستنەکاری راستییەکاندا.

بێگومان، ئەم زانستە رێژەیی نییە چونکە ئەوە ناگەیەنێت کە چەند بیرێك هەیە دەربارەی راستی و هەموویان وەکو یەك راستن. ئەگەر پێناسەکەی بێرنشتاین بەکاربهێنین دەتوانین بڵێین ئەمە بۆچوونێکە پشت بەیەك جۆر بیر دەبەستێت دەربارەی جۆرێکی بنەمای *Foundation* زانست. ماددییەتی فێمنیستەکان پێی دەوترێت "ئەپیستیمۆلۆجی لە هەڵوێستی فێمنیستەکانەوە" و لە سەر ئەو داواکارییە دامەزراوە کە دەڵێت ژنان مافێکی تایبەتی

توانای زانینیان *cognitive* هەیە لە کۆمەڵگادا بە جۆرێك کە زانستەکەیان باڵاترە لە هی پیاو و ئەم هەڵوێستە مافێکی تایبەتە (*privileged*) و رەگوریشەی قووڵی هەیە کە لە ئەزموونی ژنانەوە سەرچاوە دەگرێت.

هێشتا نەخشەی گشتیی ئەپیستیمۆلۆجی فێمینستەکان ناسنامەیەکی وەرنەگرتبوو کە بەرەنگاری بیری پۆستمۆدێرنەکان و دژە – بنەماگەراکان (*anti- foundationalists*) بووەوە، هەرچەند رێبازی پۆستمۆدێرنەکان هێشتا دوور بوو لەوەی کە پێوانەیی بێت و لەگەڵ مۆدێرنەدا لە بەرەنگاربوونەوەیەکی فراواندا بوون بەڵام هەندێك لە سەرنج و گریمانەکانی گرنگن کاتێك کە لە دیدی فێمینستەکانەوە سەیر دەکرێن. بە کورتی، هەڵوێستی رەخنەییان زۆر بنەڕەتییە چونکە بەرەنگاربوونەوەی ئەو شتانە دەکات کە لە رەگ و ریشەی پرۆژەی رۆشنگەریدایە، واتا خودی بنەمای زانست.

دژە – بنەماگەرا *anti- foundationalism* بەرهەڵستی هەموو ئەو دوولایینانە *dichotomy* دەکات کە رۆشنگەریی لەسەر دامەزراوە، لەوانە: خود/ شت، ئەقڵی/ نائەقڵی، ئەقڵ *reason*/ سۆز، زمان/ واقع (راستی). هەروەها بەرهەڵستیی ئەو گریمانانە دەکات کە تێوەیان گلاوە – وەکو بیرۆکەی کەسێکی یەکگرتووی پێکەوە گونجاو، نموونەی زانستی ئەقڵی تاکەکەسی، ئەگەرەکانی ئەودیو – زمان *metalanguage*. ئەو "بابەتەی" دەزانرێت هەمیشە هەمەچەشنە (*heterogeneous*) و لە ژێر کاریگەریی کۆمەڵگادا بونیادنراوە، لەبەرئەوە هەموو جۆرە گەوهەرگەرایەك بەرهەڵستی دەکرێت. یەکێك لەو شتانەی کە لە ئەنجامی بەرهەڵستیی بیری رۆشنگەریدا دەکرێت ئەوەیە کە "راستی *truth*" هەمیشە هەمەجۆرە و بارێکی تایبەتیی هەیە و خودی ئەپیستیمۆلۆجی دەبێت بخرێتە ژێر پرسیارەوە. هیچ بیرێك بێلایەن نییە و هیچ شوێنێك نییە کە بتوانین بۆچوونێکی راست، بە هەموو واتای وشەکەوە، لەسەری بنیاتبنێین.

خودی زاراوەی "ئەپیستمۆلۆجی فێمینستەکان"، لە دیدی گەوهەرگەراکانەوە، تەفرەدەرە. بەرەنگاربوونەوەی پۆستمۆدێرنەکان، ئەگەر بەراستی وەربگرین، پرۆژەی ئەپیستمۆلۆجی فێمینستەکان بنکۆڵدەکات، ئەگەر نەتوانن بەرگری لە بیرۆکەی مافی تایبەتی تێگەیشتنی خۆیان ( *Cognitively privileged*) بکەن. بە تێگەیشتنی من لە مەسەلەی ئەپیستمۆلۆجی فێمینستەکاندا، گرنگترین مەسەلە بریاردانە لەسەر ئەوەی تا چەند شایستەی بڕوا پێکردنە و دەتوانێت پارێزگاریی لە رەوایی ئەزموونی ژنان بکات وەکو بنەمایەك بۆ زانست. بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلەیە دێمە سەر دووەم گرژی *tension* لە ئەپیستمۆلۆجیی فێمنیستەکاندا، کە لە سەرەوە باسمکرد.

## کێشەی رەهەندی کۆمەڵایەتی لە بیری پیاوان و ژناندا

زۆربەی ئەو رەخنانەی کە فێمنستەکان ئاراستەی زانستی تەقلیدی و فەلسەفەی زانست دەکەن گریمانەی ئەوە دەکەن کە ئەپیستیمۆلۆجیی مودێرن لە ئەنجامی

زانیارییەکانی نێرەوە هاتووە، کە بێگومان ئەمەش گریمانەی ئەوە دەکات کە نێر ڕێگایەکی تایبەتیی هەیە بۆ بیرکردنەوە. بۆ نموونە، شۆڕشی پیشەسازی وا شیکار دەکرێت کە جۆرە (مەجازێکی ڕەگەزە *gender metaphor*) و تیایدا زانا و فەیلەسووفە نوێیەکان زمانێکی تایبەت بەکاردەهێنن کە دەربڕی شێوازی بیرکردنەوەی نێرانەیە لە کاردانەوەیاندا لە بەرامبەر جیهان (*Merchant 1980, keller 1985*). هەندێ فێمنیست، وەکو مەیری دالی 1979 یان دەیل سپێندەر 1980، لەگەڵ زۆربەی بونیاد شکێنە فەرەنسییەکان (*deconstructionists*) جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە زمان و تیۆر هەردوو لایەنگری پیاوانن و بە تەواوی نێرایەتی تیایدا بڵاوبۆتەوە، هەروەها ئەقڵانییەتی ڕۆشنگەری وەکو شێوازێکی تایبەتی بیری نێرانە دەستنیشاندەکەن. چەمکی مێینەی بنچینەیی (*essential female*) زۆر لە نزیکەوە پەیوەندی بەم بۆچوونەوە هەیە. دالی *Daly* نموونەیەکە لەو کەسانەی کە داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ تیشک خستنە سەر مێیەتی (*femaleness*).

زۆربەی ئەو فێمینستانەی کە سەرقاڵی ئەم خولەی ئەپیستمۆلۆجین، بەشێوەیەك لە شێوەکان، پشتگیریی ئەم بۆچوونە دەکەن و لەو باوەڕەدان کە بنەمای ئەو بیرە دوولایەنییەی ڕۆشنگەری ڕەگوریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوولایەنیی (*dichotomy*) نێر و مێ. بەڕای من، ئەم بۆچوونە زۆر کێشەی تێدایە. لە پێش هەموو شتێکەوە، زۆر گشتگرە و بوار نادات کە لایەنە نێرینەکان جیابکەینەوە لە بیرکردنەوەدا یان لە بەرهەمهێنانی بیردا لەو لایەنانەی کە ڕەگەز بە هیچ جۆرێك کاریگەریی بەسەریانەوە نەبووە. هەروەها ئەم بۆچوونە هەموو بیرێك (بۆ نموونە لە فەلسەفە یان میتاتیۆردا) لەبارەی شتێکەوە وەکو لایەنگەری نێر دەبینێت، وەکو ئەوەی هەژموونی تەواوی هەبێت. باوکسالاری واپیشاندەدرێت کە هیچ ناکۆکی و بەربەرەکانی تێدا نەبێت و نێرایەتییەکی یەکگرتوو ( *unified masculinity*) بە تەواوی زاڵبێت بەسەریدا. بە پێی توریل موا *toril moi* (1985) ئەمە ناکۆکییەکی ناوەندی دەردەخات لە فێمینزمدا: "ئەگەر هیچ بوارێك نەبێت بۆ ژنان بۆ قسەکردن لە دەرەوەی باوکسالاریدا، ئەی چۆن ڕاڤەی هەبوونی فێمینزم و گوتاری دژە – باوکسالاری دەکەن؟" (*p.81*). لە پەیوەندییەکی نزیکدا لەگەڵ ئەمەدا ئەو ڕاستییەیە کە ئەقڵانییەت دەشێت ڕەخنەی لێبگیرێت (لێشیگیراوە) بە گەڕانەوە بۆ ڕەگەز. زۆر گرنگە ئەوە دیاری بکەین کە نێرێتی چی بە پێویست دەزانێت و چی قەدەغە دەکات. بۆچی نێر بەشێوەیەکی ئەقڵانی بیر دەکاتەوە؟ ئەی ژنان چۆن بیر دەکەنەوە، یان بیرناکەنەوە؟

دووەم، ئەو گریمانانەی لە سەرەوە باسمکردن زۆر پشتدەبەستێت بە بۆچوونێکی باو دەربارەی ڕەفتاری نموونەیی ژن و پیاو، کە وێنەی کلێشەکراوی چۆنیەتیی ڕەفتار و بیرکردنەوەمان لەو نموونانەدا دیاریکراون. ئەم جۆرە بۆچوونە بە ئاسانی تووشی سەرسامی دەبێت لەبارەی ئەقڵانییەتی نێر و مێ و هۆشی زگماکیی (*intuition*) مێ، بیرکردنەوەی ڕوونی نێر بەرامبەر بیرکردنەوەی سۆزداری مێ، بێ

گوێدان بە ئەگەری هەبوونی کارتێکردنی دایەلێکتیکی لە نێوان هەردوو ڕەگەزی نێرو مێدا. من ئەو پێشنیازەی جودیس گرانت (1987) پەسەند دەکەم کە دەڵێت فێمنیستەکان لە پەرۆشییاندا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و ڕەخنەگرتن لە بیری لایەنگری نێر، زۆر پەلەیانکرد لە پێشنیازکردنی چەمکی زانستی ژنان لە ڕێی ئەزموونەوە. من، لەلای خۆمەوە، بناغەی چەمکەکە پەسەند دەکەم ئەگەر هەموو جۆرە ئەزموون و زانینێك بگرێتەوە نەك بە تەنها هی ژنان. ئەگەر ئێمە هەموو بیرکردنەوەیەك بە کۆمەڵایەتی دابنێین، گریمانەکە نابێتە کێشە. لەم حاڵەتەدا ڕووندەبێتەوە کە چەمکی نێر و مێ لەلایەن کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە بنیاتنراوە و دەگۆڕێت. ئاشکرایە کە بڕیاردان لەسەر ئەوەی ئەم دوو چەمکە بە تەواوی چی دەگرنەوە زۆر ئەستەمە. تەنها کاتێك کە پۆلێنکردن بەپێی ڕەگەز جیاوازی لە نێوان بیرکردنەوەی نێر و مێ دادەنێت من گومانی لێدەکەم. تێنەگەیشتن لەوەی کە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ سوود لە ئەزموونەکانیان وەردەگرن کاتێك بیر لە واقع (ڕاستی) دەکەنەوە و تیۆر دادەنێن مانای زۆر پاڵدانەوەیە بە ئەپیستمۆلۆجیی باستانی و تاکپەرستانە. لەوە دەچێت بە هۆی ئەم بنەمایانەوە بێت کە بیری نێر دژ بە ئەزموونی ژنان دەوەستێت و "فەرهەنگی" نێر دژ بە "سروشتی" ژنان دەوەستێت و زیرەکیی پیاو بە جیاواز لە زیرەکیی ژن دادەنێت.

کەواتە ئەو گریمانە سەرەتاییەی *premise* کە ئەم مشتومڕەی لەسەر بنیاتنراوە ئەگەر پشتگیریی لێبکرێت، وا دادەنێت *postulate* کە جیاوازیی بنەڕەتی هەیە لە نێوان ئەزموونی پیاو ژندا و لە شێوەی ئەو ئەزموونانەی کە تایبەتن بە ڕەگەز لە هەردوو ڕەگەزدا. کێشە لە دەستنیشانکردنی ناوکۆییە *communality* لە ئەزموونی هەموو ژن و پیاوانەدا. لەبارەی ژنانەوە، فێمنیستەکان پێشنیازی جۆراوجۆریان خستۆتە ڕوو، لەوانە پێناسێکی ڕەگەز کە لەسەر گەشەکردنی دەروونی دامەزرابێت (*Chodrow 1978*)، دایکایەتی (*Ruddick 1980*)، کارەکانی چاودێریکردنی ژنان (*Rose 1983*)، هەروەها پاشکۆبوونی کۆمەڵایەتی ژنان (*Hartsock 1983*).

کێشە لە هەموو ئەم پێشنیازانەدا ئەوەیە کە ئەو ئەزموونانەی باسیدەکەن هەموو ژنان تیایدا بەشدارنین و ئەگەر بەشداریش بن لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی جیاوازدان و هەموویان ئەزموونیان نییە و بە هەمان شێواز ئەزموونی ناکەن. سەرەڕای ئەوەش ئەو ئەزموونانە هەمیشە لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە لە هەلومەرجە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا و سەردەمە جیاوازەکاندا و بە هۆی جیاوازیی پایەی کۆمەڵایەتییەوە.

ئەتوانین لەلایەن ئۆنتۆلۆجییەوە بڵێین کە هەموومان بەشداریی دنیایەکی ماددی دەکەین کە بەشێکە لەو ئەزموونە، بەڵام ئەگەر واش بێت خۆ خودی جیهانی ماددی ئەزموون ناکرێت و نە ڕاستەوخۆ دەدرێت، بەڵکو لە شێوازێکی دامەزراوەیی کۆمەڵایەتیدا بیری لێدەکەینەوە و کاری تێدا دەکەین و دەیگۆڕین و لێکدانەوەی لەسەر ئەنجامدەدەین.

تێبــینی دووەم، کــە بــە گرنگــی دەزانم، دەربــارەی ئەزموونــەکانی پیــاوان و ژنانــە و یەکخستنیان لە زانستدا وەکو دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی. بەڵام لە پراکتیزەکردنی راستیدا ژنان و ئەو لێکدانەوەیان بۆ ئەزموونەکانیان لە بــارودۆخێکی ســەربەخۆدا نــین چــونکە رووبەروودەبنــەوە بــە لێکدانــەوە و رەخنــە و بەرهەڵستیی ئایدۆلۆجیای رکەبەر و لە ئاکامدا ئەزموونەکــە بەشــێکی زۆری "رەســەنایەتیی" خــۆی لەدەســتدەدات. پۆســتمۆدێرنیزم نموونەیــەکی بــاش پێشکەشــدەکات دەربــارەی ئــەوەی چــۆن بــیری بەرهەڵســت کاریگــەرە لــە بەرامبەر ئەو وێنەیەی کە مێ هەیەتی لەبارەی خۆیــەوە. بۆچــوونەکانی دیکــەش هــەمان رووبەروو بوونەوە پێشکەش دەکەن. نەك هەر بە تەنها بیروبۆچوونەکان بەڵکو ئەزموونەکانیش لە کەش و هەوای تازەدا دەگۆڕێن. هەر ئەمەشە هۆی ئەو کەلێنەی کە لە نێوان گوتاری سیاسی و گوتاری ئەکادیمی فێمینستەکاندا هەیە. لین ســیگال (1987) بــاس لــە فراوانبــوونی ئــەو جیاوازییە دەکات کە لە نێوان ئەو فێمینستانەی ســەرقاڵی چالاکیی جۆراوجۆربــوون و ئەوانــەی ســەرقاڵی کــاری ئــەکادیمی بــوون لــە ساڵانی حەفتاکانــدا لــە بریتانیــا. بــە بۆچــوونی ئــەو ئەکادیمیســتەکان زۆر ئابســتراکت بــوون بــەڵام ئەوانەی سەرقاڵی چالاکیی تری فێمینیزم بوون پشــتگیری دژ — تیــۆرێکی بنــەڕەتیان دەکــرد و ئەنجامەکەشی بووە بەربەرەکانی و دوژمنایەتی (*pp. 51-55*).

ئــەو دژوارییــە زۆرەی کــە رووبــەرووی بەچــــــــەمککردنی (*conceptualize*) زاراوەی "ئــەزموون" بووەوە و ئەو کێشانەی رووبەرووی دەستنیشــانکردنی هــەردوو تویــژی (*Category*) نێــر و مــێ دەبنــەوە لــە لێکۆڵینــەوەکانی ئــەم دواییــــەی ئەپیســــتمۆلۆجیی فێمینزمــــدا هەســــتپێکراوە و دانیپێــدانراوە. دان بــەوەدا نــراوە. کــە، لەلایــەن ئەپیســتیمۆلۆجییەوە، دەشێت ئەزموونەکان، بەپێی دەستە (گرووپ)، زانیاریی جیاواز ببەخشن، بۆ نموونە ئەزموونی ژنــانی رەش، ژنــانی جیهــانی ســێیەم، ژنــانی کرێکــار، ئــەو ژنانــەی حــەز لــە ژن دەکــەن (*lesbians*)، ئەمانە هەموو ئەزموونی جیاوازیان هەیە، کەواتە کێشەی ئەو ئەپیستمۆلۆجییەی کە لەسەر ئەزموون دامەزراوە لە ناسینەوەو گریمانەکردنی ئەو بەرژەوەندییە جیاوازانەدایە.

"فــرە شــێوەیی" (*pluralism*) لەوانەیــە بتوانێت کێشەکانی فێمێنزم چارەسەر بکات، بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك مانای ئەوە نییە کە لەلایەن ئەپستیمۆلۆجییەوە بەهێزی دەکات لە بەرامبەر تیۆرەکانی تردا. مەراقی سەرەکیی من لەم بارەیەوە ئەوەیە لە کوێ سنوورێك دابنێین. بۆچی پۆلی (*Category*) زیاتری نەخەینە سەر، وەکو ژنی گەنج و ژنی پیر، ژنی شووکردو و ژنی شوونەکردوو، ژنی منداڵدار و ژنی بێ منداڵ، ژنی زۆر رۆشنبیر و پیشەیی.. هتد؟ لاموایە ئەم جۆرە زیادکردنەی دەستەکان بەپێی جیاوازیی بەرژەوەندی بەرەو بیری خودیی (*subjectivism*) تــەواومان دەبــات. لەلایــەکی دیکەشــەوە، ئەگــەر وایــدابنێین کــە ژنــان ئەپیستمۆلۆجییەکی تایبەت بە خۆیان و جیاواز لــە هــی پیــاوان نییــە، ئــەی هەوڵــدان بــۆ جیاکردنــــەوەی بیرکردنــــەوەی پیــــاو لــــە

بیرکردنەوەی ژن سوودی چییە، چونکە ئەوە هیچ شتێك بە دەستەوە نادات کە سوودێکی ئەپیستمۆلۆجی هەبێت.

ئەم هەموو شتانە هەبن، ئەی کەواتە ئەپستیمۆلۆجیی فێمینزم چۆن دابمەزرێنین؟ من لامواییە هیچ رێگەیەکی گونجاو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە نییە. لە دوا ئەنجامیدا، پێدانی ماف تایبەت بەفرە ئەزموونی دەبێتە هۆی رێژەیییەکی زانست و ئەمەش دژە – بەڵگەیەکە (*Counter - argument*) کە زیان بە یەك – بۆچوونی دەگەیەنێت، ئەمە لە تەنگژەی سێیەمی تیۆری فێمێنزمدا ئاشکراتر دەردەکەوێت کە ئێستا باسی دەکەم.

### ناکۆکی لە نێوان لێکدانەوە جیاوازەکانی چەمکی "جیاوازی"

وەکو پێشتر باسمکرد، چەمکسازی *conceptualizing* لە گوتاری فێمینستەکاندا دەربارەی جیاوازییەکان رۆژ بەرۆژ ئاڵۆزتر دەبێت. پێشتر "جیاوازی" پەیوەندیی هەبوو بە جیاوازی نێوان هەردوو پۆلی *Category* بنچینەیی پیاو و ژنەوە، ئەم دوو پۆلە وەکو دوو مەسەلەی بێکێشە سەیر دەکران. بەهەرحاڵ، لەبەرئەوەی سیاسەتی نوێ رەچاوی جیاوازی لەناو ئەم دوو پۆلە دەکات، رووبەرووی داخوازییە باستانییەکانی فێمێنزم دەبێتەوە. ئاشکرایە کە دەبێت گۆڕانکاریی زۆر بکرێت بۆ ئەوەی چەمکی "جیاوازی" شیاو بێت بۆ بەکارهێنانێکی پڕ مانا لە هەلومەرجی ئێستادا. بێگومان من ئاگاداری دژوارییەکانی گواستنەوەی ئەم چەمکەم بۆ ناو بیری فێمنیستەکان.

زاراوەی "جیاوازی" لە فەیلەسووفی پۆستمودێرنزم جاك دێریدا وە هاتووەو ئەمڕۆ شتێکی ناوەندییە لە لێکۆڵینەوەکانی زۆر تیۆریستدا. لە چوارچێوەی تیۆرەکانی فێمێنزمدا زاراوەکە لەگەڵ ئەو بەربەرەکانیانەدا هاتە ئاراوە کە لە سەرەوە باسمکردن ( *flax 1987, Moi 1985, Rose 1988, Sawiki 1986, Scot 1988, Young 1986*) لە هەموویان کاریگەرتر لە گوتاری فێمێنزمدا ترسی ئەو جیاوازییەیە کە بزوتنەوەی فێمینزم و بیرۆکەی ئەزموونی باوی فێمینزم لەت دەکات. یەکێك لە دەستکەوتە سەرەکییەکانی شیکردنەوەی پاش بونیادگەرەکان (*poststructuralists*) رەخنەگرتن و هەڵوەشاندنەوەی خودی یەکگرتوو " *unified subject*" بوو، واتە رۆشنگەرێك ئامادە لەگەڵ خۆیداو توانای تێگەیشتنی خەڵکی دیکەی هەبێت. بە پێی یەنگ (*young 1986*)، ئەمە ئەو شتەیە کە دێریدا ناوی دەنێت میتافیزیکی هەبوون (*Metaphysics of presence*) و ئادۆرنۆ ناوی دەنێت لۆژیکی ناسنامە ( *logic of identity*)، ئەمەش میتافیزیکێکە کە حاشا لە جیاوازی دەکات و رێی لێدەگرێت (*p.1*). کەواتە، کاتێك فێمێنستەکان چەمکی "جیاوازی"ی پاش بونیادگەراکان بەکاردەهێنن لە راستیدا تەنها خودی چەمکەکە گشتگرناکەن. ئەمەش، وا دەردەکەوێت، شێوەیەکی نوێیە لە کارکردنی فەلسەفی، کە یەکێك لە بڕوا بنچینەییەکانی رەتکردنەوەی لۆژیکی پێناسەیە. لەوە دەچێت فێمینستەکان

باس لە چەند بابەتێك بكەن لە هەڵوێستێكی نموونەییدا هەمان لێكدانەوەی هەبێت. كەواتە، كەلێنێك هەیە لە تێگەیشتنی "جیاوازی"دا وەكو زاراوەیەك كە واقعی جیاواز دەگەیەنێت، كە وەكو كۆڵەكەی سەرەكی سەیر بكرێت بۆ دژە – تێزی (*antithesis*) قەوارە یەكگرتوو و سنووردار و ئامادەكان. تەنها حاڵەتی پێشوو بەسود و بەنرخە بۆ بەرگریكردن لە هەڵوێستی ئەپیستمۆلۆجی، ئەگەر فرە ئەزموونیی و "واقعەكانی" فێمینستەكان وەكو ناوچەیەكی شیاو بۆ دامەزراندنی دابنێن. "جیاوازی"، بە واتا پاش بونیادگەرییەكەی خودی یەكگرتوو لە هەر شوێنێكدا دامەزرابێت دەتوێنێتەوە، بەمشێوە بنكۆڵی هەر بناغەیەك دەكات كە دەشێت خولێكی ئەپیستمۆلۆجی لە تیۆری فێمنیزم لەسەری دابمەزرێت.

كێشەی سوود وەرگرتنی فێمنیستەكان لە كاریگەرییەكانی پۆستمۆدێرنیزم بەو راستیە ئاڵۆزتر دەبێت كە لە كاتێكدا هیچ شێوازێكی یەكتا *unique* نییە كە بشێت مرۆڤ هەوڵی بە چەمككردنی (*conceptualize*) جیاوازییەكانی رەگەز بدات، لایەنی كەم بە شێوەیەكی جێگیر و سەرنجڕاكێش، لە هەمان كاتدا چەوساندنەوەی ژنان ئایدیۆلۆجیی و لە ڕێی لێكدانەوەی ژێرییەوە نییە. لادانەوەی پوستمودێرنەكان بۆ زمانیش، وەكو فاكتەرێكی بڕیاردەر، نەك بە تەنها بۆ دەربڕینی نەست بەڵكو بۆ بنیاتنانیشی، روونكردنەوەیەكی تەواو نادات بەدەستەوە دەربارەی پەیوەندییەكانی دەسەڵات و هێزەكانی زاڵبوون. بێگومان، پەیوەندیی گرنگ هەن لە نێوان فێمینزم و پاش – بونیادگەریدا، بەڵام ئەم پەیوەندییانە هیچیان لایەنگری ئەپیستیمۆلۆجی نین.

**ئەنجام**

لە باسەكەمدا روونكردنەوەیەكی رەخنەییم پێشكەشكرد لەبارەی ئەو هەوڵانەی كە دەدرێن بۆ دامەزراندنی ئەپیستمۆلۆجیی فێمینستەكان و سێ تەنگژەی سەرەكیم دەستنیشان كرد لە تیۆرەكردنی فێمنیستەكاندا و ئەوەشم دەرخست كە هیچ لە كێشەكانیان لە ئاستی تیۆریدا چارەسەر ناكرێن. گرژی لە نێوان ماددیەت و رێژەگەرایی بۆماوەییە لە هەڵوێستی ئەپستیمۆلۆجی فێمینستەكاندا و بەسەریدا زاڵنابن. یان دەبێت هەڵوێستێكی ماددی فێمینزم هەبێت لەسەر بنەمای پایەی ژن لە كۆمەڵدا، یان دەبێت ئەو جۆرە هەڵوێستە نەبێت، ئەگەر دان بەوەدا نرا كە هەڵوێستی زۆر جیاواز هەن، كە هەندێجار لەگەڵ یەكدا ناكۆكن، ئەوسا رێگەیەكی نامێنێتەوە كە بڵێین ئەمە هەڵوێستێكی ماددییە (*objective*).

لەوەش زیاتر، هەوڵمداوە پیشانی بدەم، كە كاتێك" ئەزموون" وەكو بناغەیەك بۆ زانست دادەنرێت زاراوەكە زۆر نادیار و نائاشكرا دەبێت. ئەزموون هەمیشە لە ژێر كاریگەریی ئەو بارودۆخەدایە كە تیایدا روودەدات، لەبەرئەوە هەرگیز یەكگرتوو و چوونیەك نابێت بۆ هەموو ژنان، ئەگەر هەموو ژنان بەشداری جۆرە ئەزموونێكی بڕیاردەربن، روون نییە چ جۆرە زانستێكی لێدەكەوێتەوە.

من دژی ئەوەم كە ئەزموون ببێتە بناغەی ئەپیستمۆلۆجی فێمینستەكان، هەروەها

بەربەرەکانیی ئەو پێشنیازانە دەکەم کە دەڵێن پیاو و ژن شێوازی جیاوازیان هەیە بۆ زانست. هەروەها من دژی ئەو بیرۆکەیەم کە دەڵێت چەمکەکانی فەلسەفە و زانست بە تەواوی لایەنگری رەگەزن (*genderized*). بەرەنگاربوونەوەکانی فێمینستەکان لەگەڵ زانستدا، بەڕای من، زۆر گرنگ و بەنرخن ئەگەر بەشداریی ئەو کێشە و دەستانە (گرووپانە) بکەن کە پێشتر پشتگوێ خرابوون و لەم پرۆسەیەدا تیشك دەخەنە سەر ناوچەیەکی نوێ و گرنگ کە لێکۆڵینەوە تیایاندا پێویستە. بەهەرحاڵ، ئەمە پەیوەندییەکی کەمی هەیە بەو مەیلەوەی کە فێمینستەکان هەیانە بۆ پێشنیازکردنی ئەپیستمۆلۆجییەك لە تیۆری ژناندا.

سەرچاوە

*Radical philosophy 53*
*Autumn 1989*

# ڕەگەزایەتی‌و مەیلە ڕەگەزییەکان

ئانتۆنی گیدنز
لە فارسییەوە: کۆسار فەتاحی

دوو کورپەی تازە لە ژووری تایبەتی نەخۆشخانەیەکی لەدایکبووندان. یەکیان کوڕەو لە بەتانییەکی شینەوە پێچراوەو ئەویتر کچەو بەتانییەکی پەمەیی بەسەردا دراوە. هەردووکیان چەند سەعاتێك دەبێ کە لەدایك بوون‌و بۆ یەکەمجارە کە داپیرەو باپیرەیان هاتوونەتە سەردانیان. ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوان داپیرەو باپیرەی یەکێك لەو منداڵانەدا کراوە:

داپیرەی ئەلف: ئەوەهای- یەکەم نەوەی کوڕمان.

باپیرەی ئەلف: بڕوانە، منداڵێکی خرپنە، وانییە؟ بڕوانە چۆن مشتی گرتووەتەوە. ئەم کوڕە دەیەوێ ببێتە بوکسرێکی حیرفەیی. (باپیرەی ئەلف پێدەکەنێ‌و لە هەوادا مشتی بەرەو منداڵەکە فڕێ دەدا).

داپیرەی ئەلف: وا بزانم شێوەی تو ئەدات. چناکەی لە تۆ ئەچێ. ئۆی، چاو لێکە، خەریکە بگری.

باپیرەی ئەلف: بەڵێ- گوێ لە هەناسەی بگرە. کوڕێکی تەواوی لێدەر ئەچێ.

داپیرەی ئەلف: بەرخولە- هێشتا ژێر نەبووەتەوە.

باپیرەی ئەلف: وازی لێ بێنە. بۆی چاکە. خەریکە خۆی رادێنێ، ئەمە سییەکانی بەهێز دەکا.

داپیرەی ئەلف: بڕۆین پیرۆزبایی لە دایك‌و باوکی بکەین. دڵنیام بە هاتنی فرێدی بچکۆلە لە خۆشییان نازانن چی بکەن، حەزیان دەکرد منداڵی یەکەمیان کوڕ بێت.

باپیرەی ئەلف: بەڵێ، دڵنیابوون کە کوڕە. ئەی ئەو هەمووو لنگە فرتێ‌و پەلەقاژەی پێش لەدایکبوونی چی بوو.

کاتێ ئەوان دەڕون تا پیرۆزبایی لە دایكو باوكی منداڵەكە بكەن، داپیرەو باپیرەی منداڵەكەی تر دێنە ژوورێ. گفتوگۆی ئەوان بەم شێوەیە.

داپیرەی ب: ئەوهای... تەنیا كوڕیەیەك كە شریتێكی پەمەیی لە دەوری سەری پێچراوە. زۆر شیرینە، وانییە؟

باپیرەی ب: بەڵێ– وردیلەیە، وانییە! سەیری پەنجە وردیلەكانی بكە. وەی، چاو لێبكە– دەیەوێ مشتی گرێ بكا.

داپیرەی ب: خوێن شیرینە.. دەزانی، كەمێ شێوەی من ئەدات.

باپیرەی ب: بەڵێ كەمێ وایە. چناكەی لە تۆ ئەكا.

داپیرەی ب: وەی.. خەریكە بگری.

باپیرەی ب: ڕەنگە باشتر وابێ بانگی پەرەستارێك بكەین بیبا بیگۆڕێ یان ژێری بكاتەوە.

داپیرەی ب: زۆر باشە. كچە وردیلانەكە مەگری، مەگری، ئێمە گەرەكمانە یارمەتیت بدەین.

باپیرەی ب: وەرە پەرەستارەكە بدۆزینەوە. حەزناكەم گریانی ببینم...

داپیرەی ب: ئەم... نازانم كەی منداڵێكی دیكەیان دەبێ. ئەزانم فرێد حەزی لە كوڕە، بەڵام فرێدریكای بچكۆلە ساغو سەلامەتە، ئەمەش لە هەموو شتێك گرنگترە.

باپیرەی ب: ئەوان تازە ئەوەڵ دەمیانە. منیش شوكری خوا ئەكەم كە منداڵەكە سالمە.

داپیرەی ب: بە هەرحاڵ پێم وایە شتێكی چاوەڕواننەكراو نەبوو كاتێ زانیان كچە... سكی بچووك بوو.

*(Walum, 1977, p. 36)*

جیاوازی نێوان ئەم دوو گفتوگۆیە ئەوەندە زەقە كە ڕەنگە بە دەستكرد بزانرێ. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە دەقی دوو گفتوگۆی ڕاستەقینەن كە لە بەشی لەدایكبووندا تۆمار كراون. یەكەم پرسیار كە – لانی كەم لە كولتوری ڕۆژئاواییدا– لە دایكو باوك دەكرێ، ئەمەیە كە، كوڕە یان كچە؟، ئەزموونی ئەو كەسانەی كە پێش ئەوەی لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە بكرێن بە ژن، بەشێك لە ژیانی خۆیان وەكو پیاو تێپەڕ كردووە، نیشان دەدا كە چۆن زەینیەتی ئێمە لە سەر كەسانی دەوروبەرمان لە بنەڕەتدا لەسەر شوناسی ڕەگەزی دروست دەبێ *(Morris, 1977)*. بۆ بنەماڵەو برادەرو هاوكارەكان زۆر ئەستەمە كاتێ كەسێك كە پێشتر وەك پیاو ناسیویانە، ئەمڕۆ پێی بڵێن ژن. بۆ ئەم حاڵەتە پێویستە گۆڕانێكی گەورە لە ڕەفتارو ڕوانگەكاندا پێك بێت.

لەم پاژەدا، ماهییەتی جیاوازییە ڕەگەزییەكان تاوتوێ دەكەینو خەسڵەتی ئاڵۆزكاوی چەمكی "پیاو"بوو یان " ژن" بوون شرۆڤە دەكەین. سەرەتا لە ڕوی مێژووییەوە چاوێك بە جیاوازییە ڕەگەزییەكانی دوو ڕەگەزكەدا دەگێڕینو پاشان ڕەهەندەكانی بەكۆمەڵایەتیبوون كە كار دەكەنە سەر تایبەتمەندییە جیاوازەكانی ژنانو پیاوان دەدەینە بەر سەرنج. لە كۆتاییشدا بەر لەوەی مەیلە ڕەگەزییەكان شی بكەینەوە، ڕەوشی كۆمەڵایەتیو ئابووری ژنان لە

کۆمەڵگــەکانی ئــەم ســەردەمەدا دەخەینــە بــەر باس و لێکدانەوە.

## رەگەز، رەگەزایەتی و ژینگەناسی

وشەی رەگەز (*sex*) بەو شێوەیەی کە لە زمــانی خەڵکــدا بــە کــار دەبــرێ، وشــەیەکی ناڕوونە. واتە، هەم بە کۆمەڵە کەسێك دەوترێ و هــەم بــەو کارانــەی کــە ئــەنجامی دەدەن- بــۆ نموونــە وەکــو ئــەو کاتــەی کــە ئــەم وشــەیە لــە هەنــــدێ دەســـــتەواژەی وەك "پێوەنــــدی سێکسـی"دا بـە کـار دەبـرێ. بـۆ روونبوونـەوەی بابەتەکــە دەبــێ ئــەم دوو واتایــە لێــك جیــا بکەینــەوە. ئێمــە دەتــوانین رەگــەز، بــە واتــای جیــاوازی بــایولۆژیی و ئانــاتۆمی نێــوان ژنــان و پیــاوان لــە کــاری سێکســی جیــا بکەینــەوە. هەروەها پێویستە جیاوازییەکی گرنگی دیکەش لــە نێــوان (رەگــەز و رەگەزایــەتی)دا بکــەین. لــە کاتێکــدا کــە رەگــەز ئامــاژە بــە جیاوازییــە فیزیکیەکانی لەش دەکا، رەگەزایەتی(جنسیت) پێوەنـــدی بـــە جیاوازییـــە دەروونناســـی، کۆمەڵایـــەتی و کولتوورییـــەکانی نێـــوان ژنـــان و پیاوانـــەوە هەیـــە. جیـــاوازی نێـــوان رەگـــەز و رەگەزایــەتی جیاوازییــەکی بنەڕەتییــە، چــونکە زۆرێك لە جیاوازییەکانی نێوان ژنان و پیاوان سەرچاوەی بایۆلۆژییان نییە.

## سەرچاوەی جیاوازیە رەگەزییەکان

جینـەتیکی مرۆیـی خـاڵی دەسـپێکە بـۆ هـەر چەشنە باسێك دەربارەی رەگەز. رەگەزی ئێمە و تـا رادەیــەکی زۆر پێکهاتــەی ژیــانی ئێمــە لــە ئاکـامی ئـەو جینانـەوە بـە دەسـت دەیێـن کـە بـە هـۆی تـۆی ژن و پیـاو لـە کـاتی سـکپڕیدا، واتـە کاتی دروستبوونی خانەی نوێ بە ئیمە دراون. سـەرجەمی ئـەم مـاددە جینەتیکییە لـە بیسـت و سـێ جـووت کرۆمۆزۆمـدا جێـی گرتـووە کـە خانـەی نوێیـان تێدایـە. هـەر یـەك لـەو تۆیانـە زانیارییەکی جینەتیکی بە هەرکام لە ئەندامانی جووتەکە دەبەخشن.

ئــەوەی لێــرەدا جێــی مەبەســتی ئێمەیــە، بیســت و ســێیەمین جــووتی کرۆمــۆزۆم، واتــە کرۆمۆزۆمــە رەگەزییەکانــە. ئــەم جووتــە بــە هێمــای*XX* بــۆ ژن یــان *XY* بــۆ پیــاو نمــایش دەکرێن. ئەمە لۆژیکی جینەتیکە کە تۆیەکی مێ (خانـەی مـێ) تـەنیا بـۆی هەیـە *X*یك ببەخشێتە بیست و سێیەمین جووتی کرۆمۆزۆم، چونکە بۆ خۆی جووتی *XX*ی هەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە تــۆی نێر(خانــەی نێــر) جــووتی *XY*ی هەیــە، دەتوانـێ یـان *X*یـك ببەخشـێ کـە دەبێتـە هــۆی ئــەوەی کــە جــووتێکی *XX* (کۆرپەلــەی کــچ) دروســت بێــت، یــان *Y*یــك ببەخشــێت کــە دەبێتــە هــۆی دروســتبوونی جووتێــك *XY* (کۆرپەلەی کوڕ).

دوای سـکپڕبوون، خانـە نوێیەکـە دابـەش دەبن و خانەی هاوشێوەی نـوێ (بـە کرۆمـۆزۆمی هاوشـێوە) دروسـت دەبـن کـە ئەمانـەش دواتـر دابەش دەبن و ئەوەندە نابات کە کۆرپەلەی مرۆڤ دروسـت دەبێـت و هـەر لـە سـەرەتاوە کۆرپەلـە خـــاوەن سیســـتمی ژیـــان یـــان گرێـــی رەگەزییە(*goads*) بۆ دروستکردنی گون (*male testes*) یـــان تـــۆدانی مـــێ (*female testes*)

جیاوازی کرۆمۆزۆمی هەر لە سەرەتای دروستبوونی کۆرپەلەوە وەك کلیلێك دەکەوێتە گەڕو بە یەکێك لەو دوو ڕێگایەدا گەشەی فیزیکی بە ئۆرگانیزم دەبەخشێ.

.(Lewontin 1982, pp. 138-9)

لە هەر دوورەگەزدا میکانیزمەکانی گەشەکردنی زیاتری ڕەگەزی لە قۆناغەکانی دواتر واتە کاتی گەشەکردنی لەش دەست پێدەکەن. ئەم قۆناغە بە باڵقبوون *(puberty)* ناسراوە. نێونجی تەمەن لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا دابەزیوە: سەدسال لەمەوپێش، نێونجی تەمەنی یەکەم عادەتی مانگانە بۆ کچان چواردەساڵو نیو بوو، ئەمڕۆ بووەتە دوازدە ساڵ. کوڕان تا ڕادەیەك دەرنگتر لە کچان باڵق دەبن. لە کاتی باڵقبووندا جیاوازییە فیزیکییەکان دەگەنە ئەوپەڕی خۆیان، پیاوانی گەورەساڵ بە شێوەیەکی نێونجی لە چاو ژنان لە سەدا دە ماسوولکەی زیاترو ڕادەیەکی زۆرتریش گوڵمەی ماسوولکەییان هەیە کە ئەمە پێوەندی بە ڕادەی هێزو بڕستەوە هەیە. بەڵام ناتوانین بە تەواوی ئەوە دەستنیشان بکەین کە ئەم مەسەلەیە چەندە پێوەندی بە ئەناتۆمی جەستەوە هەیە. چونکە وەرزشو ڕاهێنان کاریگەری لەسەر دادەنێ. ئەو جیاوازییە بایۆلۆژییانەی کە وادێتە بەرچاو پیاوان ئامادە دەکا کە کارێکی جەستەیی زیاتر بکەنو وزەیەکی زیاتر سەرف بکەن، بە بەراورد لەگەڵ هی ژناندا شتێکی ئەوتۆ نییە. کارایی میکانیکی (واتە ئەو بڕە وزەیەی کە جەستە دەتوانێ لە هەر خولەکێکدا لە بەرانبەر وزەی لەدەستچوودا بەرهەمی بێنێتەوە) بۆ ژنانو پیاوان وەك یەکە.

### ئایا جیاوازییەکانی ڕەفتارکردن هۆکاری بایۆلۆژییان هەیە؟

ئاخۆ جیاوازی نێوان ڕەفتاری ژنانو پیاوان ئەوەندەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری بایۆلۆژی ڕەگەزیی، ئەوەندە پێوەندی بە جیاوازییە بایۆلۆژییەکانەوە هەیە؟ لە بنەڕەتدا رای جیاواز لە سەر ئەم مەسەلەیە هەیە. هەندێ لە نوسەران بڕوایان وایە کە هەندێ جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ڕەفتاری ژنانو پیاواندا هەیە کە لە هەموو کولتورەکاندا بە جۆرێك خۆیان دەنوێنن. بۆ نموونە، ئەوان سەرنجمان بۆ ئەم واقیعیەتە ڕادەکێشن کە تا ڕادەیەکی زۆر لە هەموو کولتورەکاندا ئەوە پیاوانن کە لە شەڕو ڕاوەکاندا بەشداری دەکەن، نەك ژنان. ئەوان دەڵێن کە بێگومان ئەم بابەتە نیشانەی ئەوەیە کە پیاوان مەیلی شەڕەنگێزانەی بایۆلۆژیکیان هەیە کە لای ژنان ئەم حاڵەتە نییە. کەسانی دیکە ئەم بۆچوونانە ڕەت دەکەنەوە. ئەوان دەڵێن، لە کولتورە جۆراوجۆرەکاندا ڕادەی شەڕەنگێزبوونی پیاوان زۆر جیاوازن، بە پێچەوانەی کولتورەکانی دیکە لە هەندێ لە کولتورەکاندا چاوەڕوان دەکرێ کە ژنان بێ هەڵوێستترو هێورتر بن (*Elshtain* 1987). جگە لەوە ئەوان دەڵێن، ئەوەکە تایبەتمەندییەك کەمو زۆر گشتگیر بێت، نیشانەی ئەوە نییە کە هۆکارێکی بایۆلۆژیکی هەیە. ڕەنگە هۆکاری کولتوری گشتگیر هەبن کە ئەم

تایبەتمەندییانـــەیان هێنابێتـــە کایـــەوە. بـــۆ نموونـە، لـە زۆربـەی کولتورەکانـدا بەشـی زۆری ژنـــــان ژیانیـــــان تـــــەرخانی ســــــك و زاو پـەروەردەکردنی منداڵـەو لـە هەلومـەرجی وادا ناتوانن بە ئاسانی لە راوو شەڕەکاندا بەشداری بکـەن. بـە پێـی ئـەم روانگەیـە، جیـاوازی نێـوان رەفتـاری ژنـان و پیـاوان لـە بنەڕەتـدا لـە رێگـای فێربــــوونی کۆمەڵایـــــەتی شوناســــەکانی ژن و پیاوەوە دێتە کایەوە.

**نیشانەکان لە جیهانی گیانلەبەراندا**

نیشــانەکان لەمــەڕ ئــەم مەســەلەیە چــیمان پێدەڵێن؟ رەنگە جیاوازی لە پێکهاتەی هورمۆنی نێوان دوو رەگەزەکەدا هەندێ زانیاریمان لەسەر بابەتەکــە پێبــدات. هەنــدێ دەڵــێن هۆرمــۆنی رەگەزی نێر یان تستوسترۆن پێوەندی بە مەیلی رەگەزی نێر بۆ توندو تیژی هەیە ( *Rutter & Giller,* 1983). بــۆ نموونــە، لێکۆڵینـــەوە دەریخستووە کە ئەگەر بێت و مەیموونە نێرەکان لـە کـاتی لەدایکبوونـدا بخەسـێنرێن، کـەمتر دڕ دەبن و ئەگەر تستوسترۆن بە مەیموونە مێیەکان بـدرێ، لـە مێیــەکانی دیکـە دڕتـر دەبـن. بـەڵام، هـەروەها دەرکـەوتووە کـە فەراهـەمکردنی هـەلی زاڵبـوون بـۆ مەیموونـەکان دەبێتـە هـۆی چـوونە سـەری رادەی تستۆسـترۆن. بـە واتایـەکی دیکـە رەفتــاری دڕندانــە دەتوانــێ کــار بکاتــە ســەر دروســـتکردنی هۆرمۆنـــات، نـــەك ئـــەوەی کـــە هۆرمۆنات ببێتە هۆی دڕبوونی زیاتر.

رەنگـــە سەرچـــاوەیەکی دیکـــەی بەڵگـــە و نیشانەکان بریتـی بێت لـە بینینـی راستەوخۆی رەفتــاری گیانلەبــەران. ئــەو نوســەرانەی کــە دڕنــدەیی رەگــەزی نێــر گــرێ دەدەنــەوە بــە کاریگەرییـــــە بایۆلۆژییەکانـــــەوە، بـــــە زۆری جـــەختێکی زۆر لـــە ســـەر ئـــەوە دەکـــەن کـــە دڕەنــدەیی رەگــەزی نێــر لــە نێــو بوونــەوەرە ســــــەرەتاییەکاندا (*non-human primates*) هـەبووە. ئـەوان دەڵـێن ئەگـەر چـاو لـە رەفتـاری بوونـەوەرە سـەرەتاییەکان بکـەین، نێرەکـان لـە مێیەکان دڕترن. سەرباری ئەمە لە راستیدا لەم رووەوە گـــەلێك جیـــاوازی گـــەورە لـــە نێـــوان بوونەوەرە جۆراوجۆرە سەرەتاییەکاندا هەیە. بۆ نموونــــە، لــــە نێــــو گیبۆنـــــەکان (*gibbons*) دا جیاوازییەکی بەرچاو لە نێوان رەگەزی نێرو مێ دا نابینرێ، کەچـی ئـەم جیاوازییانـە لـە نێـوان بابوونەکاندا(*baboons*) بەرجەستەن. جگە لەوە، زۆرێـك لـە بوونـەوەرە مێیـە سـەرەتاییەکان لـە هەندێ لە بوارەکاندا– بۆ نموونە لەو شوێنانەدا کـە بەچـکەکانیان دەکەونـە بـەر هەڕشـە – بـە تەواوەتی دڕ دەبن.

**نیشانەکان لە جیهانی ئینسانەکاندا**

ئـەو توێژینەوانـەی کـە لـە سـەر منداڵـە نائاساییەکان ئەنجام دراون، هەندێ نیشانەی روون لە سەر جیاوازییە رەگەزییەکان دەدەن بە دەســــتەوە. یـــــەکیان بە"ســــندروم تأنیــــث **بیضــوی**"(*Androgenital Syndrome*)، ئـەویتریان بە "سندروم فوق کلیوی تناسلی"( *Testicular Feminization Syndrome*) ناونراوە. لە حاڵەتی یەکەمـدا منـداڵ بـە تێکـەڵێك لـە کرۆمـۆزۆمی سروشـتی، هێلکـەکان و دابەشـبوونی ئاسـایی هورمۆنــەکان لــەدایك دەبــێ. ئەگــەر ئــەمجۆرە کەسانە وەك ئەو ژنانـەی کە لە ئۆلەمپیکەکاندا

بەشــداری دەکــەن تاقیکردنــەوەی ڕەگــەزییان لەسەر ئەنجام بدرێ، ئەوا وەك پیاو دەستنیشان دەکــرێن. بــەڵام لــە بەرئــەوەی کــە کۆئەنــدامی سێکسـیان لـە مـاوەی گەشـەکردنی کۆرپەلـەدا هیچ نیشانەیەك لە خۆی دەرناخات، لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێ کە ئەندامی سێکسییان ژنانەیە. ئەم منداڵانـە هەمیشـە وەك کچ پـەروەردە دەبـن، چونکە هـەتا ئـەو کاتـەی لـە قۆنـاغی باڵقبوونـدا نـەتوانن عـادەتی مانگانـەیان هـەبێ، دەرناکـەوێ کـە بـە تـەواوەتی مـێن یـان نـا. "سـندروم فـوق کلیـوی تناسـلی" دوخێکـی پێچـەوانەیە. ئـەو کەسانەی کە تایبەتمەندی کرۆمـۆزۆمی ژنانـەی سروشــتییان هەیــە، بەرلــەوەی لــەدایك بــن، هۆرمـۆنی پیاوانـە (*androgen*)ی زیـادی دەدەنـە دەرەوەو ئەنـــدامی سێکســـی پیاوانـــە پەیـــدا دەکـەن. هەنـدێ لـەم منداڵانـە، خـاوەن هـەر دوو ئەندامی سێکسی ژنانەو پیاوانەن کە دەکرێ لـە ڕێگـای نەشـتەرگەرییەوە بکرێنـە ژنانـە. بـەڵام زۆرێـك لـەم منداڵانـە وەك کـوڕ گـەورە دەبـنو نائاسـایی بوونەوەکـەیان تـەنیا لـە قۆناغـەکانی گەشەکردنی دواییدا بەرچاو دەکەوێ.

بە گشـتی، لێکۆڵینـەوە لـە سـەر هـەرکام لـەم حاڵەتـــــە نائاســــاییانە گرنگبــــــوونی بەکۆمەڵایــەتیبوون لــە بەرانبــەر کاریگــەرییــە بایۆلۆژییەکانـدا، لـە سـەرهەڵدانی جیـاوازی لـە نێوان ڕەفتاری کوڕانو کچاندا نیشـان دەدا. ئـەو منداڵانەی کە لـە دوای لـەدایکبوون دەردەکـەوێ کــــە مــــێن، تەنانــــەت ئەگــــەر لــــە ڕووی کرۆمۆزۆمیشـەوە نێـر بـن، حـەز دەکـەن خۆیـان وەکـو ژن لـە قەڵـەم بـدەن. لـە لایـەکیترەوە، ئـەو منداڵانـەی کـە لـە کـاتی لەدایکبوونـدا بـە کـوڕ دەزانرێن، تایبەتمەندی ڕەگـەزیی پیاوانـە پەیـدا دەکـەن( *Money & Ehrhardt*19720). لێـرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بە نموونەیـەکی ناسـراوی دووانەیەکی یـەك هێلکۆکـەیی (*identical twins*) بکـەین. یـەکێك لـەم کـوڕە دووانەییانـە لـە کـاتی خەتەنەکردنـدا بـە سـەختی برینـدار بـوو و بڕیـار درا کە ئەندامی زاوزێی بکرێتە ژنانە. ئەم کەسە بە کچی گەورە بوو. بینینی ڕەفتاری ئەم دووانـە لـە تەمـەنی شـەش ساڵیدا تایبەتمەنـدی ژنانـەو پیاوانە بەو شێوەیە کە لە کولتـوری ڕۆژئاواییـدا بەرچـاو دەکـەوێ، نیشـان دا. کچـەکە چێـژی لـە یاریکردن لەگەڵ کچانی دیکـە دەبـرد، لـە ماڵـەوە یارمـەتی دایکـی دەداو دەیویسـت کاتـێ گـەورە بێــت شــوو بکــا. کوڕەکــە تێکــەڵ بــە کــوڕان دەبــووو حــەزی لــە ماشــینی منداڵانــە بــووو ئەیویســـت کاتـــێ کـــە گـــەورە ئـــەبێ ببێتـــە ئاگرکوژێنەوە یان پۆلیس.

ئـــەم نموونەیـــە هەنـــدێ جـــار کاریگـــەری بــەرفراوانی فێربــوونی کۆمەڵایــەتی لــە ســەر جیاوازیــە ڕەگەزییــەکانی ســەلماندووە. بــەڵام دواتـــــر کاتـــــێ کـــــە کچـــــەکە گەیشـــــتە تەمـــــەنی گـــــەنجێتی لـــــە بەرنامەیـــــەکی تەلەفزیونیــــدا وتوێــــژێکی کــــرد. ئــــەم وتوێــژە دەریخســت کــە ئــەو بــە شــێوەیەکی بەرچـاو لەکچـبوونی خـۆی نارەحەتـەو ڕەنگـە وای هەسـت دەکـرد کـە جگـە لـە هـەموو ئـەم شتانە، ئەو بەراستی کوڕە. (ئەو تا ئـەو کاتـە لـە ڕابـــردووی نائاســـایی خـــۆی تێگەیشـــتبووو ئاشـکرایە کـە زانیارییـەکانی لەمـەڕ ڕابـردووی کاریان کردوّتە سەر جۆری تێگەیشتنی) (*Ryan,* 1985 *pp.* 182–3).

ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەگەری بوونی کاریگەرییە بایۆلۆژییەکان لە سەر جیاوازی نێوان ڕەفتاری ژنان و پیاوان ڕەت ناکاتەوە. هەرچەند کە ئەگەر ئەم کاریگەرییانە هەبن، تاکو ئێستا سەرچاوەی فیزیۆلۆژیکییان نەناسراون. ڕەنگبێ زۆربەی چاودێران لەگەڵ دەرەنجامەکانی ریچارد لۆنتین، یەکێك لە پسپۆڕە بەرجەستەکانی جینەتێك لە جیهاندا هاوڕان:

خۆناسینی سەرەتایی (primary self-identification) کەسێك وەکو پیاو یان ژن کۆمەڵێك ڕوانگەو بیرو مەیلی جۆراوجۆری لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، واتە بەستراوەتەوە بەوەی کە وەك منداڵ چ مۆرکێکی لێدراوە. ئەم مۆرکانە لە ڕەوتی ئاسایی ڕووداوەکاندا لە گەڵ جیاوازییە نەگۆڕە بایۆلۆژییەکانی کرۆمۆزۆمەکان، هۆرمۆنەکان و مۆرفۆلۆژیدا بەرابەری دەکەن. بەمجۆرە جیاوازییە بایۆلۆژییەکان زیاتر بوون بە هێمایەك بۆ جیاکردنەوەی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان تا هۆکاری دروستبوونی ئەو ڕۆڵانە.

.(lewontin, 1982,p.142)

### بەکۆمەڵایەتیبوونی ڕەگەزی کاردانەوەی دایباب و گەورەکان

لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لەسەر چۆنیەتی دروستبوونی جیاوازییە ڕەگەزییەکان ئەنجام دراوە. زۆربەی فۆرمەکانی هەڵاواردنی ڕەگەزی (gender discrimination) زۆر لە کاردانەوەی ئەو داپیرەو باپیرانەی کە دیتمان، وردترو دەقیقترن، بەڵام هەر لەو کاتەدا بەهێزو گشتگیرن.

ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی کارلێکی نێوان دایك– منداڵ ئەنجام دراون، جیاوازی لە شێوەی هەڵسوکەوتکردن لە گەڵ کوڕو کچەکاندا تەنانەت ئەو کاتانەش کە دایبابەکان بڕوایان وایە کە بە یەك شێوە دەڕواننە هەردوو لایان، نیشان دەدەن. کاتێ داوا لە گەورەکان دەکرێ کە کەسێتی منداڵ هەڵبسەنگێنن، وەڵامەکانیان بۆ کوڕ و کچ جیاوازە. لە تاقیکردنەوەیەکدا شێوەی ڕەفتاری پێنج دایکی گەنج لە گەڵ منداڵێکی شەش مانگەدا بە ناوی بێس (beth)خرایە ژێر چاودێرییەوە. ئەوان بە زۆری زەردەخەنەیان بۆ دەکردو بووکەشووشەیان پێدەدا. ئەوان منداڵەکەیان بە خوێن شیرین و دەنگ ناسك دەزانی. دژکردەوەی دەستەیەکی تر لە دایکان لە ئاست منداڵێکی دیکەدا بە ناوی ئادەم (Adam) بە تەواوی جیاواز بوو. بە گشتی شەمەندەفەرێکی منداڵانە یان کەرەستەیەکی یاریکردنی کوڕانەیان دەدایە دەستی. بێس و ئادەم لە ڕاستیدا هەر یەك کەس بوون و جل وبەرگی جیاوازیان لەبەر کردبوون .(Will, Self & Datan, 1976)

ئەم شێوە تێگەیشتنە لەسەر منداڵ تەنیا تایبەتی دایك و باوکان و داپیرەو باپیرەکان نییە. یەکێك لە توێژینەوەکان هەندێ لەو وشانەیان شیکاری کردووە کە لە لایەن پەرستارانی ژووری منداڵبوونەوە بۆ وەسفی کوڕپەکان بەکاردەهێنران. کوڕەکانیان بە خڕین و خڕو خەپان وەسف دەکردو کچەکانیشیان بە ژیکەڵەو خوێن شیرین دەزانی. هیچ قسەیەك لە

سەر جیاوازی قەدو بالاو قورسایی منداڵەکان لە ئارادا نەبوو( Hansen, 1980).

### پەروەردەی ڕەگەزی gender lerning

دەکرێ بڵێین کە منداڵان لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانیاندا بە شێوەیەکی نا وشیارانە لە رووی رەگەزییەوە پەروەردە دەبن. ئەمە پێش ئەو قۆناغەیە کە منداڵان بە تەواوی دەتوانن مۆرکی "کوڕێك" یان "کچێك" لە خۆیان بدەن. لە گەشەکردنی سەرەتایی وشیاری رەگەزیدا (gender awareness) هەندێ سەرەداوی پێش هاتنەگۆ (per-vebral clues) بەرچاو دەکەون. بە گشتی ژن و پیاوەکان بە شێوەیەکی جیاواز لە گەڵ منداڵەکاندا رەفتار دەکەن. ئەو میکیاژەی ژنان بەکاری دەهێنن، بۆنێکی جیاوازی هەیەو منداڵ دەزانێ کە ئەمە هی پیاوان نییە. جیاوازی لە جلوبەرگ و خۆرازاندنەوەو هتد لە پرۆسەی پەروەردەبووندا هەندێ سەرەداوی دیداری (visual clues) بۆ منداڵەکە فەراهەم دەکەن. منداڵان لە تەمەنی دوو ساڵیدا تێگەیشتنێکی ئەوتۆیان لە رەگەزایەتی (جنسیت) نییە. ئەوان ئەوە دەزانن کە ئاخۆ کوڕن یان کچن و بەگشتی دەتوانن بە شێوەیەکی وردو دەقیق کەسانی دیکە پۆلێن بکەن. بەڵام تا تەمەنی پێنج یان شەش ساڵەیی منداڵ نازانێ کە رەگەزایەتی گۆڕانی بەسەردا نایەو هەر کەسێك خاوەن رەگەزایەتی خۆیە، یان ئەوەی کە کچان و کوڕان لە رووی ئەناتۆمییەوە جیاوازییان هەیە.

سەرجەمی یارییەکان، کتێبی وێنەکان و بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان کە منداڵە ساواکان پێوەندییان پێوەی هەیە، بە گشتی جەخت لە سەر جیاوازییەکانی نێوان تایبەتمەندیی پیاوانەو ژنانەکان دەکەنەوە. فرۆشگەکانی یاریی منداڵان و کتێبە فێرکارییەکان بە گشتی بەرهەمەکانیان لە سەر بنەمای رەگەزایەتی دەستەبەندی دەکەن. تەنانەت هەندێ لەو یاریانەی کە لە رووی رەگەزییەوە پاسیڤن، بەکردەوە وا نین. بۆ نموونە، بووکەڵەی وەك بەچکەپشیلەو کەروێشکی یاری بۆ کچان دادەنرێ، لە کاتێکدا بۆ کوڕان شێرو بەور بە باشترو گونجاوتر دەزانرێ.

ڤاندالۆسیازامونر، لە دوو بەستێنی نەتەوەیی جیاوازدا (ئیتالیا و هۆڵەندا) توێژینەوەیەکی لە سەر ئەو کەرەستانە ئەنجامدا کە منداڵان لە یارییەکانیاندا بەکاری دەهێنن ( Zammuner, 1987). لەم توێژینەوەیدا روانگەی منداڵان دەربارەی جۆری یارییەکان تاوتوێ کرا، ئەو بووکەڵانەی کە جێی مەبەست بوون، زیاتر ئەوانە بوون کە بە شێوەی کلێشەیی بە کوڕانەو کچانە دەزانرێن و ئەو یاریانە کە هیچ جیاوازییەکی رەگەزییان تێدا بەدی ناکرێ. منداڵەکان زیاتر لە نێوان تەمەنی حەوت تا دە ساڵیدا بوون. داوا لە دایك و باوکەکانیان کرا کە کامە یاری بۆ کوڕان بە باش دەزانن و کامەیان بۆ کچان بە گونجاو دەزانن. منداڵە ئیتالییەکان زیاتر لە هۆڵەندییەکان ئەو یاریانەیان هەڵدەبژارد کە لە سەر بنەمای رەگەزی جیا کرابوونەوە – ئەمە دەرنجامێکی زۆر سەیر نەبوو، لە بەرئەوەی کە کولتووری

ئیتـــالی روانینێکـــی نەریتیانـــەتری بـــۆ دابەشـــکردنی ڕەگـــەزی هەیـــە. هـــەروەك لـــە توێژینەوەکانی دیکەدا بەرچاو کەوتبوو، کچان – لـە هـەردوو کولتورەکـەدا– زیـاتر لـە کـوڕان پێیان خۆش بوو بەو کەرەستانە یاری بکەن یان لـــە ڕووی ڕەگەزییـــەوە پاسـیڤ بـــوون، یـــان کەرەستەی یاریی کوڕانە بوون.

### کتێبو حیکایەتەکان

لنوور ویترزمەنو هاوکارەکانی کە لە هەندێ لە کتێبە چیرۆکە بەناوبانگەکانی پێش قۆناغی ســـەرەتایی دەوری ڕەگـــەزییان شـــیکردۆتەوە، چەندین جیاوازی زەقیان لەو دەورانەدا بەدی کردووە کە بە پێی ڕەگەز دابەش کراون. لەو چـیرۆك وێنەییانـــەدا کوڕەکـــان دەورێکـــی زۆر بەرچـاوتریان دەبینـی تـا کچـەکانو لـە ڕووی ژمـارەوە 11کـوڕ لـە بەرانبـەر 1 کچـدا بـوون. ئەگەر ئەو گیانلەبەرانەشمان جیا بکردایەوە کە شوناســـی ڕەگـــەزی خۆیـــان هەیـــە، ڕێژەکـــەی دەبـووە 95 بـە 1. چـالاکی کـوڕو کچـەکانیش جیـاواز بـوون. کوڕەکـان بـەکاری نائاسـاییو گەمەی نێو کۆلانەوە کە هێزو لە سەر پێی خۆوەســتانی گەرەکــە، ســەرقاڵبوون. لــە هــەر جێگایەك کە کچان دەردەکەوتن، چالاکییەکی کەمتریان هەبووو زیاتر خۆیان بە ئیشی نێو ماڵەوە خەریك دەکرد. کچان خواردنیان بۆ کوڕان دروست دەکردو نێو ماڵیان خاوێن دەکردەوە یان چاوەڕوانی هاتنەوەیان بوون.

ئەم دۆخە تا رادەیەکی زۆر لە سەر ئەو ژنو پیاوانە وەڕاست دەگەڕا کە لە چیرۆکەکاندا نیشـــان دەدران. ژنـــە تـــەنیاکان بوونـــەوەری خـــەیاڵی وەك جادوگـــەرەکان یـــان دایـــەی پەرییەکان بوون. لە سەرجەمی ئەو کتێبانەدا کە تاوتوێ کران، تەنانەت یەك ژنیش نەبوو کە لــە دەرەوەی مــاڵ ئــیش بکـا. بەپێچـەوانەوە، دەوری جۆراوجـۆری وەك جـەنگاوەر، پـولیس، دادوەر، پاشاو هتد بە پیاوان درابوون.

ئـەو چـیرۆكو کتێبـە وێنەییانـە کـە لـە روانگەیـەکی ناڕەگەزییـەوە نووسـراون، تـاکو ئێستا لە بازاڕی ئەدەبی منداڵاندا قورساییەکی ئەوتۆیان نییە.بۆ نموونە،چیرۆکی پەرییان لە روانگەیـەکی یـەکجار نەریتیانـەوە دەڕوانێتـە ڕەگەزایـەتیو ئامـانجو ئاواتـەکانی کـوڕانو کچـان. "ڕۆژێـك شـازادەکەی مـن دێـت" – ئـەم دەسـتەواژەیە لـە حیکایـەتی پەرییانـدا چـەند سەدە لەمەوپێش بەو مانایە بوو کە پێدەچوو کچـێکی هـەژارو کەمدەسـت خـەون بـە دەوڵەمەنـدیو بەختەوەرییـەوە ببینـێ. ئـەم سەردەمە مانای ئەو حیکایەتە لەگەڵ ئەشقی ڕۆمانتیکیدا گرێی خواردووە. فێمینیستەکان هەوڵیان داوە هەندێ چیرۆکی بەناوبانگی لەو چەشـنە ئـاوەژوو بکـەنو سـەر لـە نـوێ بینووسنەوە.

لـە راسـتیدا مـن زۆر ورد نەبوومـەوەو نـەمزانی لـووتی زۆر ناشـیرینە. بێگومـان جلەکانی عەیبەکانی داپۆشیبوو.

ئـەو چـەند شـەوی پێشـوو لـە ئێسـتای جـوانترو سەرنجڕاکێشـتر بـوو. کەواتـە مـن پێمـوایە دەبـێ وا نیشـان بـدەم کـە ئـەم پـێڵاوە بلوورینانە بە پێم تەنگەن.

(*Virost, 1987, p. 73*)

لە راستیدا ئەم شێوە دەربڕینەی حیکایەتی سیندریلا لەو کتێبانەدا زیاتر دەنووسرێنەوە کە رووی دەمیان لە گەورەسالأنەو کەمتر لە نێو چیرۆکە بێ ئەژمارەکانی منداڵاندا کەمتر رەنگیان داوەتەوە.

### تەلەفزیون

راڤەکردنی ماوەی بەرنامەی منداڵان لەگەڵ ئەو دەرنجامانەی کە لە (لێکدانەوەی) چیرۆکی منداڵاندا بە دەست هاتوون، یەکتر دەخوێننەوە، دیارە هەندێ حاڵەتی ئاوەرتەش لەم بارەوە بەرچاو دەکەون کە لە جێی خۆیاندا سەرنجڕاکێشن. لێکۆڵینەوەکان لەمەڕ ئەو کارتۆنانەی کە بینەرێکی زیاتریان هەیە، ئەوە دەردەخەن کە ئاکتەرە بەرجەستەکان زۆربەریان پیاون و پیاوەکان لە ئەنجامدانی چالاکییەکانی خۆیاندا کارلێهاتوون. هەندێ لێکچون لەو ریکلامە بازرگانیانەدا بەرچاو دەکەون کە ماوەماوە لە نێو بەرنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە.

### کاریگەری قوتابخانەو گرووپی هاوتەمەنەکان (پێرەکان)

کاتێ منداڵان بۆ یەکەمجار دەچنە قوتابخانە، بە باشی هەست بە جیاوازییە رەگەزییەکان دەکەن. ئێمە بە گشتی پێمان وانییە کە قوتابخانەکان بەپێی رەگەز دابەش کرابن، بەڵام بەکردەوە کۆمەڵێك هۆکار بە شێوەی جیاواز کار دەکەنە سەر کچان و کوڕان. ئێستاش لە زۆرێك لە وڵاتە رۆژئاواییەکاندا جیاوازی لە وانەدەرسییەکانی کوڕان و کچاندا بەرچاو دەکەوێت - بۆ نموونە، ئابووری ماڵ، یان زانستەکانی ماڵداری بۆ کچان و دارتاشی و ئاسنگەری بۆ کوڕان لە بەرچاو گیراون. بە زۆری کچان و کوڕان هاندەدرێن کە بە شێوەی جیاواز وەرزش بکەن. رەنگە مامۆستاکان ناڕاستەوخۆ یان راشکاوانە جیاوازی بکەن لە نێو کوڕان و کچانداو، چاوەڕوانییەکی زیاتریان لە کوڕان هەبێ کە چالاکتر بن، یان هەراوهوریای کوڕان زیاتر تەحەمول بکەن تا هی کچان. بە گشتی رەوتی بە کۆمەڵایەتیبوون لە نێو گرووپی هاوتەمەنەکاندا (*peer-group socialization*) دەورێکی بەرچاوی لە بەهێزکردن و چەسپاندنی زیاتری شوناسی رەگەزی لە سەرتاسەری قۆناغەکانی خوێندنی منداڵاندا دەگێڕێ. کۆڕی هاوڕێتی منداڵان لە دەرەوە یان ناوەوەی قوتابخانەدا بە گشتی یان تەواو کوڕانەیە یان تەواو کچانە.

### دژوارییەکانی پەروەردەکرنی نارەگەزیانەی منداڵ

جۆن ستاتهام ئەزموونەکانی تاقمێك لەو دایك و باوکانە کە لە بریتانیادا خۆیان لە ئاست پەروەردەکردنی نارەگەزییانەی منداڵەکانیاندا بە دەرەوەست دەزانن، خستە بەر لێکۆڵینەوە (*Statham,* 1986). لەم لێکۆڵینەوەیەدا سی گەورە ساڵی نێو هەژدە بنەماڵە بەشدارییان کرد کە منداڵەکانیان لە نێوان شەش تا دوازدە ساڵدا بوون. ئەم دایك و باوکانە سەر بە چینی مامناوەندی بوون و زۆربەیان وەك مامۆستا بە کاری پەروەردەیی و زانستییەوە سەرقاڵ بوون.

ستاتهام بەو ئاكامە گەيشت كە دايبابەكان تەنيا هەوڵيان ئەوە نەبووە كە گۆڕان لە دەورە ڕەگەزييە نەريتييەكاندا پێك بێنن – واتە هەوڵبدەن كە كچان وەكو كوڕان لێبكەن – بەڵكو دەيانويست تێكەوڵاوێك لە تايبەتمەندييە ژنانەو پياوانەكان پەروەردە بكەن. ئەوان هەوڵيان ئەوە بوو كە كوڕەكان لە ئاست هەستو ئيحساسى كەسانى ديكەدا حەساستر بنو بتوانن هەستو ئيحساسى خۆيان بە گەرمى دەربڕن، لە حاڵێكدا كچەكانيان هان دەدا كە چالاكانەتر هەلەكانى فێربوونو پێشكەوتنى شەخسى بقۆزنەوە.

هەموو دايبابەكان بەربەرەكانێكردن لەگەڵ سەرمەشقەكانى فێربوونى ڕەگەزييان بە دژوار دەزانى، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو كە منداڵەكانيان لە قوتابخانەو لە نێو كۆڕى هاوڕێكانياندا ئەم سەرمەشقانەيان پێڕەو دەكرد. دايبابەكان تا ڕادەيەك توانيبوويان منداڵەكانيان وا لێبكەن كە بە كەرەستەى يارى نارەگەزييانە يارى بكەن، بەڵام تەنانەت خودى ئەم كارەش لەوە زەحمەتتر بوو كە ئەوان بيريان لێكردبووەوە. يەك لە ژنەكان دەيگوت: ئەگەر بچييە فرۆشگەيەكى يارى منداڵان، پڕە لە كەرەستەى جەنگى منداڵانە بۆ كوڕانو كەرەستەى ياريكردنى كچانە،و كۆمەڵگە چۆن هەيە وا نيشان دەدات. منداڵان بەم شێوەيە پەروەردە دەبن: بۆ كوڕان هيچ عەيب نييە ئەگەر فێرى كوشتنو ئازارگەياندن بنو من وا ئەزانم ئەمە ترسناكەو پێى تێكدەچم. تا پێم بكرێ ناچمە ئەو جۆرە فرۆشگانە، زۆر پێى قەڵس دەبم.

كەرەستەى يارى منداڵەكان بە پێى ڕەگەز ديارى كرابوو و بەو كەرەستانەى كە خزمو كەس پێيانى دابوو يارييان دەكرد.

ئێستا هەندێ كتێبى چيرۆك هەن كە كاراكتێرە سەرەكييەكانيان بريتين لە كچانى بەهێزو سەربەخۆ. بەڵام كتێبێكى كەم هەيە كە كوڕان تێدا ڕۆڵێكى نەريتى دەگێڕن. دايكى كوريژگەيەكى پێنج ساڵانە بەمجۆرە باس لە كاردانەوەى منداڵەكەى دەكا كاتێك لە خوێندنەوەى چيرۆكێكدا ڕەگەزى پاڵەوانى چيرۆكەكە ئاوەژوو دەكا:

لە ڕاستيدا كاتێ چيرۆكێكم دەخوێندەوە كە دەورى كچو كوڕێكى زۆر نەريتيانە وەسف دەكرد و جێگەى كوڕو كچەكەم لە تێكڕاى چيرۆكەكەدا دەگۆڕى، كوڕەكەم نەختێك هەڵدەچوو. كاتێ بۆ يەكەمجار دەستم بەم كارە كرد، ئەو دەيويست بڵێ ،تۆ كوڕت خۆش ناوێ، تۆ تەنيا كچت خۆش دەوێ،. من دەبوا ئەوە ڕوون بكەمەوە كە ئەمە بە هيچ شێوەيەك وانييە، تەنيا شتێك كە هەيەو ئەويش ئەوەيە كە وەك پێويست باسى كچان نەكراوە (Statham, 1960, pp, 43, 67).

ئاشكرايە كە پەروەردەى ڕەگەزى ڕيشەيەكى قووڵى هەيەو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵيدا ڕەنگە كێشەى لێكەوێتەوە.

## شوناسى ڕەگەزىو ئينتما ڕەگەزييەكان: سێ تيۆرى

### تيۆرى فرۆيد لەمەڕ گەشەكردنى ڕەگەزى

ڕەنگە كاريگەرترين– و باس هەڵگرترين –

تیۆریی دەرکەوتنی شوناسی رەگەزی تیۆری زیگمۆند فرۆید بێت. بەپێی روانگەی ئەو فێربوونی جیاوازییە رەگەزییەکان لە مێردمنداڵو ساواکاندا لە سەر بنەمای هەبوون یان نەبوونی سیرەت چەقی بەستبێ. ‹من سیرەتم هەیە، یەکسانە لەگەڵ ‹من کوڕم. لە حاڵێکدا من کچم، یەکسانە بە من سیرتم نییە›. فرۆید جەخت لە سەر ئەوە دەکا کە تەنیا جیاوازییە ئەناتۆمییەکان لێرەدا گرنگ نین، بەڵکو هەبوون یان نەبوونی سیرەت نیشانەی پیاوانەبوون یان ژنانەبوونە.

لە قۆناغی ئۆدیبدا، کوڕ وا هەست دەکا کە ئەو دیسپلینو سەربەخۆبوونەی کە باوکی دەیەوێ، هەڕەشەی لێدەکاو وا ئەزانێ باوکی گەرەکیە سیرەتی ببڕێ، یان بە واتایەکی تر دەیخەسێنێ. کوڕ تا رادەیەك بە ئاگاییەوە، بەڵام زیاتر لە ئاستی ناوشیارییدا (*unconscious level*) باوکی بە رەقیبی خۆ دەزانێ. کوڕ پاش سەرکوتکردنی هەستی سێکسی لە ئاست دایکیداو قبووڵکردنی باوکی وەك کەسێکی بەهێزتر، خۆی وەك باوکی دەبینێو لە شوناسی پیاوانەی خۆی تێدەگا. کوڕ لە ناوشیاری خۆیدا لەوە دەترسێ کە بە هۆی باوکییەوە بخەسێنرێ، بۆیە ئەشقی خۆی بۆ دایکی دەشارێتەوە. وا دیارە کچان "خەفەتی بێ سیرەتی"(*penis envy*) ئازاریان دەدا چونکە خاوەنی ئەو ئەندامە زەقە نین کە کوڕان جیاواز دەکاتەوە. دایك لە چاو کچە بچوکەکەدا ئەو نرخو قورساییەی نییە، چونکە ئەویش لە سیرەت بێ بەشەو توانای ئەوەی نییە کە ئەو ئەندامە دابین بکا. کاتێ کچ خۆی وەك دایکی دەبینێ، ملکەچی دەکاتە پیشەو خۆی بە بوونەوەرێکی پلە دوو دەزانێ.

بە کۆتاییهاتنی قۆناغی ئۆدیب، منداڵ فێر دەبێ کە هەستە سیکسییە ئاشقانەکانی (*erotic feelings*) سەرکوت بکا. بە رای فرۆید ئەم قۆناغە لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە تا تەمەنی باڵقبوون قوناغی شاراوەییە(*latency*) – چالاکییە سیکسییەکان بە شێوەی کاتی رادەگیرین، تا کاتێك کە گۆڕانە بیولۆژیکییەکان لە قۆناغی باڵقبوونی مەیلە سیکسییە ئاشقانەکاندا بە شێوەی راستەوخۆ سەرلەنوێ چالاك دەبنەوە. قۆناغی شاراوەیی، کە ساڵە سەرەتاییو نێونجییەکانی قوتابخانە دەگرێتەوە، سەردەمێکە کە گرووپە هاوتەمەنو هاو رەگەزەکان (*same-sex peer groups*) زۆرترین گرنگیان لە ژیانی منداڵدا هەیە.

## هەڵسەنگاندن

گەلێك رەخنەی گرنگ لە روانگەکانی فرۆید گیراوە، بە تایبەت لە لایەن هەندێ لە لایەنگرانی مافەکانی ژنانو زۆرێك لە نوسەرانی دیکەوە. (*Mitchell,* 1973*; Coward,* 1984). یەکەم، وادێتە بەرچاو کە فرۆید لە رادەبەدەر شوناسی رەگەزی دەبەستێتەوە بە وشیاریی سێکسییەوە، بێگومان گەلێك هۆکاری وردتر لەم شتەدا دەور دەبینن. دووەم، وا دێتە بەرچاو تیۆرییەکەی فرۆید پشتی بەم ئەندێشەیە بەستووە کە سیرەت بە شێوەیەکی سروشتی لە زێ باشترەو زێ تەنیا لە نەبوونی سیرەتدا مانا

پەیدا دەكا. بەو حاڵەش بۆ نابێ كۆئەندامی زاوزێی ژن لە كۆئەندامی زاوزێی پیاو بە باشتر بزانرێ. سێیەم، فرۆید باوك بە هۆكاری سەرەكی زەبرو زەنگ دەزانێ، لە حاڵێكدا لە زۆرێك لە كولتوورەكاندا دایك دەورێكی گرنگتری لە داسەپاندنی زەبرو زەنگدا دەگێڕێ. چوارەم، فرۆید بڕوای وایە كە پەروەردەبوونی ڕەگەزی لە قۆناغی ئۆدیبدا لە دەوروبەری تەمەنی چوار تا پێنج ساڵیدا چەقی بەستووە. زۆربەی نوسەرانی دوایی و بەتایبەت ئەوانەیان كە بە توندی كەوتوونەتە ژێر كارتێكەری فرۆید، جەختیان لە سەر ئەوە كردۆتەوە كە فێربوون لە سەرەتای منداڵیو تەمەنی خوارەوە دەست پێدەكا.

## تیۆری چودرۆف دەربارەی گەشەی ڕەگەزی

لە حاڵێكدا كە زۆرێك لە نوسەران سوودیان لە ئاڕاستەی فرۆید لە توێژینەوەی گەشەی ڕەگەزی وەرگرتووە، بە گشتی لە چەند لایەنێكی گرنگەوە ئەو ئاڕاستەیانەیان هەموار كردووە. نموونەیەكی دیار لەم بوارەدا كارەكەی نانسی چودرۆفە ( ***Nancy Chodrow*** 1978 1988). چودرۆف بەرلەوەی لەگەڵ تیۆرییەكەی فرۆیددا هاوڕا بێت، لە گەڵ نوسەرانی بەرهەمە دەروونشیكارییە نوێیەكاندا هاودەنگە كە بڕوایان وایە هەستكردن بە نێر یان مێبوون یەكێكە لە ئەزموونە سەرەتاییەكان كە لە هۆگربونی منداڵ بە دایكو باوكییەوە سەرچاوە دەگرێ. جگە لەوە، چودروف زۆر لە فرۆید زیاتر پێ لە سەر گرنگی دایك دادەگرێ تا باوك.

منداڵان حەزیان بە تێكەڵبوونی عاتفی لەگەڵ دایكیان هەیە، چونكە دایك بە ئاسانی گرنگترین كاریگەریی لە قۆناغە سەرەتاییەكانی ژیانی ئەواندا هەیە. دەبێ ئەم هۆگرییە لە پێناو دروستبوونی هەستێكی جیاوازو تایبەت بەخۆدا لە قۆناغێكدا دابڕێ – پێویستە منداڵ خۆی كەمتر بە هۆگری دایكی بزانێ.

چودرۆف بە بەڵگەوە دەڵێ كە ئەم پرۆسەی دابڕانە – كە فرۆید بە قۆناغی كاتی ئۆدیب وەسفی دەكا – بۆ كچانو كوڕان بە شێوەی جیاواز ڕوو دەدا. كچان بە پێچەوانەی كوڕانەوە لە دایكیان نزیك دەكەونەوە – بۆ نموونە، دەتوانن بەردەوام لە ئامێزی بكەنو ماچی بكەنو لاسایی كارەكانی بكەنەوە. كچ لە چاو كوڕ بو ماوەیەكی درێژتر هۆگری دایكی دەبێ. لە بەرئەوەی كە دابڕانێكی كتوپڕ لە نێوان كچو دایكدا ڕوو نادات، ئەو كچەی كە دواتر دەبێ بە ژنێكی گەورە لە پێوەندی لەگەڵ خەڵكی تردا خۆی دەناسێ. پێدەچێ شوناسی ئەو زیاتر تێكەڵ بە شوناسی ئەویدی بێت یان بێتە پاشكۆی شوناسی ئەویترەوە: سەرەتا دایكیو پاشان پیاوێك. چودرۆف پێیوایە ئەم حاڵەتە لە ژناندا دەبێتە هۆی دروستبوونی سۆزو دڵسۆزیو دووبارەبوونەوە لە نێو نەوەكانی داهاتوودا.

كوڕان لە ڕێگای ڕەتكردنەوەی توندڕەوانەی نزیككەوتنەوەی سەرەتاییان لە دایك دەگەنە هەستی خۆناسینو دەركیان لە تایبەتمەندیی پیاوانە لە سەر بنەمای ئەو شتەی كە ژنانە نییە، دروست دەبێت.ئەوان دەبێ فێر بن كە كچەڕەنگ (*sissies*) یان

ترسنۆك (*mother's boy*) نەبن. لە ئاكامدا، كوڕان تا ڕادەیەك ناتوانن بە باشی پێوەندییەكی نزیكتر لەگەڵ كەسانی تردا دروست بكەن، ئەوان بە شێوەیەكی شیكارانەتر دەڕواننە جیهان. چالاكانەتر كار دەكەنو گرنگیی زیاتر بە پێشكەوتن دەدەن، بەڵام تواناییەكانی خۆیان بۆ دەرككردنی هەستی خۆیانو هی كەسانی تر سەركوت كردووە.

لێرەدا چودرۆف تا ڕادەیەك جەختكردنەكەی فرۆید ئاوەژوو دەكا. ئەو لەباتی تایبەتمەندیی ژنانە تایبەتمەندییە پیاوانەكان وەك "بۆشاییەك" پێناسە دەكا. واتە لەدەستدانی هۆگرییەكی نزیكی بەردەوام لە ئاست دایكدا. شوناسی پیاوانە لە ڕێگای جیاییەوە دروست دەبێت. بەمجۆرە پیاوان بە شێوەیەكی خۆبەخۆ لە قۆناغەكانی دیكەی ژیاندا وا هەست دەكەن كە ئەگەر پێوەندییەكی نزیكی سۆزداری لەگەڵ كەسانی تردا دروست بكەن، شوناسیان دەكەوێتە مەترسییەوە. لە لایەكی ترەوە، ژنان وا بیر ناكەنەوە، نەبوونی پێوەندییەكی نزیك لەگەڵ كەسێكی تردا ئەو هەستە لای ژنان دروست دەكا كە ڕێزو حورمەتیان دەكەوێتە مەترسییەوە. لە بەرئەوەی كە ژنان دەورێكی سەرەكی لە بەكۆمەڵایەتیكردنی منداڵاندا دەگێڕن، ئەم سەرمەشقانە لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی تر دەگوازرێنەوە. لە بنەڕەتدا ژنان بە پێی پێوەندییەكانیان هەستەكانی خۆیان دەردەبڕنو پێناسەی دەكەن. پیاوان ئەم شتانەیان سەركوت كردووەو بە شێوەیەكی پراتیكیانەتر دەڕواننە جیهان.

## هەڵسەنگاندن

چودرۆف ڕووبەڕووی ڕەخنەیەكی زۆر بووەتەوە. بۆ نموونە، جنت سایرەز وتوویەتی كە چودرۆف خەباتی ژنان – بە تایبەت لەم سەردەمەدا – لە پێناو سەربەخۆبوونو پاشكۆنەبووندا پشتگوێ دەخات( *Sayers,* 1986). بە وتەی ئەو، ژنان (و پیاوان)، زیاتر لەوەی كە چۆدرۆف لە تیۆرییەكەی خۆدا نیشانی دەدا، لە ڕووی دەروونییەوە تێكەڵاو یان دژوارن. سایرەز ئەوە دەسەلمێنێ كە، ڕەنگە تایبەتمەندیی ژنانە ببێتە هۆی ئەوەی كە دەمشڕبوون (*aggressiveness*) یان ئازایەتی (*assertiveness*) كە تەنیا لە هەندێ بەستێندا ئاشكرا دەكرێ، بشاردرێتەوە ( *Brennan,* 1988). هەرچەند ئەندێشەكانی چۆدرۆف سنووردارن، بەڵام گرنگیی خۆیان هەیە. ئەو ئەندێشانە یارمەتیمان دەدەن تا سەرچاوەی ئەو شتەی كە دەروونناسەكان پێی دەڵێن "بێ توانایی پیاوان لە دەربڕینی هەستەكانیاندا"– ئەو دژوارییەی كە پیاوان لە كاتی دەربڕینی هەستەكانیان بۆ كەسانی دیكە تووشی دەبن– بناسین ( *Balswick,* 1983). ئەو ئەندێشانە زۆر شت لەمەڕ ماهییەتی تایبەتمەندییە ژنانەكان ڕوون دەكەنەوە، و ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە تێگەیشتن لە ماهییەتی گشتیی زاڵبوونی پیاوان بە سەر ژناندا هەیە – دیاردەیەك كە دواتر لەم پاژەدا بە بەڵگەوە شرۆڤەی دەكەین.

## ڕەگەزایەتی، خودو ئەخلاق

كارۆل گیلیگان بە پێی ئەو وێنا زەینییانەی

که ژنان‌و پیاوان له خۆیان‌و دەسکەوتەکانیان هەیانە، شیکردنەوەیەکی لەسەر جیاوازییە رەگەزییەکان ئەنجام داوە( 1982Gilligan, ).
ئەو لە گەڵ چۆدرۆفدا هاودەنگە کە دەڵێ ژنان بە پێی پێوەندییە شەخسییەکانیان هەستەکانی خۆیان پێناسە دەکەن‌و دەسکەوتەکانی خۆیان بە ئاماژەکردن بۆ توانایی نۆژداریکردنی کەسانی تر هەڵدەسەنگێنن. رۆڵی ژنان لە ژیانی پیاواندا بە شێوەیەکی نەریتی رۆڵی و یارمەتیدەرە. بەڵام پیاوان کە پێشکەوتنی تاکەکەسی بە تەنیا شێوەی سەرکەوتن دەزانن، بایەخێکی ئەوتۆ بۆ ئەو شایەستەگییانە قایل نین کە لە بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکانەدا بە دەستی دێنن. سەرنجدانی ژنان بە پێوەندییەکان بە زۆری وەك خاڵێکی لاواز چاو لێدەکرێ، نەك خاڵێکی بەهێز.

گیلیگان لە گەڵ نزیکەی دووسەد ژن‌و پیاوی ئەمریکیدا کە سەر بە تەمەنی جیاوازو بەستێنی کۆمەڵایەتی جیاواز بوون، چەند وتوێژێکی قووڵی ئەنجام داوە. ئەو ریزە پرسیارێك دەربارەی شێوەی روانینی ئەخلاقی ئەوان‌و تێگەیشتنیان لەسەر خۆیان هێناوەتە گۆڕێ. گەلێك جیاوازی نەگۆڕ لە نێوان روانینی ژنان‌و پیاواندا بەرچاو کەوت. بۆ نموونە، پرسیار کرا: کە دەڵێن شتێك لە رووی ئەخلاقییەوە دروستە یان هەڵەیە، مانای چییە؟ لە حاڵێکدا کە پیاوەکان بە گشتی بە ئاماژەکردن بە ئایدیالە ئەبستراکەکانی وەك ئەرك، عەدالەت‌و ئازادی تاکەکەسی وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە، ژنان بەردەوام مەسەلەی یارمەتیدان بە کەسانیتریان دەهێنایە گۆڕێ. بەم پێیە کچە خوێندکارێکی زانستگا ئاوا وەڵامی دایەوە: ئەم (ئەخلاقە) لەگەڵ بەرپرسیارەتییەکان‌و بەهاکان، بەتایبەت بەهاکاندا پێوەندی هەیە... من لە ژیانمدا ئەخلاق دەبەستمەوە بە پێوەندی نێوان تاکەکان کە پێوەندییان بە رێزی دوولایەنەوە هەیە». توێژەرەکە پاشان پرسی: بۆ دەبێ رێز لە کەسانی تر بگرین؟ وەڵامەکەی ئەمە بوو کە، چونکە ئەوان خاوەن هەست‌و شیارییەکی ئەوتۆن کە رەنگە دڵگران ببن، رەنگە ئەوان هەستیان بریندا ببێ.( 1982Gilligan, p. 65).

ژنان لە داوەرییە ئەخلاقییەکانیاندا نەرمتر لە پیاوان بوون‌و دەیانزانی کە رەنگە پێڕەوکردنی کۆمەڵە یاسایەکی وشکی ئەخلاقی‌و خۆپاراستن لە دڵئێشاندنی خەڵك کارێکی دژوار بێت. گیلیگان دەڵێ ئەمجۆرە تێڕوانینە رەنگدانەوەی رەوشی نەریتیانەی ژنانە کە زیاتر پابەندی پێوەندی چاودێریکەرانەن تا تێڕوانینە "ئۆبژکتیڤەکان"ی پیاوان. ژنان لە رابردوودا رێزیان بۆ داوەریکردنی پیاوان دادەنا، لە حاڵێکدا دەیانزانی کە هەندێ تایبەتمەندییان تێدایە کە لە پیاواندا نییە. بیرکردنەوەکانی ئەوان لە سەر خۆیان بە پێی دابینکردنی سەرکەوتوانەی خواستەکانی کەسانی ترە، نەك شانازیکردن بە خۆ و پێشکەوتنەکانیان.

### باوکسالاری‌و بەرهەمهێنان
### بالادەستی پیاوان

هەرچەند جیاوازییەکی بەرچاو لە کولتورە جۆراوجۆرەکاندا لە نێوان رۆڵی ژنان‌و پیاواندا

هەیە، لە هیچ کۆمەڵگەیەکدا نموونەیەکی ناسراو بەرچاو ناکەوێ کە ژنان تێیدا لە پیاوان بەهێزتر بن. ژنان لە هەموو شوێنێکدا بە شێوەی بنەڕەتی بە کاری پەروەردەکردنی منداڵ، ئاگاداری‌و ئیدارەکردنی ماڵەوە سەرقاڵن، لە حاڵێکدا چالاکی سیاسی‌و سەربازی بە زەقی بە بالای پیاواندا بڕاوە. لە هیچ شوێنێکی دونیادا پەروەردەکردنی منداڵ راستەوخۆ لە ئەستۆی پیاوان نییە. بە پێچەوانەوە، ئەو کولتورانەی کە تێیاندا ژنان بەرپرسیاریەتی سەرەکی لەوەڕاندنی ئاژەڵە گەورەکان، راوکردن، ماسیگرتن لە دەریا قووڵەکان یان زەویکێڵان بە گاوئاسنیان لە ئەستۆیە، ئەگەریش هەبن، زۆر کەمن. لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا، دابەشکردنی کار لە نێوان ژنان‌و پیاواندا لە چاو کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا کەمتر زەق‌و بەرچاوە، بەلام ڕێژەی پیاوان لە قەڵەمڕەوەکانی هێزو دەسەلاتدا هێشتا لە ژنان زیاترە.

بالادەستبوونی پیاو بە گشتی پێی دەوترێ باوکسالاری. بۆ دەبێ باوکسالاری – بە شێوەی جۆراوجۆر – باو بێت؟ وەلامی جۆراوجۆر بەم پرسیارە دراوەتەوە، بەلام نزیکترین دەربڕین، تا رادەیەك سادەیە. ژنان منداڵیان دەبێ‌و گەورەی دەکەن. داماویی منداڵی مرۆڤ وا دەخوازێ هەر لە سەرەتاوە بە توندی‌و بەردەوامی ئاگاداری بکرێت – لێرەدایە کە چۆدرۆف جەخت لە سەر ئەوە دەکات کە "دایکایەتی" گرێی خواردووە بە ئەزموونی ژنانەوە. پێویستی فیزیکی وا دەکا کە دایکان منداڵیان ببێ‌و پەرستاریی بکەن‌و ئەمە بە سادەیی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ژنان وەك لە هەموو کولتورەکاندا قبووڵیان کردووە، بەردەوام رۆڵی نۆژداریکردن‌و پەروەردەکردن بگێڕن. ژنان لە بەرئەوە کە رۆڵی دایك‌و نۆژدار دەبینن، لە بنەڕەتدا لە چوارچێوەی راییکردنی کارەکانی ناوماڵدا قەتیس دەمێنن. ژنان دەبنە ئەو شتەی کە رۆماننووس‌و رەخنەگری فەڕەنسی، سیمۆن دوبوار ناوی لێناوە "رەگەزی دووەم" ( *second sex*). چونکە رێگە نەدراوە وەك پیاوان رۆڵی گشتیتر ببینن ( ***de Beauvaoir,*** 1972). پیاوان بە هۆی هێزی بالای فیزیکییەوە، یان لە بەر توانستی فیکری تایبەتەوە بە سەر ژناندا زاڵ نین، بەڵکو لە بەر ئەوە وەپێش کەوتوون کە بەر لە راگیرکردنی زاوزێ، ژنان دیلی پێکهاتەی بیوڵۆژیکی خۆیان بوون. منداڵبوونی پەیتاپەیتا، و ئاگاداریکردنی بەردەوامی منداڵان، لە رووی بژێوی ژیانەوە ئەوانی دەکردە پاشکۆی پیاوان ( ***Michell,*** 1973 & ***Firestone,*** 1971).

### ژنان‌و کارگە: دیمەنی مێژوویی

بۆ زۆربەی هەرە زۆری حشیمەتی کۆمەڵگە نەریتییەکان (و زۆرێك لە خەڵکی جیهانی سێهەمی ئەم سەردەمە)، کاری بەرهەمهێنان‌و کاری نێو ماڵ لە یەکتر جیا نەبوون. کاری بەرهەمهێن یان لە ماڵەوە یان لە نزیکی شوێنی ژیاندا ئەنجام دەدرا. لە ئەورووپای سەدەکانی نێوەڕاستدا هەموو ئەندامانی بنەماڵە یان لە مەزرا یان لە کارەدەستییەکاندا بەشدارییان دەکرد. لە شارەکاندا، بە گشتی خەڵك لە ماڵەوە کارگەیان هەبوو و ئەندامانی بنەماڵە لە لایەنە

جیاوازەکـــانی پرۆســـــەی بەرهەمهێنانــــــدا هاریکاریـان دەکـرد. بـۆ نموونـە، لـە پیشـەی رستن و چنیندا، منداڵان کەڵکیت و شانەلێدانیان دەکـرد و ژنـان و کچـە عازەبـەکان کـاری رسـتن و باوکانیش کاری چنینیان ئەنجام دەدا. هەر بەم شـێوەیە ژنـان و منـداڵان لـە کـاری دروومـان، پینەچـییەتی و نانەواییـدا راسـتەوخۆ لەگـەڵ پیاوان کاریان دەکرد. ژنان هەرچەند رێگەیان پێنەئـەدرا لـە قەڵـەمڕەوی پیاوانـەی شـەڕو سیاسـەتدا بەشـدار بـن، بـەڵام لـە بەرئـەوەی رۆڵێکی گرینگیان لە پرۆسەی ئابووریدا هەبوو، بە زۆری لە نێو بنەماڵەدا دەستڕۆیشتوویەکی زۆریـان هـەبوو. ژنـی پیشـەوەر بـە زۆری بـە حسـێب و کتێبەکانـدا رادەگەیشـتن، هـەر بـەو شێوەیە ژنی وەرزێڕەکانیش هەر ئەم کارەیان دەکـرد و بێوەژنـەکانیش بـە گشـتی نانهێنـەرو بەڕێوەبەری بنەماڵە بوون.

لـە ئـەنجامی پەرەســەندنی پیشەســازیدا کارگەکان لە خانووەکان جیا کرانەوە و دۆخەکە گـۆڕانێکی زۆری بـە خـۆوە دیـت. گواسـتنەوەی بەرهـەمهێنان بـۆ نێـو فابریکـە میکانیزەکـان وەك گـرنگترین هۆکـاری یاریـدەر لـەم پێوەندییـەدا چاولێدەکرێ. کارکردن بە خێرایی ئامێرەکان بە هۆی ئەو کەسانەوە ئەنجام دەدرا کە تایبەت بەم کارە دامـەزرابوون، بـەمجۆرە لەمەوبـەدوا خـاوەن کارەکـان گرێبەسـتی تاکەکەسـییان لەگـەڵ کرێکارەکانـدا ئیمـزا دەکـرد، نـەك لەگـەڵ بنەماڵـەکان. بـەڵام دەمێکـی زۆری خایانـد تـا شێوازی کۆنی بە یەکەوە دانانی بنەماڵەکان لە نێو چوو. لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لـە بریتانیـا و زۆرێـك لـە وڵاتـە ئەوروپییەکانـدا خـاوەن کارەکـان هێشـتا بنەماڵـەکانیان وەك یەکەیـەك بـە کـرێ دەگـرت. بـۆ نموونـە، ئەگـەر باوك بۆ کارکردن لە فابریکەدا بە کرێ دەگیرا، ژن و منداڵەکـەی وەك خزمـەتکاری ماڵـەوە یـان کرێکاری مەزرا کاریان دەکرد.

بـەڵام ئـەم شـێوازە بەرەبـەرە لـە نێـو چـوو، شـوێنی ژیـان و شـوێنی کـار بـە تـەواوەتی لێـك دابڕان. ژنـان لـە پێوەنـدی لەگەڵ کاری نێوماڵدا پێناسـە کـران، ئەگەرچـی ئـەم ئەندێشـەیە کـە دەڵـێ "جێگـای ژن ماڵەوەیـە" لـە ئاسـتە جۆراوجۆرەکـانی کۆمەڵگـەدا بـە شـێوەی جۆراوجـۆر لێـك دەدرایـەوە. خاتوونـە دەوڵەمەنـدەکان گزیـرو خزمـەتکارو پەرستاریان هەبوو. قورسایی ژیان کەوتبووە سەر شانی ژنە هـەژارەکان، چـونکە ناچـار بـوون هـەم ئیشـی ماڵـەوە رایـی بکـەن و هـەم شانبەشـانی هاوسەرەکانیان لە فابریکەکاندا کار بکەن.

رێـژەی کـارکردنی ژنـان لـە دەرەوەی مـاڵ تـا سەدەی بیستەم بۆ هـەموو چین و توێـژەکان زۆر کـەم بـوو. تەنانـەت تـا سـاڵی 1910 لـە بریتانیـادا، زیـاتر لـە یـەك لەسـەر سـێی ئـەو ژنانـەی کـە لـە دەرەوەی مـاڵ کاریـان دەکـرد، بریتی بوون لە خزمەتکار یان کارەکەری ماڵان. هێزی کاری ژنان لە بنەڕەتدا لە ژنە گەنجەکان پێك دەهات کە حەقدەستەکانیان دوای ئـەوەی لـە فابریکـە یـان دائیرەکانـدا کاریـان دەکـرد، راستەوخۆ لە لایەن خاوەنکارەکانەوە دەنێردرا بۆ بـاوك و دایکیـان. ئەم ژنانە دوای شـووکردن وازیان لە کارکردن دەهێنا.

لەو کاتـەوە تـاکو ئێسـتا، بەشداری ژنـان لـە هێـزی کـاردا کەموزۆر چووەتە سەر. یـەکێك لـە

هۆکاره سەرەکییەکانی ئەم کاره، دەگەڕێتەوە بۆ کەمبوونی هێزی کار لە سەردەمی شەڕی جیهانی دووەمدا. بە درێژایی شەڕەکە، ژنان زۆرێك لەو کارانەیان ئەنجام دەدا کە پێشتر بۆ پیاوان تاپۆ کرابوون. دوای تەواوبوونی شەڕ، سەرلەنوێ پیاوان چوونەوە سەر کارەکانی خۆیان، بەلاّم مودێلی پێشوو ئیتر تێك شکابوو. ئەمڕۆ زیاتر لە 50٪ی ژنانی نێوان 16 تا 60 ساڵ لە زۆربەی ولاّتە ئەوروپییەکاندا فەرمانبەرو مووچەخۆرن. بەرچاوترین چوونەسەر لە نێو ژنە مێرددارەکاندا بووە. ئێستا لە بریتانیادا زیاتر لە 40٪ی ئەو ژنانەی کە منداڵی خوار تەمەنی سێ ساڵیان هەیە، خەریکی کارن‌و داهاتیان هەیە. بە سەرینی ئەمانەشەوە، هێشتا هێزی کاری ژنانی مووچەخور لە چاو پیاوان زۆر کەمترە. زیاتر لە 74٪ی حەشیمەتی پیاوانی نێوان تەمەنی بیست‌و پێنج تا شەست ساڵ کاری مووچەخۆری دەکەن‌و، ئەم ڕێژەیە بە درێژایی سەدەی رابردوو گۆڕانێکی ئەوتۆی بە خۆوە نەدیوە. پەرەسەندنی ئاستەکانی کارکردن بو ژنان لە ئەنجامی دەرپەڕاندنی هێزی کاری پیاوان لە لایەن ژنانەوە بەدی نەهاتووە، بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ چوونەسەری گشتیی ژمارەی ئەو کارانەی کە سەریان هەڵداوە.

### نایەکسانی لە کاردا

هێزی کاری ژنان ئەمڕۆ بە گشتی لەو کاره ئاساییانەدا چەقی بەستووە کە حەقدەستێکی کەمتریان هەیە. گۆڕانکاری لە ڕێکخستنی کارەکان‌و تێگەیشتنی رۆتینی لە رۆڵی رەگەزی یارمەتی بەم باره کردووە. بە دەرکەوتنی گۆڕان لە کەسێتی‌و ئەرکەکانی "کاری ئیداری"دا نموونەیەکی زەقی ئەم بوارەیە. لە ساڵی 1850 لە بریتانیادا، 99٪ی فەرمانبەرە ئیدارییەکان لە پیاوان پێك دەهاتن. فەرمانبەری ئیدارییبوون بە زۆری هەڵگری واتای هەبوونی پلەو پایەی بەرپرسیاریەتی، بوونی زانیاری‌و پسپۆڕی لە بواری ژمێریاری‌و هەندێجاریش هاوکات لە گەڵ بەرپرسیاری لە بەڕێوەبەریدا بوو. تەنانەت سادەترین فەرمانبەری ئیداریش لە نێو کۆمەڵدا کەسێتییەکی دیاریکراوی هەبوو. سەدەی بیستەم سەدەی بە ئامێرکردنی کاره ئیدارییەکان بوو (ئەم گۆڕانە بە باوبوونی ئامێری تایپ لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دەستی پێ کرد.)، کاتێ کە لێزانییەکان‌و پلەو پایەی "فەرمانبەری ئیداری" بە شێوەیەکی دیارو بەرچاو دابەزی، پۆستێکی دیکەی پێوەندیدار، واتە پۆستی سکرتێری ئیداری بوو بە کارێکی ناگرنگ‌و کەم حەقدەست. بەرەبەرە کەپرستیژو حەقدەستی ئەمجۆرە کارانە دابەزی، ژنان ئەم پۆستانەیان داگیر کرد. لە بریتانیای ساڵی 1991دا نزیکەی 90٪ی فەرمانبەرەکان‌و 98٪ی هەموو سکرتێرەکان ژن بوون.

لەم دواییانەدا ژنان تا رادەیەك روویان لەو پیشانە کرد کە بە "پیشەی پیاوان" ناودێر کرابوون، بەلاّم تاکو ئێستا لە رادەیەکی سنووردراردا توانیویانە ئەم پیشانە بە دەست بهێنن. سەرباری ئەوەی کە لە بریتانیای ساڵی 1984دا ژنان 46٪ی هێزی کاری مووچەخۆر پێك دەهێنا، تەنیا 17٪ی پۆستەکانی سەرووی

بەڕێوەبەرایەتییان بە دەستەوە گرتبوو. ژنان تەنیا 5٪ی تەواوی دامەزراوە بازرگانییەکانیان بە دەستەوەیەو ئەم دامەزراوانە تەنیا 1٪ی پێداویستییەکانی بازاڕ دابین دەکەن. کاتێ لە ساڵی 1979دا مارگرێت تاتچەر بوو بە یەکەم سەرۆک وەزیرانی ژن لە بریتانیادا، ئەم کارە وەك هەنگاوێکی بەرەوپێش بۆ ژنان بە شێوەیەکی گشتی لە قەڵەم درا. لە راستیدا، ساڵی 1980 پارلمانی بریتانیا لە 1762 پیاوو تەنیا 87 ژن پێك هاتبوو، و تاکو ئێستاش گۆڕانێکی ئەوتۆ لەم نایەکسانییەدا بەرچاو ناکەوێ.

### پرسەکانی سەرکەوتن

ئەو بەشە لە ژنان کە لە رووی ئابوورییەوە سەرکەوتوون، ناچارن لە گەڵ دونیایەکدا خۆیان بگونجێن کە بە هی خۆیانی نازانن. مارگارت هینگو ئان ژاردن ئەزموونەکانی بەڕێوەبەرانی ژن لەگەڵ کەسێکدا بەراورد دەکەن کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دەچێتە ولاتێکی دیکە. پێویستە نەخشەو رێبەری چاك لەگەڵ خۆیدا ببات و یاساکانی خەڵکی ئەو ناوچەیە رەچاو بکات. شۆکی کولتوری (culture shock) تا رادەیەك شتێکی ناچارییەو تەنانەت ئەو بێگانەیە کە بۆ هەمیشە لە ولاتێکی بیانیدا دەژی، هەرگیز وەك کەسێکی خۆیی چاو لێناکرێ، بەلام هینگو ژاردن پێشبینی ئەوە دەکەن کە رەنگە ژنان لە درێژخایەندا سیستمی بەهای پیاوانە هەموار بکەن و بەرپرسیارییەتی بنەماڵەیی و پێویستییە کارییەکان پێکەوە هاوئاهەنگ بکەن. (Hennig & jardin, 1977).

یەکێك لەو هۆکارە سەرەکییانە کە کار دەکاتە سەر ژیانی پیشەیی ژنان، ئەم تێگەیشتنە پیاوانەیە کە کارکردن بۆ ژنانی فەرمانبەر، دوای منداڵبوون لە پلەی دووەمدایە. یەکێك لە توێژینەوەکانی ئەم دواییە لە بریتانیادا تاوتوێی راوبۆچوونی ئەو بەڕێوەبەرانە دەکا کە لەگەڵ ژنانی خوازیاری کاردا لە بەشی تەکنیکی ناوەندە خزمەتگوزارییە لەشساغییەکاندا گفتوگۆیان کردووە. توێژەرەکان بۆیان دەرکەوت کە بەڕێوەبەرەکان هەمیشە لە ژنانیان پرسیوە کە ئاخۆ منداڵیان هەیە یان نا، و ئاخۆ بەرنامەی منداڵبوونیان هەیە؟ لە حاڵێکدا کە هیچکات ئەم شتەیان لە پیاوانی خوازیار نەپرسیوە. کاتێ هۆی ئەم شتەیان لێپرسیون، لە هەموو وەلامەکاندا دوو مەسەلە بەرچاو کەوتووە: یەکەم، رەنگە ژنە منداڵدارەکان بۆ رۆژانی پشووی قوتابخانە یان نەخۆشی منداڵەکانیان پێویستیان بە مۆڵەتێکی زیاتر هەبێ، دووەم، ئەرکی منداڵ بەخێوکردن زیاتر بە مەسەلەی دایك دەزانرێ تا هی دایك و باوك.

هەندێك لە بەڕێوەبەرەکان هۆی دەرخستنی ئەو پرسیارانەیان بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە کە "سەرنجێکی" تایبەتییان بە فەرمانبەرە ژنەکانیان داوە، بەلام زۆربەیان ئەمجۆرە پرسیارانەیان وەك بەشێك لە ئەرکەکانیان بۆ هەڵسەنگاندنی خوازیارێکی ژن چاو لێدەکرد تا دەربکەوێ کە چەندە دەتوانن لە داهاتوودا ببن بە هاوکارێکی جێی متمانە. بەم شێوەیە یەکێك لە بەڕێوەبەرەکان رایگەیاند: من قبووڵمە کە ئەمە تا رادەیەك پرسیارێکی شەخسییە، بەلام

پێموایە کە دەبێ وەك کێشەیەك چاوی لێبکەین. راستە کە ئەمە بۆ پیاو روونادات، بەڵام لە سەرێکیشەوە بێ ئینسافانەیە — ئەمە هەلێکی یەکسان نییە، چونکە پیاو هەرگیز بەم شێوەیە ناتوانێ ماڵو منداڵ پێکەوە بنێ. ( *Homans,* 1987 *p.* 92). لەگەڵ ئەوەدا ئەگەرچی پیاوان ناتوانن لە رووی بیولۆژییەوە منداڵ بە دونیا بێنن، بەڵام ئاشکرایە کە رەنگە بەشێك لە بەرپرسیاریەتی بەخێوکردنی منداڵ بکەوێتە ئەستۆیان. ئەگەرێکی وەها لەلایەن هیچکام لە بەڕێوەبەرانەوە لەبەرچاو نەگیرابوو. هەمان ئەو تێڕوانینە لە بارەی بەرزکردنەوەی پلەی کاری ژنانیشەوە هەبوو: ئەوان رەنگە سەرباری بوونی پلەو پایەیەکی باشیش ناچار بن سەبارەت بە ئاگاداریکردنی منداڵەکانیان بۆ ماوەیەکی کاتی واز لە کارەکەیان بێنن. یەکێك لە بەڕێوەبەرە پایەبەرزەکان لەم پێوەندییەدا وتی:

پیاوەکان لە ئاستە بەرزترەکاندا لە بەرئەوە زاڵن چونکە ژنان سەبارەت بە منداڵبوونو کاری لەو جۆرە واز لە کارەکەیان دەهێنن... من پێم وانییە کە ئەم پلەوپایە بەرزکردنەوە حەتمەن دەبێ "گزینشی" بێت، بەڵکو ئەمە تەنیا واقیعیەتەکانی ژیانە کە بە گشتی ژنان هەوڵدەدەن بڕۆن، شوو بکەنو منداڵیان ببێ، کەواتە ژیانێکی کاری پچڕپچڕیان هەیە. ئەوان دوای گەڕانەوەیان وەستانێك لە ئەزموونو فێربوونیاندا دروست بووەو، کاتێ دێیو لەمە ئەکۆڵییەوە و دەتەوێ خۆبەخشەکان تاقی بکەیەوە، ئەوەی کە گرنگە مەرجەکانی جێبەجێکردنی کارای ئەرکەکانە، نەك رەگەزی خۆبەخشەکە. ئێوە خۆبەخشێکتان هەیە کە رەنگە ژنێك بێت کە بە هۆی گرفتی بنەماڵییەوە سێ ساڵ لە کارەکەی دوور بووەو پیاوێك کە بەردەوام لە کارەکەیدا هەبووە، بۆیە تا رادەیەك ئاشکرایە کە بە مەرجی یەکسانبوونی مەرجەکانی دیکە، لە نێوان ژنو پیاوەکەدا، رەنگە پیاوەکە لە سەر ئیشەکە دابنرێ. ( *Homans,* 1987 *p.* 95).

ئەو ژمارە کەمەی ژنانیش کە پۆستێکی بەرزی بەڕێوەبەرایەتییان بە دەستەوە بوو، تێکڕا منداڵیان نەبوو، و چەندین کەس لەوانە کە دەیانویست لە داهاتووا منداڵیان ببێ، وتیان کە ئەیانەوێ واز لە کارەکەیان بێننو رەنگە دواتر سەر لە نوێ بۆ کاری دیکە رابهێنرێنەوە.

دەبێ بە چ شێوەیەك ئەم ئەنجامانە باس بکەین؟ ئاخۆ دەمارگرژی پیاوەکان لە بنەڕەتدا رێگرە لە بەردەم ژناندا بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەلەکانی کارکردن؟ هەندێ لە بەڕێوەبەرەکان رایان وابوو کە نابێ دایکان هەوڵبدەن بۆ کارکردن بچنە دەرەوەی ماڵ، بەڵکو خۆیان بە منداڵداریو راییکردنی کارەکانی نێو ماڵەوە سەرقاڵ بکەن. بەڵام زۆربەیان ئەم پرنسیپەیان قبووڵ بوو کە ژنان دەبێ لە رووی کەڵك وەرگرتن لە هەلەکانی کارکردن لەگەڵ پیاواندا یەکسان بن. دەمارگرژی لە تێڕوانینەکانیاندا کەمتر پێوەندی بە خودی شوێنی کارکردنەوە هەبوو و زیاتر پێوەندی بە ئەرکو بەرپرسیارێتی بنەماڵەییەوە هەبوو. ئێستا کە زۆربەی خەڵك ئەوە دەسەلمێنن کە ئەرکەکانی دایكو باوك بە شێوەی یەکسان دابەش ناکرێ، کێشەکانی فەرمانبەرە ژنەکان هەروەك خۆیان دەمێننەوە. هەروەك یەکێك لە بەڕێوەبەرەکان

وتویەتی، ئەمە راستییەکی ژیانە کە ژنان لە بەراورد لەگەڵ پیاواندا لە رووی هەلەکانی پێشکەوتنەوە لە دۆخێکی تەواو نالەباردا دەژین( Cockburn, 1991).

**حەقدەستی کەم و داوی هەژاری ژنان**

هەروەك چاوەڕوان دەکرێ، نێونجی حەقدەستی ژنانی کارکەر زۆر لە هی پیاوان کەمترە، دیارە لە ماوەی بیست ساڵی رابردودا ئەم جیاوازییە تا رادەیەك کەم بووەتەوە. ژنان زیاتر لەو بەشانەدا کار دەکەن کە حەقدەستێکی کەمتریان هەیە، بەڵام تەنانەت لەو ئاستانەشدا ژنان لە چاو پیاوان مووچەیەکی کەمتر وەردەگرن. بۆ نموونە، ژنانی فەرمانبەر لە بریتانیادا داهاتیان بەرانبەرە بە 60٪ی داهاتی پیاوەکان و فرۆشیارە ژنەکانیش 57٪ی داهاتی پیاوەکان بە دەست دەهێنن.

لە بریتانیا رێژەیەکی بەرچاو لە ژنان لە هەژاریدا دەژین. ئەم مەسەلەیە بە تایبەت لە سەر ئەو ژنانە وەڕاست دەگەڕێ کە سەرپەرستی بنەماڵەن. لە نێو هەژارەکاندا رێژەی ژنان لەو دوو دەیەی پێشوودا بەردەوام چووەتەسەر، سەرباری ئەو راستییە کە رێژەی ئەو کەسانەی کە لە هەژاریدا دەژین لە دەیەی 1960دا دابەزیو لە دەیەی 1970دا نەگۆڕ بوو (سەرلەنوێ لە دەیەی 1980دا چووەسەر.) بە گشتی ئەو ژنانەی کە منداڵی وردیان هەیەو پێویستیان بە ئاگادارییەکی زیاتر هەیە، لە هەژارییەکی زۆردا دەژین. لێرەدا بەفیڕۆچوونێك هەیە: ئەو ژنەی کە دەتوانێ کارێکی باش و داهاتێکی باشی هەبێ، لە بەرئەوەی کە ناچارە خەرجی بەخێوکردنی منداڵەکەی بدات، رەنگە لە رووی ماددییەوە فەلەج ببێ، بەو حاڵە ئەگەر نیودان کار بکا، داهاتەکەی دائەبەزێ، هیچ هەلێکی پێشکەوتنی لە بەردەمدا نامێنێ و هەروەها ئیمتیازە ئابوورییەکانی دیکەی وەك مووچەی خانەنشینی - لەدەست دەدات ( Rodgers, 1986).

تا چەند ئەم دۆخە لە وڵاتانی دیکەدا جیاوازە؟ وەك بنەڕەتێك بۆ بەراوردکردن، ئێمە سوید وەك نموونە دەهێنینەوە. بە بەراوردکردن لەگەڵ بریتانیادا ئەم وڵاتە ریزە هەنگاوێکی بەربڵاوتری بۆ باشترکردنی رەوشی ئابووری ژنان هەڵگرتووە.

**نموونەی سوید**

سوید لە رووی یاسای گەشەپێدانی یەکسانی نێوان ژن و پیاودا پێشەنگی جیهانی رۆژئاوایە ( Scriven, 1984). بەشێکی بەرچاو لە ژنانی سوید فەرمانبەرن- لە ساڵی 1984دا 80٪ی ئەو کەسانەی تەمەنیان لە نێوان 16 تا 64 ساڵدا بووە، کاریان کردووەو مووچەخۆر بوون. ( Allmanl-manad Statisk 1987). هەر ژنێك کە منداڵی دەبێ لە یەك مانگ پێش لە دایکبوونییەوە تا شەش مانگ دواتر لە لایەن دەوڵەتەوە هەندێ ئیمتیازی پێدەدرێ کە دەتوانێ 90٪ی داهاتی ئاسایی دابین بکا. ئەم

شەش مانگە دەکرێ لە نێوان دایكو باوكدا بەو پێیە کە کامیان بۆ راگرتنی منداڵەکەیان بە شێوەی کاتی واز لە کارەکەی بهێنێ، دابەش دەبێت. ئیمتیازی 180 رۆژەی دیکەش هەیە، کە دایكو باوك دەتوانن لە قۆناغێکی دواتردا سوودی لێوەربگرن. گەلێگ ناوەندی راگرتنی منداڵانیش هەن کە لە ساتەکانی دوای قوتابخانەو رۆژەکانی پشووداندا هەندێ ئاسانکاری بۆ منداڵانی تا تەمەن 12 ساڵ فەراهەم دەکەن.

وادیارە ئەم هەنگاوانە لە رووی فەراهەمکردنی چەند هەلو دەرفەتێك بۆ دەستڕاگەیشتنی ژنان بە پۆستو مقامی بەرز تا رادەیەك سەرکەوتوو بوون. بۆ نموونە، ژنان یەك لە سەر چواری کورسییەکانی پارلمانی سویدیان لە بەردەستدایە کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا یەکێك لە بەرزترین رێژەکانە. بەوحاڵەش ژمارەیەکی کەم لە ژنان لە ئاستە بەرزەکانی کۆمپانیا بازرگانییەکاندا دەبینرێنو لە زۆربەی ئیشوکارەکاندا ئامادەیی ژنان لە وڵاتانی دیکەی رۆژئاوایی زیاتر نییە. لە ساڵی 1985دا 45٪ی ژنانی سویدی بە شێوەی نیودان کاریان دەکرد، کە هەلی کاری، ئیمتیازی ئابووریو مووچەی خانەنشینی کەمتری هەیە (لە سویددا تەنیا 5٪ی پیاوەکان بە شێوەی نیودان کار دەکەن.). زۆرێك لە ژنان حەز ناکەن بۆ ماوەیەکی زۆر منداڵەکانیان لە ناوەندەکانی داینگەکاندا بەجێبهێڵنو لە بەر بوونی ئەو ناوەندانە، پیاوەکان پێیان وایە چیتر پێویست ناکا لە کاری راگرتنی منداڵەکانیاندا بەشداری بکەن.

### ژنانی ئەورووپای رۆژهەڵات

گوایە رووسیا "یەکەم وڵاتە کە لە جیهاندا یەکسانی ژنو پیاوی راگەیاندووەو خۆی لە ئاست ئەو سیاسەتانەی کە ئەم یەکسانییە دابین دەکەن، بە دەروەست زانیوە" ( *Attwood & McAndrrew,* 1984*, p.* 259). دوای شۆڕشی 1917ی رووسیا، حکومەتی نوێی شۆراکان راشکاوانە رایگەیاند کە گەلێك هەلی کاری یەکسان بۆ ژنانو پیاوان وێڕای ئیمتیازی دەوڵەتی بۆ راگرتنی منداڵان پێکدەهێنێ.

لە مانگی سپتامبێری 19919دا لقێکی ژنان لە کومیتەی ناوەندی حیزبی بلشڤیکدا بە ناوی ژنوتدل*Zhentdel* پێك هات. مەبەست ئەوە بوو کە ژنان رۆڵێکی سەرەکییان لە ژیانی سیاسیو ئابووریدا هەبێ. ژنوتدل لەگەڵ رێکخراوە ئەمڕۆییەکانی ژناندا بەراورد کراوە – کە بە مەبەستی بردنەسەری ئاستی وشیاری ژنان، پێشانگەو کۆڕو کۆبوونەوەی پەروەردەیی دادەمەزرێننو خەباتی ژنان رێك دەخەن. بەڵام، کۆمیتەکانی حیزبی کومۆنیست کە لە ژێر دەسەڵاتی پیاوەکاندا بوون، بە گومانەوە دەیانڕوانییە ئەو رێکخراوانە. لە چەند بەشێکی یەکیەتی سۆڤییەتدا، لقەکانی ژنان دوای ئەوەی بۆ یەکەمجار دامەزران، هەڵوەشێنرانەوە. لە ناوچەکانی دیکەی ئەو وڵاتەدا ئەو لقانە زۆر چالاك بوون، بەڵام زۆربەی رێکخراوە حیزبییەکانی ژێر دەسەڵاتی پیاوان بەرسەڤیان بوونەوە. سەرەنجام هەموویان هەڵوەشێنرانەوەو تێکەڵ بە کۆمیتە فەرمییەکانی حیزب بوون – و ئەمریان پێکرا

کــــە چـــالاکییەکانیان زیـــاتر لـــە بـــواری بەرهـەمهێنانی باشـتردا چـڕ بکەنـەوە، نـەك بـە تەنیا لە مەسەلەی ژناندا.

ســـەرباری ئەمـــەش حیزبـــی کۆمۆنیســـت بەردەوام ژنانی هان دەدا تا بە شێوەیەکی بەرین لە کاری مووچەخۆڕیدا بەشداری بکەنو ئەمڕۆ ڕێژەی ژنانی مووچەخۆڕ لە رووسیاو ولاتانی ئـەورووپای ڕۆژهەلاتـدا لـە ولاتـانی ئـەورووپای ڕۆژئاوا زۆر زیاترە. بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژئاوادا، ڕێژەی بەشداریکردن لە کاری مووچەخۆڕیدا بە تایبـەت لـە پێوەنـدی لەگـەڵ ئـەو دایکانـەی کـە منـداڵی وردیـان هەیـە لەسـەرێیە. لـە بریتانیـادا نزیکـەی 32٪ی ئـەو ژنانـەی کـە منـداڵی خـوار شـەش ساڵیان هەیـە، لـە نێـو هێـزی کـاردان. لـە چیکوسـلڤاکی (پێشـوو) دا بـە بـەراورد، ئـەم ژمارەیـە زیـاتر لـە 80٪ ە ( Heitlinger, 1979).

هـەروەها ژنـان بـە شێوەیەکی یەکسـانتر لـە چاو ڕۆژئـاوادا لـە نێـو کـارە جۆراوجۆرەکانـدا بـلاو بوونەوەتەوە. لە بریتانیادا، یـەك لەسـەر چواری سەرجەمی ژنانی کارکەر لە پێنج کاردا بەرچاو دەکــەون — ســکرتێری، تایپیســت، کاتــب، خزمــەتکاری مــالان، مامۆســتای ســەرەتاییو گارسۆنی ڕێستووڕانت. لـە رووسیادا ژنان ئـەو کارە جەستەییانە ئەنجام دەدەن کە لە زۆربەی ولاتاندا بە کاری پیاوانە ناسراون، بۆ نموونە، ئەوان لـە کانگاکـان، بەرهـەمهێنانی پـولاو پیشـە موهەندسـییەکاندا کـار دەکـەنو تـا ڕادەیـەك نیوەی هێزی کاری پیشەسازیی پەخەشین (یقه ابی) پێك دەهێنن. ئـەوان هـەروەها بـە ڕێژەیـەکی زۆر لـە زۆربـەی کـارە پیشـەییو پسـپۆڕییەکاندا ئامادەییان هەیـە. لـە رووسیادا زیاتر لـە 75٪ی پزیشکەکانو ددانپزیشکەکانو زیاتر لە 50٪ی بەڕێوەبەرانی پزیشکی لە ژنان پێك هاتوون (بە بـــەراورد، نزیکـــەی 7٪ی پزیشـــکەکانو ددانپزیشـــکەکانی بریتانیـــا لـــە ژنـــان پێـــك هاتوون.).

بـەلام لـە ئـەورووپای ڕۆژئـاوادا یەکسـانی ڕەگەزی کەمتر لـەو ڕادەیە پەرەی سەندووە کە ئامارەکـان دەریدەخـەن. (لـەم بەشەشـەدا) وەکـو ڕۆژئاوا، ئەو کارانەی کە ژنان تێیدا ڕێژەیەکی بەرزیان هەیە، لە چاو پیاوەکاندا کە هەمان ئەو کارانە دەکەن، مووچەی کەمتر وەردەگرن. بـۆ نموونـــە، نێـــونجی مووچـــەی پزیشـــکەکانی رووسـیا لـە هـی موهەندیسـەکان کـەمترە، ئەمـە پیشـەیەکە کـە تێیـدا ڕێـژەی پیـاوان زیـاتر لـە ژنانە. بە شێوەی مامناوەندی داهاتی ژنان لە رووسیادا نزیکەی 75٪ی پیاوانە. ئامادەبوونی ژنـــان لـــە پۆســـتە بـــەرزەکانی حکومـــەتی نیشتمانیدا لاوازە.

هـەروەها، سـەرباری ڕادەی زۆری بەشـداری ژنـان لـە هێـزی کـاردا، ژنـان لـە رووسـیاو ئـــەورووپای ڕۆژهەلاتـــدا ئـــەرکی ســـەرەکی ڕاییکردنی کاروباری ماڵەوەشیان لە ئەستۆیە — و ڕادەی چالاکیان لە چوارچێوەی ماڵـەوەدا لـە زۆربەی ولاتانی ڕۆژئاواییی زۆر زیاترە. کاتێکی زۆر بـۆ شـت کـڕین تـەرخان دەکـرێ، چـونکە چاوەڕوانیکردن لە ڕیزەکانی کڕینی پێویستییە سەرەتاییەکاندا کارێکی پێویستە، خانووەکـان بچـــووکنو کەرەســـتەکانی نێـــو مـــاڵ کـــەمتر پێشـــکەوتوون. نرخـــی مەکینـــەی جـــل شـــتن (غسـالە)و سـەلاجە لـە چـاو مووچـەدا گرانـە، مەکینەی کاسەوکەوچك شتنو مەکینەکانی جل

وشككردنەوە دەكرێ بڵێین هەر نین. پیاوان بە زۆری بە شێوەیەكی نەگەتیڤانە دەڕواننە كارەكانی ماڵەوەو، ئەگەرچی نیسبەتی ئەو ژنانەی كە دوودان لە دەرەوە كار دەكەن، زۆر لە بریتانیا زیاترە، نێونجی هاریكاریكردنی پیاوەكان لە كارەكانی ماڵەوەو راگرتنی منداڵەكان كەمترە.

**كاروباری نێو ماڵ**

كاری نێوماڵ بەشێوەی ئەمڕۆ لەگەڵ جیابوونەوەی خانوو و كارگەدا سەری هەڵدا (Oakley, 1974). خانوو لەجیاتی ئەوەی ببێتە شوێنێك بۆ بەرهەمهێنانی كاڵا، بوو بە شوێنی بەرخواردن (مصرفكردن). بەرەبەرە "كاری راستەقینە"، زیاتر لە پێشوو وەك كارێك پێناسە كرا كە حەقدەستی راستەوخۆ وەردەگرێ، ئیتر كاروباری نێوماڵ ئاسەواری نەما. قۆناغی پەرەسەندنی خانوو وەك، یەكەیەكی جیاواز كۆمەڵێك گۆڕانی دیكەی بە خۆوە دیت. بەرلەوەی داهێنانەكان و خزمەتگوزارییەكان بە هۆی پیشەسازییەوە باڵ بەسەر قەڵەمڕەوی ماڵەوەدا بكێشێن، كاروباری نێوماڵ سەختو دژوار بوو. بۆ نموونە، پاكوخاوێنی حەفتانە ئەركێكی دژوارو گران بوو. كۆمپانیای مەكینەی جلشۆریی مایتەگ (Maytag) بە وێناكردنەوەی چۆنیەتی شیوكردن لە سەدەی نۆزدەهەمدا، لێكۆڵینەوەیەكی ئەنجام داوەو بەو ئاكامە گەیشتووە كە " سەختی شیوكردنی جاران وەك ئەوە وابوو كە ڕێگایەكی پێنج مایلی یەكسەر بە بۆقەمەلە ببڕی، چونكە جووڵەی دەستەكانو خۆ خووساندن لە هەر دوو حاڵەتەكەدا وەكو یەك وان( Hardyment, 1987,p.6).

بە راكێشانی بۆری ئاوی ساردو گەرم بۆ نێو ماڵەكان بەشێك لەو ئەركانەی كە وەختگر بوون، كۆتاییان هات. پێشتر دەبوایە ئاویان بە شان بگوێزایەتەوە بۆ نێو خانووو هەر كاتێك پێویست بوایە، ئاویان گەرم بكردایە. راكێشانی كێبڵی كارەبا و بۆری گاز(غاز) بۆ نێو خانووەكان، جێی بە كوورەی خەڵووزو دار لێژ كردو بەمجۆرە هەندێ كاری وەك دار وردكردنو گواستنەوەی خەڵووزی بەردو خاوێنراگرتنی بەردەوامی کووره لە کۆڵ بوویەوە. ئەو ئامێرانەی كە هۆی خێراتركردنی كارەكانن وەك، گسكی كارەباییو مەكینەی جلشۆریی، كارە دژوارەكانی ئاسان كردو بنەماڵە باشتر توانی بە پەروەردەكردنی منالاندا رابگا. بەو حاڵەش جێی سەرسوورمانە كە ژنان ئێستاش هەر كاتێكی زۆر بۆ راییكردنی كاروبارەكانی ماڵەوە تەرخان دەكەن. ئەو ماوە زەمەنییەی كە كەیبانووە بریتانییەكان لە ماڵەوە بۆ راییكردنی كارەكان سەرفی دەكەن لە ماوەی نیوسەدەی رابردوودا هیچ گۆڕانێكی بە سەردا نەهاتووە. ئامرازەكانی نێوماڵ هەندێ لە كارە سەختەكانیان ئاسان كردووە، كەچی هەندێ ئەركی نوێشیان دروست كردوە. پێڕاگەیشتن بە منداڵو كڕینی پێداویستەكانی ماڵەوەو چێشت لێنان هەمووی زیادی كردووە.

بزووتنەوەی ژنان تا رادەیەك توانیویەتی كار بكاتە سەر تێڕوانینی پیاوان بۆ ئەركەكانی ماڵو دەرەوەی ماڵ، بەڵام تەنانەت پیاوە نوێخوازەكانیش پێوەرە كۆنەكانیان پاراستووە.

میراکۆماروڤسکی لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر شەست و دوو پیاوی خوێندکاری قۆناغی کۆتایی زانکۆی کۆلۆمبیای شاری نیویۆرك ئەنجامداوە بەو مەبەستەی کە گۆڕانی بیروباوەڕیی تایبەت بە خەسڵەتە پیاوانەکانیان تاوتوێ بکات. زۆرێك لەم کەسانە لایەنگری ئامانجەکانی بزووتنەوەی ژنان بوون، سەرباری ئەوەش هێشتا بڕوایان وابوو کە پیاوان خاوەن ئیرادەیەکی بەهێزن و بڕوابەخۆن. ئەوان هاودەمیکردنی رۆشنبیرانیان پێخۆش بوو، بەڵام بە پارێزەوە خۆیان لە قەرەی ژنانی زیرەك و بڕوابەخۆ دەدا. ئەگەرچی ژنانی ماڵەوەیان بە هەند وەرنەدەگرت، بەڵام زۆربەیان بڕوایان وابوو کە زەمەنی کاریی پیاوەکان لە سەرەوەی هەموو شتێکەوە بێت. ئەوان بە گشتی داوەرێکی باش بوون، بەڵام کە ئەهاتە سەر (مافی) تاکەکان بەجۆرێکی دیکە بیریان دەکردەوە. بۆ نموونە، یەکێك لەو پیاوانە دەیوت باشتر وایە ئەگەر ژنێك ویستی شوغڵێکی هەبێ، وازی لێبێنین با کاری خۆی بکات. هەرچەند من وەك خۆم حەز ئەکەم ژنەکەم لە ماڵەوە بێت (*Komarovsky,* 1976).

رەوتی روولە زیادبوونی ژمارەی ئەو ژنانەی کە دەچوونە نێو هێزی کار، کارێکی گەورەی کردە سەر ئەرکەکانی ماڵەوە(*Vanek,* 1974). ئەو ژنەخێزاندارانەی کە لە دەرەوە کار دەکەن، لە ژنەکانی تر کەمتر خۆیان بۆ ماڵەوە تەرخان دەکەن ئەگەرچی بە زۆری کارەکانی ماڵەوە رایی دەکەن. دیارە لە کارەکانیاندا سەرمەشقی جیاوازیان هەیە. ئەوان لە رۆژانی کۆتایی حەوتوودا هەر لە ئێوارەوە تا درەنگانی شەو بە پاك و خاوێنکردنی ماڵەوە خەریك دەبن.

کاری بێ بەرانبەری ماڵەوە گرنگییەکی زۆری بۆ ئابووری کۆمەڵگە هەیە. مەزەندە کراوە کە کاری ماڵەوە لە نێوان 25 تا 40٪ی سەروەت و سامانی وڵاتانی پیشەسازی لە خۆ دەگرێ. کاری ماڵەوە بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بێ بەرانبەر، کە زۆرێك لە کارکەرانی کۆمەڵگە پێویستیان پێیەتی، بەشەکەی تری ئابووری بەهێز دەکا.

### بزووتنەوەکانی داکۆکیکردن لە مافی ژنان

ئەوانەی لایەنگرییان لە مافەکانی ژنان کردووە، تا رادەیەکی زۆر گرنگیی کاروباری نێوماڵیان وەبیر هێناوەتەوە و شرۆڤەیان کردووە. دەمێك ساڵ بوو کە کۆمەڵناسان بەوە تاوانبار دەکران کە پێناسەیان بۆ کار تەنیا بریتییە لە کاری دەرەوەی ماڵ. لایەنگرانی مافەکانی ژنان ئەوەیان نیشانداوە کە ئەمە روانگەیەکی چەواشەکارانەیە و، (بەمجۆرە) زەمینەیان بۆ خوێندنەوەی چالاکی و تێڕوانینی ژنان لە زۆرێك لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا کە پێشتر بایەخێکی ئەوتۆیان پێنەدەدرا، خۆش کرد. ئەگەرچی ئەم کاریگەرییە دیاردەیەکی نوێ و تایبەت بووە. داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنان – خەبات بۆ داکۆکیکردن و پەرەسەندنی مافەکانی ژنان – لە راستیدا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە و ئەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم.

یەکێك لەو کتێبانەی کە بۆ یەکەمجار ئەندێشەی داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنانی خستەروو کتێبی (مری ولستونکرافت) بوو بە ناوی "داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنان". ( *A. Vindication of the Rights of Women*). ئەم کتێبە یەکەمجار لە ساڵی 1792دا بڵاو کرایەوە. ئەو رایگەیاند: "ژنان هەموو گەمژەیی و خەوشەکانی شارستانیەتیان وەرگرتووەو لە خێرو بەرەکەتەکەی بێ بەری بوون". شانزەساڵ بەر لەو مێژووە، ئەبیگێل ئادامز (*Abigail Adams*) لە ئەمریکادا داوای چاککردنی رەوشی ژنانی کردبوو. کاتێ کە هاوسەرەکەی بڕیار وابوو ببێتە سەرۆك کۆماری ئەمریکا، نامەیەکی بۆ نووسی و تێیدا وتی، من پێم خۆشە تۆ ژنان لە بیر نەکەی و زیاتر لە جاران خۆت بە هاوڕێ و دڵسۆزی ئەوان بزانی. لە بیر نەکەی کە هەموو پیاوان ئەگەر بیانتوانیبا دەبوون بە ملهوڕ( *Rossi & Caldevxr wood,* 1973).

### یەکەم بزووتنەوەکانی ژنان لە فەرەنسا

دوابەدوای شۆڕشی ساڵی 1789ی فەرەنسا، یەکەمین گرووپەکانی داکۆکیکاری مافەکانی ژنان چالاکانە خۆیان رێکخست. ( *Evans,* 1977). لە دەیەی 1790دا بە ئیلهام وەرگرتن لە ئارمانەکانی ئازادی و یەکسانی کە شۆڕشی فەرەنسا سەبارەت بەوان سەری هەڵدابوو، چەندین سەنتەری تایبەت بە ژنان لە پاریس و شارە گەورەکاندا دروست بوون. ئەم سەنتەرانە بوونە شوێنی کۆبوونەوەی ژنان، بەڵام پرۆژەی سیاسیشیان هەبوو و داوای مافی یەکسان لە بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن، کارو حکومەتدارییان دەکرد. ماری گەووز (*Mari Gauze*) رێبەری یەکێك لەم سەنتەرانە راگەیەندراوێکی بە ناوی "مانیفێستی مافەکانی ژنان" لە سەر بنەمای بانگەوازی جیهانی مافی مرۆڤ و مافی هاووڵاتیان، واتە گرنگترین دیکۆمێنتی شۆڕش نووسی. ئەو بە بەڵگەوە باسی لەوە دەکرد کە مافی هاووڵاتی ئازادو بەرابەر بە پیاوان تەواو نابێ. چۆن یەکسانییەکی راستەقینە بەدی دێت کاتێ کە نیوەی خەڵك لەو ئیمتیازانە بێ بەش کراون کە پیاوان بەشیان پێوەیە. وەڵامی رێبەرە شۆڕشگێڕەکان بە هیچ شێوەیەك نیشانەی هاوخەمی نەبوو – ماری گەووز لە ساڵی 1792دا لە قەنارە درا. دوابەدوای ئەوە سەنتەرەکانی ژنان بەپێی بڕیارنامەیەکی حکوومەتی هوڵوەشێنرانەوە. لەو کاتەوە تاکوو ئەمڕۆ گرووپەکانی داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنان و بزووتنەوەکانیان بەردەوام لە وڵاتە رۆژئاواییەکاندا دامەزراون و دەکرێ بڵێین کە هەمیشە دوژمنایەتییان کراوەو جاری واش هەبووە کە بەرپرسە حکوومەتییەکان توندو تیژانە جووڵاونەتەوە. ماری گەووز تەنیا داکۆکیکاری مافەکانی ژنان نەبوو کە گیانی خۆی لە پێناوی دابینکردنی مافی یەکسان بۆ هاورەگەزەکانیدا بەخت کرد.

### خەبات لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا

لە سەدەی نۆزدەهەمدا بزووتنەوەی داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا زیاتر لە وڵاتانی دیکە گەشەی

کردو زۆربەی ڕێبەرانی بزووتنەوەکانی ژنان لە ولاَتانی دیکەدا وەك سەرمەشقێك دەیانڕوانیە خەباتی ژنانی ئەمریکایی. لە ساڵەکانی 1830 تــا 1850 داکۆکیکــارانی مافــەکانی ژنــانی ئەمریکایی پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەبوو کە لایەنگری هەڵوەشاندنەوەی کوێلایەتی بوون. تۆمارەکانی دژی کوێلایەتی تا ڕادەیەکی زۆر ئیمزای ژنانی لەخۆ دەگرت. لە گەڵ ئەوەشدا، چونکە ژنان هیچ جەشنە مافێکی سیاســی – یاســاییان نــەبوو، ریفۆرمیســتەکان نەیاندەتوانی وەك لۆبییەکی سیاسی ( *political lobbying*) دوای ئامانجــەکانی خۆیــان بکــەون. هــیچ ژنێك ڕێگــەی پێنــەدرا کــە لــە کونفرانســی جیهــــانی دژی کوێلایــــەتی ســــاڵی 1840ی لەندەندا بەشداری بکاو هەر ئەم ڕاستییەش ڕێکخراوەکانی ژنانی ناچار کرد تا ڕاستەوخۆتر دژی ئــەمجۆرە نایەکســانییە ڕەگەزییانــە کــار بکــەن. لــە ســاڵی 1848دا ڕێبــەرانی ژنــانی ئــەمریکایی وەك، هاوخەباتــە فەرەنسییەکانیان لــە ســەدەونیویێك لەوەپێشــدا لــە دەوری یــەك کۆبونــــەوە تــــا مانیفێســــتی ڕوانگــــەکان (*Declaration of Sentiments*) لە سەر بنەمای نموونەی سەربەخۆیی ئەمریکا پەسندبکەن. ئەم مانیفێســـتە بـــەمجۆرە دەســـتپێدەکا: "ئێمــە بــاش لــەم ڕاســتییە ئاگــادارین کــە هــەموو ژن و پیاوێــك بــە یەکســان لــە دایــك بــوون". پاشــان مانیفێســتەکە لیســتێکی درێــژ لــەو ناعەدالەتیانــە ڕیــز دەکا کــە دەرهــەق بــە ژنــان جێبەجێ کراون ( *Banner & Hartman,* 1974). بەلاَم لەم قۆناغەدا دەسکەوتێکی ڕاستەقینەی ئــــەوتۆ لــــە بــــواری چــــاککردنی ڕەوشــــی کۆمەلاَیــەتی یــان سیاســیی ژنــان بــەدی نــەهات. کاتــێ کــە کوێلایــەتی کۆتــایی هــات، کــونگرە ئــەوەی پەســند کــرد کــە تــەنیا پیــاوە کۆیلــە ئازادکراوەکــان دەتــوانن مــافی دەنگدانیان هەبێ.

ژنــــە ڕەشپێســــتەکان لــــە گەشــــەکردنی ســــەرەتایی بزووتنــــەوەی ژنــــانی ئــــەمریکادا دەوریــان هــەبوو، ئەگەرچی ئــەوان ناچار بــوون دژ بە دوژمنکاری خوشکە سپی پێستەکانیان ڕابوەســتن. ســوجۆرنێر تــرۆس ( *Sojourner Truth*). ئەو ژنە ڕەش پێستە بوو کە ڕاشکاوانە دژ بە کوێلایەتی و بێبەشکردنی ژنان لە مافی دەنگــدان هاتــە دەنــگ و ئــەم دوو پرۆســەی لــە نزیکــەوە پێکــەوە بەســتەوە. کاتــێ کــە نــاوبراو ساڵی 1850 لە ئیدیانادا بە جۆش وخرۆشەوە لە کۆبوونەوەیەکی دژی کوێلایەتی قسەی کرد، پیاوێکی سپی پێست هاواری کرد: من بڕوا ناکەم تو بە ڕاستی ژن بیت. ئەو بەرۆکی خۆی کردەوە تا بە نیشاندانی مەمکەکانی ژنایەتی خــۆی بســەلمێنێ. ســاڵی 1852 کاتێــك کــە ناوبراو لە کۆڕێکی مافەکانی ژنان لە ئاکرۆندا وتــاری دەدا، ژنــە ســپی پێســتەکان لــە نێــو خەڵکەکەدا ویستیان بە پرسیارکردن هەراسانی بکەن و گاڵتەی پێبکەن. ئەو بەسەر ئەو جۆرە بەرهەڵستیانەدا زاڵ بووو لەم قۆناغەدا ڕۆڵێکی بەرجەستەی لە خەباتی ژناندا گێڕا ( *Hooks,* 1986). بــەلاَم ژنــە ڕەش پێســتەکانی دیکــە کــە تێدەکۆشــان شانبەشــانی داکۆکیکــارە ســپی پێستەکانی مافەکانی ژنان بەشداری خەباتەکە بکــەن، ڕووبــەرووی دەمــارگرژی دەبوونــەوەو دڵســارد دەبــوون, بــەمجۆرە ڕێــژەی ژنــە ڕەش

پێستەکان لە نێو بزووتنەوەی بەرگری لە مافەکانی ژنان کەم بوویەوە.

**وەرچەرخانەکانی ئەوروپا**

یەکێك لە گرنگترین رووداوەکان لە رەوتی گەشەکردنی سەرەتایی بزوتنەوەکانی داکۆکیکردن لە مافەکانی ژنان لە ئەوروپادا پلاتفۆرمێك بوو کە ساڵی 1866 بە ئیمزای 1500 ژن پێشکەش بە پارلمانی ئەوروپا کرا. لەم پلاتفۆرمەدا داوا کرابوو کە لە چاکسازییەکانی هەڵبژاردندا کە ئەو دەم باسی رۆژ بوو، مافی دەنگدانی ژنانیش لە بەرچاو بگیرێت. هیچ بایەخێك بەم پلاتفۆرمە نەدرا، لە بەرانبەردا رێبەرانی ئەو حەرەکەتە یەك ساڵ دواتر "کۆمەڵەی نیشتمانی مافی دەنگدانی ژنان"یان دامەزراند. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بە لایەنگرانی مافەکانی ژنان (*Suffragists*) ناسران و تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام لە پێناو بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بۆ ژنان پلاتفۆرمیان دەدایە پارلمانی ئەوروپا. لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا داکۆکیکارانی مافەکانی ژنان لە بریتانیادا شانبەشانی بزووتنەوەی ژنانی ئەمریکا تەشەنەی سەند. لە سەرەتاکانی دەیەی 1900دا گەلێك رێپێوان و خۆپیشاندان لە شەقامەکانی هەردوو وڵاتدا رێکخران. لە میتینگێکی مانگی ژووەنی 1908دا لە لەندەن حەشیمەتێکی یەك ملیون و پێنسەد هەزار کەسی بەشداری کرد. لەم قۆناغەدا بزووتنەوەکانی ژنان لە هەموو وڵاتە گەورەکانی ئەوروپا و هەروەها ئوستورالیا و نیوزیلەندادا بە خێرایی گەشەیان کرد.

ئیمێلین پانکهۆرست (*Emmeline Pankhurst*)، یەکێك لە کەسایەتییە هەڵکەوتووەکانی لایەنگری مافەکانی ژنان چەندین جار بۆ وتاردان چووە ئەمریکا و لە چەندین کۆبوونەوەی گەورەی ژنانی خەباتکاری بریتانیدا وتاری پێشکەش کرد. ئالیس پاین و هاریت ستانتۆن بلاچ (*Alice Paine & Harriet Stanton Blatch*)دوو ژنی ئەمریکایی بوون کە هاوبەشی خەباتی ژنانی بریتانیایان دەکرد، لە ساڵی 1910دا زنجیرە رێپێوان و خۆپێشاندانێکیان بە بەربڵاوی لە نیویۆرك و شارە گرنگەکانی رۆژهەڵاتی ئەمریکادا رێبەری کرد.

لە دوای ساڵی 1920 بزووتنەوەکانی داکۆکیکار لە مافەکانی ژنان لە بریتانیا و شوێنەکانی دیکە بەرەبەرە هەرەسیان هێنا. هۆکاری ئەم هەرەسهێنانە تا رادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ دابینبوونی مافی دەنگدان کە تا ئەو رێکەوتە (1928 لە بریتانیادا) لە زۆربەی وڵاتە رۆژئاواییەکاندا دابین کرابوو. ژنە شۆڕشگێڕەکان روویان کردە بزوتنەوەکانی تری وەك، ئەو بزووتنەوانەی کە دژی فاشیزم خەباتیان دەکرد. لە حاڵێکدا کە زۆرێك لەو بزووتنەوانە لە پێناو داکۆکیکردن لە مافەکانی ژناندا هەڵدەسووڕان، لایەنگری لە مافەکانی ژنان وەك بزووتنەوەیەکی دیار کە دژ بە ئۆرگانەکانی ژێر دەسەڵاتی پیاوان خەبات دەکا، کەمتر بەرچاو بوو. بەمحاڵەش دابینکردنی مافی سیاسیی یەکسان نەیتوانی پەلوپۆ بۆ بوارەکانی دیکە بهاوێ و لەوانەشدا یەکسانی دابین بکا.

## بووژانەوەی بزووتنــەوەی لایــەنگری لــە مــافی ژنان

لـــــە کۆتاییـــــەکانی دەیـــــەی 1960دا بزووتنـــەوەکانی ژنـــان ســـەرلەنوێ ســـەریان هەڵدایـەوە. لـە مـاوەی ئـەو چارەکە سـەدەیەدا، بزووتنـەوەی لایـەنگری لـە مافـەکانی ژنـان لـە سەرانسـەری جیهـان و بـۆ وێنـە لـە زۆرێـك لـە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا بە شێوەیەکی بەرین پـەری سـەندووە. لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکادا بزووتنـەوەی لایـەنگری لـە مافەکانی ژنـان لـە ژێـر کاریگـەری بزووتنـەوەی مافـە مەدەنییـــەکان و بزووتنـــەوەی خوێندکاریـــدا گیـانێکی تـازەی هاتەوەبەر. زۆرێك لـە ژنـان لـە پێناو ئـەم ئامانجانـەدا هاتنـە مەیدان و چالاکانە کاریان کرد، بەڵام بە زۆری شاهیدی ئەوە بوون کـە لـەم بزووتنەوانـەدا خـەباتکارانی پیـاو بـە شـێوەیەکی نەریتیانـە رۆڵـی پاشـکۆیەتییان بـۆ قایـل دەبـوون. رێبـەرانی بزووتنـەوەی مافـە مەدەنییـەکان ئامـادە نـەبوون ئـەو مافانـەی کـە ژنان خەباتیان بۆ دەکردو خوازیاریـان بوون لـە مانیفێسـتەکانی خۆیانـدا بیـانگونجێنن. بۆیـە ژنـــان دەســـتیان کـــرد بـــە دامەزرانـــدنی رێکخراوەکـــانی ســـەربەخۆی خۆیـــان. بزووتنـەوەکانی خۆیـان لـەم دواییانـەدا لـە چـاو هاوخەباتە پێشـووەکانی خۆیاندا گـەلێك پرسـی هەمەکیتریان هێنایە گۆڕێ. بۆ وێنە، هەندێ لـەو خواسـتانەی کـە ئـەم بزووتنەوانـە پێـداگریان لەسـەر کـردووە، بـریتین لـە بەرابـەری ئـابووری، ئـازادی لـەباربردنی منـداڵ، و گۆڕانکـاری لـە یاسـاکانی تایبـەت بـە تەڵاقـدا. جگـە لـەو دەسـکەوتانەی کـە ژنـان لـە بـاری زانسـتییەوە بەدەسـتیان هێنـاوە، ئـەمڕۆ کاریگەرییـەکی بـێ وێنەیان لە رووی رۆشنبیرییەوە بەجێهێشتووە. نوسـەران و توێـژەرانی داکۆکیکـاری مافـەکانی ژنـــان لـــە هـــەموو لقـــەکانی زانســـتە کۆمەڵایەتییەکان، و زۆرێك لە بوارەکانی دیکـەدا ئێمەیان ناچار کردووە کە خوێندنەوەیەکی نوێ بـۆ ئەندێشـە و تیۆرییـەکانی پێشـووی خۆمـان ئـەنجام بدەین. زۆرێـك لـەو لێکۆڵینەوانـەی کـە لـەم سـاڵانەی دواییـدا لـە پێوەنـدی لەگـەڵ ئـەو هۆکـارە مێـژوویی و کولتوریانـەی کـە کاریـان کردۆتە سـەر رەوشـی ژنـان و هـەروەها دەربـارەی پێوەندییـە رەگەزییـەکان بـە شـێوەیەکی گشـتی ئـەنجام دراون، کاریگـەرییان لـە بزووتنـەوەی داکۆکیکـاری مافـەکانی ژنـان لـەم سـەردەمەدا وەرگرتووە.

## توندوتیژی بنەماڵەیی، ئازاردان و دەسـتدرێژی سێکسی

ئێستا چەند مەسـەلەیەکی بنـەڕەتی تـاوتوێ دەکـەین کـە زۆرێـك لـە ژنـان راسـتوخۆ یـان ناڕاستەوخۆ لەگەڵیاندا بەرەوروون. هـەموو ئـەم مەسـەلانە پێوەنـدییان بـەو شێوازانەوە هەیـە کـە پیـاوان هێـزی باڵادەسـتی کۆمەڵایـەتی یـان فیزیکـی خۆیـان دژ بـە ژنـان بـەکاردەهێنن، ئـەوانیش بـریتین لـە: توندوتیـژی بنەماڵـەیی (*domestic violence*)، ئـازاردانی سێکسـی (*sexual harassment*) و دەسـتدرێژی سێکسـی (*rape*). لـە حاڵێکـدا کـە هەنـدێك لـەم شـێوازانە

هەنـــدێجار لەلایـــەن ژنانـــەوە دژی پیـــاوان گیراونەتەبـەر لـە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا پیـاوان دەستدرێژیکارو ژنانیش قوربانین.

### توندوتیژی بنەماڵەیی

خـانوو بـە گشـتی وەك وارگـەی ئاسـایش و بەختـەوەری چـاو لێـدەکرێ، بـەڵام توندوتیـژیی بنەماڵەیی بەشێکە لە ئەزموونی زۆرێك لە ژنان. توندوتیـژیی بنەماڵـەیی بەڵایـەکی کۆمەڵایـەتی نـــوێ نییـــە. لـــە ســـەدەکانی نێوەڕاســـت و سەرەتاکانی بەپیشەسازیبووندا توندوتیژی لە هەمبـــەر ژنـــان لایـــەنێکی بـــاوی ژیـــانی ژن و مێردایـــەتی بـــوو. تـــا کۆتاییـــەکانی ســـەدەی نۆزدەهەم لە بریتانیادا هیچ یاسایەك نەبوو کە پـێش بـەوە بگـرێ پیـاو لـە ژنەکـەی بـدات. بریـنـدارکردن یــان کوشــتنی ژنەکــە شــتێکی جیاواز بوو. ئەمڕۆ ژنان پشتگیرییەکی یاسایی زیاتریـان هەیـە، سـەرباری ئەوانـەش ئـەمجۆرە توندتیژییانە گەلێك باون. هەندێجار توندوتیژی لـە دژی ژنـان لـە چوارچێوەی ماڵـدا بـە شـتێکی ئاسایی دەزانرێ، بەڵام بەڵگەو شایەتحاڵەکان لە حەشـــارگەی ژنـــە ئەشـــکەنجەدراوەکانەوە پێچـەوانەی ئـەوە نیشـان دەدەن. لـە ڕاپۆرتێکـدا هاتووە کە:"هەنـدێ لـە ژنـەکان زۆر ناجوامێرانـە لێیاندراوە، ئەوان بەهۆی شکانی ئێسکەکانیان، لە بەر برینی چەقۆو گەلێك برینی قووڵی دیکە ئـازار دەکێشـن. هەنـدێکیان بـە کورسـی لـە ســـــەریان دراوە، هەنـــــدێکیان لـــــە پلیکان(قالدرمە)کانـەوە خراونەتـە خـوارەوەو بـە چـــەکوش بزماریـــان چـــەقاندووتە بـــن پێـــی یەکێکیتر. (32,p.1978 Pahl, ).

ســەرباری باشـتربوونی یاسـاکان،بەڵام ئـەو ژنانـەی کـە تووشـی توندوتیـژی دەبنـەوە، بـە زەحمەت دەتوانن پەنا بۆ یاسا ببەن. تێڕوانینـی پـــــۆلیس، کـــــە بـــــە گشـــــتی سیاســـــەتی دەســـتێوەرنەدان لـــە "کێشـــەی بنەماڵـــەیی"دا پەیڕەو دەکەن، هیچ یارمەتییەکیان نادات. کاتێ لـەمجۆرە حاڵەتانـەدا پـەنا بـۆ پـۆلیس دەبـرێ، ئـــــەوان بـــــە گشـــــتی تـــــەنیا هەوڵـــــدەدەن کێشمەکێشـــەکە هێـــور بکەنـــەوەو ئیـــدی لـــە تۆمەتـەکان ناکۆڵنـەوە. ژنـان لـە پێوەندییـەکانی تێکـەڵ بـە توندوتیژیـدا بـە گشـتی لـە بـەر هـۆی جۆراوجۆری ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ وێنـە لـە بەر منداڵەکانیان پێیان سەختە بتۆرێن.

دەزگـــا ئیدارییـــەکانی نیشـــتەجێکردنی ناوچـــەیی هێنـــدێجار بـــە پـــارێزەوە داکـــۆکی لـــەو ژنانـــە دەکـــەن کـــە بـــە دەســـت ئـــازاری جەســـتەییەوە گلـــەیو گازنـــدەیان بـــۆ دەبـــەن، و پێیـــان وایـــە ئـــەم گازندانـــە لـــە بـــەر ئەوەیـــە کـــە خێراتر خانوویەکی دیکەیان پێ بدرێ و ڕەنگە شتی لێ زیاد بکەن.

### ئازاردانی سێکسی

شـوێنی کـار ئاسـانتر مافـەکانی ژنـان دابـین دەکا و ڕادەی توندوتیژیی ڕاستەقینە دژی ژنـان کەمترە. سەرباری ئەمە، ئازاردانی سێکسـی زۆر ئاسـاییە. پێناسـەی ئـازاردانی سێکسـی لـە شـــوێنی کـــاردا دەکـــرێ بریتـــی بێـــت لـــە کەڵکوەرگرتن لە بەرپرسایەتی یان بەکارهێنانی دەسـەڵات بـە مەبەسـتی داسـەپاندنی خواسـتە سێکسییەکان. ڕەنگە بۆ ئەم مەبەستە شێوازی توندوتیژانە پەیڕەو بکرێ، وەکو ئەوەی کە بە

کارمەندێکی ژن دەوترێ یان بە تێکەڵبوونێکی سێکسیانە رازی بێ، یان لەسەر کارەکەی دەردەکرێ. شێوازەکانی ئازاردانی سێکسی تا رادەیەکی زۆر زیرەکانەیە. بۆ نموونە، ئەم شێوازانە بریتین لە تێگەیاندنی ئەوەی کە قبووڵکردنی خواستە سێکسییەکان پاداشتی دیکەی لە دوا دەبێ یان ئەگەر بێت و ئەم خواستانە جێبەجێ نەکرێن جۆرێك لە سزادان، وەك پێشگیری لە بەرزکردنەوەی پلەوپایەی لێ دەکەوێتەوە.

بڕیاردان لە سەر ئەوەی کە لە کوێ و لەگەڵ کێدا پێوەندی سێکسی ئەنجام بدەین، بەشێکی بنەڕەتی لە کونترۆڵکردنی ژیانی ئێمە پێکدەهێنێ، و ئازاردانی سێکسی مافی ئەم هەڵبژاردنەمان لێ زەوت دەکا. هەرچەند رەنگە پیاوان شێوازە هێمنانەکانی ئازاردانی سێکسی بە بێ زیان بزانن، ژنان بە زۆری ئەو شێوازانە وەك سووکایەتی بە خۆیان چاو لێدەکەن. وا چاوەڕوان دەکرێ کە ژنان لە بەرانبەر توانجلێدان، ئیشارەکردن یان خۆلێخشاندندا دان بە خۆیاندا بگرن و "گوێ نەدەن". ئەم کارە نەك هەر سەبرو دان بەخۆداگرتنی دەوێ، بەڵکو پێویستی بە لێزانیشە. گارسۆنێکی ژن کە دەبێ کوکتێل بو سەر مێزەکان بهێنێ و بەخشش لە موشتەریەکان وەربگرێ – ئەمەش بەشێکی گرنگی داهاتەکەی پێك دەهێنێ – ناچارە موشتەرییەکان رازی بکا، بۆیە دەزانێ کە ژنێکی وەك ئەو دەبێ فێر بێ کە لەش و لارێکی جوان و هەر لەو کاتەشدا دوورەدەستی هەبێ. ئاشکرایە کە ئەمە بەو مانایە کە پیاوان لە رێگای وشەی شەهوانی و فریودەرانە، پێشنیاری زیرەکانە و چاوبڕکێکردنەوە هەوەسی خۆیان دائەمرکێنن. ئەو ناچارە بەبێ ئەوەی سووکایەتی بە کەس بکا، بە نەرمییەکەوە دەست بنێ بە رووبیانەوە و خۆیشی تاڵ نەکا. لە راستیدا ئەو دەبێ خۆی وا نیشان بدا کە شیفتە بووە. رێگایەك بۆ رەفزکردن بدۆزێتەوە و بەرانبەرەکەی دڵخۆش بکا (*Mackinnon,* 1979*,p.*78).

ئاشکرایە کە جیاوازیدانان لە نێوان ئازاردانی سێکسی و ئەو شتەی کە پیاو بە نزیکیکردنی رەوا لەگەڵ ژنێك تێی دەگا، کارێکی ئاسان نییە، بەڵام بە پێی راپۆرتە شەخسییەکان وادێتە بەرچاو کە لە بریتانیادا لە نێو هەر 10 ژندا حەوتیان لە ماوەی تەمەنی کارکردندا بۆ ماوەیەکی درێژ تووشی ئازاردانی سێکسی دەبن. ئازاردانی سێکسی پێدەچێ رووداوێکی تایبەت یان سەرمەشقێکی رەفتاری بەردەوام و نەگۆڕ بێت. لەم حاڵەتەی دواییدا ژنان بەگشتی نەیانتوانیوە بە گوێرەی پێویست رەوتی ئاسایی کارکردنی خۆیان بەردەوام بکەن، رەنگە ناچار بووبن ئیزن وەربگرن، یان بە یەکجاری واز لە کارەکەیان بهێنن(*Mackinnon,* 1979).

## دەستدرێژی سێکسی

هەڵسەنگاندنێکی وردی رادەی دەستدرێژی سێکی کارێکی دژوارە. تەنیا رێژەیەکی کەم لە دەستدرێژییە سێکسییەکان بە کردەوە بە ئاگاداری پۆلیس دەگەن و لە ئامارەکاندا دەهێنرێن. رەنگە ژمارە راستەقینەکە پێنج ئەوەندەی ئامارە فەرمییەکە بێت – هەرچەند

کە خەملاندنەکان تا رادەیەکی زۆر جیاوازیان هەیە. بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە دەربارەی 1236 ژنی لەندەنی ئەنجام درابوو، دەرکەوت کە لە نێوان هەر شەش ژندا، ژنێك دەستدرێژی کراوەتە سەر، لە نێو پێنج کەسەکەی دیکەدا یەکێکیان توانیبووی بەرگری لە خۆی بکا،و نیوەی دەستدرێژییەکان یان لە ماڵی خودی ژنەکەدا ئەنجام درابوو، یان لە ماڵی دەستدرێژیکەرەکەدا (Hall, 1985). زۆربەی ئەو ژنانەی کە دەستدرێژییان دەکرێتەسەر یان دەیانەوێ بە تەواوی ئەم رووداوە لە بیری خۆیان ببنەوە، یان ئامادە نین لە پرۆسەیەکدا بەشداری بکەن کە بە سووکایەتیکردن بە خۆیانی دەزانن،و تێیدا لە لایەن پزیشکەوە بپشکنرێن،و پۆلیس لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکا،و دادوەر دادگاییان بکا. پرۆسەی یاسایی بە زۆری کاتێکی زۆر دەخایەنێ، رەنگە تا دادگا بە ئەنجام بگا، هەژدەمانگ بە سەر رووداوەکەدا تێپەر بووبێ.

دادگاییەکەش دەکرێ جێی نیگەرانی بێت. رەوتی دادگاکە ئاشکرایە،و قوربانییەکە دەبێ بەرابنەر بە تۆمەتبارەکە بوەستێ. بە گشتی پیاوان تەنیا لە سەر بنەمای شایەتی قوربانییەکە بە تاوانبار ناناسرێن. کەواتە دەبێ بەڵگەی پشتڕاستکەرەوە لە کەسانی تر وەربگیرێت. دەبێ بەڵگەی تەواو بۆ سەلماندنی کارەکە، شوناسی تۆمەتبارەکە،و راستبوونی ناڕازیبوونی ژنەکە بخرێتە روو. ئەگەر تاوانەکە لە کۆڵان یان شەقامێکی تاریکدا روویدابێ، لەوانەیە بەڵگەی تەواو بۆ ناسینەوەی هێرشبەرەکە بە زەحمەت کۆبکرێتەوە. رەنگە وابزانرێ ئەو ژنەی کە شەوانە بە تەنیا پیاسە دەکا، دەیەوێ پیاوان بۆ لای خۆی رابکێشێ. کاتێك دەستدرێژییەکە روو دەدا، رەنگە داوا لە ژنەکە بکرێ کە باسی پێوەندییە سێکسییەکانی رابردووی خۆی بکا، لە حاڵێکدا پیاوان داوایەکی لەوچەشنەیان لێناکرێ. لە راستیدا رابردووی پیاوەکە پێوەندی بە رووداوە تازەکەوە نابێ. بەپێی بۆچوونی سێر میتۆ هیل، واتە ئەو دادوەرەی کە لە ساڵی 1736دا بڕیارێکی دەرکرد، مێرد لە بەرئەوەی کە دەستدرێژی کردۆتە سەر هاوسەرە یاساییەکەی خۆی بە تاوانبار ناناسرێ. چونکە بەپێی مارەبڕان،و رازیبوونی دوولایەن، ژنەکە خۆی تەسلیمی مێردەکەی کردووە،و ناتوانێ حاشا لەو شتە بکا (Hall, James & Kertez, 1984,p.20). ئەم بنەمایە لە بریتانیا،و ویڵزدا تا ساڵی 1991 وەك یاسایەك جێبەجێ کرا. جگە لە هەندێ حاڵەت کە بڕیاری دەستدرێژی نەکردن، فەرمانی پاراستنی شەخسی، یان جیابوونەوەی یاسایی دەرکراوە، تەنانەت ئەو ژنانەی کە لە مێردەکانیان جیا بوونەتەوە، لە بەرانبەر دەستدرێژی سێکسی ئەواندا هیچ بەرگرییەکی یاسایی لە خۆیان ناکەن. دەستدرێژیکردن لە چوارچێوەی هاوسەرگیریدا تەنیا لە هەندێ وڵاتی وەك دانیمارك، سوید، نەرویج،و کەنەدادا بە نایاسایی دەزانرێ — دیارە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات هەندێ یاسایان پەسند کردووە کە پارێزراوبوونی مێرد لەم پێوەندیانەدا هەڵدەوشێنێتەوە.

لە ئەمریکادا یەکەمین بڕیاری راوەدوونان

(تعقیب) بە هۆی دەستریژیکردن لە ژیانی هاوبەشدا لە دژی جیمز کرتییەن( James k. chretien) لە ساڵی 1979دا دەرکرا. پێش سەرهەڵدانی ئەم کێشەیە، دستدرێژی کردن لە ژیانی هاوبەشدا لە پێنج ویلایەتدا نایاسایی بوو. لەو دەمەوە تاکو ئەمڕۆ زۆرێك لە ویلایەتەکان لەو پێوەندییەدا یاسایان پەسند کردووە، یان هەندێ پشکنین (فحص)یان بۆ سەلماندنی تاوان رواج پێداوە.

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی جەماوەر دەربارەی دەستدرێژی سێکسی راست نییە. بۆ نموونە، ئەمە راست نییە کە ئەگەر قوربانییەکە بەرگری لە خۆی بکا، بە هیچ شێوەیەك دەستدرێژی سێکسی روو نادات، یان رەنگە ژنە گەنجەکان زیاتر بکەونە بەر دەستدرێژی سێکسی، هەندێ لەو ژنانەی کە دەستدرێژی سێکسییان دەکرێتەسەر، چێژی لێوەردەگرن، یان ئەو پیاوانەی کە دەستدرێژی سێکسی ئەنجام دەدەن، لە رووی دەروونییەوە نەخۆشن (Hall, 1985). زۆربەی دەستدرێژییە سێکسییەکان خۆبەخۆ روو نادەن، بەڵکو لانیکەم تا رادەیەك کارئاسانی بۆ کراوە. دەستدرێژی سێکسی راشکاوانە پێوەندی بە پێوەندی نێوان پیاوەتی و دەسەڵات، باڵادەستی و زۆرداریيەوە هەیە و بە زۆری لە ئاکامی مەیلێکی سێکسی لە رادەبەدەر روو نادات، بەڵکو لە ئاکامی پێوەندییەکانی نێوان مەیلە سێکسییەکان و هەستکردن بە دەسەڵات و باڵادەستییەوە ئەنجام دەدرێ. وا دێتە بەرچاو کە پێوەندییەکی ئەوتۆ لە نێوان شەهوەت و دەستدرێژی سێکسیدا نەبێ. ژمارەیەکی زۆر لە دەستدرێژیکەرەکان تەنیا کاتێك هەستە سێکسییەکانیان دەبزوێ، کە بە تەواوی بەسەر قوربانییەکەدا زاڵ بووبن و کەسێتییان شکاندبێ. کردەوەی سێکسی بە بەراورد لەگەڵ شکاندنی کەسێتی ژنەکەدا ئەوەندە گرنگ نییە( Estrich, 1987).

لەم ساڵانەی دواییدا بزووتنەوەکانی ژنان پێیان لە سەر ئەوە داگرتووە کە دەبێ گۆڕان لە روانگەی جەماوەرو یاسا پێوەندییدارەکاندا دروست ببێ. ئەوان جەختیان لە سەر ئەوە کردووە کە نابێ دەستدرێژی سێکسی وەك لادانێکی سێکسی چاو لێبکرێ، بەڵکو دەبێ وەك تاوانێکی درندانە تەماشا بکرێ. دەستدرێژی سێکسی تەنیا هێرشێکی فیزیکی نییە، بەڵکو دەستدرێژی و پێشێلکردنی کەرامەتی ئینسانی ژنە. هەروەك نوسەرێك دەڵێ، دەستدرێژی سێکسی، پێشێلکردنی خۆ بڕیاردان ( self-determination) ی قوربانییەکەیە. ئەنجامدانی توندوتیژییەکە ئەگەر بە لێدان و بریندارکردن دەست پێنەکات، ئەوا هەڕەشەی کوشتنی تێدایە( Griffin, 1978,p.342).ئەم خەبات و تێکۆشانە لە رووی گۆڕینی یاساکانەوە هەندێ ئاکامی واقیعی لێکەوتەوە، و ئەمڕۆ دەستدرێژی سێکسی بە شێوەیەکی گشتی لە یاسادا وەك جۆرە توندوتیژییەکی جینایەتکارانە دەناسرێ.

**دەستدرێژی سێکسی و پەشێوی ژنان: تیۆریی براون میلەر**

لە سەرێکەوە هەموو ژنان قوربانی دەستدرێژی سێکسین. ئەو بەشە لە ژنان کە هەرگیز دەستدرێژیان نەکراوەتە سەر، پەشێوی و نیگەرانییەکی هاوشێوەی ئەو ژنانە دایگرتوون کە رووبەرووی دەستدرێژی سێکسی بوون. ئەوان رەنگە نەوێرن شەوانە بە تەنیا بچنە شەقامە قەرەباڵغەکانیش، و هەروەها رەنگە بە هەمان رادەش ترسیان لەوە هەبێ کە بە تەنیا لەماڵەوە دانیشن، یان لە شوقەیەکدا بە تەنیا بژین. سووزان براون میلەر، بە جەختکردن لە سەر ئەوەی کە مەیلی سێکسیی ئاساییانەی پیاوان و دەستدرێژی سێکسی پێوەندیەکی نزیکیان لەگەڵ یەکدا هەیە، دەڵێ، کە دەستدرێژی سێکسی بەشێکە لە سیستمی هەڕەشەکردنی پیاوان کە هەموو ژنان لە ترس و تۆقاندندا رادەگرێ. ئەو ژنانەی دەستدرێژیان نەکراوەتە سەر، پەشێوی و نیگەرانییەك دایان دەگرێ کە دەبنە هۆی هەڵخراندیان و پێوستە لە ژیانی رۆژانەدا لە هەموو بارێکەوە لە پیاوان چاوقایمتر بن (Brown miller, 1975). رەنگە براون میلەر کەمێك توندڕەوانە بیری کردبێتەوە، بەڵام ئەگەر نەختێك ورد بیر بکەینەوە، بەو ئاکامە دەگەین کە ئەگەر ژنێك بیەوێ ئەگەری دەستدرێژی بۆ سەر خۆی بە تەواوی کەم بکاتەوە، دەبێ چەندە ئاگاداری خۆی بێت. ئەم خاڵانەی خوارەوە ریزە رێنوێنیەکە بۆ ئەو ژنانەی کە هەوڵ دەدەن مەترسی دەستدرێژی بۆ سەر خۆیان کەم بکەنەوە. ئەم رێوشوێنانە لەلایەن یەکێك لە رێکخراوەکانی ژنان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بڵاو کراوەتەوە. ئەم رێوشوێنانە بەردەوام جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە دەستدرێژی سێکسی، جینایەتێکە کە کار دەکاتە سەر رەفتاری هەموو ژنێك (Katz & Mazur, 1979, p 307).

1. تا ئەو جێگایەی بۆتان دەکرێ، خانووەکەتان قایم بکەن. قفڵەکان، پەنجەرەکان و دەرگاکان دەبێ قایم بکرێن. ئەگەر چوونە نێو شوقەیەك یان خانوویەکی تازەوە، قفڵەکان بگۆڕن. بنکەی پولیسی دژە تاوانی گەڕەکەکەتان دەتوانێ لەو پێوەندییەدا رێنمایتان بکات.

2. ئەگەر بە تەنیا دەژین:

ئەلف) گڵۆپەکان مەکوژێننەوە تا خەڵك پێیان وابێ خانووەکەتان لە کەسێك زیاتری تێدایە.

ب) کاتێ وەڵامی زەنگی دەرگا (ئایفۆن) دەدەنەوە، وا نیشان بدەن کە پیاوێك لە ماڵەوەیە و بە دەنگی بەرز بڵێن ئەوا یەکێك ئەبینم لە بەر دەرگا زەنگ لێدەدا.

ج) ناوی یەکەمی خۆتان لە سەر زەنگەکە یان دەفتەری تەلەفۆن مەنووسن، تەنیا پیتی یەکەمی بنووسن.

3. بە گشتی نزیکایەتی خەڵکی بێگانە مەکەن و هەرگیز دەرگاکە بە رووی کەسێکی نەناسدا مەکەنەوە. هەمیشە داوای پێناس (هەویە) لە مەعمیلەکانی خۆتان بکەن و لە ژێر دەرگاکەوە پێناسەکەیان لێ وەر بگرن. ئەگەر منداڵتان لە ماڵەوە هەیە، وریا بن دەرگا لە نەناس نەکەنەوە.

4. ئەگەر لە شوقەیەکدا دەژین، بە تەنیا مەچنە نێو ژێر زەمینێکی چۆڵ، گەراج یان یەکەی جلشۆرییەوەو بە تەنیا لەوێ مەمێننەوە.

5. ئەگەر بە تەلەفۆن قسەیەکی ناشیرینتان لەگەڵدا کرا، هیچ مەڵێن و تەلەفۆنەکە دابخەنەوەو پۆلیس لە مەسەلەکە تێبگەینن.

6. درەنگانی شەو بە تەنیا لە نێو شەقام یان حەوشەی زانکۆدا مەمێننەوە. ئەگەر بۆتان کرا با چەکێکی "کارا"تان پێبێ، وەك جگەرەیەکی داگیرساو، سووژنی کڵاو، لیمۆیەکی لاستیکی، چەتر، قەڵەم، چنگاڵی مەتبەخ، زنجیری کلیل، بورس یان شانەی قژ (بۆ بریندارکردنی دەموچاو)، یان فیقەیەکی پۆلیس (مەیکەنە ملتان، بەڵکو با بە زنجیرەکەوە بێ).

7. لە بەر شوفێری کامیون و لۆرییەکان مەپارێنەوە سوارتان بکەن. (ئەمە زۆر گرنگە!). ئەگەر ناچار بوون سەرکەون، بە کۆمەڵ سەرکەون و تەنیا لە کاتی ترافیك لایتدا.

8. ئەگەر ئۆتۆمبیل لێدەخوڕن:

ئەلف) دڵنیا بن لەوەی کە یەك لە سەر چواری مەخزەنی بەنزینەکەتان پڕ بێ.

ب) هەمیشە کاتێ لە ئۆتۆمبیلەکان دائەبەزن، دەرگاکانی قفڵ بکەن.

ج) بەر لەوەی سواری ئۆتۆمبیلەکەتان ببن، کورسی پشتەوەو تەختاییەکەی چاو لێبکەن.

د) ئەگەر ئۆتۆمبیلەکەتان لە رێدا شکا، داوای یارمەتی لە پیاوێك یان چەند پیاوێك مەکەن، بەڵکو کاپووتەکەی هەڵدەنەوە، و لە نێو ئۆتۆمبیلەکەتاندا دابنیشن و دەرگاکانی قفڵ بکەن و چاوەڕوانی گەیشتنی پۆلیس بن.

9. لە بارەکاندا خۆتان لە ناسینی پیاوی بێگانە ببوێرن، بە تایبەت ئەگەر مەشروبێکی زۆرتان خواردبێتەوە یان ماددە هۆشبەرەکانتان کێشابێ.

10. بە تەنیا لە گەڵ پیاوێکدا مەچنە نێو ئاسانسۆرەوە. یان خێرا دابەزن و یان لە تەنیشت پلاکی کونترۆڵکردنەوە بوەستن.

11. کاتێ مەوعیدێکتان داناوە، سنووری تێکەڵبوونی خۆتان هەر لە سەرەتاوە دیاری بکەن تا دوایی هەڵەیەك روونەدات.

12. ئەو پەرستارانەی کە بۆ راگرتنی منداڵان دەچنە ماڵان، دەبێ پێشتر لێکۆڵینەوەی تەواو لە سەر ناوبانگی بنەماڵەکە بکەن. دایبابەکان دەبێ لە هەڵبژاردنی دادەکاندا زۆر وردبین بن.

13. ئەگەر هێرشتان کرایە سەر، هاوار مەکەن "دەستدرێژی"، هاوار بکەن "ئاگر"!

## کرداری رێسامەندی سێکسی

## جیاوازی نێوان کولتورەکان

بەشێك لە خەڵك وا ئەزانن کرداری سێکسیی مرۆڤ لە بنەڕەتدا لە ژێر کاریگەری هۆکارە بیولۆژییەکاندایە، چونکە کردەوەی سێکسی پێویستییەکی حەتمی زاوزێکردنە. ئەوەی راستی بێت بە پێچەوانەی زۆربەی گیانلەبەرەکانەوە، کاردانەوە سێکسییەکانی ئێمە لە رووی ژنێتیکییەوە دیاری نەکراوە، بەڵکو دەکرێ بڵێین هەموویان لە رێگای فێربوونەوە دروست دەبن – و کردەوەی

سێکسیانەی مرۆڤ بریتییە لە گەلێك چالاکی جۆراوجۆری دیکە، و بە تێکئالآن لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەر (تێکئالآنی ژن و پیاو) یشەوە.

## مەیلە سێکسییەکان لە کولتوری ڕۆژئاوایدا

بۆ ماوەی نزیکەی دوو هەزار ساڵ ئایینی مەسیحییەت بووە سەرچاوەی سەرەکی تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان بۆ کردەوەی سێکسی. هەرچەند کە ئاینزاو فیرقە جۆراوجۆرەکانی مەسیحییەت دیدو ڕوانگەی گەلێك جیاوازییان لەمەڕ پێگەی گونجاوی مەیلە سێکسییەکان لە ژیاندا هەبوو، ڕوانگەی زاڵی کڵێسەی مەسیحی ئەمە بوو کە هەرچەشنە کردارێکی سێکسی گوناحە، و دەبێ لە سنووری زاوزێکردن تێپەڕ نەکات. لە سەردەمانی پێشوودا و لە هەندێ شوێندا ئەم ڕوانگەیە، ڕواڵەتێکی پیرۆزو ڕیاکارانەی لە ئاستی کۆمەڵگەدا وەرگرتبوو. بەڵام دوای ئەو سەردەمە، خەڵکێکی زۆر ئامۆژگارییەکانی کڵێسەیان پشتگوێ خست یان لە بەرانبەریدا ڕاوەستان و بە گشتی ڕوویان کردە زەناکردن و کردەوەی ئەوتۆ کە لە لایەن پێشەوا مەزهەبیەکانەوە حەرام کرابوو.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا تیۆرییە پزیشکییەکان تا ڕادەیەك جێگای تێگەیشتنی مەزهەبییان لەمەڕ مەیلە سێکسییەکان گرتەوە. بەڵام زۆربەی نووسراوە پزیشکییەکان هەروەك بیروباوەڕەکانی کڵێسە ڕوانگەیەکی سەختگیرانەیان دەربارەی کردەوەی سێکسی هەبوو. هەندێ لەو نووسراوانە وایان نیشان دەدا کە هەرچەشنە کردەوەیەکی سێکسی ئەگەر لە چوارچێوەی زاوزێکردندا نەبێ، زیانی جەستەیی بەو کەسانە دەگەیێنێ کە ئەنجامی دەدەن.

## کردەوەی سێکسی

ئێمە دەتوانین بە دڵنیاییەکی زیاترەوە دەربارەی بەها گشتییەکانی تایبەت بە مەیلە سێکسییەکان لە ڕابردوودا قسە بکەین تا ئەوەی کە باسی شێوازەکانی ڕەفتاری تایبەتی بکەین، چونکە ئەم کردەوانە بەپێی سروشتیان هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نادەن. کاتێ ئالفرێد کینسی لە ساڵانی 1940 و 1950دا لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەست پێکرد، بۆ یەکەمجار بوو کە لێکۆڵینەوەیەکی بەرچاو دەربارەی کردەوەی سێکسی ئەنجام دەدرێ. کێنسی و هاوڕیانی لەلایەن زۆرێك لە ڕێکخراوە مەزهەبییەکانەوە تاوانبار کران، و توێژینەوەکانی وەك کارێکی نائەخلاقی لە ڕۆژنامەکان و کونگرەدا مەحکووم کرا. بەڵام ئەو پێداگربوو و سەرەنجام بیوگرافی سێکسی هەژدەهەزار کەس لە حەشیمەتی سپی پێستی ئەمریکای وەرگرت کە نموونەیەکی باشی حەشیمەتی سپی پێستی ئەو وڵاتە بوو (***Kinsey et all,*** 1953, 1948).

ئاکامەکانی لێکۆڵینەوەکانی کێنسی زۆربەی خەڵکی تووشی سەرسووڕمان و زۆری دیکەشی ڕاچڵەکاندبوو، چونکە دەریانخست کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان چاوەڕوانییەکانی خەڵکی ئەو سەردەمە لەمەڕ کردەوەی باوی سێکسی و کردەوەی ڕاستەقینەی سێکسیدا

هـەبوو. هـەروەها نـاکۆکی نێـوان تێڕوانینـی جـەماوەرو کـردەوەی راسـتەقینەی سێکسـیدا نیشـان دا. بـەڵام رەنگـە ئـەم ناکۆکییـە لـەو سەردەمە تایبەتـەدا دوابـەدوای شـەڕی جیهانی دووەم زۆر بووبێ. لـە دەیـەی 1920دا قۆنـاغی ئـازادبوونی پێوەندییـە سێکسییەکان ( *Sexual Liberal Lization*) تـا رادەیـەك زووتـر دەسـتی پێکردبوو، سـەردەمێك کـە زۆرێك لـە گەنجـەکان هەستیان دەکرد لـە ژێر باری یاسا ئەخلاقییە دوگماکاندا رزگاریان بووە. پێدەچوو گـۆڕانێکی تـا رادەیـەکی زۆر بەسـەر کـردەوەی سێکسـیدا هاتبێ، بـەڵام پرسـە سێکسـییەکان وەك ئـەمڕۆ ئازادانە نەدەهاتنە بەرباس.

لەبەرئـەوە کـە کـردەوەی سێکسـی لـە لایـەن خەڵکەوە بە ناشیرین دەزانرا. ئەو کەسانەی کە لـەو کارانـەدا بەشـدارییان دەکـرد، هـەوڵیان دەدا کـەس پێیان نەزانێ، بێ ئـەوەی بـە تـەواوی لـەوە ئاگـادار بـن کـە خـەڵکی دیکـە چـەندە سـەرقاڵی ئـەمجۆرە کردەوانـەن. قۆنـاغی ئازادیخوازانـەی دەیــەی 1960 تــوانی تێڕوانینــە شــەفافەکان لەگــەڵ واقیعییەتــەکانی کــردەوەی سێکســیدا نزیکتر بکاتەوە.

هیچ لێکۆڵینەوەیـەکی گشتگیرتر کـە بتوانێ شـان لـە شـانی لێکۆڵینـەوەکانی کینسـی بـدات، لەو کاتەوە تاکو ئەمڕۆ لـە هیچ وڵاتێکدا ئـەنجام نــەدراوە. بــە هــۆی پــرژوبڵاوی ماهییــەتی لێکۆڵینـەوەکانی دوایـی، نـاتوانین بـە تـەواوی لـەوە دڵنیـا بـین کـە کـردەوەی سێکسـی لـەم سـەردەمەدا چـەندە لەگـەڵ سـەردەمی دوای شـەڕی جیهـانی دووەمـدا جیاوازی هەیە. بـەڵام هەندێ لە رەوتـەکان تـا رادەیـەك بەرچاورونییان تێدایـە. لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان و زۆربـەی وڵاتە ئەوروپییەکاندا رادەی ئەزموونی سێکسـی بـەر لـە هاوسـەرگیری (بەتایبـەت لـە نێـوان ژنەکانـدا) چـووەتە سـەر. وا دێتـە بەرچـاو کـە زۆربەی کۆمەڵگە رۆژئاواییەکان درەنگ یان زوو دەگەنە ئاستێك کە سوید لە ساڵی 1970دا پێی گەیشتووە. واتـە سـەردەمێك کـە 95٪ی ژنـان و پیـاوان لــەو وڵاتــەدا بــەر لــە هاوســەرگیری ئەزموونی سێکسییان هەبوو.

### هاورەگەزبازی (هۆمۆسێکسواڵ)

هاورەگـەزبازی لـە هـەموو کولتورێکـدا هەیـە. بــەڵام چــەمکی "کەســی هاورەگــەزباز (*homosexual person*) – واتـە کەسـێك کـە بـە ئاشـکرا سـەلیقەیەکی سێکسـی جیـاوازتری لـە سەلیقەی گشتی هەیە – چەمکێکی تا رادەیەك نوێیـە. پێناچـێ ئـەم چـەمکە پـێش سـەدەی هەژدەیـەم هـەبووبێ. هـەتیوبازی (نێربـازی) لـە لایـەن کڵێسـەو یاسـاوە بـە تـاوان زانرابـوو. لـە بریتانیا و چەندین وڵاتـی دیکەدا سـزای مردنی بــۆ دیــاری کرابــوو، بــەڵام هــەتیوبازی بــە شــێوەیەکی تایبــەتی وەك لادانێکــی هاورەگەزبازانە پێناسە نەکرابوو. ئەم کردەوەیە لـە رێگـای پێوەنـدی نێـوان پیـاوو ژن، پیـاو و ئاژەڵان و پیاوو پیاو جێبەجێ دەکرا.

زاراوەی "هاورەگــەزبازی" (*homosexuality*) لــە دەیــەی 1860دا داهێنــرا، و دوای ئــەوە هاورەگــەزبازەکان زیــاتر لــە پێشــوو وەك کەسانێکی جیاواز کە لادانی سێکسییان هەیە چــاولێکران (*Weeks,* 1986). بــەکاربردنی

زاراوەی "ژنـــی هاورەگـــەزباز" (*Lesbian*) لـــە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـدا دوای سـەربەخۆیی و لە ئەوروپاشدا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی نۆزدەهەمدا هەڵوەشایەوە.

بـەڵام نزیکـەی چـەند دەیـە لـەوەوپێش لـە بریتانیـا و زۆربـــەی وڵاتـــە یەکگرتوەکانـــدا هاورەگـەزبازی وەك هەمیشـە بـە کردەوەیـەکی تاوانکارانە دەژمێردرا.

### ئایدز

لـەم دواییانـەدا نێربـازی پێوەنـدی دراوە بـە کاریگـــەری کۆمەڵایـــەتی نەخۆشـــی ئایـــدزەوە (*Acquired Immune Deficiency Syndrome* (*AIDS*)). تـەنیا لـە کۆتاییـەکانی سـاڵی 1981دا بوو کە لە راگەیەنەرە گشتییەکاندا باسی ئەم نەخۆشـییە هاتــە گــۆڕێ، هەرچــەند لــە نێــو نێربازەکانـدا پێشـتر ناسـرابوو. بیروڕای گشـتی راسـت لـە کاتێکـدا لـەم دیاردەیـە تێگەیشـت کـە زۆرێـــــك لـــــە پێشـــــداوەرییەکان لـــــە دژی هاورەگـــەزبازی لـــەنێو چـــووبوون. بـــۆ ئـــەو کەســـانەی کـــە رقیـــان لـــە هاورەگـــەزبازی دەبوویـەوە، بـە تایبـەت بـۆ هەنـدێ لـە گرووپـە مەزهەبییـەکان وادیـار بـوو کـە ئـەم نەخۆشـییە هۆیـەکی راسـتەقینە بـوو بـۆ تۆمـەتبارکردنی ئەنجامـدەرانی. تەنانـەت هەنـدێ لـە ناوەنـدە پزیشکییەکانیش هاتبوونە سەر ئەو بڕوایە کە ئایدز بەڵایەکە کە خودا بۆ سزادانی لادەرەکان و سەرلێشـێواوەکان ناردوویـەتی. لـە سـەروتاری یـەکێك لـە گۆڤارە پزیشـکییەکاندا ئـەم پرسـیارە هـاتبووە گـۆڕێ: ئـاخۆ بـە راسـتی دەکـرێ بـە چاوی خۆمان ببینین کە وتەکەی سن پۆڵ کە دەڵێ "ئەمە سزای شیاوی گوناحەکانیانە" بە شێوەی نەخۆشییەکی تەشەنەنەستێن بێتە دی؟ (*Altman,* 1986*,p.*17).

پەرەســەندنی خێــرای ئایــدز بێگومــان تــا رادەیــــەك دەگەڕێتــــەوە بــــۆ مامەڵــــەکردنی وردەکولتورەکــــانی ئــــەمریکای بــــاکوورو شــــوێنەکانی تــــر لــــە گــــەڵ هاورەگەزبازیــــدا. وادیـاربوو کـە ئایـدز لـە راسـتیدا تـەنیا لـە نێـو شـارەگەورەکانی ئـەمریکادا کـە حەشـیمەتێکی بەرچـاوی هاورەگـەزبازیان تێـدابوو، هەیـە. مانشـــێتی چـــاپەمەنییەکان یەکـــەم زەنگـــی وشـیارکردنەوەیان لێـدا: بـەڵای هاورەگـەزبازی کارناسـە پزیشـکییەکانی تووشـی سەرلێشـێوان کـردووە. ئـەم مانشـێتەی رۆژنامـەی فلادلفیـا دەیلـی نیـوز (*Philadelphia Daily News*) لـە رێکـــەوتی 9ی ئـــووتی 1982دا لێـــدرابوو. رۆژنامەی ساتردای ئیڤینینگ پۆست (*Saturday Evening Post*) لە رێکەوتی ئۆکتۆبەری 1982دا رایگەیاند "هاورەگەزبازی دژی لەشساغییە."لە کاتێکـدا کـە تۆرنتـۆ سـتار (*Toronto Star*) رایگەیانـد "بـەڵای هاورەگـەزبازی گەیشـتە کەنەدا".گۆڤاری ئاس (*Us*) لە راپۆرتێکدا وتی "نێربازەکان چیتر ئەوەندە خۆشحاڵ نین." لەو سەردەمەدا دەرکەوتبوو کە یەك لە سەر سێی ئایدزییـەکان لـە ئـەمریکادا هاوڕەگـەزباز نـین، بەڵام ئەم مەسەلەیە لە سەرەتاوە لە میدیاکاندا بە کردەوە پشتگۆی خرا. کاتێ کە رۆك هودسن (*Rock Hudson*) ئەستێرەی سینەما لـە سـاڵی 1985دا بە هـۆی نەخۆشـی ئایدزەوە گیانی لـە دەسـت دا، ئـەوەی کـە زیـاتر چـاپەمەنییەکانی جیهـانی راچڵەکاندا ماهییـەتی نەخۆشـییەکەی

نەبوو، بەڵکو ئەو راستییە بوو کە ئەم سەمبولی ئازایەتییە هاورەگەزباز بوو.

لێکۆڵەرەوە پزیشکییەکان لە باتی ئەوەی لە ڤایرۆسێکی تایبەتدا بە دوای سەرچاوەی ئەم نەخۆشییەدا بگەڕێن، سەرەتا هەوڵیاندا لە لایەنە تایبەتییەکانی کردەوەی هاورەگەزبازیدا سەرچاوەکەی بدۆزنەوە. ئەم دۆزینەوەیە کە ئایدز دەتوانێ لە رێگای پێوەندی سێکسی لەگەڵ رەگەزی بەرانبەردا بگوێزرێتەوە، دواتر ناچاری کردن کە بە تێگەیشتنەکانی خۆیاندا بچنەوە. زۆربەی بەڵگەو شایەتییەکان لەمبارەیەوە لە ئەفریقای ناوەندیدا بەدەست هات، واتە ئەو شوێنەی کە ئایدز تێیدا پەرەی سەندبوو، بێئەوەی کە هیچ پێوەندییەکی تایبەتی بە نێربازییەوە هەبێ. "بەڵای هاورەگەزبازی" دەستبەجێ لەلایەن چاپەمەنییەکانەوە وەك "مۆتەکەی پێوەندی لەگەڵ رەگەزی بەرانبەردا " سەرلەنوێ پێناسە کرایەوە.

کێشەی ئایدز لەوانەیە کار بکاتە سەر زۆرێك لە شێوازەکانی کردەوەی سێکسی. لە نێو کۆڕی هاورەگەزبازاندا گۆڕانێکی بەرچاو دەبینرێ، و لە بنەڕەتدا رادەی کردەوە سێکسییە بە رێکەوتەکان کەم بووەتەوە.

### ئایدزو حشیمەتی ناهمۆسیکسیواڵ

لە روانگەی پزیشکییەوە، ئایدز ئامانجێکی ناجێگیر، نوێو فریودەرانەیە. زانیاری پزیشکی لەمەڕ ئەم نەخۆشییە زۆر بە خێرایی دەستپێدەکا. ئایدز دۆخێکە کە دەبێتە هۆی دارمانی سیستمی بەرگری جەستە، خودی نەخۆشییەکە نابێتە هۆی مردن، بەڵام کەسی تووشبوو گیرۆدەی کۆمەڵە نەخۆشییەك دەبێ، بۆ وێنە، شێرپەنجە کە کوشندەیە. زۆرێك لەو بەڵگەو شایەتیانەی کە تاکو ئێستا بە دەست هاتوون، وا نیشان دەدەن کە ئایدز پێوەندی بە یەك ڤایرۆس یان چەندین ڤایرۆسەوە هەیە کە پێوەندییان پێکەوە هەیە.

گومانی ئەوە لە ئارادا هەیە کە ئایدز یان لە رێگای خوێنەوە (وەك ئەوەی کە موعتادەکان کەڵك لە یەك دەرزی وەردەگرن)، یان لە رێگای مەنیی پیاو یان تەڕایی زێی ژنەوە دەگوازرێتەوە. نێربازەکان هێشتا هۆکاری گواستنەوەی 70٪ی ئایدزن لە ویلایەتە یەککگرتووەکان، و رێژەیەکی بە نیسبەت زیاتر لە وڵاتە ئەورووپییەکاندا.

بە پێی هەندێ بەڵگە، ترسان لە تووشبوون بە ئایدز وای کردووە کە ناهاورەگەزبازەکان بە پارێزەوە کاری سێکسی ئەنجام بدەن. یەکێك لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییانە دەربارەی سۆزانییەکانی لەندەن دەریخست کە 70٪ی ئەوانە لە دوای ئاگاداربوون لە بوونی ئایدز رەفتاری خۆیان گۆڕیبوو، و دوای ئەوە دوایان لە هەموو حەریفەکانی خۆیان دەکرد کە بۆ تێکئاڵانی سێکسی کەندۆم بە کاربهێنن. بەڵام، 10٪ی ئەم گرووپە سەرباری نیگەرانبوونیان وتیان کە بەردەوامی بەکاری خۆیان دەدەن، ئەگەر بشزانن کە تووشی ڤایرۆسی ئایدز دەبن (Barton, 1985).

ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکاندا روانگەی جۆراوجۆر لە گۆڕیدایە سەبارەت بەوەی کە ئاخۆ دەبێ جیاکردنەوەیەکی زۆرەملیانە سەبارەت بە ئایدز هەبێ یان نا،و ئاخۆ دەبێ یاسا جۆرێك لە هەڵاواردن لە ئاست تووشبوانی ئایدزدا پەسەند بکا یان نا. رێکخراوەکانی داکۆکیکاری مافە مەدەنییەکان بەڵگە دێننەوە کە ئاساییکردنی هەرچەشنە جیاکردنەوەیەکی زۆرەملێیانە نیشانەی ئەوەیە کە ئازادییە تاکەکەسییەکان کەم دەبنەوە، لە بەرانبەردا دژبەرەکانیان دەڵێن ئەگەر ئەم کارە بتوانێ پێش بە پەرەسەندنی نەخۆشیەکی ترسناك بگرێ، ئەوە دێنێ کە نرخێکی وەهای بۆ بدەی. هەندێ لە وڵاتان سزای یاساییان بۆ ئەو کەسانە داناوە کە بە ئەنقەست کەسانی تر ئالوودە بکەن – بۆ نموونە، لە نەرویجدا بۆ ئەم کارە هەشت ساڵ زیندانی دیاری کراوە. لە ئەمریکادا نەخۆشێکی ئایدزی کە تفی کردبووە دەمووچاوی دوو پۆلیس، دادگایی کراو بە تۆمەتی ئەوەی کە ویستوویەتی ئەو دوو کەسە بکوژێ، بە تاوانبار ناسرا. بەپێی گەڵاڵە یاساییەکانی ساڵی 1982ی تەگزاس لە پێوەندی لەگەڵ نەخۆشییە تەشەنەئەستێنەکان و رێگاکانی پێش پێگرتنیان، شارستانی ئانتۆنیو لە ویلایەتی تەگزاس سزای تا 10ساڵ زیندانی بۆ ئەو نەخوشانە دیاریکردوە کە لەگەڵ کەسانی لەشساغدا کردەوەی سێکی ئەنجام دەدەن. لە بریتانیادا ئەمجۆرە یاسایانە تاکو ئێستا بە شێوەی جددی نەهێنراونەتە بەرباس.

### لەشفرۆشی

دەکرێ لەشفرۆشی بەم شێوە پێناسە بکەین: دابینکردنی خواستە سێکسییەکان لە بەرانبەر پارەدا. لە نێوان گراوێکی پارەخواز (*paid mistress*) – کە هۆی سەرەکی پێشکەشکردنی لەش‌ولاری بە خوازیارەکەی ئەو پارەیە کە پێی دەدرێ – و لەشفرۆشیدا هیچ جیاوازییەکی ئاشکرا لە ئارادا نییە. هەرچەند کە جیاوازی سەرەکیی لەوەدایە کە لەشفرۆش خۆی دەخاتە بەردەست کڕیارە جۆراوجۆرەکانی. وشەی "لەشفرۆش" لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا رەواجی پەیدا کرد. لە دونیای کۆندا، زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە بەرانبەر پاداشتی ئابووریدا خواستە سێکسیەکانیان دابین دەکرد لەشفرۆشی دیوەخانان، ژنە دڵدارەکانی نێو خێزان یان گزیرەکان بوون. لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا لەشفرۆشی دیوەخانان و گزیرەکان بە زۆری خاوەن رێزو قەدرێکی زۆر بوون.

یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی لەشفرۆشی لەم سەردەمەدا ئەوەیە کە ژنە لەشفرۆشەکان و کڕیارەکانیان بە گشتی یەکتر ناناسن. هەرچەند رەنگە پیاوەکان ببنە کڕیاری هەمیشەیی، بەڵام پێوەندییەکە لە سەرەتادا لە سەر بنەمای ناسیاری دانامەزرێ. لە سەردەمانی پێشوودا دۆخێکی لەم چەشنە لە پێوەندی لەگەڵ زۆربەی شێوەکانی دابینکردنی خواستە سێکسییەکان لە بەرانبەر سوودی ماددیدا لە گۆڕێدا نەبوو. لەشفرۆشی لە ئاکامی

دارمــانی کۆمەڵگــە خۆماڵییــە بچــووکەکان، پەرەســەندنی گەرەکــە گــەورەکانی شــارو بــە بــازاڕیبوونی پێوەندییــە کۆمەڵایەتییەکانــدا پەرەیســـەند. لـــە کۆمەڵگـــە خۆماڵییـــە بچـــووکەکاندا زەقبـــوونی پێوەندییـــە سێکسییەکان دەبووە هۆی ڕاگیرکردنیان. لە نێو گەرەکــە پــەرەگرتووەکانی شــاردا، پێوەندییــە کۆمەڵایەتییــە نەناســراوەکان بــە ئاســانی دادەمەزران.

### لەشفرۆشی لەم سەردەمەدا

ئــەمرو لــە بریتانیــادا هــەروەك پێشــوو لەشفرۆشــەکان لــە چــینی هــەژاری کۆمەڵــەوە دەردەکەون، بەڵام لە نێو چینی مامناوەندیشدا ژمارەیــەکی بەرچــاو ســەریان هەڵــداوە. ڕادەی چونەسەری تەڵاق بووەتە هۆی ئەوە کە بەشێك لەو ژنانەی کە تەڵاق دراون، لە بەر کەمدەستی ناچار بوون پەنا بۆ لەشفرۆشی ببەن. بەتایبەت بەشێك لەو ژنانە کە دوای تەواوکردنی خوێندن کاریــان دەســت ناکــەوێ، لــە هۆڵــەکانی ماســاژ (شــێلاندن) یــان لــە نێــو تــۆڕی کچــە تەلەفۆنییەکانــدا (*call-girl networks*) وێــڕای گەڕان بە دوای کارێکی دیکەدا، ئیش دەکەن (*Rosen,* 1982,*p.* 173−4).

پــۆل ج. گولدســتین بــەپێی پابەنــدبوونی پیشــەیی یــان بەســتێنی پیشــەیی، جۆرەکــانی لەشفرۆشی پۆلێن کردووە. پابەندبوونی ژن بە بەرفراوانی کارکردن پێی دەوترێ لەشفرۆشی. زۆرێك لە ژنان تەنیا بە شێوەی کاتی ئەو کارە دەکەنو بەر لەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ یان بۆ هەمیشــە واز لــە لەشفرۆشــی بهێــنن، ئــەو کــارە ئــەنجام دەدەن. لەشفرۆشــە هەڵکەوتــەکان، بــەو ژنانــە دەوتــرێ کــە بــە زۆری لــە بەرانبــەر پــارەدا تەســلیم دەبــن، دیــارە ناوەنــاوە و بــە مەبەســتی یارمەتیــدان بــە داهاتیــان. بەشــەکەی تــر بــە بــەردەوامی لەشفرۆشــی دەکــەن، و ئــەم کــارە سەرچــاوەی ســەرەکی داهاتیــان پێــك دەهێنــێ. مەبەســت لــە بەســتێنی پیشــەیی، ئــەو شــوێنو کارلێکە بەردەوامانەیە کە ژنێك تێدا بەشدارە. ژنێکــی بــازاڕی (*street-walker*) لــە نێــو بــازاڕدا لەگــەڵ کڕیارەکانــدا دەکەوێتــە مامەڵــەکردن. کچــێکی تەلــەفۆنی، لــە ڕێگــای تەلەفۆنــەوە لەگــەڵ کڕیارەکانیــدا گفتوگــۆ دەکــا، یــان پیاوان دەچنە ماڵی یان ئەو دەچێتە دیداریان. لەشفرۆشــی هۆڵــەکان (*house prostitute*)، بــەو ژنانــە دەوتــرێ کــە لــە یانەیــەکی تایبــەتی یــان لــە قــەڵا (قەحبەخانــە)دا کــار دەکــا. لەشفرۆشـــێکی هـــۆڵی ماســـاژدان (*parlour prostitute*0*massage*) لــە ســەنتەرێکدا کە بە ڕواڵەت بەشێوەی یاسایی خزمەتگوزاری تەندروســـتیو ماســـاژ فەراهـــەم دەکـــا، خزمەتگوزاری سێکسی پێشکەش دەکا.

زۆرێــك لــە ژنــانیش بــە شــێوەی ئــاڵوگۆڕ (وەرگرتنــی کــاڵا یــان خزمــەتگوزاری لــە جیــاتی پــارە) مامەڵــەی سێکســی دەکــەن. زۆربــەی ئــەو کچــە تەلەفۆنیانــەی کــە گولدسـین لێکۆڵینــەوەی لەسەر کردوون بە شێوەی ڕێکوپێك بە شێوەی ئاڵوگۆڕ مامەڵەی سێکسی (*Sexual bartering*) ئەنجام دەدەن − پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری سێکســی لــە بەرانبــەر وەرگرتنــی تەلــەفزیون، چــاککردنی ئۆتۆمبیــلو ئــامێری کارەبــایی، وەرگرتنـــــی پۆشـــــاك، خزمـــــەتگوزاری

مافپەروەرانـــەو ددانپزیشـــكی ( *Goldstein,* 1979).

یـــەكێك لـــە بڕیارنامـــەكانی ڕێكخـــراوی نەتەوەیـــەكگرتووەكان كـــە لـــە ســـاڵی 1951دا پەسند كرا، ئەو كەسانە بە تاوانبار دەناسێ كە یان خەریكی ڕێكخستنی كاری لەشفرۆشین یان بازرگانی بەو كارەوە دەكەن، بەڵام لەشفرۆشی بە یاساغ نازانێ. بەگشتی پەنجاو سێ ئەندامی ڕێكخـراوی نەتـەوەكان، بـۆ وێنـە بریتانیـا بـە شێوەی فەرمی ئەم بڕیارنامەیان قبووڵ كردوە، هەرچـەند یاسـاكانیان لـە پێوەنـدی لەگـەڵ لەشفرۆشیدا جیاوازییان پێكەوە هەیە. هەندێ لە وڵاتاندا لە بنەڕەتدا لەشفرۆشی بە نایاسایی دادەنێن. هەندێ وڵاتی دیكەی وەك، بریتانیا چەند جۆرێك لە لەشفرۆشی وەك مامەڵەكردنی نێوبـازاڕ یـان لەشفرۆشـی منـداڵانیان ( *Child Prostitute*) بە یاساغ زانیوە. هەندێ حكومەتی نیشتمانیو ناوچەیی مۆڵـەتی كاركردن دەدەن بـە ناوەنـدە فەرمییـەكانی لەشفرۆشـی یـان هۆڵـــەكانی ســـێكس (*Sex- Parlours*) وەك ســـەنتەرەكانی ئـــەرۆس (*Eros Centers*) لـــە ئاڵمانیـای ڕۆژئـاوا یـان خانووەكـانی سـێكس (*Sexhouses*) لە ئامستردام. تەنیا چەند وڵاتێك مۆڵـەتی كاركردن دەدەن بە پیاوانی لەشفرۆش (*Male Prostituyes*).

یاسـاكانی دژی لەشفرۆشـی تـا ڕاددەیـەكی زۆر لە هـەموو شـوێنێكدا یـەكێك لـە لایەنـەكانی مامەڵەكردنی نێوان لەشفرۆشەكانو كڕیارەكان دەگرێتـــەوە. ئـــەو كەســـانەی خزمەتـــە سێكســـییەكان دەكـــەن، ڕاوەدوو نـــانرێنو دەستگیر نـاكرێنو لـە ڕەوتـی لێكۆڵینـەوەكانی دادگـــادا دەتـــوانن شوناســـیان بشـــارنەوە. لێكۆڵینەوەیـەكی كـەمتر دەربـارەی كڕیارەكـان ئەنجام دراوە تا ئەو كەسانەی كە لەشفرۆشی دەكـەنو كـەمتر بینـراوە كـە كەسـێك وتبێتـی ئەوان لـە ڕووی سایكۆلۆژییەوە كێشـەیان هەیـە – هەروەك بە زۆری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ قسەی لەو جۆرە دەربارەی لەشفرۆشی دەكرێ. بێگومـان ئەم ناهاوسەنگییە لـە توێژینەوەكانـدا قبـووڵكردنی بـێ ئـەملاو ئـەولای بیروبـاوەڕە ڕۆتینییـەكان دەربـارەی مەیلـە سێكسـییەكان نیشـان دەدا كـە بـەپێی ئـەو بـیرو باوەڕانـە بـۆ پیـاوان شـتێكی ئاسـاییە كـە ئازادانـە بـە دوای ڕێگاكانی خۆدامركانەوەدا بگەڕێن، لـە حاڵێكدا ئەو كەسانەی وەڵامی ئەم خواستانە دەدەنەوە، تاوانبار دەكرێن.

### لەشفرۆشی منداڵان

لەشفرۆشی بە زۆری لـە نێـو منداڵانـدا هەیـە. دیڤیـدكامپانیا ڕادەی لەشفرۆشـی منـداڵانی لـە ویلایەتە یەكگرتووەكاندا شیكردۆتەوە. ناوبراو لێكۆڵینـــەوەكانی خـــۆی لەســـەر بنـــەمای گەڵاڵەیـەكی بـەربڵاوی لێكۆڵینـەوەكردن ئـەنجام داوە كـــە لـــە 596 بنكـــەی پـــۆلیسو 125 دامـــەزراوە خزمـــەتگوزاری كۆمەڵایـــەتی لـــە سەرتاسـەری وڵاتـدا زانیارییـەكانی كۆكردۆتـەوە (*Compagna,* 1985). بە پێی ئەو ئامارانـەی كـە نـاوبراو دەیخاتـەڕوو ڕادەی داهـاتی سـاڵانەی لەشفرۆشـی منـداڵان لـە سـەرووی دوو ملیـار دۆلار دەگرێتـەوە. بـەڵام سـەرباری ئـەم داهاتـە زۆرو زەوەنـدە، پێناچـێ تـۆڕە تاوانكارەكـان بتـوانن بـە شـێوەی گشـتی لەشفرۆشـی منـداڵان

کونترۆڵ بکەن. لێکۆڵینەوە لەسەر لەشفرۆشی منداڵان لە ئەمریکا، بریتانیاو ئەڵمانی رۆژئاوا دەریخستووە کە زۆربەیان لە کاری بچووکدا بەشداریان کردووە کە تێیدا بۆ نموونە، ئەو منداڵانەی کە لە ماڵەوە هەڵدێن و بژێویان نییە روودەکەنە لەشفرۆشی. پێناچێ زۆربەی هەتیوبازەکان بە شێوەی تایبەتی دوای منداڵان بکەون، بەڵکو زیاتر دوای ئەو گەنجانە دەکەون کە لە خزمەتگوزاری سێکسی دەگەڕێن.

ئەم راستیە کە زۆرێك لە منداڵە هەڵاتووەکان روودەکەنە لەشفرۆشی، لە راستیدا یەکێك لە ئاکامە نەخوازراوەکانی ئەو یاسایانەیە کە لە بەرانبەر کاری خوار تەمەنی کارکردندا (*under-age employment*) پشتیوانی لە منداڵان دەکەن، بەلام بە هیچ شێوەیەك هەموو منداڵە لەشفرۆشەکان لە ماڵەوە هەڵنەهاتوون. دەتوانین منداڵە لەشفرۆشەکان بە سەر سێ گرووپدا دابەش بکەین (*Heid Bracey,* 8*Janus* 1980).

1-هەڵاتووەکان (*runaways*) کە یان لە ماڵ هەڵاتوون و بنەماڵەیان بە دوایاندا ناگەڕێن یان هەر جارێك کە ئەیاندۆزنەوە و ئەیانبەنەوە، سەر لەنوێ هەڵدێنەوە.

2-گەڕاڵەکان (*Walkways*) کە لە بنەڕەتدا لە ماڵەوە دەژین، بەلام جارناجار بۆ ماوەیەك و بۆ نموونە، چەند شەوێك لە دەرەوە دەمێننەوە.

3-تەریککراوەکان، کە دایك و باوکیان لە ئاستیاندا کەمتەرخەمن یان بە تەواوەتی وازیان لێ هێناون.

کچان و کوڕان لە نێو هەموو ئەم گرووپانەدا هەن.

لەشفرۆشی منداڵان بەشێکە لە پیشەی "گەشتیاری سێکسی" (*sex-tourism industry*) لە هەندێ ناوچەی جیهاندا – وەك نموونە، تایلەند و فیلیپین. تۆڕە داخراوەکان (*package tours*)، کە ئامانجیان بایەخدانە بە لەشفرۆشی، لە ئەمریکا و ئەوروپا و ژاپۆنەوە پیاوەکان بۆ ئەم ناوچەیە رادەکێشی. ئەندامانی بزووتنەوەی ژنانی ئاسیایی نارەزایەتییەکی گشتییان دژی ئەم تۆڕانە وەرێخستووە، بەلام ئەمجۆرە تۆڕانە هەر لە جێی خۆیانن. سەرچاوەی گەشتیاریی سێکسی لە ئاسیای رۆژهەڵاتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئامادەکردنی لەشفرۆشەکان بۆ ئەو سەربازە ئەمریکاییانەی کە لە ماوەی شەڕی ڤیەتنام، کوریا و تایواندا لەو ناوچەیەدا بوون. بۆ ئەم مەبەستە لە تایلەند، فیلیپین، ڤیەتنام، کوریا و تایواندا گەلێك ناوەندی "پشووودان و رابواردن"(*"rest and recreation" centers*) دامەزران. بەشێك لەم ناوەندانە هێشتا هەر ماون، بە تایبەت لە فیلیپین و، لە پێناو خۆشگوزەرانی گرووپە گەشتیارییە سیستماتی و هێزە سەربازییەکانی ناوچەکەدا خزمەتگوزاری پێشکەش دەکەن.

هۆی لەشفرۆشی چییە؟ گومان لەوەدا نییە کە لەشفرۆشی دیاردەیەکی سەقامگیرە و لە بەرانبەر هەوڵی حکومەتەکان بۆ سڕینەوەیان، خۆڕاگری دەکەن. هەروەها ئەم دیاردەیە بەردەوام مەسەلەی ئەو ژنانەیە کە لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەدا خواستی پیاوان دابین دەکەن – هەرچەند چەند نموونەیەکی وەك هامبۆرگی ئاڵمانی رۆژئاوا هەیە کە هەندێ ناوەندی رابواردنی

تێدایە کە خزمەتگوزاری سێکسی پیاوانە بۆ ژنان فەراهەم دەکەن. دیارە کوڕان یان پیاوانیش هەواو هەوەسی پیاوانی دیکە دائەمرکێننەوە.

بیرکردنەوە لەمەڕ ئاخێزی لەشفرۆشی ناهاوڕەگەزبازانە لە راستیدا یارمەتی بە روونکردنەوەی ئەو بابەتە سەرەکییانە دەکا کە لەم نەسکەدا تاوتوێ کراون. ئەم کارە بریتییە لە رەفتارێك کە لە سەر بنەمای دابەشکردنی سێکسی ئەنجام دەدرێ (دانی پارە یان هەر شتێکی دیکە لە بەرانبەر دامرکاندنی خواستی سێکسیدا)و بە زۆری بە هۆی نایەکسانییەکی زەقەوە دیاری دەکرێ (بۆ نموونە، لەشفرۆشەکان بە سووك چاو لێدەکرێن و رەنگە رووبەرووی سزای یاسایی ببنەوە، لە حاڵێکدا کڕیارەکانیان بە زۆری رووبەرووی هیچ کاردانەوەیەکی کۆمەڵایەتی نابنەوە) هیچ هۆکارێك بە تەنیایی هۆی لەشفرۆشی روون ناکاتەوە. رەنگە وابێتە بەرچاو کە پیاوان بە بەراورد لە گەڵ ژناندا پێویستییەکی سێکسی بەهێزتر یان زیاتریان هەیە، و بۆیە پێویستیان بە رێگای دامرکاندنەوە هەیە کە لەشفرۆشی لێدەکەوێتەوە. بەلام ئەم دەربڕینە پاساو هەڵناگرێ. وادیارە زۆربەی ژنان دەتوانن مەیلە سێکسییەکانی خۆیان بە شێوەیەکی توندتر پەرە پێبدەن تا ئەو پیاوانەی کە هاوتەمەنی خۆیانن ( *Hyde,* 1986). ئەگەر لەشفرۆشی تەنیا بۆ دامرکاندنەوەی هەستە سێکسییەکان بوایە، بێگومان ژنانیش دەیانتوانی بە هۆی پیاوانی لەشفرۆشەوە خواستە سێکسییەکانی خۆیان دابین بکەن.

جێی بڕواترین ئاکامی گشتی لەمبارەیەوە ئەوەیە کە لەشفرۆشی نیشاندەری شێوەی روانینی پیاوانە کە ژنان وەك ئامرازێك بۆ مەبەستە سێکسییەکانی خۆیان چاو لێدەکەن و ئەم شێوە روانینە (بە هۆی لەشفرۆشییەوە) بەردەوام دەبێ. لەشفرۆشی لایەنێکە لە پێوەندی باوکسالارانە، کە لە بوارێکی تایبەتدا نایەکسانییەکانی دەسەڵاتی ژنان و پیاوان نیشان دەدا. ئاشکرایە کە زۆر تۆخمی دیکە لەم کارەدا بەشدارن. لەشفرۆشی رێگایەکی بۆ دامرکاندنەوەی ئەو کەسانەی کە بە هۆی کەمئەندامی یان بوونی یاسای ئەخلاقی توندوتۆڵ ناتوانن کەسێکی تایبەت بۆ خۆیان پەیدا بکەن. لەشفرۆشی دەتوانێ پێویستی سێکسی ئەو پیاوانە دابین بکا کە یان لە ماڵەوە دوورن، یان حەزیان لە رابواردنە، یان حەزیان لە هەندێ ژنی تایبەتە. بەلام ئەم هۆکارانە زیاتر پێوەندیان بە رادەی لەشفرۆشییەوە هەیە تا ماهییەتەکەی.

### دەرەنجام: کۆمەڵناسی و پێوەندی سێکسی

لەم ساڵانەی دواییدا کەمتر بوارێکی کۆمەڵناسی وەك خوێندنەوەی پێوەندییە سێکسییەکان تا ئەم رادەیە پەرەی سەندووە، یان بە شێوەی گشتی تا ئەم رادەیە بۆ ئەم لقە گرینگی پەیدا کردووە. ئەم شتە تا رادەیەکی زۆر رەنگدانەوەی گۆڕانی خودی ژیانی کۆمەڵایەتییە. جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان شوناس، تێڕوانینەکان و شێوەی رەفتاری رەگەزی ژن و پیاو ئەمڕۆ بە شێوەیەکی دیکە چاویان لێدەکرێ. ئەم گۆڕانکارییانە کار دەکاتە

سـەر زۆرێـك لـە دامـەزراوە كۆمەڵایەتییـەكانی دیكـە، و هـەروەها كـردەوەی سێكسـی و ژیـانی بنەماڵـەیی. ئێمـە لـە نەسـكەكانی دیكـەدا ئـەم كاریگەریانە تاوتوێ دەكەین.

**پوختەی باسەكە**

1.زاراوەی "رەگـەز" نارِوونـە. ئـەم زاراوەیـە لـە بـەكاربردنی ئاسـاییدا ئامـاژە بـە جیاوازییـە فیزیكـی و كولتورییـەكانی نێـوان ژنـان و پیـاوان (وەك، رەگـەزی پیـاو، رەگـەزی ژن) و كـردەوەی سێكسی دەكا. هەروەها پێویستە بزانین كە لە نێـــوان رەگـــەز، بـــە مانـــا فیزیۆلـــۆژی و بیولۆژییەكـەی و رەگەزایـەتی (جنسـیت) كـە تـوخمێكی كولتورییـە (كۆمـەڵێك سەرمەشـقی رەفتاری پەیڕەوكراو) جیاوازی دابنێین.

2.هەنـــدێ كـــەس بەڵگـــە دەهێننـــەوە كـــە جیاوازییـەكانی رەفتـاری ژن و پیـاو بەشـێوەی ژنێتیكییـــەوە دیـــاری دەكـــرێن، بـــەڵام هـــیچ بەڵگەیـــەك بـــۆ پشتراســـتكردنی ئـــەم بابەتـــە لەبەردەستدا نییە.

3.بەكۆمەڵایـــەتیبوونی رەگـــەزی دوابـــەدوای لەدایكبوونی منداڵ دەست پێدەكا. تەنانەت ئەو دایك و باوكانەش كە باوەڕیان وایە بە یەك چاو دەڕواننـە منداڵـەكانیان بەگشـتی بـە شـێوەی جیـــاواز لـــە ئاســـت كـــوڕو كچـــەكانیاندا دەجووڵێنەوە. ئەم جیاوازیانە بە هۆی زۆرێك لە كاریگەرییە كولتورییەكانەوە بەهێز دەبێت.

4.شوناسـی رەگـەزی و شـێوەكانی دەربڕینـی مـەیلی سێكسـی تەواوكـەری یـەكترن. دەڵـێن تایبەتمەندیی پیاوانە لە ئەنجامی حاشاكردن لـە هۆگریـەكی تـەواو بـۆ دایـك سـەرهەڵ دەدەن، بـــەمجۆرە ئـــەم دۆخـــە دەبێتـــە هـــۆی دەستەوەستانبوونی پیاوان لە ئاست دەربڕینی هەستەكانیاندا.

5.باوكســـالاری بریتییـــە لـــە باڵادەســـتبوونی پیـاوان بـە سـەر ژنانـدا. هـەموو كۆمەڵگـەكان باوكســـالارن، هەرچـــەند رادەو خەســـڵەتی نایەكسـانییەكانی نێـوان ژنـان و پیـاوان تـا رادەیـەكی بەرچاو لـە كولتـورە جۆراوجۆرەكـان و نێوان كولتورەكاندا جیاوازی هەیە.

6.لە هەموو وڵاتە پیشەسازییەكاندا رێژەی ژنان لە ناوەندەكانی هێزو دەسەڵاتدا زۆر لە پیاوان كەمترە. نێونجی حەقدەستی ژنان كەمترە لە هـی پیـاوان، لـە نێـو مووچـەخۆرەكاندا ژمـارەی ئـەو ژنانەی كە بە شێوەی نیودان كار دەكەن، زۆر لە پیـــاوان زیـــاترە. ژنـــان بەشـــێكی گـــەورەی بەرپرســـایەتی كاروبـــاری مـــاڵ و راگرتنـــی منداڵەكانیان لە ئەستۆیە. كاری بێ حەقدەستی نێومالْ بۆ ئابووری یەكجار گرنگە.

7.بیرۆكـەكانی لایـەنگریكردن لـە مافـەكانی ژنـان لە سـەدەی هەژدەهەمـەوە سـەرهەڵدەدەن. یـەكەم بزووتنـەوە گرنگـەكانی ژنـان لـە نیـوەی سـەدەی نۆزدەهەمـەوە سـەریانهەڵدا، ئـەم بزووتنەوانـە بـە تایبـەت هەوڵـەكانی خۆیـان بـۆ بەدەسـتهێنانی مافی دەنگدان بۆ ژنان چڕ كردبۆوە. هەرچەند بزووتنـــەوەی لایـــەنگریكردن لـــە ژنـــان دوای دەیـــەی 1920 هەرەســـی هێنـــا، لـــە دەیـــەی 1960دا بـەخێرایی گەیشـتەوە لووتكـە، و لـە زۆرێـك لـە بوارەكـانی ژیـانی كۆمەڵایـەتی و چالاكی ڕووناكبیرانەدا كاریگەری خۆی دانا.

8.ئازاردانی سێکسی بەشێکی گەورەی ژنانی کارمەند بە شێوەی راستەخۆ دەخاتە ژێر کاریگەریەوە. توندوتیژی خێزانیو دەستدرێژی سێکسیش زۆر لە ئامارە فەرمییەکان زیاترە. لە لایەکەوە هەموو ژنان قوربانیی دەستدرێژی سێکسین، چونکە ناچارن بە شێوەی تایبەت ئاگایان لە خۆیان بێتو ژیانێکی تێکەڵ بە ترسیان هەبێ.

9.لە نێو کولتورە جۆراوجۆرەکانو لە نێو خودی کولتورەکاندا شێوازەکانی کردەوەی سێکسی زۆر جیاوازن. لە رۆژئاوادا، تێڕوانینە سەرکوتکەرانەکان لە ئاست مەیلە سێکسییەکاندا جێگای خۆیان داوە بە جیهانبینییەکی ئازادو کراوەتر لە دەیەی 1960دا، ئەمڕۆش ئاسەوارەکانی بەرچاو دەکەون.

10.هاورەگەزبازی بە رواڵەت لە هەموو کولتورەکاندا هەیە، بەوحاڵەش چەمکی هاوڕەگەزباز، چەمکێکی تا رادەیەك نوێیە. تەنیا لە سەدساڵی رابردوودا کردەوەی هاورەگەزبازی وەك جۆرە رەفتارێك کە خەڵکێکی تایبەت ئەنجامی دەدەن، لەبەرچاو گیراوە – مەقوولەیەك لە لادانو پێشێلکاری دژ بە مەقوولەی "ناهاوڕەگەزبازی رێسامەند" دروست بووە.

11.کردەوەی سێکسی هەنووکە لە ژێر کارتێکەرییەکی توندی پەرەسەندنی ئایدزدایە. ئایدز لە سەرەتادا لە روانگەی جەماوەرەوە تەنیا پێوەندی بە هاوڕەگەزبازییەوە هەبوو، بەڵام لە رێگای تێکئالاّن لەگەڵ رەگەزی بەرانبەریشدا پەرەدەستێنێ. مەترسی ئەوە هەیە کە ئایدز بە شێوەی نەخۆشییەکی گشتگیر دەربکەوێ، و تەنیا رێگای پێشگیریکردن ئەوەیە کە تاکەکان بە شێوەیەکی تەندروستانە سێکس بکەنو خۆیان لە سێکسی بەرێکەوت دوور بگرن.

12.لەشفرۆشی بریتییە لە دابینکردنی خواستە سێکسییەکان لە بەرانبەر پارەدا. لە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمەدا گەلێك شێوەی جۆراوجۆری لەشفروشی هەیە، بۆ وێنە لەشفرۆشی پیاوانو منداڵان. لەشفرۆشی یاسایی بە هۆی حکومەتە نیشتمانیو ناوچەییەکان لە هەندێ لە وڵاتاندا قبووڵ کراوە، بەڵام لە زۆربەی وڵاتاندا لەشفرۆشەکان بە شێوەی نایاسایی کار دەکەن.

**سەرچاوە**

نەسکێك لە کتێبی: کۆمەڵناسی – نوسینی ئانتوانی گیدنز

# دیالۆگی ئایینی و شارستانی

سید حسێن نەسر
لە ئینگلیزییەوە: هادی محمد

**پێشەکی**

خوشکان و برایانی بەڕێز، بەخێر بێن بۆ کۆنفرانسی ئایین و دیالۆگی نێوان شارستانییەتەکان. میوانی ووتاردەرمان پرۆفیسۆر سید حسێن نەسرە. سەرەتای خوێندنی لە ئێران دەست پێکردووەو لە پەیمانگای ماساچوسێتی تەکنەلۆژی و زانکۆی هارڤەرد خوێندنەکانی تەواوکردووە. یەکێکیشە لە باشترین قوتابییەکانی ئایەتوڵڵا تەباتەبایی و نووسەری زیاتر لە 30 کتێب و 300 مەقالەیە. لە ژمارەیەك زانکۆی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست و بە تایبەتی زانکۆی تاران و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وانەی وتۆتەوە. بەشێوەیەکی بەرفراوانیش ووتاری لەسەر فەلسەفەی ئیسلامی داوە. ئێستا پرۆفیسۆر نەسر پرۆفیسۆری زانستە ئیسلامییەکانە لە زانکۆی جۆرج واشنتن. هیوادارم پەیامی ئەم کۆنفرانسە دادپەروەری و ئازادی و یەکسانی و یاسا و مەعنەویەت بێت بۆ هەموو هاولاّتیانی کۆمەڵگای مرۆیی جیهان. لە کۆتاییدا داوا لە پرۆفیسۆر نەسر دەکەم ووتارەکەی پێشکەش بکات.

پرۆفیسۆر نەسر: بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان. لە رۆژگاری کۆندا، پێش ئەوەی شارستانییەتەکان *Civilizations* لە ڕووی تەکنیکییەوە پێکەوە ببەسترێن، خەڵکی بەریەککەوتنێکی (پەیوەندییەکی) زیاتریان لەگەڵ یەکدیدا هەبووە وەك لە رۆژگاری ئەمڕۆمان سەرەڕای بوونی ئەم هەموو پەیوەندی و پێکبەستە تەکنیکییانە. من نازانم ئاخۆ ئەم پێکبەستە تەکنیکییانە یارمەتی خوڵقاندنی دیالۆگ دەدەن لە نێوان شارستانییەتەکاندا یاخود نا. مایەی خۆشحاڵییە بۆ من توانیومە لێرەدا ئامادەبم و ووتارێك لەسەر بابەتێك پێشکەش بکەم کە پێموایە بۆ هەرکەسێك چ لە

جیهانی ئیسلامی و چ لە ڕۆژئاوا بابەتێکی ڕێزدار و خۆشەویستە، ئەم ساڵ بە ساڵی دیالۆگی شارستانی ناوزەند کراوە. ئەمڕۆ داوام لێکراوە لە بارەی دیالۆگی ئایین و شارستانییەتەوە بدوێم و لە جیاتی ئەوەی چاوێك بە رووکاری بابەتەکەدا بخشێنم، دەمەوێت بە قوڵی بچمە ناو ئەو بوارانەوە کە لە ڕاستیدا بەشێکە لەو بابەتەی قسەی لێدەکەین.

سەرەتا ئێوە مەبەستتان چییە لە شارستانیەت؟ بێگومان زۆر لە بارەی شارستانییەتەوە نوسراوە. یەکێك لە جوانترین ئەو مەقالانەی تا ئێستا نوسراوە لەسەر بابەتەکە لەلایەن خوالێخۆشبوو "ئەنانندا کومانسرامی" لە مەقالەیەکدا بەناوی "شارستانییەت چییە؟" نووسراوە، ئێستا ناونیشانی کتێبیەکیەتی دەساڵ لەمەوپێش لە ئنگلتەرا بلاوکرایەوە. هەروەکو ئەناندا زۆرێك لە قوتابییە جدییە مێتافیزیکییەکان، ئێوەش دەشێت قسە لە بارەی ترادسیۆنی *Tradition* جۆراو جۆرەوە بکەن کە تا ئێستا ئاماژەیان پێدرابێت، شارستانیەت تەنها پەیوەندی بە مێژووناسی و ڕیشەناسی (*etymology*) وشەی (*civetas*) لەلاتینیدا نییە کە مانای (شار) دەگەیەنێت.

لە ڕاستیدا شارستانیەت جێبەجێ کردنی جیهانبینییەك، دیدگایەکی تایبەتی حەقیقەت دەگرێتەوە بۆ کۆییەکی مرۆیی. ئەمڕۆ، ئەم پێناسەیە تەواو ئاڵۆز بووە لە زەینی زۆر لە خەڵکیدا ئەویش بەهۆی پوکانەوەی ئایین لە جیهانی نوێداو تەشەنەکردنی بۆ باقی دیکەی جیهان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە بەدواوە..

لەبەرئەوەی دەمەوێت بگەڕێمە دواوەو سەرەتا چاوێك بخشێنمەوە بە سەر کۆنترین شارستانییەتەکان لە جیهاندا و بە کورتی بزانین چۆن سەریانهەڵداوە و بۆچی بە شارستانییەت دادەنرێن. وە بۆچی ئێمە ووشەی فرەییانەی (*plural*) شارستانییەتەکان بەکاردەهێنین وەك لە ووشەی تاکییانەی (*singular*) شارستانییەتەکان.

یەکێك لە کارەساتترین و بەدترین میراتەکانی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمی فکری ئەوروپی بۆ تەواوی جیهان بریتی بوو لە کەمکردنەوەی شارستانییەتەکان بۆ شارستانییەت، بەو مانایەی بەکارهێنانی تاکیانەی وشەی شارستانیەت. لە ڕاستیدا ئەمە نەخۆشییەکی ڕۆشنبیرییە، گەیشتە لوتکەی خۆی لە ئەوروپای سەدەی هەژدەهەم و فەرەنسای سەدەی ڕۆشنگەری و ئەڵمانیای سەدەی نۆزدەهەم و ئنگلتەرای خاوەن بیرۆکەی گەشەسەندن و پەرەسەندن. بەکارهێنانی تاکیانەی وشەی شارستانییەت بیرۆکەیەکە ئەو ڕاستییەمان پێدەڵێت کە تەنها یەك شارستانییەت هەیە و هەموو شارستانییەتەکانی دیکە بوونەتە خشتێك لە بینای ئەو شارستانییەتە.

بۆ ئەوەی دەرکی ئەوە بکەین چۆن ئەم هەڵەیە بە قوڵی ڕیشەی داکوتاوە، ئەوەندە بەسە ئاماژە بەو ڕاستییە بکەین کە ئێمە زۆر جار ڕۆژانە وشەی (بەشارستانی بوو *Civilised*) بە ئینگلیزی بەکاردەهێنین، تەنانەت ئەم زاراوە باوە کاتێك لە ڕووی سیاسییەوە ڕاست دەبێت ئەگەر تۆ ملیۆنەها خەڵك بە بۆمبی ئەتۆمی

پێشکەوتوو جۆرەکانی دیکەی تەکنەلۆژیای مۆدێرن بکوژێت، ئەو کاتە ئەوەندە بە شارستانی بوویت. بەڵام ئەگەر پانزدە کەس بە ڕم بکوژێت، ئەوا ناشارستانیت (*uncivilised*). ئەم بەکارهێنانەی وشەی (بەشارستانی بوو) کە ئێمە بەردەوام دەڵێین (ڕەفتاری بەشارستانی بوو) لە ڕاستیدا گەمەیەکە بۆ کەسێك نەزانێت بەکارهێنانی ئاوەها زاراوەیەك چەند کارەساتبارە.

ئێستا بە خۆشحاڵییەوە بۆ قسەکردن لە بارەی دیالۆگی شارستانییەتەکانەوە پێویستە پێشوەخت دەرکی فرەیی *plurality* شارستانییەتەکان بکەین کە هەنگاوێکی زۆر گەورەیە و پێویستیشە بۆ ئەوەی لەو هەوری نەزانین و بەهەڵە تێگەیشتنە تەواوە دەرچین کە زۆر بە زەقی لەم ماوەی پێشووتری مێژووی ئەوروپا و باقی جیهان بەرچاو دەکەوێت. سەیرکەن چۆن ووشەی "بەشارستانی بوون" لە زمانی عەرەبی و فارسیدا بەکاردەهێنین، هەر لەم دیدەوە چۆتە ناو زمانە ئیسلامییەکانەوە. بۆ نمونە لە زمانی دایکی مندا، واتە فارسی، ئێوە چەندان جار دەڵێن "موتەممەدین یاخود ناموتەممەدین" واتا شارستانی بوو یاخود ناشارستانی بوو.

ئەمە مانای شتێکی خراپ ناگەیەنێت بەڵکو کاریگەری سەردەمی بیرکردنەوەی ڕۆشنگەری *Enlightenment* ئەوروپایە. هەروەها بە ڕوونی ئێوە هەمان بەکارهێنان لەلای یابانییەکان و چینییەکان (من ئەم زمانانە نازانم) و زمانە ئاسیاییەکانی دیکە دەبینین. لەبەرئەوە ئێستا بە خۆشحاڵییەوە لەم هەڵەی بەتاککردنە *Singularising* دەردەچین کە لە ڕاستیدا فرەیە. ئێستا پێویستە لەوە تێبگەین چ شتێکە لە ڕووی مێژووییەوە شارستانییەتێك بنیات دەنێت و بۆچی شارستانییەتەکان فرە بوون.

ئەگەر ئێوە سەیرێکی شارستانییەتە جۆربەجۆرەکانی جیهان بکەن، تەنانەت ئەوانەی لە کتێبەکەی ساموێل هنتنگتۆندا بەناوی "پێکدادانی شارستانییەتەکان" ژمێرکراون (ئەم کتێبە ئەمڕۆ مشتومڕێکی زۆری لە بارەی شارستانییەتەکانەوە دروستکردووە)، بۆتان دەردەکەوێت کە هیچ هەلاوێردنێك لە نێوان شارستانییەتەکان نییە، لەهەر بارێکدا سەیرکەن، هەر شارستانییەتێك ئایین دایمەزراندووە، یاخود ئەگەر ئێوە حەزتان لە ووشەی ئایین نییە، ئەوا زاراوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەیە کە خوالێخۆشبوو مارکۆ پالیس بەکاریهێناوە، پێی دەڵێت "بیرۆکەی سەرەکی *Idea presiding*". بەدرێژایی هەر شارستانییەتێك بیرۆکەیەکی سەرەکی خۆی نمایش کردووە، واتە جیهانبینییەکی گشتگیر، ئەم جیهانبینییەش لە دیدە فراوانەکەی زاراوەکەدا بریتییە لە ئایین. سەد لە سەد هیچ هەلاچویردنێك لەم نێوەندەدا بوونی نییە.

بابزانین چی هەیە لە بارەی شارستانییەتە نوێکانەوە؟ بە خێرایی قسە لە بارەیانەوە دەکەم. شارستانیەتی نوێ پاشماوەی شارستانییەتێکی ئایینییە. ڕیشەی ئەم شارستانییەتە فەلسەفەیەکی عەلمانییەتگەرا نەبوو. کاتێك مەسیحیەت *Christianity* لە ئەوروپا دەرکەوت، شارستانییەتی ئەوروپی مەسیحی دروست بوو. ئێستا ئەگەر پاش

2000 ساڵ، تەنها لە 3٪ی پیاوانی ئنگلیز دەچن بۆ کەنیسە لە ڕۆژی یەکشەممەی پیرۆزدا (*Easter Sunday*)[1]، مانای ئەوە نییە شارستانییەتێکی نوێ دروست بووە. ئەوە لادانێکە لە ڕێسای شارستانییەتێك کە پێشتر دروستبووە، پاشان سەیری شارستانییەتی ئیسلامی، هندۆسی، بووزی، ئاسیای ڕۆژهەڵاتی باشور، کۆنفۆشیۆسی، تاویست، ماووری لە نیوزلاند، هندییەکانی ئەمریکای باکور، هندییەکانی ئەمازۆن، یۆربا، هەرجێگەیەك لە جیهاندا تۆ دەچیت، دڵی شارستانییەت هەمیشە ئایین بووە. هەر مشتومڕێکی تیۆری ئەمڕۆی لە بارەی دیالۆگی شارستانییەتەکانەوە سازبکرێت، زۆر زۆر گرنگە ئەم حەقیقەتە مێژووییە لە بیر نەکەین..

هەرچەندە دۆخەکە ئەمڕۆ بریتی نییە لەم حەقیقەتە مێژووییە بە تەواوی چونکە ئێستا ئێمە یەك شارستانییەتی زۆر بەهێزمان هەیە و هێشتا بانگەشەی جیهانی بوونی خۆی دەکات و بانگەشەی ئەوە دەکات بنەمایەکی ئایینی نییە، هەرچەندە بێگومان توخمێکی ئایینی زۆر بەهێزتر لەم شارستانییەتەدا بوونی هەیە وەك لەوەی خەڵکی حەزدەکەن قبوڵی بکەن. بەڵام شارستانییەتی ڕۆژئاوا لە بنەڕەتدا بە تەواوی لەلایەن بەناو نوخبەیەکی ڕۆشنبیری عەلمانی کۆنترۆڵکراوە، ئەم نوخبەیە زیاتر لە دانیشتوانی ڕۆژئاوا وەکو گشتێك عەلمانی ترن و ئەو بەهایانە دیاری دەکەن کە خەڵکی ئاسایی هەڵگریەتی.

چی لە بارەی ئەم شارستانییەتەوە بڵێین؟ لە ڕاستیدا ئەمە کێشەی سەرەکی لەبەردەم دیالۆگدا دەخوڵقێنێت. بۆ ئەوەی دیالۆگ بێتە کایەوە، پێویستمان بە زەمینەیەکی هاوبەشە. من فەیلەسوفێکی پیشەیم. ئەفلاتون باوکی بیری دیالۆگییە لە ترادسیۆنی ڕۆژئاواو ئەو ترادسیۆنەی کە ئیسلام بە میرات لە بەرهەمەکانی سەردەمی دێرینەوە وەریگرتووە. بۆ ئەوەی دیالۆگ هەبێت پێویستە پێوەرێکی هاوبەش، زەمینەیەکی هاوبەشمان هەبێت. لێرەوە، ئەمڕۆ بابەتی سەرەکی بریتییە لە جیاوازی کردن لە نێوان:

-دیالۆگ لە نێوان ئەو شارستانییەتانەی سەرەڕای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر هێشتا ڕەگ و ڕیشەیان لە بیرۆکە سەرەکییەکەدایە، بەدەربڕینێکی فراوانتر لە ناو ئایندایە *Religion*.

-شارستانییەتی نوێی ڕۆژئاوا و جێکەوتەکانی لە بەشەکانی دیکەی جیهاندا. هەروەها حەزدەکەم قسە لە مەسەلەیەکی دیکە بکەم.

بەڵام پێش ئەوەی ئەو کارە بکەم، سەرەتا پێویستە بە هەموو ڕاستگۆییەکەوە پرسیارێك لە خۆمان بکەین، دیالۆگ بۆ؟ بۆچی دەتانەوێت دیالۆگ بکەن. ئەگەر بەو تێزە دەست پێبکەن کە تەنها یەك شارستانییەت لە جیهاندا نییە، بەڵکو فرەییەك لە شارستانییەتەکان هەیە و فرەیی شێوازەکانی تێڕوانینی جیهان هەیە بەو واتایەی ئەوە بیرۆکەی سەرەکییە بۆمان دیاریدەکات چۆن شتەکان هەڵبسەنگێنین، چۆن شتەکان ببینین، چۆن لە ژیانی مرۆڤ و ئامانجی بوون و جۆری ئەو ڕوحانیەتە تێبگەین کە خۆی دەسەپێنێت بەسەرماندا. ئەگەر فرەییەك لەم

شتانەدا هەیەو چەندان شارستانییەتمان هەیە، لە هەمان کاتیشدا یەك شارستانییەت هەوڵدەدات ئینکاری بنەڕەتە (ئەصڵە) بڵندگەرا (متعالی)کەی ئەم شتانە بکات، بۆچی دەمانەوێت دیالۆگ بکەین. پێم وایە ئەم ساڵ کە نێودەوڵەتییانە وەکو ساڵی دیالۆگی شارستانی ناوزەدکراوە[2] بێمانا دەبێت ئەگەر ڕاستگۆ نەبین لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە. بۆ ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ پێش سەردەمی مۆدێرن، شارستانییەتەکان لە دیالۆگدا بوون بەبێ بوونی دیالۆگێکی ڕەسمی. بەمانایەك لە ماناکان، ترادسیۆنە ڕوحی و فەلسەفی و هونەرییەکانیان دیالۆگیان لەگەڵ یەکدیدا کردووە. ئیسلام و هندۆسی لە هندستان، ئیسلام و مەسیحیەت و یەهودیەت لە ئیسپانیا، بودیزم لە چینی کۆنفۆشیۆسیدا دەرکەوت، کۆنفۆشیۆنیزم بەرەو یابانی شینتۆیست پەلی هاویشت. لە ڕووی مێژووییەوە، گەلێك نمونەی زۆر هەن.

لە ماوەی چەند سەدەیەکی کەمی ڕابردوودا، ئەو شارستانییەتەی لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە زاڵ بووە شارستانییەتی ڕۆژئاوایە، ئەم شارستانییەتە گرنگی نەداوە بە دروستکردنی دیالۆگ لەگەڵ شارستانیەتەکانی دیکە. بەشێوەیەکی گشتی. من لە بارەی وڵاتێك لێرەو وڵاتێك لەوێ قسە ناکەم. ئامانجی[3] بەریتانیا لە چوون بۆ هندستان، فەرەنسا بۆ جەزائیر دروستکردنی دیالۆگی شارستانی نەبوو. پێویستە دەرکی ئەمە بکەین.

لەلایەکی دیکەوە، ژێر دەستەکان عادەتەن بوونەتە دوو دەستەوە: دەستەیەکیان هەوڵیانداوە خۆیان بپارێزن بۆ ئەوەی بە تەواوی لەسەر ڕووی زەوی وەکو شوناسێکی *Identity* جیاواز نەسڕێنەوە، جا ئەم دەستەیە هندۆسی، موسڵمان، بوزی بووبن هەوڵیانداوە خۆیان لەم هێزە زیانبەخشە تازەیە بپارێزن. زاناکانمان لە جیهانی ئیسلامیدا هەتاوەکو ئەمڕۆ بۆ ماوەی دووسەدە، جا زانایانی میسری، فارسی، عێراقی، سووری یاخود مەراکیشی بووبن، هەوڵیانداوە خۆبە دوور بگرن لە فکری ڕۆژئاواو نەیانویستووە هیچ شتێك لە بارەیەوە بزانن..

خۆتان بەدوور بگرن لە فکری ڕۆژئاوا و ئێمەش مەعریفەی سوننەتی (تەقلیدی) خۆمان دەپارێزین. هەمان شتیش لە شارستانییەتەکانی دیکەدا ڕوویدا. ئەمە ئامانجی شارستانییەتی ڕۆژئاوابوو نەك دیالۆگ. پێموایە یەکەم دیالۆگی جدی لە نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا لەسەر ئاستێکی فەلسەفی و مێتافیزیکی لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا لە تاران ڕوویدا، تەنها نیوسەدە لەمەوپێش، نەك لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

دەستەی دووەم لەم شارستانییەتانەدا ئەو کەسانەبوون وەکو کەسێکی ڕۆژئاوایی ڕەفتاریان دەکرد. گرنگییان نەدا بە دیالۆگ کردن لەگەڵ ڕۆژئاوادا، ویستیان ببنە ڕۆژئاوایی، ڕۆژئاواییەکی پلە دوو. ئەمە وەکو شەپۆلێك هەموو کەلتورە ناڕۆژئاواییەکانی گرتەوە، نەك تەنها کەلتوری ئیسلامی، نەك تەنها هندۆسی، نەك تەنها بوزی، هەر هەموویان، جگە لەوەی هەندێکیان باشتر

لاسایی رۆژئاوایان دەکردەوە وەك لەوانی دیکە. هەندێك كەس لاساییكەرەوەیەكی باش بوون، بەڵام هەمیشە لاساییكردنەوەیەكی پلەدوو بووە. لاسایی كردنەوە (*Imitation*) جیاوازە لە دیالۆگ، ئەمە خاڵێكی زۆر گرنگە، لە دیالۆگدا تۆ دەبەخشیت و وەردەگریت، بەڵام شوناست پارێزراوە. لاسایی كردنەوە واتای قوتدانی شوناسێكە بۆ ناو شوناسێكی دیكە.

لەبەرئەوەشە تەواوی بابەتی دیالۆگ لە ڕاستیدا بابەتێكی كۆن نییە. ئەگەر ئێمە بە نیازی دیالۆگ كردنین، واتای گۆڕانێكی زۆر گەورەی هەڵوێست و ئامانجی هەردوولایە. واتای ئەوەیە كە شارستانییەتی زاڵی ڕۆژئاوا بوونی شارستانییەتەكانی دیكەی قبوڵە و باوەڕی وایە كە ئەم شارستانییەتانە هەندێك شتی بەسوودیان هەیە شایانی دیالۆگ لەسەر كردنن. شارستانییەتە نازاڵەكانیش (نارۆژئاواییەكان) لە لایەن خۆیانەوە، چ لەناوەوەو چ لە دەرەوەی خۆیانەوە، دەبێت متمانەیەكی تەواویان بە بوونی خۆیان هەبێت.

من لەناو نەوەیەكدا گەورەبووم لە ئێران كە هەموو كەسێك پێیوابوو ساڵی 2000 هەموو ئێرانییەكان وەكو مرۆڤی فەڕەنسی یان سویدیان لێدێت، بەڵام كەسانێك هەن دووچاری توڕەییەكی زۆر بوون كە دەبینن چۆن ئاین لە هەموو جیهاندا گەشاوەتەوەو چۆن ڕەتكردنەوەی بیرۆكە رۆژئاواییەكان خەریكە پێی خۆی دەگرێت.

بەهەرحاڵ، واتای ئەوەیە هەرلایەنێك لەلای خۆیەوە كە بەشداری دروستكردنی دیالۆگەكە دەكات پێویستە هەستێكی متمانە بە بوونی خۆیی و شوناسی خۆی هەبێت و لە هەمان كاتیشدا هۆكاری سێهەم دێتە ناوەوە ئەویش كرانەوەیە بۆ هاوبەشی كردن بەو مانایەی ئامادەیی هاوبەشی كردنی هەبێت. ئەمڕۆ لە زۆربەی جیهانی نا رۆژئاواییدا، ئێمە بزوتنەوەیەكی زۆر بەهێزی ڕەتكردنەوەی تەواوەتی ئەوی دی دەبینین. هەر لە تالیبانی ئەفغانستانەوە بگرە تا دەگاتە تاكارای لە بۆمبای لە جاكارتا. ئەمانەی من ناوم هێنان دوو ڕاستڕەوی موسڵمان و هندۆسی بوون و ئێوەش نمونەگەلێكی زۆرتان هەیە لە هەموو دنیادا. ئەوانە فۆرمێكی توندڕەوی ڕەتكردنەوەی تەواوەتی بەرامبەرن. بێگومانیش فۆرمی لەو شێوەیە هەمیشە لە رۆژئاوا هەیە، بەڵام ناوی بەو شێوەیە نابردرێت. ئەو كەسانەی لە رۆژئاوا *West* هەموو بەهاكانی *Value* دیكە ڕەت دەكەنەوە پێیان ناوترێت "بنەڕەتخوازەكان *Fundamentalist*"، بەڵكو ئەوانە عەلمانیەتگەرای عەقڵ – كراوەن. بەڵام ئەوانە هیچ نین جگە لە بنەڕەتخوازە بەهێزەكان. هەموو جیهان بینییەكانی *worldview* دیكە ڕەت دەكەنەوە. ئەوان لە بەرژەوەندی ئازادیدا كاردەكەن بە مەرجێك تۆ دیدگای ئەوانت قبوڵ بێت. ئەوان لە بەرژەوەندی مافەكانی مرۆڤدان بەمەرجێك ئەو مەخلوقەت قبوڵ بێت ئەوان پێی دەڵێن مرۆڤ. ئەگەر تۆ باوەڕت وایە مرۆڤەكان وێنەیەكی خوداوەندن و بۆ بڵندگەرایی (متعالی *Transcendent*) دروستكراون زیاتر لە هەر شتێكی دیكە، ئەوان بێگومان تۆ قبوڵ ناكەن. ئەمەیە كرانەوەی درۆیینە *pseudo – openness*. بەڵام ئەگەر تۆ لە دۆخێكی ئاوادا بیت، دوو

هەڵویست یاخود تێڕوانینت *Attitudes* هەیە لە هەردوو شارستانییەتەکەدا: ڕۆژئاواو ناڕۆژئاوایی کەسانێکی دیاریکراویان تێدایە کە ئەوی دیکە سەد لەسەد ڕەت دەکاتەوە *rejection*. بەڵام کەسانێکی دیکەش هەن لە ڕاستیدا دەیانەوێت ببەخشن و وەرگرن لە پێناوی فێربوون و فێرکردنی دایالۆگداو ئەمەش بەشێکی زۆر گرنگی مێژووی ئێمەیە ئەگەر بەجدی وەربگیرێت. ئەگینا دایالۆگ دەبێتە فێڵ و تەڵەکەیەکی سیاسی. کەسانێکی زۆرهەن لە جیهانی نا ڕۆژئاوایی دا لە بوونی دایالۆگ دەترسن لەگەڵ ڕۆژئاوادا چونکە باوەڕیان وایە دایالۆگیش هەروەکو بەجیهانی بوون *globalization* بەناوی ئازادییەوە دەتوانیت زۆر بە ئاسانی سەروەت و سامانی نەتەوەکانی دیکە بدزیت. باوەڕیان وایە دایالۆگ واتای پێدانی ڕوناکییە بە دزەکە بۆ ئەوەی بتوانێت زۆر بە ئاسانی دزییەکەی خۆی بکات. کاتێک دزێک دێتە ناوماڵەکەتەوە بەلاییتێکەوە دەتوانێت ئەو شتانەی باشترن بۆ دزین هەڵبژێرێت. هەندێک خەڵك لە جیهانی ئیسلامی و هندۆسی و هندی و بوزی و سەرتاسەری جیهاندا ئەم تێڕوانینەیان هەیە.

گومانی تێدانییە ئەم تێڕوانینە *Attitude* بوونی هەیە، پێویستە ڕوبەڕووی ببینەوەو چەند ساڵێکی کەمی داهاتوو پێمان دەڵێت ئاخۆ ئەمە کەف و کوڵێکی کاتی بوو یاخود شتێکی جدی بوو. ئایا لە ڕاستیدا شارستانییەتی ڕۆژئاوا دەیەوێت دایالۆگ بکات لەگەڵ شارستانییەتەکانی دیکە و بە پێچەوانەشەوە...

ئەم بە پێچەوانەییە تەواو ڕاست دەرناچێت لەو ڕووەوە کە لایەکی هاوکێشەکە زاڵە بەسەر لاکەی دیکەدا واتە شوێنی ئەویشی گرتۆتەوە چونکە یەکسانی بنیادی هێز لە نێوان شارستانییەتەکاندا بوونی نییە. من دەزانم کتومت لەم شاری لەندەنەدا، چەندان قسەکەر و نووسەری موسڵمانی زۆر بەناوبانگ ووتویانە ئێمە ئێستا چووینەتە ناو سەردەمی دایالۆگی شارستانییەوە، سەیری ئینگلیزەکان بکەن گوێدەگرن بۆ کەوالییەك *Kawali* و سەریان ڕادەوەشێنن. ئەوان لەسەردەمی ڤیکتۆریادا ئەمەیان نەدەکرد[4] *Victorian period*. ڕاستە لە سەردەمی ڤیکتۆریادا ئەمەیان نەدەکرد بەلاّم ئختیاریان هەبوو ئاخۆ دەیانەوێت گوێ بگرن بۆ کەوالی یاخود نا. لە هەمان کاتدا لە تاران ئەوەندە ئاسان نییە ئختیارت هەبێت ئاخۆ دەتەوێت گوێبگریت بۆ مایکڵ جاکسۆن یاخود نا. فشاری جەستەیی لەگەڵ فشاری دەروونیدا یەکسان نین. یەکسانی *Equality* لە نێوانیاندا نییە. ئەوە جەوهەری چۆنیەتی نیازی مامەڵەکردنی ئێمەیە لەگەڵ ڕووبەڕوبونەوەی شارستانیەتەکاندا.

داینەمیکێکی بەرچاو هەیە و بەردەوامە. ئەگەر لەدەرەوە سەیری شارستانییەتی پۆست مۆدێرن بکەین وا دەردەکەوێت بەردەوام بەرەو زاڵتربوون دەچێت. بەلاّم لە ناوەوە ئەم شارستانییەتە زۆر بە خێرایی بەرەو داڕمان دەچێت. لە شارستانیەتەکانی دیکەوە، بەهاکان بەرەو گەورەیی و لوتکەی شارستانیەتی زاڵ هەنگاو هەڵدەگرن. ئەم شوێنەی ئێستا ئێوە تێیدا دانیشتوون، سەردەمێك جێگەیەك بوو کە

پیتەر ئوتولْ یەکێك لە ئەکتەرە بەریتانییە بەناوبانگەکان، شانۆیی تێدا دەگێڕاو هێشتا لە ژیانـدا مـاوە، بـەلاٚم ئێسـتا ئـەم شـوێنە سەنتەرێکی ئیسلامییە. هیچ کەسێك لە ساڵی (1930)دا تەسەوری ئەوەی نەدەکرد ئێرە ببێتە سەنتەرێکی ئیسلامی.

کەواتە ئێوە دووچاری دیاردەیەکی زۆر نامۆدەبن، لێرەوە مایکلْ جاکسۆن دەچێت بۆ تاران و لاهورو کەراچی و لەلایەکی دیکەوە بزوتنەوەیەکی دیکە دەبینن، لە چوارچێوەی ئەم داینەمیکە تەواوەتییەدا، ئێمە پێویستە تێبگەین دیالۆگی شارستانی مانای چییە.

بە بڕوای من سێ شێوە دیالۆگ هەیە کە دەکرێت بەشداریان پێ بکرێت ئەگەر خەڵکی بەجدی ڕەچاویان بکات.

یەکەم شێوەی دیالۆگ بریتییە لە دیالۆگی نێـوان پاشماوەکـانی شارسـتانییەتە سوننەتییەکان (تەقلیدییەکان)، ئەمە شتێکە بە درێژایی ژیانم سەرقاڵی بووم. کە من دەڵێم پاشماوە لەبەرئەوەیە ئەمڕۆ لە جیهاندا هیچ شارستانییەتێکی سوننەتی تەواو ساغ و تەندروست نەماوە. بەلاٚم هێشتا جیاوازی گەورە هەیە، سەرەڕای ئەوەی هەموو کەسێك لە بارەی بەجیهانی بوون و.. هتد قسە دەکەن هێشتا جیاوازی گەورە لە نێوان قوتابییەك لە قاهیرە و قوتابییەك لە نیوٚرکدا هەیە. هێشتا جیاوازی گەورە هەیە. لەگەڵ بوونی هۆشیارییەکی بڵندگەراییانەی توخمی ڕوحی (مەعنەوی) لە چەند بەشێکی دیاریکراوی جیهان و پوکانەوەی لە بەشەکانی دیکەدا.

لەبەرئەوە جۆرێك دیالۆگ هەیە کە دەکرێت دروست بکرێت و گرنگی لە ڕادەبەدەری هەبێت ئەگەر بە هەند وەربگیرێت. بۆ نمونە، ئەو دیالۆگەی ڕوویدا لە نێوان بەشە ئیسلامییەکەی هندستان (بەشێکە لە شارستانییەتی ئیسلامی) و شارستانییەتی هندۆسیدا. سی هەزار کەس لە کشمیر کوژراون و هەزارانی دیکەش لە باقی هندستاندا. ئەگەر لە ڕاستیدا دیالۆگێك هەبوویایە، لێك تێگەیشتنی لە نێوان ئەم دوو شارستانییەتە دەهێنایە کایەوەو دەرەنجامی سیاسی گەورەشی لێدەکەوتەوە. ئەو جۆرە دیالۆگە زۆر گران و قورس نییە چونکە کاتێك تۆ سۆزەکانت و هۆکارە دەروونییەکان و چاوچنۆکی مرۆڤ بۆ پارە و دەسەلاٚت و توخمە نەژادییەکان و.. هتد بخەیتەلاوە، دەبینیت کۆمەڵێك بەهای ڕیشەدار و بەهێزت هەیە کە دەتوانن وەکو دوولای پردێك لە نێوان دوو شارستانییەتەکە دەور ببینێت یاخود لێك تێگەیشتن بێنێتە کایەوە.

ئەمە شتێکە هەزاران ساڵ لەمەوپێش لەلایەن کەسانێکەوە شایەنی تێگەیشتن بووە، ئەو موسڵمانانەی بۆ یەکەم جار چوون بۆ هندستان. پێشتر ڕوونکرایەوە کە هەرچەندە زۆر شتی نامۆ لە هندستان دەگوزەرێت، بەلاٚم هێشتا باوەڕێك بە یەکیەتی خودا ( *unity of God*) لە ناو هەندێك هندۆسی تایبەتدا هەیە. ئەوەش لە فۆرمێکی زۆر دوور و درێژتردا دووبارە کراوەتەوە لەلایەن "دۆرا شاکۆب" و کەسانی دیکەوە کە من ناچمە ناو باسەکەوە.

دیالۆگ لە نێوان پاشماوەکانی شارستانییەتە سوونەتییەکان *Traditional* لە

ماوەی سەدەی بیستەمدا ئاسانکارییەکی باشی بۆ کراوە بەهۆی دەرکەوتنی ژمارەیەك نووسەری سووننەتی گەورە کە پەیامە گەردونییەکەی ناو شارستانییەتە سووننەتییەکانیان هێنایەوە ناو کۆمەڵگا و بە گوتەی کۆمار سۆمی ئەم پەیامە دەکرێت وەکو ئامرازەکانی گوتار *Discourse* دەور ببینێت. کۆمارسۆمی ووتی: وانە سووننەتییە جۆراو جۆرەکان هەموویان هەمان حەقیقەتمان *truths* پێدەڵێن بەلاّم بەزمانی جیاواز و دەربڕینی جیاواز. حەقیقەتەکان چوونیەك نین بەلاّم زۆر زۆر لە یەکەوە نزیکن. ئەو حەقیقەتەش تەنها لە یەکیەتیە خودایییە دەرنەبڕاوەکەدایە، لەم یەکیەتیەشدا شووناسی بالاّ دەبینرێتەوە.

شێوە دیالۆگی دووەم زۆر زۆر سەخت و گرانە کە لە ڕاستیدا سەپێنراوە بەسەرماندا. ئەویش دیالۆگی شارستانیەتە ناڕۆژئاوایەکانو شارستانییەتی ڕۆژئاوایە. بۆچی ئەم دیالۆگە هێندە قورسە؟ پێش هەموو شتێك بەهۆی بونیادی هێزەوە. شارستانیەتێك خاوەنی فرۆکەی بۆمبهاوێژی *B52* و بۆمبی ئەتۆمی و کەشتی ژێرئاوگەڕو هەموو شتەکانی دیکە بێتو شارستانییەتەکانی دیکەش هیچیان نییە. ئەگەریش بیانەوێت ئەو جۆرە شتانە بەدەست بخەن، ئەوا پێویستە واز لە کاراکتەری خۆیان بهێنن کە زۆربەی موسڵمانان تێیناگەن. لە بارەی بۆمبی ئەتۆمی ئیسلامییەوە قسە دەکەین. ئەگەر مەسیحیەکان و جولەکەکان هەیانبێت، پێویستە ئێمەش بۆمبی ئەتۆمی ئیسلامیمان هەبێت. چەند جار لە ڕۆژنامەکانی پاکستاندا ئەمەتان خوێندۆتەوە؟ بەلاّم بەداخەوە؟.

بۆ شارستانییەتی ئیسلامی و فکری ئیسلامی، ئەمە چی دەگەیەنێت؟ هیچ کەس حەزناکات بیر لەمە بکاتەوە؟. بنیادی هێز *Power structure* یاخود پێکهاتەی هێز یەکسان نییە. ئەمە یەکەم بوو. دووەمینیش ئەم مەسەلەیە زۆربەی بیریارە موسڵمانەکان بە تەواوی تێیناگەن، بەلاّم پێویستە تێیبگەن. لە شێوەیەکی ئاساییدا، هەر شارستانییەتێك پێویستە ئەجێندای (کارنامە *agenda*) خۆی دروست بکات و ئەجێندای خۆی هەبێت و لەگەڵ شارستانییەتەکانی دیکە دیالۆگ بکات. ئەمڕۆ ڕۆژئاوا هەموو ئەجێنداکان دیاری دەکات. قەت بیرتان لەوە کردۆتەوە؟ ڕۆژئاوا هەموو ئەجێنداکان بۆ هەموو شارستانییەتەکانی دیکە دیاری دەکات..

بۆچی ئەمڕۆ ئەو هەموو موسڵمانە دەبێت لەسەر "ئافرەت لە ئیسلامدا" بنووسن؟ ئەولیا مێکانی مەراکیش، بۆچی ئەولیا نێرەکانی مەراکیش نەبێت؟ کێ ئەمەی کرد؟ ئەوە ڕۆژئاوایە ئەجێنداکەی دروست کردووە؟.

دەربارەی مافەکانی مرۆڤ *Human rights*. ڕۆژئاوا گرنگی نەداوە بە نووسین لە بارەی مافەکانی مرۆڤەوە لە ساڵی 1750. پاشانیش دەربارەی مافەکانی ئاژەڵان. ئێستا دەبێت لە بارەی مافەکانی ئاژەڵەوە *animal rights* قسە بکەین. دەکرێت بەلیستەکەدا یەك یەك بڕۆمە خوارەوە. ئەوە ڕۆژئاوایە ئەجێنداکە دیاری دەکات و هەر زوو بیریارە ناڕۆژئاواییەکان

تێدەگەن کە سەربەخۆیی رۆشنبیری زیاتر بەدەست دەهێنن.

گەلێك ئەجێندای دیاری کراو هەن لەلایەن بیریارەکانی رۆژئاواوە ناسەپێنرێن بەڵکو لە رێگەی کردارەکانی رۆژئاواوە دەسەپێنرێن. کاتێك تۆ ملیۆنێك ئاژەڵ لە ئنگلتەرا دەکوژیت بۆ ئەوەی پارە پەیدا بکەیت، دنیایەك کێشەی ژینگەیی جیهانی دەخوڵقێنیت کە هەر بیریارێك پێویستە لەسەری بوەستێت. ئێوە ناتوانن خۆتان لەمە گێژکەن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ناهاوسەنگییەکی باوەڕ پێنەکراو دروست بووە لە نێوان تەکنەلۆژیای مۆدێرن و جیهانی سروشتیدا. ئەمە کردارەکانی رۆژئاوایە.

بەڵام زۆرینەی ئەجێنداکان هێندەی فکر و تیۆرو بیرۆکەن هێندە کردار نین. لە پڕ کابرایەك بەیانییەك لە فرانسا خەبەری دەبێتەوەو شتێك بەرهەم دێنێت بەناوی "هەڵوەشاندنەوە گەرایی[5] ***Deconstructionism***". تێگەیشتنی پەرتووکە پیرۆزەکان دەگۆڕێت هەروەکو ئەوەی خۆیان هیچ مانایەکیان نەبێت. پاشانیش کەسێکی دیکە لە جیهاندا دەبێت چەندان ساڵ کۆشش بکات و هەوڵبدات وەڵامی شتەکانی ئەو بداتەوە.

ئەمە ئەو ڕێچکەیەیە ئەمڕۆ جیهان لەسەری ڕێدەکات. لەبەرئەوە دیالۆگ لە نێوان شاستانییەتەکانی دیکە و شارستانییەتی نوێدا تەنها پشت نابەستێت لەسەر نایەکسانی دەسەڵات و هێزی سەربازی و ڕاگەیاندن و سیاسی و ئابوری، بەڵکو پشتیش دەبەستێت لەسەر ئەم دۆخە زۆر نامۆیە کە هەرگیز لە مێژووی جیهاندا نەتانبینیوە شارستانییەتێك ئەجێندا بۆ شارستانیەتەکانی دیکە دروست بکات. تەنانەت ئەگەر شارستانییەتەکانی دیکە بیانەوێت وەڵامەکانیان بدەنەوە، ئەوا دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە ڕۆژئاوا دەیانوروژێنێت.

هەر ڕۆژێك لەمەوپێش، کۆنفراسێکی زۆر گەورە بەسترا لە واشنتۆن تیایدا ژمارەیەك ئافرەتی زۆر بەناوبانگ ئامادەبوون بۆ ئەوەی سۆز و پەژارەی خۆیان نیشانی ئافرەتە داماوەکانی ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و.. هتد بدەن. منیش ووتم خۆزگە هەر لەم کاتەدا کۆنفراسێك لە قاهیرە بگیرایە لە بارەی ئەو منداڵە داماوانەی کە لە قوتابخانەکاندا لە هەموو جێگەیەکی ئەمریکادا بەر دەستڕێژی گوللە دەکەون. بەڵام هیچ کۆنفراسێك نابەسترێت لە قاهیرە لە بارەی تەقەکردن لە مندالأن لە قوتابخانەکانی ئەمریکادا. تکایە ئەگەر ئێوە شتێکی لەو شێوەیە دەزانن، با منیش بیزانم و دیدی خۆم بگۆڕم. بەڵام هیچ شتێکم لە ڕۆژنامەکاندا لەو بارەیەوە نەبیستووە.

ئەمەیە نەبوونی یەکسانی ئەگەر بە جدی ڕەچاوی نەکەین، هەموو دیالۆگی ئاینی تەنها بە فیڕۆدانی ووزەی زەوییە بۆ ئەوەی بە فرۆکەکانیان لە قاڕەیەکەوە بفڕن بۆ قاڕەیەکی دیکە. شارستانییەتە ناڕۆژئاواییەکان پێویستە توانای ئەوەیان هەبێت لانی کەم ئەجێندای خۆیان دابنێن. ئەوان هێزیان *power* نییە بۆ ئەوەی ئەجێندا بۆ رۆژئاوا دابنێن بەڵام لانی کەم دەبێت بتوانن ئەجێندا بۆ خۆیان دابنێن. بارەکە ئەمڕۆ بەم شێوەیە نییە. ئاخۆ تۆ چینی

کۆمیۆنستیت، ژاپۆنی ئمپریالیست، هندستانی دیموکراتیت، جیهانی ئیسلامیت.. ناوەکان هەرچییەك بن تۆ دەتەوێت بەکاریان بهێنیت، چەپ، ڕاست، ناوەند، ئەو بیریارانەی بڕیاردانیان بە دەستە ناتوانن بڕیار لەو شتە بدەن کە پێویستە بیری لێبکرێتەوە.. ئەمە شارستانیەتێکی دیکە دیاری دەکات و لەبەرئەوە زۆر مەحاڵە لە ڕاستیدا دایالۆگ بەم شێوازە جێبەجێ بکرێت. دایالۆگت پێناکرێت، تۆ داخ کراویت، جگە لە هەندێك کایەی دیاریکراوی بچوکی زۆر تایبەتی، لە کایەی گەورەی گشتیدا ئەمە سەختییەکە لە بەردەم دایالۆگدا.

تەنانەت ئەگەر لە باری دووەمدا دایالۆگ جێبەجێ بکرێت، واتە ئەو بارەی کە تیایدا پاشماوەی شارستانییەتەکان و ڕۆژئاوا دەکەونە دایالۆگ، پرسیارە سەرەکییەکە دەمێنێتەوە ئایا پرنسیپە هاوبەشەکان چین.

لێرەدا دیدی من تەواو جیاوازە لە دیدی زۆرینەی ئەو تیۆریستانەی لەم ماوەیەدا لەسەر بابەتەکە قسەیان کردووە. باوەڕم وانییە کە سروشتی مرۆڤ بەس بێت بۆ ئەوەی خۆی ببێتە پرنسیپێکی هاوبەش بۆ دایالۆگ کردن لە نێوان شارستانییەتەکاندا. سروشتی مرۆڤ سوشتێکی زۆر شلەییە، گۆڕاوە. وەکو شەپۆلەکانی دەریا وایە. مرۆڤ گەرایی *Humanism* بەس نییە بۆ ئەوەی ببێتە بنمایەکی هاوبەشی لێك تێگەیشتن لە نێوان شارستانیەتەکاندا..

ئەمە پێداگرتنێکی گەورەیە ئێمە بتوانین بیکەین لە سەردەمێکی بەناو مرۆڤگەرایی، من هەر لە کاتی لاوێتییەوە کەسێك نەبووم لە هیچ شتێك ترسابم و تەمەنێکی درێژە دژی شەپۆلەکانی دەریا مەلە دەکەم.

بەلاّم پێموایە مێژووی سەدەی بیستەم کەموکورتی مرۆڤگەرایی نیشانداوین، بەمەرجێك مرۆڤ گەرایی مەبەستتان مرۆڤگەرایی ڕوحی نەبێت، بەلاّم بۆچی ئەم زاراوەیە بەکاردێنن؟ خەڵکی قسە لە بارەی مرۆڤگەرایی مەسیحی و مرۆڤگەرایی ئیسلامی و مرۆڤگەرایی هندۆسییەوە دەکەن، کە ئەوە بەکارهێنانێکی ناڕاستی زاراوەکەیە. ئەگەر مرۆڤگەرایی بگەڕێتەوە بۆ کاتی دەرکەوتنی لە سەردەمی ڕێنسانسدا، ئەوا بریتیە لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی مرۆڤ لە خودا. ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی مرۆڤ و بە گوتەی فەیلەسوفی بەناوبانگی سویدی دیمارکۆ *Demarco*: جێگرتنەوەی پاشایەتی مرۆڤ لەجیاتی پاشایەتی خودا. ئەگەر ئەوە مرۆڤگەرایی بێت، هێشتا زەمینەیەکی هاوبەشی تەواو نییە بۆ دایالۆگێکی جدی. دایالۆگ پێویستی بە شتێکە زیاتر لەوە. هەر ئەوەشە دایالۆگەکە قورس و سەخت دەکات. من ناڵێم ئاسانی دەکات.

باشترین کارێك بکرێت بریتییە لە نیشاندانی ئەو جێگەیەی کە بوارە تایبەتەکانی ڕێکەوتن *agreement* دەگرێتە خۆی. بەلاّم ئەگەر ڕێکەوتن نەیەتەکایەوە لەسەر ئەو پرنسیپانەی کە سروشتی حەقیقەت *Reality* چییە، بنەچەی (ئەسڵی) جیهان چییە، لە کوێوە هاتوون، بۆ کوێ دەچن، ناتوانن بگەنە ڕێکەوتنێك بە سادەیی لە پێناو ئاشتییدا. ئاشتی *Peace* بە تێرکردن و ڕازی کردن نایەتەکایەوە هەروەکو

بــەریتانیا ســاڵی 1939 پەنــدی لێــوەرگرت. ڕێکــەوتن پێویســتە لەســەر بنــەمای هەنــدێك ڕاســتی بێتــە کایــەوە و ئەگــەریش ڕاســتی هاوبــەش بــوونی نــەبێت، سـود و بەرژەوەنـدی کیفایەت نییە.. بەڵام ئەوەی لە باشترین حاڵەتدا دەتوانرێـت بکرێـت پێویسـتە دایـالۆگ بکەینـە ڕێگایـەك بـۆ هەسـتکردن و دەرککردنـی پێگـەی لایەنــەکانی دیکــە، ئەگــەر نیــەتێکی باشمــان هـەبێت. کەسانێکی زۆر لـە ڕۆژئاوا هـەن نیـەتی باشـییان هەیـە و بـە هـەموو ڕاسـتگۆییەکەوە هەست دەکەن هیچ شتێك بۆ خـەڵکی سریلانکا لـەوە باشتر نییـە کـە وەکـو ئەمریکیـەکان ژیـان بگــوزەرێنن. باشــترین کارێــك ئێــوە بتــوانن بــۆ ئــەوانی بکــەن گــۆڕینی ئەوانــە بــۆ ئــەو ژیانــەی خــەڵکی ڕۆژئــاوا دەیباتــە ســەر. لــە ڕاســتیدا ڕۆژئاواییــەکان جۆرێــك لــە پەرۆشـی مژدەهێنەرانـەی سیکولارانەیان هەیـە. پەرۆشـــی مژدەهێنەرانـــە *missionary zeal* تایبەتمەندییــەکی ڕۆژئــاوا بــووە هــەر لــە سەردەمی ڕۆمانەکانەوە، لەم سەردەمەدا کاتێك موسـڵمانەکان یـاخود ئیسـلام چـووە ئـەوێ، جەنگی دژی خاچ پەرستەکان ئەنجام نەدا، لە کاتێکدا ئیسلام بە ئاینی شمشێر ناسرابوو، لەم کاتــەوە پەرۆشــی مژدەهێنەرانــە لــەناو ڕۆژئاواییەکاندا پەیدابوو..

لە ڕۆژئاوا کەسانێکی زۆر هەن لەگەڵ بوونی نیـەتی باش جۆرێك پەرۆشـی مژدەهێنەرانـەیان هەیە بۆ ئەوەی وا لە هەموو کەسێك بکەن وەکو خۆیـان بـژین. لانـی کـەم لەوانەیـە دایـالۆگ، ئەگەرچـی لەگـەڵ جیهـانی نـوێی عەلمانیشـدا بێت، دەتوانێت کەسە نیـەت باشـەکان وا لـێ بکات دەرکی ئەوە بکەن کە دەشێت ئافرەتێکی جوتیـاری سـادەی بـەنگالی چـی دی ناڕەحـەتتر نـەبێت وەك لـە سکرتێرەیەکی دانیمارکی. ئەمە شتێکی شیاوە و دەشێت ڕووبدات. لێیگـەڕێ با خۆی بڕیار بدات چ شتێك بەختەوەری دەکات. بڕیاری بۆ مەدە کە بەختەوەرییەکەی پێویستە لەسەر جۆرێك بنەمای ئایدیاڵ بێت کە لە زەینی تـۆدا هەیـە و پـاش دە سـاڵ بـاوی نامێنێـت. ڕۆژئـاوای نـوێ شـتێکی سـەلماندووە، ئـەویش ئەوەیە کە هیچ شتێك نییە جێگیر بێت *constant* یـاخود نـەگۆڕ بێـت. زاراوەیـەکم داهێنـاوە بـە دەگمەن خۆم کاری پێدەکەم. بەو زاراوەیە دەڵێم "بە ڕەهـایی کردنـی کـاتی *Absolutalisation of the transiet*"، ئەمە تایبەتمەندییەکی ڕۆژئاوای نوێیــە کــە "کــاتی" بــە ڕەهــایی دەکــات. لــە ڕۆژگــاری کۆنــدا "کــاتی" مــاوەیی (40–50) ساڵی بوو. ئێستا ماوەیەکی دەساڵییە. پێشتر، شەســـتەکان لـــە لنـــدن ســـەردەمی شـــاژن ئەلیزابیسی یەکەم بوو. هەمان شت لە ئەمریکا جێبـــەجێ دەکرێـــت. لـــە ڕۆژئـــاوا، تـــەرزە کاتییـەکانی فکـر یـاخود هـەر شـتێکی دیکـە بـەڕەهایی دەکـەین و بـە نائومێدییـەوە بتێکـی گـــەورە دروســـت دەکـــەین و پاشـــانیش بڕیاردەدەین هـەموو جیهـان پێویسـتە ملکەچـی بـن. پێموایـە دایـالۆگی شارسـتانی لانـی کـەم لەگـەڵ کەسـە نیـەت باشـەکان کاریگـەری خـۆی دەبێــت، لانــی کــەم دۆخەکــە کــەمێك هێــور دەکاتەوە.

جـۆری سـێهەمی دایـالۆگ کـە پێویسـتە دروست بکرێت زۆر نامۆیە. ئەویش دایالۆگی نـاو – شارسـتانییە (*Intra – civilization*)، لـە

ئەنجامی دیالۆگی نێوان – شارستانی ( Inter civilisational)یـــەوە دروســـت دەبێـــت. هـــیچ شارستانییەتێك لە ئێستادا نییە سەد لەسەد ســـاغ و تەندروســـت بێـــت. نـــەك تـــەنها شارســـتانیەتی ســـوونەتی، بـــەڵكو تەنانـــەت شارســـتانییەتی ســـیكولاری نـــوێ، ئـــەگینا لـــەم هۆڵەدا كۆنەدەبووینەوە. ئەوەی بە عەرەبی پێـی دەڵـــێن "تـــــدخول" واتـــــە پێكداچـــــوونی Interpenetration هـەردوو جیهانەكە. تەنگژەی دەروونـــی Tension زۆر ئاشـــكرایە لـــە جیهـــانی ڕۆژهــەڵاتی ناڕۆژئاواییـدا چـونكە كۆلۆنیـالیزم چـــەندان ســـەدەی خایانـــدووە. هـــەروەها ئـــەو هەڵچـــونانە یـــاخود تەنگـــژە دەرونییانـــە زۆر ئاشكراترەو بەرەو زیادبوونیش دەچێت لە ناو خـــەڵكی ڕۆژئـــاوادا، لـــەناو ئـــەم كەســـانەدا، كەسانێك هەن دەیانەوێت بگەڕێنەوە و ژیانێكی ســـوونەتییانە. بگـــوزەرێنن و زۆربەشـــیان باوەڕیـان بـە ئیسـلام، یـاخود بـودیزم یـاخود هەندێك ئاینی دیكە هێناوەو زۆربەشیان بەهۆی كاریگـــەری ئیســـلام یـــاخود هندۆســـی یـــاخود بودیزمـــەوە گەڕاونەتـــەوە بـــۆ مەســـیحیەتە سوونەتییەكەو باقی كۆمەڵگا. لە ئەوروپا كە لە چـاو قاڕەكـانی دیكـەی جیهانـەوە كـەمترین ئاینییە، ئەم گەڕانەوەیە هێندەی ئەمریكا ڕوون نییـــە، لـــە ئـــەمریكا هەنـــدێك لـــەم تەنگـــژە دەروونییانـــە خۆیـــان بـــەیانكردووە بەشـــێوەی پرســـیاركردن لـــە بـــارەی پـــیرۆزی Sacredness ژیانـەوە، ئایـا لـە بـاربردنی كۆرپەلـە abortion قبوڵە یان نا. ئەمە مەسەلەی مردنی ژیانە. لە ئـەمریكا خۆزگـە دەخـوازین ئـەم كێشـەیە لـە ماوەی قاوە خواردنەوەیەكدا كە تامەكەی زۆر خۆشـــە چـــارە بكـــەین، لەبەرئـــەوە خـــودی مەســـەلەكەمان. لـــەبیر دەچـــێتەوە و خـــەڵكیش پەرۆشی چارەكردنی مەسەلەكەن..

كەواتە پێویستە لە جۆرێك تەنگژە تێبگەن لـــەناو ئـــەم شارســـتانیەتانەدا. تـــەواو جێـــی سەرسوڕمانە، پەنجا ساڵ لەمەوپێش، تەنگژە لە ڕۆژئاوادا نەبوو. لە جیهانی ئیسلامیدا، تەنگژە لـە نێـوان میسـرییەكی نوێگـەر و میسـرییەكی ســوونەتی و فارســێكی نوێگــەر و فارســێكی ســوونەتیدا هــەبوو. لــە جیهـانی هیندۆسـیدا، تەنگژە هەموو جێگەیەكی تەنیبوو. ئەمڕۆش لە ڕۆژئـــاوا هەیـــە. بـــاوەڕم وایـــە ئـــەم تەنگژەیـــە بێگومـــان ڕوو لـــە زیادبوونـــەو دیـــالۆگی شارســـتانی نێـوان ئـەم شارسـتانییەتە مەزنانـە دیـوێكی نـاوخۆیی هەیـە بـەو مانایـەی لـە نـاو خـــودی خۆیاندایـــە، ئـــەویش بـــوونی ئـــەو تەنگژەیەیە..

دەڵـێن كـە مـن دەمـەوێت بـۆ ڕۆڵـی ئـایین بگەڕێمـەوە. هـەروەكو ووتم ئەگـەر بـە هـەموو ڕاســـتگۆییەكەوە ســـەیری شارســـتانییەتەكان بكـــەیت لـــە ڕووی مێژووییـــەوە، هـــەموو شارسـتانییەتێك ئـاین دروسـتی كـردووە و هـیچ هـەڵاوێردنێك لەمـەدا نییـە. لەبەرئـەوە ئەگـەر دیـــالۆگ دەیـــەوێت لێـــك تێگەیشـــتن Understanding بەرهەم بێنێت، ئەوا جەوهەری دیـالۆگی شارسـتانی لێـك تێگەیشـتنی نێـوان ئاینەكانـە. ئەگـەر ئایینـەكان گەیشـتنە لێـك تێگەیشـتنی یەكـدی نـەك تـەنها لەسـەر ئاسـتی ڕەسمـــی بـــەڵكو لەســـەر ئاســـتی ڕێزگـــرتنی ناوەكییانە بۆ هەمان حەقیقەت Truth، ڕێزگرتن Respect زیـاتر و گـەورەتره لـە تێگەیشـتنی

سـادەی هـەڵکردن و لێکبـووردن *Tolerance* هـەروەکو پێشـتر بناغـەی دایـالۆگی شارسـتانی ڕاستەقینەمان ڕونکردەوەو رامانتا.

ئەوەی پێی دەوترێت "یەکیـەتی بڵندگـەرای ئاییـنـەکان"، کـە ئێسـتا بۆتـە زاراوەیـەکی بـاو، باوەڕم وایە سەد لەسەد زاراوەیەکی جەوهەریو بنەڕەتییە.

ئـەو موسـڵمانانەی باوەڕیـان وایـە ئەمـە دژی قورئانـە، ئـەوە قورئانیـان نەخوێندۆتـەوە. هـیچ پـەرتوکێکی پـیرۆز نییـە هێنـدەی قورئـان لـە ڕوانگـــەی *Perspective* خۆیـــدا گەردونگـــەرا *universalist* بێـت. قورئـان پێمـان دەڵێـت ئێمـە پـەیامێکمان بـە وەحـی (سـروش) نـاردووە بـۆ هەموو گەلێك و ئێمەش ئەم میراتـە درێـژەمان لـە ئیسـلامدا هەیـە و بۆتـە دوا ئـاییـنی مرۆڤایـەتی. ئەمـە کتومـت بیرۆکـەی گەردوونایـەتی سروشـە (وەحی *Revelation*).

هەنـدێك لـە ئاینـەکانی دیکـە کێشـەگەلێکی زیاتریـان هەیـە. لـەناو ئەمانەشـدا، ئـەو ئاینـەی گـــەورەترین کێشـــەی هەیـــە مەســـیحیەتە *Christianity* چـــونکە مەسـیحیەت خـــودا بـــە شـوێنگەیەکی تایبـەتی دەرکـەوتنی خـودا لـە مەسـیحدا دەزانێـت، واتـە خـودا لـە مەسـیحدا بەرجەســـتە دەبێـــت. واتـــە لای زۆربـــەی مەسیحییەکان مەسیح چەقە (مەسیح چەقێتی *Christocentric*) نـەك خـودا چـەق بێـت (خـودا چـەقێتی *Theocentric*). ئەگـەر مانـای ووشـەی مەسـیح *Christ* نـەگۆڕن بـۆ عـەقڵی گـەردونی یـاخود هـەر شـتێکی تـر، ئـەوا زۆر زەحمەتـە هـەموو ئاییـنـەکانی دیکـە لـە خـودی مەسیحدا یـەکبگرن. ڕێگەچارە گـۆڕینی ماناکەیـەتی بـەڵام لە دیـنناسی باوی ڕۆژانەی کەنیسەی مەسیحیدا چ ئۆرســـۆدۆکس، کاســـۆلیکی یـــاخود پرۆتستانتی بێت بەو شێوەیە نییە.

لەبەرئـەوە ئەمـە کێشـەیەکی سـەرەکییە بـۆ هەنـدێك ئـایین، بـەڵام ئاسـانترە بـۆ ئاینـەکانی دیکەی وەك ئیسلام و تاڕادەیـەکیش هندۆیزیم. بـە کـورتی پێموایـە پـێش هـەموو شـتێك کلیلـی سەرکی هـەبوونی لێك تێگەیشـتنێکی هاوبەشـە لـە نێـوان ئایینەکانـدا. نامـەوێت وەسـفی ئـەوە بکەم چۆن ئەم کارە دەکرێت. ئەو بابەتە نییە من بە نیازم ئەمڕۆ قسەی لێبکەم.

زۆر گرنگە دوای پەنجا شەست ساڵێك پاش هـەبوونی ئـەم هـەموو کۆبوونـەوەی هاوبەشـی کەنیسەکان و گوتارانە تێبگەین کە بنەمای ئەم بابەتـە لەسـەر ڕێـز *politeness* یـاخود سـود و قازانج *expediency* دانانرێـت. خـودا هـەرگیز لـەو کەسانە خۆش نابێت خۆیان دەکەنە قوربـانی لـە پێناو ئاشی زەمینیدا. ئەوە شتێکی بێ مانایە. مـن نیـوەی بـاوەڕم بـە خـودا بخەمـە لاوەو تـۆش نیوەی بـاوەڕ بە خـودات بخەیتـە لاوەو نیوەکەی دیکەی کە دەمێنێتەوە ئێمە دەتوانین بە ئاشتی بەیەکەوە بژین. چۆن وەڵامی خودا بدەینـەوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا، ئەمـە بـۆ ئەوانـەی باوەڕیـان بـە خودا هەیە ئەوە شتێکی بێ مانایە.

هـەروەها تـەنها قسـە لـە بـارەی هـەڵکردن و لێبوردنـــەوە (تۆلـــەرانس) ناکـــەم. دەزانم ئەمـــە وشـەیەکی جەوهەرییـە ئـەمڕۆ بـۆ عەقڵیـەتی ڕۆژئـاوایی کـە پێویسـتە هەڵکـەیت و لێبـوردە بیـت. بێگومـان تۆلەرانسـتان هـەبێت بەرامبـەر هـــەموو کەســـێك جگـــە لـــە مـــن چـــونکە ڕۆژئاواییـەکان پێیـان وایـە مـن تۆلەرانسـم نییـە

بەرامبەریان، مەقالەیەك لە مانچستەر گاردیاندا بڵاوكرایەوە، خاوەنەكەی زۆر دەمارگیرە چونكە قسەكانی منیان قبوڵ نییە. بەڵام ئەم تۆلەرانسە درۆینە (*pseudotolerance*) یەكێكە لە فەزیلەتە درۆینەكانی *pseudovirtue* جیهانی نوێ. تەنانەت ئەگەر تۆ وەكو فەزیلەتیش قبوڵت بێت هێشتا بەس نییە. من هەمیشە نمونەیەك دەهێنمەوە: كاتێك ددانت ئازاری هەیە و دانسازەكەت پشوویەتی، خێزانەكەت پێتدەڵێت بۆچی تۆلەرانسی ئازارەكە ناكەیت (بەرگەی ناگریت) تاوەكو دانسازەكە دەگەڕێتەوە. تۆ تۆلەرانسی ئازار دەكەیت. تۆ تۆلەرانسی شتێك دەكەیت كە حەزت لێ نییە. بێگومان ئەوە نابێتە هۆی هێنانەكایەی لێك تێگەیشتن لە نێوان شارستانییەتەكان و ئایینەكاندا. لە كۆتاییدا ئەم لێك تێگەیشتنە دەبێت بنەمای دابنرێت لەسەر ڕاستی، حەقیقەت، حەق (لە عەرەبیدا بەمانای هەردوو ڕاستی و حەقیقەتیش دێت). بەبێ كردنی ئەم كارە، بێ سودە قسە لە بارەی هێنانەكایەی لێك تێگەیشتن بكەیت، لێك تێگەیشتنی چی شتێك..

لێرەدا دەرەنجامێكی سیاسی هەیە، كاتێك ئەم دیالۆگە یاخود لێك تێگەیشتنە بنەما تەنها لەسەر سیاسەت دابنێت، هیچی لێ سەوز نابێت. چل ساڵ دیالۆگم لەگەڵ كەنیسەی كاسۆلێكیدا كردووە، هەر لەو كاتەوەی تەمەنم 24 ساڵ بووە چووم بۆ مەراكیش. دوای چل ساڵ دیالۆگ كردن، كاردینال (*cardinal*) ڕاستینگەر بانگەشە دەكات و دەڵێت هەموو نا – كاسۆلیك مەزهەبەكان دەچنە جەهەننەم. ئەو بەرگری لە پاشماوەكانی كاسۆلیسیزم دەكرد. كاسۆلیسیزم بە تەواوی لاوازنەبووە. كەواتە ئاشكرایە چل ساڵی تەمەنم بە فیڕۆداوە چونكە ئەگەر من بچم بۆ جەهەننەم و ئەویش بچێت بۆ بەهەشت، ئەو كاتە دیالۆگ لە بارەی چییەوە بكەین؟ بۆ كاتی یەكتر بەفیڕۆ بدەین؟ زۆر بە ئاشكرا قسە دەكەم بەڵام ئەمە كاردینال ڕاستینگەرە كە هاوڕێی شەخسی خۆمەو یەكێكە لە ڕێزدارترین كاردیناڵەكانی كەنیسەی كاسۆلیكی.

ئەوانەی دەیانەوێت ڕێزی قسەكانی من بگرن و لێی تێبگەن چی دی لەوە زیاتر باوەڕ بە كاسولیك مەكەن. ئەوان نایانەوێت مەسیحیەكی زۆر باش بن. جارێكیان لە شاری قوم لەلایەن چەند كەسێكەوە هێرشم كرایە سەر چونكە ووتبووم من ئەوەم لاپەسەندە كە جۆن هیك[6] هێشتا باوەڕی بە بەرجەستە بوونی خودا لە شێوەی مەسیحدا هەیە (*Incarnation*)، ئەوان لەگەڵمدا كۆك نەبوون و باوەڕیان بە بەرجەستەبوونی خودا لە كەسایەتی مەسیحیدا نییە. ئەوەی وایلێكردم ئەم قسەیە بكەم ئەوە بوو ئەگەر جۆن هیك بگاتە تەبایی و سازگاری لەگەڵ بیریارێكی موسڵمانی وەكو من، بەرجەستەبوون لە بیر خۆی دەباتەوە، جۆن هیك كێیە؟ ئەگەر من تەبابم لەگەڵ هیكدا، ئەوا تەبام لەگەڵ پیاوێكی بەناوبانگی شاری بێرمینگهام كە یەك ملیۆن خەڵكی لەگەڵدایە. هیك نوێنەرایەتی چی دەكات؟ هەر ئاینێك نوێنەرایەتی كۆیەك (*collectivity*) دەكات، ئەم كۆیە بریتییە لە دیدە سەرەكییە دینناسییە فەلسەفییەكان، نەك تەنها دیدی شەخسی من،

ئەو کاتە هەنگاوێك لە ئومەتی خۆمەوە دەنێم بەرەو پێشەوە بۆ ئەوەی کەسانێکی دیکە لە لایەنی بەرامبەرەکەم هێوربکەمەوە و رازییان بکەم. زۆرێك لە موسڵمانان هەوڵیانداوە ئیشێکی شەش مانگی دەست بخەن لە زانکۆیەکی دیاریکراودا یاخود فیزەیەك وەربگرن بۆ ئەوەی بێنە رۆژئاوا، بە ویستی خودا ئێمە هەمیشە ئەم کارانە ڕادەپەڕێنین..

کاری گرنگ ئەوەیە دەست بە حەقیقەتەوە بگرین بەڵام لەسەر بنەمای ئەوەی هەوڵ بدەین و لێك تێگەیشتن دروستکەین. باوەڕم وایە ئەگەر ئەم مەسەلەیە چارە نەکرێت، دایالۆگی شارستانی هیچی لێ سەوز نابێت. کەمێك دوودڵم لەو دایالۆگەی یونسکۆ *UNESCO* بانگەشەی بۆ دەکات چونکە یونسکۆ پیتێکی لە بیرچووە ئەویش پیتی (*R*) لە وشەی (*Religion*)ەوە واتا ئاین، ئەمەش حکومەتەکانی سۆڤیەت و چینی کۆمیۆنیسی کاتێك یونسکۆ دامەزرا لێیان قەدەغەکرد و ڕێگەیان پێنەدا پیتی (*R*) بچێتە سەری، وە بە پێناسەکردنیش، ڕێکخراوێکی عەلمانیەتگەرایە و هەمیشە هەوڵیداوە قسە لە بارەی ئایینەوە نەکات..

کاتێك قسە لەسەر غەزالی دەکەین، بیریارێکە خەڵکی خۆراسانە، ووشەی بیریار *Thinker* مانای چییە؟ مانای شتێکی خراپ ناگەیەنێت غەزالی یەکێکە لە گرنگترین کەسایەتیە ئیسلامییەکانی مێژووی ئیسلامی. کەمێك دوو دڵم. من ساڵی پار پێش 2001، ووتارێکم لە یونسکۆ لەسەر هەمان بابەت پێشکەش کرد. ئەگەر دایالۆگی شارستانییەتی لە پێش هەموو شتێکەوە چەقێتی ئایین بە هەند وەرنەگرێت و وەکو شتێکی دووەمی (شانوی) ڕەچاوی بکات، سودێکی نابێت. ئەگەر ئیسلام و هندۆیزم نەتوانن لە یەکدی تێبگەن، لە جیاتی ئەوە خۆمان خەریك بکەین بە بەراووردی تاج مەحەل و هەندێك تەلاری هندۆسی و هتد، ئەوا لە ڕاستیدا ئاین شتێکی دووەمییە. ئەو کاتە لە شارستانییەتی یەکدی تێناگەین.

هەروەها ئەمە بۆ رۆژئاواش ڕاستە. خۆشبەختانە لە رۆژئاوا هێشتا هەندێك پاشماوەی یەهودیەت و مەسیحیەت ماوە. بە تەواوی لەناو نەچوون. لەبەرئەوە ئەم دایالۆگە لە نێوان ئیسلام و رۆژئاوا یاخود جیهانی هندۆسی و رۆژئاوا، پێموایە سەرەتا پێویستە لەگەڵ ئەو کەسانەی رۆژئاوا بکرێت کە هێشتا باوەڕیان بە حەقیقەتی میتافزیکی و سیستەمێکی ئەخلاقی هەیە کە لە ڕاستیدا هاوشێوەی حەقیقەتە مێتافزیکی و سیستەمە ئەخلاقییەکەی ئێمەیە. ئەوانەی هێشتا جولەکەن یاخود مەسیحی یاخود بەشێوەیەك لە شێوەکان دەستیان بەو حەقیقەت و سیستەمەوە گرتووە.

بێگومان، بە داخەوە لادانێکی زۆر هێشتا لەناو مەسیحیەکاندا هەیە کە زەحمەتە بتوانیت پێی بڵێیت مەسیحی. نوکتەیەك هەیە لە ئەمریکا، پیاوێك بە پیاوێکی دیکە دەڵێت تۆ باوەڕت بەچی هەیە، ئەویش دەڵێت باوەڕم بەهیچ شتێك نییە، ئەویش پێی دەڵێت باشە خۆ تۆ ئەنجلیکانیت (شوێنکەوتەی کەنیسەی ئینگلیزی). ئەم نوکتەیە هێشتا برەوی هەیە و لە ڕاستیدا تراژیدیایەکی گەورەیە..

هەموو ئایینەکان لە دڵی شارستانییەتەکاندان. چەندان توخم هەن کە هەموویان بەشێوەیەك لە شێوەکان لەسەر ئاین بنەما دادەنێن بەڵام هاوشێوەی ئاین نین، ئەم توخمانە پێویستە لە دیالۆگی شارستانی جدیدا بە هەند وەربگیرێن. یەکەمین توخم بریتییە لە جیهان بینی. بیرۆکەی سەرەکی واتە ئایین لە تێگەیشتنە ديناسییە فەلسەفییە مێتافیزیکییەکەیدا. ئەمە توخمی یەکەمینە یاخود سەرەکییە. دەکرێت ڕێککەوتنێك *accord* هەبێت لە نێوان شارستانیەتەکاندا ئەگەر ڕێککەوتنێك لەسەر جیهان بینی نەبێت، بەڵام هەرگیز ڕێککەوتنێکی تەواو نایەتە کایەوە بەبێ ڕێککەوتن لەسەر جیهان بینی (ئاین). دەشێت بەڵێننامەیەك *agreement* هەبێت بۆ یەکتر نەکوشتن، ئەوە شتێکی دیکەیە و مانای ڕێککەوتن ناگەیەنێت. ڕێککەوتن *accord* مانای هارمۆنییەت (سازگاری و گونجاوی) دەگەیەنێت. هارمۆنییەت واتە دوو پرتەی ئاوازێك بەیەکەوە بڕۆن و لەگەڵ یەکدیدا سازگاربن، واتە تێکەڵی یەکتری دەبن بە شێوازێکی هارمۆنیانە. کەواتە یەکەم شت ئەوەیە پێی دەڵێن جیهانبینی *world view*. هۆی ئەوەی من ئەم زاراوەیە لە جیاتی خودی ئاین بەکاردەهێنم لەبەرئەوەی کەسانێك هەن دێن و دەڵێن خۆ بودیزم و کۆنفۆشیانیزم ئاین نین. ئەوە تا سەر ئێسقان قسەیەکی بێ مانایە. بەڵام ئەگەر ئێوە زاراوەی جیهان بینی بەکاربهێنن هەموو ئەمانە دەگرێتە خۆی. ئەوە تێگەیشتنی کۆتاییە یاخود جیهانبینییە دیاری دەکات ئێمە چۆن کردار دەنوێنین،چۆن بیردەکەینەوە، چۆن لە خۆمان دەڕوانین. هەر ئەوەشە تێگەیشتنی کۆتایی ئێمە بۆ حەقیقەت دیاری دەکات. دیدی یاخود بینینی ئێمە لە پەیوەندی بە تێگەیشتنی کۆتاییەوە هەموو شتێك دیاریدەکات کە ئێمە دەیکەین، ئاخۆ پۆزەتیڤ بێت، یاخود نێگەتیڤ، نا دڵسۆزانە بێت یاخود دڵسۆزانە. بە کورتی لەبەرئەوەیە ئاین هێندە گرنگە.

لێرەدا پرسیارێك هەیە: ئایا مرۆڤ کێیە؟ پیاو (*man*) کێیە؟، بێگومان لێرەدا ئەم زاراوەیە بە مانای مرۆڤ (*human being*) بەکاردەهێنم، یاخود شێت *Insane* (بە گوتەی فێمنستەکان). هەرگیز نامەوێت قسە لەسەر شێواندنی فێمنستیانەی زمانی ئینگلیزی بکەم بێگومان شێواندنێکی بێ مانایە، کەواتە مرۆڤ کێیە؟ مرۆڤ، پیاوان، هەروەها ئافرەتان کێن؟ بۆ کوێ دەچین؟ ئامانجی ژیانی مرۆڤ چییە؟ ئەم پرسیارانە لەهەر شارستانیەتێکدا پەیوەندییان بە ئایینەوە هەیە. هەر ئایینێك هەوڵی داوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە. هەندێك ئایین وەکو کۆنفیوشیانیزم زۆر نەدواون لە بارەی ئەوەی لە کوێوە هاتووین واتە چۆنیەتی پەیدابوونی گەردوون *Cosmogony* و ڕیشەو پەرەسەندنی مرۆڤ *anthropogeneisis*. بەڵام هەموویان دواون لە بارەی ئێمە چین، چۆن پێویستە هەڵسوکەوت کەین، بۆ کوێ دەچین، ئامانجی ژیانی مرۆڤ چییە.

ئەگەر ئاینێك قسە لەسەر ئەم بابەتانە نەکات، نابێتە ئایین. کەواتە ئەمە یەکەمین توخمی گرنگە دەچێتە پێکهاتەی جیهان بینییەوە. سروشتی مرۆڤ و ئامانجی ژیان چی پەیوەندییان بە سروشتی جیهانی

دەورووبەرمانــەوە هەیــە، سروشــتی جیهــان، گەردوون *Cosmos*. لەبەرئەوەشە تەنانەت ئەگەر بگەڕێینــەوە بــۆ ئیســلام، بــۆ قورئــان.. بــۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر، هەمیشە گەڕانەوەیەك هەیە بۆ مرۆڤایەتی "*humankind*" و سروشت "*nature*" بە زمانی عەرەبی.

لە قورئاندا هەندێ ئایەت دەگەڕێننەوە بۆ مــرۆڤ، هەنــدێکی دیکــە بــۆ خــۆر، مــانگ، ئاسمانەکان، هەسارەکان، ئاژەڵەکان، میوەکان.. هتد. ئەم رێکەوتنە یاخود تەباییە لە نێوان دووشتدا هەیە. چۆن لە خۆمان بڕوانین ئەوەمان بۆ دیاری دەکات چۆن لە جیهان بڕوانین. سەیری جیهانی نوێکەن، سەرەتا جیهان فکری بە سێکولار کرد و پاشان زانستی سێکولاری بەرهەم هێنا کە هێشتا مرۆڤی بە سیکولار کراو زیــاتر بەرهــەم دێنێــت لــە جــۆرە ســوڕێکی مەترسیداردا ئێمــەی بــە جێگەیــەك گەیانــدووە لەسەر لێواری هەڵدێرین.

پاشان، کارلێکی کۆمەڵایەتی و پێکهاتەی کۆمەڵایــەتی بوونیــان هەیــە. ئێمــە تــەنها تــاك گەلێك نین لە کۆمەڵگادا وەکو مرۆڤگەلێك بژین. هەریەکێك لە شارستانییەتە مەزنەکان پێکهاتەی *Structure* کۆمەڵایــەتی بەرچــاویان دروســت کردووە. ئەم پێکهاتە چوونیەك نین. شوناس تەنها لە یەکیەتییە بنەڕەتییەکەدایە. لە هەموو جێگەیــەکی دیکــە جیــاوازی دەربــڕین هەیــە. شــتێکی ئاشــکرایە پێکهاتــەی خێزانـــی کۆنفۆشیۆسی و پێکهاتەی خێزانی ئیسلامی چوونیەکن. چ لێکچوونێکی بەرچاو هەیە لە نێــوان شارســتانییەتە ســوونەتییەکاندا، ئەگەرچی لەسەر ئاستە کۆمەڵایەتییەکەش بێت.

بۆ نمونە هەڕەمیەت لە خێزاندا، ئەگەر تۆ هندییەکی ئەمریکی بیت، هندۆسییەك بیت، موسڵمانێك بیت، یاخود شینتۆیستێکی یابانی بیت، هەڕەمییەتێك لە خێزاندا هەیە.

پێشــینان *ancestor* هەمیشــە لــە خــوداوە نزیکتربوون چونکە ئەوان لە ڕیشەی (ئەسڵی) ڕەگەزی مرۆییەوە نزیکتر بوون. لە ئیسلامدا ئێمـــە پەرســـتنی پێشـــینانمان نییـــە (باووباپیرانمان ناپەرستین) بەڵام لەچین هەیە. بەڵام رێزگرتنی باووباپیرانمان بەشێکە لە سوونەتی ئیسلام. موسڵمانە لاوەکانی نەوەی مـــن بـــێ بـــەش کـــراون لـــەو پیرۆزییـــە سەرســـوڕهێنەرە. هاوڕێیـــەکی فارســـم هەیـــە دەیووت هەرکاتێك دەچوومە بەردەم باوکم، دەبوایە وەکو رێزێکی گەورە لە بەردەمیدا ڕابوەستامایە. هەر شتێکی بووتایە دەمووت بەڵێ بەسەرچاو. هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کاتێك تەمەنم دەبێتە پەنجا ساڵ، کوڕەکەی منیش هەمان کاردەکات لەبەردەم مندا. ئێستا من لەبەردەم کوڕەکەمدا دەوەستم و دەڵێم بەڵێ بە سەرچاو، هەرشتێك بڵێت دەیکەم. بێگومان ئەمە هەڵاوێردنێکی لەناوبردنی هەڕەمییەتە کە هەمیشە بوونی هەبووە, هەمیشە گرنگی خێزان هـــەبووە، جـــۆرە جیاوازەکـــانی خێـــزان و پەیوەندییە نزیکەکان بوونیان هەبووە..

بابێنە سەر گرنگی ئەخلاق *ethics*. هیچ شارســتانییەتێك نییــە پێــی لەســەر ئــەخلاق دانــەگرتبێت. کردارەکــان *Actions* کاریگــەریان لەسەر ڕوح *soul* هەیە. کردارەکان بێ بایەخ و بێ کاریگەری نین. خەڵکی لە هندستان دەڵێن ئەم یۆگاچییانە باوەڕیان بە هەموو شتێك هەیە

واتە "مایا" "*maya*"، گوایە باوەڕیان بە ئەخلاق نییە. ئەوە تا سەر ئێسقان بیٚ مانایە، ئەوانە هیچ شتێك لە هندۆیزم تێنەگەیشتوون. هیچ هەلاٌویردنێك لێرەدا نییە، چ ئیسلام بێت، هندۆیزم، بودیزم، زەردەشتی، یەهودی، مەسیحیەت بێت. بیرۆکەکە ئەوەیە کە پێکهاتەکانی یاخود بونیادەکانی کۆمەلٌگا پێویستە لە ڕێگەی نۆرمی (ڕێسای) ئەخلاقی تایبەتەوە پێکەوە گرێبدرێن و دواجاریش ئەم فۆرمانە کاریگەری لەسەر ئێمە دروست دەکەن وەکو مرۆڤگەلێك کە بۆ نەمری *Immortality* لەدایکبووین. فۆرمەکان بەشێوازێکی دواجاری کاریگەری لەسەر ئێمە دادەنێن و لەبەرئەوە شتگەلێکی سادەی بەرژەوەندپارێزنین. ئەو نۆرمانە بۆیە هەن کە بەها تایبەتییەکان و شیاوێتی هەلٌوێستە تایبەتییەکان بپارێزن، نۆرمەکان شوێن ژیانی ئایینی تایبەت دەکەون، ئەم ژیانەش خۆی لە خۆیدا بەڕەهایی جەوهەری و بنەڕەتە بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی درێژە بە بوونی خۆیان بدەن.

لێرەدا شتێکی دیکە هەیە خەلٌکی زۆر کەم سەرنجی دەدەن ئەویش هونەرە *art*. هونەر بواری گشتی دروست کردنی شتەکانە. ووشەی هونەر بە مانا سوونەتییەکەی خۆی لە لاتیندا بەکاردێنم یاخود لە عەرەبیدا وشەی (صنع)، مانای دروستکردنی یاخود خولٌقاندنی شتەکان دەگەیەنێت. خودا هونەرمەندی بالاٌیە، ئەم هێزی خولٌقاندنەشی داوەتە ئێمە. ئەمە بوارێکی زۆر گرنگە بۆ دیالۆگ و لێك تێگەیشتنی نێوان شارستانییەتەکان. هێزی هونەر هەروەها زۆر جار دەتوانێت ماناگەلێك بگوێزێتەوە کە ئاسان نییە بە ووشە لە ڕێگەی دینناسی (ئیلاهیاتناسی *Theology*) یاخود فەلسەفەوە بگوێزرێنەوە.

بە درێژایی کات، کاتێك ڕۆژئاواییەکان دژی ئێران بوون، ئەگەر کەسانێك گویٚ بیستی کۆنسێرتێکی مۆسیقای فارسی ببوونایە، یاخود سەیری پێشانگایەکی وێنەیی فارسییان بکردایە، هەر زوو سەرنجیان ڕادەکێشرا. هونەر دەتوانێت ئەم ئاسانکارییە گەورەمان بۆ بکات لە گواستنەوەی ماناکاندا. بەلاٌم بیرتان نەچیٚ لە شارستانییەتی سوونەتیدا هونەر هەمیشە دەربڕینێکی حەقیقەتەکانی ئایین بووە. ئەمڕۆ هونەری ئایینی هەرگیز ناشێت ئایینی بێت. تەنها بابەتەکەی ئایینییە. لەبەرئەوەشە ئێمە جیاکاری دەکەین لە نێوان هونەری ئایینی *Religiousart* و هونەری موقەدەسدا *Sacred art* بەشێوەیەکی سادە قسە بکەین، هونەری ئایینی هونەرێکە بابەتەکەی (مادەکەی) ئاینییە. هونەری موقەدەس هونەرێکە فۆرمەکانی ڕەنگدانەوەی حەقیقەتە خوداییەکانن، پرنسیپەکانی و سیمبولەکانی بان – تاکین واتە لە سەرووی خودی تاکەوەن *Metaindividual*. لەبەر ئەوەشە من نووسیومە هەندێك لە سرودە یاخود ئاوازە موقەدەسەکانی تەورات (*psalms*)لە سەدەی بیستەمدا کراونەتە موسیقا زۆر ئایینی ترن لە ئاهەنگەکانی خواردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست. هیچ گومانێك لەم بارەیەوە نییە. پەرستگەی سەدەی سیانزدەهەم لە هونەری مەسیحییەوە نزیکترە وەك لە زۆربەی کەنیسەکانی لەندەن و زۆرێك لە شارەکانی دیکە. لەبەرئەوە ئەم دوو جۆرە هونەرە پێویستە

تێکـەڵ نـەکرێن. بـەڵام هونـەری شارسـتانییەتە سـوونەتییەکان هەمیشـە پەیوەنـدی بـە موقـەدەس و دڵـی ئـەو شارسـتانییەتانەوە هـەبووە. تەلارسـازی، شـعر، خـەت خۆشـی، مۆسـیقا، هـەر شارسـتانییەتێك چـەند جـۆرێکی دیـاریکراوی هونـەرەکانی بەرهـەم هێنـاوە، نـەك هـەموو جۆرەکـانی. بـەڵام ئـەم جۆرانـە کلیلێکـی زۆر گـرنگن. بـەڵام بەداخـەوە ئێمە پارادۆکسێکی گەورەی ڕێگری بەرچاومان هەیە لەبەردەم دیالۆگدا.

لـە ڕۆژئـاوای مۆدێرنـدا، هونـەر گرنگییـەکی زۆر زۆری پەیدا کردووە. بۆ زۆرێك لە خەڵکی هونـەر شـوێنی ئـایینی گرتۆتـەوە. ئەگـەر تـۆ سووکایەتی بەناوی مەسیح بکەیت هیچ کەسێك روبەڕوت نابێتەوە. بـەڵام ئەگـەر سوکایەتی بە بەرهـەمێکی کێشـراوی مایکـڵ ئـەنجلۆ بکـەیت، ڕوبـەڕوت دەبنـەوە و لێت قبـوڵ ناکـەن، زۆر بـە سـادەیی پێـت دەڵـێن تـۆ ناشارسـتانیت. بـە سـادەیی بـدوێین: ئەمـە نهـێنی ئـەو تراژیـدیا گەورەیە بوو کە مانگی ڕابردوو لە ئەفغانستان ڕوویدا. ڕژێمی تالیبان لەلایەن وەهابیزمەوە لە نیشتمانی ئیسلامی ڕۆژهەڵاتدا دروست بوو بە یارمـەتی سـوپای پاکسـتانی (هـەرگیز ئـەم فۆرمـەی ئیسـلامم نـەبینیوە)، تالیبـان دەسـتی کـرد بـە خـاپوورکردنی پەیکـەرەکانی بـوزا لـە بانیـان. ئـەم کـارە دژی سـەرجەمی ترادسیۆنی ئیسـلامییە. هـەر لـەو کاتـەدا هەنـدێك شـتم نووسـی و زۆرکەسیش لە بەشی کاروبارەکانی دەرەوەی ولایەتـە یـەکگرتووەکان پەیوەنـدییان پێـوە کـردم. لـە بـاری ئاسایدا نامـەوێت مامەڵـە لەگەڵ سیاسـەتدا بکـەم بـەڵام پەڕەیـەکی بچوکم نووسی ووتم کاتێك عمری کوڕی خەتاب چووە نـاو قودسـەوە، ڕەتـی کـردەوە نوێـژ لـەناو کەنیسەی مەزاری مەسیحدا بکات، بەرماڵەکەی لە دەرەوەی کەنیسـەکەدا ڕاخسـت و نوێژەکـەی کـرد، لەبەرئـەوە هـیچ کـەس لـەناو کەنیسـەکەدا نوێـژی نـەکرد و هـیچ وێنەیـەکی مەسـیحی لەلایەن خەلیفە عمرەوە نەشکێنرا.

بەڵام تالیبان مەبەستی چی بوو؟ ئەوەی لە ڕاستیدا تالیبـان ویسـتی بیکات بـریتی بـوو لـە ئـازاردانی ڕۆژئـاوا لـە بەرامبـەر ئـەو گـەمارۆ ئابوورییـەی خسـتبوویانە سـەر ئەفغانسـتان و چەندان منـداڵی ئـەفغانی گیانیـان لـە دەسـتدا. دەیانزانی ئەگەر سوکایەتی بە مەسیحیەت بکەن هیچ کەسێك نایەتـە وەڵام. بـەڵام تێکشـکاندنی هونـەر هـەموو کەسـێك تـووڕە دەکـات. کاتێـك زیـاتر لـە دە هـەزار منـداڵی ئـەفغانی بـەهۆی گەمارۆی ئابوورییـەوە مـردن لـە برسـاندا، چەند مەقالەیەکی کـەم لـە لاپـەڕەی 55 نیوۆرك تایمزدا بڵاوکرانـەوە. بـەڵام هـەر لەگـەڵ شـکاندنی پەیکـەرەکانی بوزادا لەلاپـەڕەی یەکـەمی هـەموو ڕۆژنامەیـەکی ئنگلیـزی و ئەمریکیـدا هەواڵەکـە بەرچاو کەوت.

ئەمەیە بە کورتی مانای دیالۆگی ئاینی، یا بـابڵێین مانـای هونـەر. بـەڵام بەداخـەوە هونـەر لـەلای زۆرێـك لـە خـەڵکی عادەتـەن شـتێکی بـێ مانایـە و زۆربـەی شـێوەکانی هونـەر ڕێگەیـەکن بەرەو جەهەننەم و بریتین لە دەربڕینی نزمترین جـۆری غـەریزە بـەدەکانی ڕوح. لەگـەڵ ئەوەشـدا هونەر تا ئەوپەڕی شتێکی پیرۆزە. لـەلای زۆرێك لـە خـەڵکی شـوێنی ئـایینی گرتۆتـەوە. ئەگـەر کەسێك دەیـەوێت دیـالۆگ بکـات نـەك لـە نێوان

شارســـتانییەتە ســـوونەتییەکان بـــەڵکو لـــە نێـــوان شارســـتانییەتە ســـوونەتییەکان و ڕۆژئـاوادا, ئـەوا مەسـەلەی هونـەر یەکێکـە لـە گرنگترین مەسەلەکان.

بۆ نموونە ئەمڕۆ ئەمریکا سەرکەوتنی خۆی لـــە هـــەر شارســـتانییەتێکی نـــا ڕۆژئاوایـــدا دەبینێتـەوە ئەگـەر ئـەو شارستانیەتانە گوێ بۆ مۆســـیقای ڕۆك بگـــرن. ئەمـــە یەکێکـــە لـــە نیشانەکانی سـەرکەوتنی کلتوری ئـەمریکی. لە ڕوویەکـەوە ڕاسـت دەکـەن ئەمـە سـەرکەوتنە چونکە ئەمـە جۆرێکـە لـە چوونە نـاو دەروونـی لاوانەوە. هیچ هونەرێك نییە بەبێ پەیام، جا ئەو هونەرە وێنەی کەسێکی پیرۆز یاخود وێنەیـەکی کێشـراوی فارسـی بێـت پـەیامێکیان پێیـە. پەیامەکە لە دوو شارستانییەتدا چوونیەك نین. لـەم دایالۆگـەدا زۆر گرنگـە خـەڵکی لـە یەکـدی تێبگـەن. ئەمـەش کاتێك دەبێـت کـە تـوخمێکی ناوخۆیی هەمان شارستانییەت بێتە بەردەممان. کەسانێکی زۆرهـەن لـە جیهـانی ئیسـلامیدا هیچ تێگەیشـتنێکیان لـە بـارەی کاریگـەری هونـەری ڕۆژئـاواوە نییـە. هـەر لەبـەر ئەوەشـە زۆرێـك مزگـەوتی ناشـیرین لـە جیهـانی ئیسـلامیدا دروست دەکرێن. جارێکیـان وەزیـری پێشـووی ئـەوقافی ئەندۆنیسـیا پێـی ووتم ئامۆژگاریـت بۆمـان چییە لـە بـارەی داهـاتووی ئیسـلام لـە ئەندۆنیسیا. ووتم پـێش هـەموو شتێك مزگەوتـە نیشتمانییەکەت بڕوخێنە کە لەلایەن قەشـەیەکی بەلجیکییـەوە دروسـتکراوەو پاشـان بۆتـە بـێ بـاوەڕ (ملحـد *atheist*). گومـانی تێدانییـە ئـەم مزگەوتـە یەکێکـە لـەو ناشـیرینترین سـێ چـوار بینایـەی جیهـان کـە بـەکاردێن بـۆ خواپەرسـتی.

بۆیـە بـەم شـێوەیەیە چـونکە موسـڵمانان لـە کاریگـەری هونـەر لەسـەر ڕوح تێناگـەن. ئـەم نمونـــە بەرجەســـتانەم خســـتە ڕوو هـــەر لـــە تالیبانـــەوە بـــۆ مزگـــەوت لـــە جاکارتـــا بـــۆ ئەوەی نیشانی بدەم ئەم دایالۆگی نێوان ئاینییە چەند گرنگە.

لە کۆتاییدا دەمـەوێت ئـەو دەرەنجامـە بگـرم بـــە پێچـــەوانەی ئـــەوەی زۆرێـــك لـــە عەلمانیەتگەراکان بەتایبەتی لـە ئەوروپا دەیڵێن گوایـە ئـایین چـیدی پێـی نـەماوەو بـڕ ناکـات. دەمەوێت ئاماژە بە کتێبێك بکەم لەم دواییەدا لە ئـــەمریکا بڵاوکرایـــەوە و بـــوو بـــە مەیـــدانی مشـــتومڕێکی زۆر بـــەناوی "لـــە عەلمانیـــەت کـەوتنی کۆمـەڵگا" *The Desecularisation of society*. نەك بە عەلمانیەتکردنی کۆمەڵگا بەڵکو لە عەلمانیەتکەوتنی کۆمەڵگا. ئەوە پڕۆسەیەکی پێچەوانەییە. لەلایەن بەناوبانگترین کۆمەڵناسی ئەمریکییـەوە نوسـراوە بـەناوی پیتـەر بێرگـەر. یەکێکـە لـە تیۆریسـتە مەزنـەکانی تیۆریـای بـە عەلمانیـەت کـردن یـاخود بـە سـیکۆلار کـردن (*secularization*). ئـەم کتێبـە ژمارەیـەك بابـەتی لێکۆڵـــەرە پلەیەکـــەکانی لـــەخۆ گرتـــووە لەسەرتاســەری جیهانــەوە و بابــەتی پێشــەکی (یەکـەمی) کتێبەکـەش لەلایـەن پیتـەر بێرگـەر خۆیەوە نوسراوە. هەموو ئەم بابەتانە ئەو تێزە نیشان دەدەن کە لە سەرەتاسەری جیهاندا ئایین لـە بەرزبونەوەیـەکی تەسـەورنەکراودایە جگـە لـە ئـــەوروپای ڕۆژئـــاوا. ئـــەوروپای ڕۆژئـــاوا لـــە دەرەوەی بارە گشتییەکەدایە. ئەمریکای باشور، ئەمریکای باکور، جیهانی ئیسلامی، هندستانی هندۆســی، ئاسـیای بـودایی، تەنانـەت چـینی

کۆمیونیستی لەم بارە بەدەر نییە. ئایا کۆنفۆشیانیزم ئەمڕۆ بەهێزترە یاخود سەردەمی ماوتسی تۆنگ. پێم وایە هەموو کەس ئەوە دەزانێت کۆنفۆشیانیزم لە بەرزبوونەوەدایە تەنانەت لە چینی کۆمیۆنیستیدا. لە هندستانی هندۆسیدا، هەموو سیکولاریزمی نەهرو بۆتە مێژوو، هیچ کەس لە بارەیەوە نادوێت. لە جیهانی ئیسلامیدا، تاکە کەسایەتییەك درێژەی کێشابێت و مابێتەوە کەمال ئەتاتورکە، یەکێکە لە کەسایەتیە دژە – ئیسلامییە گەورەکانی سەدەی بیستەم، پێم وانییە مانەوەی زۆر درێژە بکێشێ..

هەموو ئەم شەپۆلی بە سیکولارکردنە (عەلمانیەت کردنە) کە لە سەرەتای یاخود ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا روویدا، بەشێوەیەك لە شێوەکان پێچەوانە دەبێتەوە. کەواتە ئەوەی لەمەوە دەردەکەوێت لە سیکولارکەوتنە. بەلاّم ئەو بیرۆکەیەی خەڵکی هەیانبووەو هێشتا زۆرێك لە مێژوونووسە ئینگلیزی و فەرەنسییەکان هەیانە ئەوەیە کە ئەم بەرزبوونەوەی ئایین تەنها دیاردەیەکی پاشکۆییەو پشتی بەستووە بە هۆکارە کۆمەلاّیەتی و ئابوورییەکان (واتە پاشکۆی ئەم فاکتەرانەیە) و ئایین لە داهاتوودا بە تەواوی لە بیر دەکرێت..

ئەمە تا سەر ئێستا هەڵەیە لانی کەم بۆ داهاتووی پێشبینی کراو..

ئەوانەی خەون دەبینن کە ئێران و میسر دەچنە قۆناغی پاش – ئیسلامییەوە ( *post - islamic*) هەروەکو چۆن ئنگلترا ئێستا پاش – مەسیحییە، خەیاڵ پلاّون. ئەوەی لە ئەوروپادا دەگوزەرێت مەسەلەیەکی زۆر ئاڵۆزە کە من نامەوێت بچمە ناو ئەو مەسەلەوە.

دەگەمە ئەو دەرەنجامەی ئایین لاوازتر نابێت لە جیهاندا. لە ڕاستیدا بەهێزتر دەبێت، هەندێك جاریش لە فۆرمێکی دەمارگیرییانەی داخ هێنەردا. هەر کاتێك شتێك دژایەتی کرا، بەهێزتر دەبێت، ئەگەر کەسێك چڕنوق لە گەدەت بگرێت دەبێت دەستبەجێ ماسولکەکانی گەدەت گرژدەکەیت، ئەوە کاردانەوەیەکە بۆ چڕنوقەکە. لە ئیسلام و هندۆیزم و بودیزمدا لە هەموو جیهاندا بەم شێوەیەیە. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لە دوورەوە سەیر دەکەین گومانی تێدا نییە تەنانەت لە بواری فکر و بواری هونەر، بە سیکولارکردن کە بەردەوامی هەیە ڕوو لە پوکانەوە و لاوازبوون دەکات لەبەرئەوەشە ئەگەر بەنیازن دایالۆگی شارستانی بکەن بێگومان پێویستە ئایین لە چەقی دایالۆگەکەدا بمێنێتەوە بەبێ تێگەیشتن لە ئاین چ لە ڕاستییە گەردونییەکانیدا بێت و چ وەك ئەوەی لای ئێمەیە و ئیسلامیش وەکو کۆمەڵەیەکی سیاسی ئایینی، دایالۆگی شارستانی قەت سەرکەوتوو نابێت.

جیهان بەرەو ئەوە دەڕوات یان هەموومان بەیەکەوە بژین یان بەیەکەوە بمرین. بیرۆکەی چەند بانگەشەکەرێکی کەمی مەسیحی کە گوایە مەسیح دێت و چەند هەزارێکی کەم لە خەڵکی رزگار دەکات و ئەوانی دیکەش مەحکومن بە جەهەننەم، بەزەیی خودایی ئەڵلاّ هەرگیز ڕێگە بەوە نادات. ئێوە

دووچاری جەنگی زیاتر و زیاتر دەبن بەڵام جەنگی جوگرافیانە نا لە نێوان ئەم وڵات و ئەو وڵاتدا بەڵکو جەنگێك لە نێوان ئەوانەی باوەڕ دەهێنن و ئەوانەی باوەڕ ناهێنن. ئەوانەی بنەمای دیدگاکانیان لەسەر خودا دادەنێن و ئەوانەی لەسەر خودا داینانێن و ئەمەش تەشەنە دەکات و دەگاتە ئاستێك کە کاریگەری نوێ تەشەنە دەکاتە ناو رۆژهەڵات و بەشەکەی دیکە بۆ ناو رۆژئاواو ئێستا ئێمە جۆرێك زەمینەی جەنگ بە چاوی خۆمان دەبینین کە خودا دەزانێت لەوانەیە دواهەمین رووداوی مێژووی مرۆییمان بێت. ئەو جەنگەیە نەك بۆ قسە کردن لە بارەی میتافۆرە ئاسایيەکانی تاریکی و رووناکی بەڵکو جەنگێکە لە نێوان کەسانی خاوەن ئیمان *faith* کەسانێك ژیانیان لە ژێر سایەی دیوە بڵندگەراو گەورەکانی حەقیقەتدا بەسەردەبەن و لەگەڵ کەسانێك ئیمانیان نییە.

هەموو شتێکی دیکە پاشکۆیە و ناپەیوەندیدارە..

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

1-*Eastersunday*: جەژنێکی ساڵانەی مەسیحییە لەیەك شەممەیەکی مانگی ئازار یاخود نیساندا، مەسیحیەکان لە یادی زیندوبونەوەی مەسیحدا ئاهەنگ دەگێڕن، هەر لەم رۆژەدا هێلکەی رەنگکراو وەکو دیاری دەدرێتە خەڵکی.

2-ئەم ووتارە ساڵی 2001 پێشکەشکراوە، ئەم ساڵە (2001) بە ساڵی دیالۆگی شارستانی ناوەزەند کراوە.

3-ووشەی *Attitude* بە مانای شێوازی بیرکردنەوەو رەفتار و هەڵوێست و ئامانجی کەسێکە یاخود گروپێکە، کاتێك دەڵێین ئامانج یاخود هەڵوێست مەبەستمان ئامانج یاخود هەڵوێستێکە کە دەرەنجامی شێوازی بیرکردنەوەو تێڕوانینی کەسەکە یاخود گروپەکەیە واتا ئامانج و هەڵوێستێکی مەبدەئییە نەوەکو ڕوکەشی و سیاسیانە.

4-ماوەی ڤیکتۆریا *Victorian period* نێوان ساڵانی 1837-1901 لەم سەردەمەدا شاژن ڤیکتۆریا حکومی هەبووە.

5-خاوەنی تیۆریای هەڵوەشاندنەوەگەرایی فەیلەسوفی فەرەنسی جاك دێریدایە چەند ساڵێك لەمەو پێش کۆچی دوایی کرد.

6-جۆن هیك: یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسوفە ڕیفۆرمستەکانی مەسیحیەت، خاوەنی چەندین کتێبە و زیاتر لەسەر فەلسەفە و عیرفان کاردەکات، ئێستا لە شاری بێرمینگهام دادەنیشێت..

### سەرچاوە

www.nasr.org

ئەم ووتارە لە مانگی حوزەیرانی ساڵی 2001 لە لەندەن پێشکەش کراوە.

# شۆڕشی فەڕەنسا و پێکهاتنی دەوڵەتی نوێ

ڕامین جهانبگلو
لە فارسییەوە: دلاوەر عەبدوڵڵا

مرۆڤـەکان زۆر دەربـارەی ئاینـدەی چـاکتر دەدوێــن و خــەیاڵپلاوی دەکــەن، دەبیــنین وەك شێت بەرەو سەردەمێکی زێڕین هێرش دەبەن، سـەردەمێکی خۆشـبەختی تیایـدا چاوەڕوانیان دەکـات، جیهـان هەنـدێجار پیر و سـەردەمانێك گـەنج دەبێتـەوە، بـەڵام مـرۆڤ هـەردەم هیـوادارە چارەنوسێکی باشتر بەدەستبێنێت.

(شیللەر: امید 1797)

لــە ســاڵی 1789 دا نزیکــەی هەژدەســاڵ بەســەر تەمــەنی "هیگــڵ" دا تێدەپــەڕی. لــەو کاتەدا لە توبینگن نیشتەجێ بوو. لە هەمان ئەو ساڵەدا کتێبەکـەی "شـیللەر" بـە ناونیشـانی (مێـژووی جیهـان چ واتایــەکی هەیــە و بــە چ نییـــــەتێك دەخوێنرێتـــــەوە؟)، بەرهـــــەمێکی "یـــاکوبی" بـــەناوی دەربـــارەی فەلســـەفەی (سـپینۆزا، پـەیام بـۆ مندلسـون) بڵاودەبنـەوە. تـەنها یـەك سـاڵ بەسـەر کتـێبی ڕەخنـە لـە ئــەقڵی پراکتیکانــەی "کانــت" و ئەفرانــدنی سـیمفۆنی "ژوپیتێـر" لەلایـەن "مـۆزارت"ەوە تێدەپەڕی. لەو فەزا کەلتوریەدا بوو، کە ئەڵمانیا بە هەواڵی ڕوخاندنی زیندانی باستیل لە خەو بێدار بووەوە.

ئـەم ڕوداوە لـە مێـژوی مرۆڤایەتیـدا بێوێنـە بوو. هاواری شۆڕش لە هەموو ئەوروپادا دەنگی دایـەوە. بـە گوتـەی "دانتـۆن"، لەگـەڵ روخـانی "باستیل"دا (ئازادی لە جیهانی نوێدا هەڵچوو).

کاتێــك ئــاگر و هــەراو زەنــای شــۆڕش "پــاریس"ی گرتبــۆوە (ئـەڵمانیا)ش خـامۆش نەبوو. دیارە تەنانەت "کانت"یش، کە لە نێوان هاوڵاتیانی شاری (کونیگسبرگ) بە ڕێکخستن و ئەنجامـــدانی کارەکـــان لـــە کـــات و ســـاتی دیـاریکراودا بـەناوبانگ بـوو، پـاش بیسـتنی هەواڵی پەیوەست بە ڕودانی شۆڕش لە فەرەنسا بەرنامـەی ئاسـایی پیاسـەکردنی خـۆی بڕیـوە. ئەویش وەك هـەموو بیریـارانی سـەردەمەکەی لـە ڕودانــی تەقینەوەیــەکی بــەو جــۆرە فراوانــە، سەرســـوورمابوو. سەرســـوڕمانەکەی لـــە ڕوی مێژووییــەوە، کــە بــە بەرچــاویدا تێدەپــەڕی، بەمجۆرە ڕونکردۆتەوە:

"ئەو شۆڕشەی ئەمڕۆژانە گەواهی ڕودانـــین

لەناو گەلێکی لێوان لێو لە هۆش و زیرەکی.. ئارەزوویەکی تارادەی تامەزرۆیی لە نێوان رۆحی هەموو چاودێرانی بێلایەندا دەبزوێنێت"[1]. لە نێو رۆشنبیرانی دیکەی ئەڵمانی کە ستایشی شۆڕشی فەرەنسییان کردووە، دەتوانین ئەم ناوانە بهێنین (فریدریش گوتلیب کلوپشتوك)، کە چەندین غەزەلی بۆ شانازیکردن بە شۆڕشی فەرەنساوە هۆنیوەتەوە، "یوهان گوتلیب فیختە" کە (بە پەرۆش و عیشقێکی مەزنەوە بۆ شۆڕش پەیامێکی لەژێر ناودێری – تێبینی بەمەبەستی راستکردنەوەی داوەری گشتی سەبارەت بە شۆڕشی فەرەنسا نوسی). "فیتخە" لەو کتێبەدا پرسی مافی گەلێك بۆ شۆڕشکردن و سەرەونگونکردنی دەوڵەتێکی زۆردار گەڵاڵە دەکات. فیختە لەم بەرهەمەدا رووداوە مێژووییەکان وەك کۆمەڵێك وێنە کە دەتوانین لێیانەوە فێربین، پیشاندەدات. دەڵێت دەبێت شۆڕشی فەرەنسا بە (وێنەیەکی پرمانا لەم دەقە مەزنە، واتە مافی مرۆڤ و رێزی مرۆڤ) دابنرێت[2]. دیدی "فیختە" بۆ شۆڕش بە گشتی و شۆڕشی فەرەنسا بە تایبەتی شایستەی خوێندنەوەیەکی قوڵترە، بەڵام لێکدانەوەیەکی قوڵتر دەربارەی "فیختە" لە چوارچێوەی کارێکی پەیوەست بە "هیگڵ" نادروستە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بەراوردکردنی هەڵوێستی ئەم دوو فەیلەسوفە لە بە رووداوەکانی پشت (راین) دەکرێت سەرنجڕاکێش بێت. بەرهەمە (شۆڕشگێڕییەکانی) "فیختە" رادەی پەرۆشی و تاسەی لەو رووەوە پیشاندەدات. فیختە لە بیریارە دەگمەنەکانی ئەڵمانیایە کە لەگەڵ دەسپێکردنی قۆناغی "تیرۆر"دا پشتی لە فەرەنسا نەکرد، بەڵام لەگەڵ بەدەسەڵات گەیشتنی "ناپلیون" و پاش داگیرکردنی (پرووس) لە 1806 وتارە بەناوبانگەکانی بڵاوکردەوە، کە لە ژێر ناونیشانی (گوتار بۆ میللەتی ئەڵمان) ستایشی نیشتمانی ئەڵمانی کردووە، کە لە مەترسیدایە، لە نێو ئەو (گوتارانەدا) بانگەواز بۆ یەکگرتنی ئەڵمانیەکان دەکات دژ بە دوژمنی وڵاتەکەیان. (گوتارەکان) نمونەی رۆحیەتێکی ناسیۆنالیستی تەنگ و داخراون و دەرکەوتەیەکی سەیرە لە بیریارێکی وەك "فیختە"وە. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو بیریارە ئەڵمانیەکان هاوبەش و هاورای "فیختە"و هاوڵاتیەکانی دیکەیان نەبوون لە هەستی نەتەوە پەرستی ئەڵمانیدا. "هیگڵ" چ لە رووی هەڵوێستیەوە لە شۆڕشی فەرەنسی و چ لە رووی ئەو شێوازەوە کە مامەڵە لەگەڵ ئەو دیاردە مێژووییە لە چوارچێوەی فەلسەفەکەیدا دەکات، دەکرێت لە نێوان سەردەمەکەیدا بە تایبەت – لە زۆر رووەوە وەك نمونە – سەیر بکرێت. پێویست بە گوتن ناکات کە کاریگەری راستەوخۆی سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسا لەسەر (هیگڵ)ی لاو بێوێنە بوو. دەنگدانەوەی هاوارەکانی خەڵکی پاریس لە نێو لێدانەکانی دڵی فەیلەسوفی لاودا دەبیسترا. ئەو رووخانی (باستیل)ی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا – لەوانە هۆلدرلین و شلینگ – کردە جەژن. (هیگڵ) و (شلینگ) وەك نیشانەی (دووبارە بەدەستهێنانەوەی ئازادی) درەختێکیان چاند. ئەم هزرو ئایدیالەی ئازادی لەوەو دواش لە رۆحی (هیگڵ) نەبۆوە.

بۆ (هیگڵ) سەرچاوەکانی ئەم ئایدیاله هەم لە شاری ئەسینادا هەبوەو هەم لە رۆحی شۆڕشی فەرەنسادا. سەبارەت بە کاریگەری یۆنانی کۆن لەسەر (هیگڵ) لەگەڵ (ئارنست بلوخ)دا هاوڕا دەبینەوە کە دەڵێت: (یۆنان لە دیدی – هیگڵ – دا هەمان یۆنانی لاوی لەدەستچووە، یۆنانی هاولاّتی، یۆنانی درێژکراوەی ئاپۆلۆنی[3]). بە گوتەی (هیگڵ) لە یۆناندا تاکەکان ئازادبوون، (بەلاّم ئەو ئازادییە هێشتا بە رادەی ئەو ئەبستراکیە نەگەیشتبوو کە هزری تاك بە تەواوی وابەستە بە جەوهەری حوکم بێت) واتە بە پێکهاتنی (دەوڵەت وەك دەوڵەت)[4]. بە بڕوای (هیگڵ) هاولاّتی یۆنانی پەیوەندی بە (دەوڵەتی ئەبستراکتەوە) نەبووە، هاولاّتی یۆنانی بەهیچ کلۆجێك (دەوڵەتی ئەبستراکتی) نەناسیوە. ئەوەی لە یۆنانی کۆندا جێگای (دەوڵەت)ی دەگرتەوە چەمکی نیشتمان بوو. نیشتمان بۆ یۆنانیەکان شتێکی پیرۆز بوو. بە وتەی "هیگڵ" یۆنانی بەبێ نیشتمان، هۆیەکی دی بۆ ژیان نەدەدۆزیەوە. لەیۆنانی دێریندا چەمکی نیشتمان دەیتوانی تەنانەت بە شارێکی وەك ئەسیناش سنوردار بێت. بەمپێیە شاری ئەسینا نمونەی دەوڵەتێکی کامڵ بوو. لە راستیدا لە دیدی "هیگڵ" ەوە ئەم تێڕوانینە ئەخلاقیە بۆ ژیان بوو، کە بەردەوامی و مانەوەی دیموکراسی مومکین دەکرد، چونکە لە دیموکراسیدا پرنسیپی سەرەکی ئەوەیە کە کەسایەتی هاولاّتی یەکپارچە و لە هەمان کاتیشدا فۆرمگیر و دینامیکی بێت، دەبێت لە هەموو بڕیار وەرگرتندا، نەك تەنها بەڕادان بەڵکو لە پراکتیکیشدا بەشدار بێت)[5].

ئەو شتەی لێرەدا "هیگڵ" بە بنچینەی دادەنێت پرسی (جیهانی گوتارە). گوتاری ئەسینایی، گوتارێکی کراوەو راستەوخۆیە. مەرجی بونی ژینگەی کۆمەلاّیەتی یۆنانی، واتە (ئاگورە *Agora*)، هەمان ئەو گوتارەیە – کە بە یۆنانی بە لۆگۆس – *Logos* – ناو دەبرێت. ریشەی دیموکراسی ئەسینایی بەو (لۆگۆس)ەدا یان بە گوتاردا رۆچووە. لێرەدا (هیگڵ) دوو جیهانی (گوتار) و (نوسراو) لە بەرامبەر یەکدا دادەنێت، دروست وەك ئەوەی دوورترین پشتی، واتە ئەفلاتۆن، لە نامەی (فایدرۆس)دا دەڵێت:

(کەسێك لەو باوەڕەدا بێت دەتوانێت بەهۆی پیتەوە هونەرەکەی بۆ کەسێکی دیکە بگوازێتەوە، هەروەها کەسێك لەو باوەڕەدا بێت دەتوانێت لەم نوسراوانە زانستێکی رون و دروست بەدەست بێنێت، لە راستیدا زۆر ساویلکەیە..) هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا بەمجۆرە دەڵێت: هەر کەس خاوەنی زانستی پەیوەست بە عەدالەت و ستاتیکا و چاکە بێت، ناتوانێت هزرەکانی لە (ئاوێکی رەندا) دابنێت پاشان بەهۆی قەڵەم یان بەکارهێنانی وشەی سست و لاوازەوە، ئەو وشانەی ناتوانن بە دروستی حەقیقەت فێربکەن، بیەوێت بلاّویان بکاتەوە[6].

ئەفلاّتون ئەگەری فێرکاری بەهۆی نوسراوەوە رەتدەکاتەوە و "هیگڵ"یش نوسراوەکانی دەربارەی دیموکراسی دەخاتە بەر رەخنە. رەشبینی "هیگڵ" بەرامبەر بە دیموکراسی نوسراو (واتە بازنەی کاری سیاسەتی ناڕاستەوخۆ) لە بەرامبەر

دیموکراسی گوفتاری (واتە بازنەی کاری سیاسەتی ڕاستەوخۆ) دەبێتە هۆی ڕەتدانەوەی بنەمای جیهانێك کە گرفتاری بیوکراسی بووە. (جیهانی کاغەزبازی) بە گوتەی "هیگڵ" (جیهانێکی مردووە)[7]. پەیوەندی نێوان ئەندامانی شار بە بەشداریکردنی هێزی سێیەم پراکتیکانە دەبێت. ئەم هێزەی سێیەم دەوڵەتە)، دیارە بە واتا "هیگڵ"ێکە نا. چونکە بە بڕوای هیگڵ (دەوڵەت) پیشاندەری دوایین قۆناغی بەدیهاتنی (ئەقڵ)ە بەهۆی ئەقڵ و لە پێناوی ئەقڵدا و بەدیهێنەری (ژیانی ئەقڵانی ئازادی خود و ئاگا)یە بە هەمان وێنەی کە دوابەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا لە مێژودا دەرکەوتووە. یەکێك لە تایبەتییەکانی دەوڵەتی لەو جۆرە (دامەزراندنی یەکێتی میللی وڵاتە لەسەر بنچینە واژوکردنی سیستمی خانەدان و زنجیرەی پلەداری ئیمتیازاتی فیودالی)[8].

دەتوانین بڵێین دەستکەوتەکانی شۆڕشی فەڕەنسا کاملبونی یەکێتی نەتەوەیی وڵات بوو. یەکێتییەك کە لە پێش شۆڕشدا لەلایەن ڕژێمی سەڵتەنەتەوە بە جۆرێکی ناتەواو و پلە بە پلە فۆرمگیر ببوو. (ڕژێمی رابردوو)توانیبوی بەهۆی دامەزراندنی سیستمێکی ئیداری ڕاگیر لەسەر زنجیرە پلە پۆست و نایەکسانی، قەڵەمڕەوی خاکی وڵات دیاری بکات. بە پێچەوانەوە (شۆڕش) ئەم زنجیرەیەی ئاوەژوو کردەوە. بەو پێیە دەبوو هەموو فەرەنسیەکان ئازاد و لە بەرامبەر یاسادا یەکسان بن، پاش دامەزراندنی ماف نوێ، گەلی نوێ پێکهات. شۆڕشگێڕانی ساڵی 1789 هەوڵیاندەدا تا بە پشتبەستن پرنسیپی ماف سروشتی و ئاسایی، خەسڵەتێکی گشتی و جیهانی بە بەری شۆڕشی فەرەنسادا بکەن. ئەوانە لەو باوەڕەدا بوون بە ئەنجامدانی ئەو کارە لە بەدەستهێنانی مافەکانیاندا لە چاو شۆڕشگێڕانی ئینگلیزی ساڵی 1688 و شۆڕشگێڕانی ئەمریکای ساڵی 1776 هەنگاوێکی بەرەو پێشتر هەڵدەنێن. (بەیاننامەی ماف مرۆڤ و هاولاتی)ش بەم ڕۆحیەتەوە داڕێژرا.

ئەگەرچی دەکرێت ڕەسەنایەتی ڕاستەقینەی دەستکەوتەکانی شۆڕشی ئینگلیز و ئەمریکا، لە بەرهەمەکانی فەیلەسوفان و سیاسەتمەدارانی وەك (ژان لاك، بنیامین فرانکلین، تۆماس جیفرسۆن، تۆماس پین) دابنرێت، بەلام شۆڕشی فەرەنسا ڕەهەندێکی زۆر گشتیتر و جیهانیتری بەخۆوە گرت. شۆڕشی گەورەی فەرەنسا، دابڕانێکی مەزن بوو لە جیهانی کۆن. ئەم شۆڕشە دوا دەرئەنجامی چەندین سەدە بیرکردنەوەو کۆشش بوو لە پێناوی گێڕانەوەی ئازادی بۆ مرۆڤ لە جیهانی کۆمەلایەتیدا. ئەم کارەش بەبێ کۆمەکی شۆڕشەکانی ئینگلستان و ئەمریکا مەیسەر نەدەبوو، کە زەمینەی یاریدەدەر و ساتی گونجاویان بۆ تەقینەوەی کۆمەڵگەی فەرەنسی ڕەخساند.

بۆنمونە، (ژان لاك) کە لە بیرکردنەوەی سەدەی هەژدەدا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە، یەکێکە لە ئەستونگەکانی بیرکردنەوەی سیاسی نوێ، ئەو (شۆڕشی ساڵی 1688ی بە پشتبەستن بە پرنسیپەکانی ماف سروشتی پاساودایەوە)[9].

**کورتەکەشی ئەمەیە:**

کۆمەڵگە، کەلە پێناوی پارێزگاری لەئازادی تاك پێکهێنراوە، لەسەر بناغەی ڕێکەوتنی ئازادی نێوان هاوڵاتیان راوەستاوە. هەروەها بنچینەی دەسەلأتداریتی حکومەتیش ڕێکەوتنێکە لە نێوان خەڵك، کە سەرچاوەی سەرەکی دەسەلأتن و لەگەڵ نوێنەرەکانیان کە نابێت سوود لە دەسەلأتیان بۆ مەبەستی بێجگە لە پاراستنی حورمەتی ئەو مافە نەنووسراوانەی لەلایەن خواوەندی مەزنەوە بەتاك بەخشراوە، بەکاربهێنن[10].

لێرەدا دەبینین کە چۆن هزری (لاك) لەگەڵ هزری ئەوەی پێش خۆی، واتە (هۆبز) و ئەوەی پاش خۆی (ڕۆسۆ) نزیکە. "لاك" دروست وەك (هوبز) پرسی ئازادی لە دۆخی سروشتیدا دەخاتە ڕوو، هەروەك ئەویش دوو پرنسیپی (پەیمان) و (دەسەلأتی سیاسی) پەسەند دەکات. (پەیمان) بە بڕوای هەردوو بیریار، "پەیمان" بریتیە لە ڕێکەوتنێك کە لەسەر بناغەی ملکەچی تاك بۆ دەسەلأت راوەستاوە, جا ئەو دەسەلأتە (سوڵتان) بێت (لە دیدی هوبز) ەوە یان خواوەند لە (دیدی لاك)ەوە.

لەگەڵ "ڕۆسۆ"دا تیۆری نوێی ماف سروشتی پێی نایە قۆناغێکی تازەوە. (ڕۆسۆ) لە جیاتی یاسای سروشتی یاسای ئەقڵ دادەنێت، کە تیۆری (ئیرادەی گشتی) دەربڕیەتی. لەبەرئەوە لە دیدی "ڕۆسۆ"ەوە (پەیمانی کۆمەڵایەتی) بەهیچ کلۆجێك پەیمانی ملکەچی نییە، بەڵکو پەیمانێکە بۆ (هاوبەشیکردن)ی تاکەکان و (هاوکاری) نێوانیان لە کۆمەڵگەدا. بەمجۆرە تاکی سەر بە کۆمەڵگەی مەدەنی پەیڕەوی لە کەس ناکات تەنها لە ئیرادەی گشتی نەبێت، کە بەرئەنجامی کۆی ئیرادەی تاکەکانە. بەمجۆرە مافەکانی تاك تەواو تەندروست و توند و تۆڵ دەمێنێتەوە، چونکە لە راستیدا بە پەیڕەویکردنی لە ئیرادەی گشتی تەنها پەیڕەوی کردنە لە خۆی:

کاتێك هەموو خەڵکی دەربارەی هەموو خەڵك بڕیار دەدەن تەنها خۆیان مەبەستە و ئەو پەیوەندییەی لەو دەمەدا دێتە ئاراوە پەیوەندییەکی فرەلایەنی یەك بابەتە، بەبێئەوەی گشتێتی ئەو تاکە بابەتە دوچاری دابڕان و دابەشبون بێت. کەواتە بابەتی بڕیار و حوکمدان وەك ئەو ئیرادەیەی حوکمڕانی دەکات ڕەهەندێکی گشتی و کۆی هەیە، ئەمە ئەو کردارەیە من بە یاسا ناوی دەبەم[11].

پاش چەند ساڵ پرنسیپی شەشەمی (بەیاننامەی ماف مرۆڤ و هاوڵاتی) ئەوە ئاشکرا دەکات کە (یاسا ڕاگەیانراوی ئیرادەی گشتییە). شۆڕشی فەرەنسا نەك تەنها خوازیاری چاودێری ماف مرۆڤ بوو، بەڵکوو بەرگی پراکتیك کردنی ئەو مافەشی پۆشی. دوو چەمکی (ئازادی) و (یەکسانی) بنەمای یاسایی شۆڕشی فەرەنسا. پێك دێنن. تاك چیدی لە ڕێگای خۆڕسکی و سروشتەوە پێناسە نەدەکرا، بەڵکو بەبونی یاسا و یەکسانبونی لە بەرانبەریدا "پێگەیەکی کۆمەڵایەتی – سیاسی" بەدەست دەهێنا. بەمجۆرە لەوەودوا ئیدی ئازادی و یەکسانی لە حوکمی خەون و ئارەزوە دورەدەستەکاندا نەبون، بەڵکو مافگەلێکن بە ئێمە بەخشران، مافگەلێك کە بە گشتی لە مرۆڤ جیانابێتەوە[12].

(بەیاننامـــەی مـــافی مـــرۆڤ) دەبێـــت بـــە (بڵاوکراوەی یاساکان). بەپێی ئەم بڵاوکراوەیە هـــەموو کەســـێك لـــە مافـــەکانی بـــە ئاگایـــە. هەرئەوەنـدەی کـە مافـەکانی تـاك بـە هـۆی ئـەم یاسایانەوە داڕێژرابوو پێویست بوو بونیادێکی یاسـایی بـۆ ئـەم یاسـایانە پەیـدا بکرێـت. لـەو ڕووەوە دەبوو نەك تەنها ئەحکام بۆ دیاریکردنی پەیوەنـدی نێـوان تاکـەکان دابنرێـت، بـەڵکو پەیوەندی نێوان تاك و دەوڵەتیش ڕونبکرێتەوە.

کەواتـــە پرســـەکە بـــریتی بـــوو لـــە دەســـتەبەرکردنی (مـافی گشـتی) و پێکهێنـانی دەوڵـەت لەسـەر بنـەمای پرنسـیپە خۆڕسکەکان. دەوڵـەتێك هیچـی نـەبێت کـە نـەتوانێت لـەو مافانەوە بەرهەم بهێنرێت، هیچ پەیوەندییەکیش لـە نێـوان بونـەوەرانی مرۆڤـدا نـەبێت کـە نـەتوانرێت بگەڕێتـەوە سـەری، هـیچ بابـەتێکی دەربـارەی بـون تێدانـەبێت، کـە نـەتوانرێت لـە یەکێك لە پرنسیپەکانیەوە هەڵنەهێنجرێت[13].

کەواتـە مـافی یاسـادانان پەیوەنـدی بـە کێـوە هەیـە؟ بەنـدی بیسـت و پێنجـەمی (ڕاگەیـەنراوی مـافی مـرۆڤ و هـاوڵاتی) دەڵێـت: خـەڵکی مـافی یاسـادانانیان هەیـە. (خـەڵکی) کـێن؟ خـەڵکی میللەتـە، کۆمەڵگایـە، یاسایە. بـە کورتی خـەڵك دەوڵەتە. بەمشێوەیە ئێمە لـە دروستبوونی مافی خۆڕسکیەوە دەگەینـە دامەزراندنی مافی دانراو، چـــونکە بـــە هـــەمان شـــێوەی "ســـیس" لـــە کتێبەکەیـدا بـە نـاوی – چینی سێیەم کێیـە؟ دا دەڵێت: (نەتـەوە تـەنها لەگـەڵ مـافی خۆڕسـکیدا پێکـدێت، لـە بارێکـدا حکومـەت بـە پێچـەوانەوە تەنها وابەستەی یاسا دانراوەکانە)[14]. بەمجۆرە پرنســـیپی حـــوکمڕانێتی خـــەڵك بـــە تیـــۆری دەســـەڵاتی بـــێ ســـێ و دووی دەوڵـــەت کۆتـــایی دێـت. لـە دیـدی شۆڕشـگێڕەکانی سـاڵی 1789 وە پرســـەکە نـــەك تـــەنها دیـــاریکردنی ڕوتـــی بونیـادی مـاف بـۆ کۆمـەڵگای نـوێ بـوو، بـەڵکو دۆزینـەوەی مەرجـەعێکی سیاسـیش بـوو بـۆ پاراستنی ئەو مافانە. لەبەرئەوەیە کە (شۆڕش بـە پێویسـتی دەزانێـت نابێـت هـیچ شـتێك لـە ژیـانی دەوڵەتـدا هـەبێت کـە بنـەمای یاسـایی نـــەبێت. شـــۆڕش بـــە پەســـەندکردنی دیـــدی مۆنتیسـکۆ سـەبارەت بـە پێکهاتـەی ئامانجداری دەوڵـەت، وەڵامدانـەوەی خواسـتە یاساییەکانی کردوە بە ئامانجی کۆمەڵگای نوێ)[15].

بەمپێیـە ئامـانجی شۆڕشـی مـەزنی فەرەنسا دروستبوونی دەوڵەتی نوێیە. شۆڕشی فەرەنسا دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی دەوڵـەت. کـە زامنـی مافـە بەدەسـتهێنراوەکان دەکـات. بـە واتایـەکی دیکـە دەوڵـــەت هێزێکـــە پاســـەوانی لـــە مافـــە گشـــــتیەکان دەکـــــات. بەنـــــدی دوانـــــزەی (ڕاگەیـەنراوی مافـەکانی مـرۆڤ و هـاوڵاتی)ش بەباشی ئەوە ڕوندەکاتەوە:

(زامنکردنی مافی مرۆڤ و هاوڵاتی پێویستی بە هێزێکـی گشـتی هەیـە، کەواتـە ئـەم هێـزە بـۆ سـودی گشـتی دروسـت دەبێـت نـەك بـۆ سـودی تایبـــەتی ئـــەو کەســـانەی کـــە ئـــەم هێـــزە لـــە ئەستۆیان دەنرێت)[16].

لێرەوە دەوڵەت هەمەکیەکە (کلی)، کە (مافی) تەندروسـت بـە بەشـەکانی (اجـزاو) دەدات و پارێزگاریـان لێـدەکات، بەشـەکانیش ژیـان بـەو هەمەکیە دەبەخشن، چونکە بەشە واقعیەکانیان تـەنها لـەو هەمەکیـەدا دەبیننـەوە. کەواتـە هەمـەکی، حەقیقەتـە، لەلایـەکی دیکـەوە ئەگـەر

کاری فەلسەفە ناساندنی "هەمەکی"ە، کەواتە بەو شێوەیەی "هیگڵ" دەڵێت (زانستی ماف بەشێکە لە فەلسەفە). لەبەرئەوە هزرەکانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا لەناو سەنتەری (بنەماکانی فەلسەفەی ماف)ی "هیگڵ" دان دەتوانرێت تیۆری سیاسی (هیگڵ) لە هەمان کاتدا بە جۆرێك لێکدانەوەو هەم بە جۆرێك رەخنە گرتن لە شۆڕشی فەرەنسا دابنرێت. گۆڕانی شۆڕشی فەرەنسا بۆ بە دەزگایبوونی ئەقڵانی دەوڵەت لە کۆمەڵگادا، واتە بە ئەقڵانی بونی واقیع، ئەو توانایە بە "هیگڵ" دەدات تا پرنسیپی لە پێشبونی (ئەقڵ) بەسەر واقیعدا بێنێتە پێشێ. سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسا هەم هەوڵێك بوو لە پێناوی بەدیهێنانی چوارچێوەیەکی نوێی کۆمەڵایەتی – سیاسی و هەم پراکتیك کردنی ئەو هزرانەشی، کە "هیگڵ" لە سیستمی فەلسەفەکەیدا باسیان دەکات.

بەمپێیە پێدەچێت کە بیرکردنەوەی "هیگڵ"ی هەوڵێکی تیوریە بۆ تۆمارکردنی میراتی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا لە قاڵبی سیستمێکی هزریدا، دواجار (ململانێی مرۆڤایەتی لە ڕوبەڕوبوونەوەی لەگەڵ سروشت و ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەی کە هەیە لەمەودوا گەشەکردنی مەعریفە ڕابەرایەتی دەکات، واتە جیهان بۆ سیستمی (ئەقڵ) دەگۆڕێت(17).

## پەراوێزەکان

1-G. W. F. Hegel: Science de la logique, torne l, traduction p.J. Labarriere et Gwendoline Jarczyk, Paris, Aubier Montaigne 1972 p. 43.

2- G. W. F. Hegel: Morceaur choisis l, traduction H. Lefebvre et N Gulerman, paris, Gallimard 1939, p. 41.

3- G. W. F. Hegel: Propedeurique philosophique, traduction de Maurice de Ganditlac, Paris, Gonthier 1963, p. 177.

4- G. W. F. Hegel: Lencyclopedie des sciences philosophiques (1830), traduction de Maurice de Gandillac, Paris, Gallimard 1970, $574, p, 499.

5-Ibid, Iavant – propos, p. 16.

6-Ibid, $ 14, p.87.

7-E. Weil: Essais et conferences, tome I, paris, Plon 1970, p. 136.

8- G. W. F. Hegel:op. cit., p, 453.

9-E. Weil: op, cit., p. 145 et 146.

10- G. W. F. Hegel: principes de la philosophie du droit, traduction de Robert Derathe, Paris, Vrin 1975, p. 349.

11-Ibid, la preface, p. 59.

12-Jean Hyppolite: Genese et structure de la phenomenologie de lespric de Hegel, Paris, Aubier montaigne 1946, p. 438.

13- G. W. F. Hegel: La phenomenologie de Iesprit, tome II, Paris, Aubier Montaigne 1941, p. 170.

14-Ibid, p. 136.

15-Ibid, p. 136.

16- G. W. F. Hegel: principes de la philosophie du droit, traduction de Robert derathe, paris, Vrin 1975, p. 126.

17-J. Habermas: Theorie et pratique, tome I, Paris, Payot, p. 157.

## سەرچاوە:


هگل و سیاست مدرن، رامین جهانبگلو، فصل دوم (انقلاب فرانسه و تشکیل دولت نوین). ص 35-44.

SARDAM No. 47&48 2006

# ئەفسانەكان لە جیهانی مۆدێرندا

مێرسیا ئەلیاد

لە عەرەبییەوە: محەمەد حسێن

**لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەماندا ئەپرسین، ئەفسانە لە حەقیقەتی خۆیدا چییە؟**

بە گوێرەی ئەو زمانەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا داهێنرا، ئەفسانە بریتیە لە هەموو ئەو شتانەی بە واقع ناكۆكە. هەموو ئەوانەی لەسەر مرۆڤ ئەوترێت بەشێوەیەكی چاوەڕواننەكراو، یان نەبینراو بە ئەفسانە دائەنرێت. مێژووی ئەو جیهانەی وا خێڵەكانی زولو[1] نەوەكانی ئەو خوداوەندانەی كە وا هزیۆد[2] قسەی لە بارەیانەوە ئەكرد، ئەگەڕێتەوە بۆ بواری ئەفسانە.

ئەمە بەشی زۆری ئەو قسانەیە كە لەلایەن ئەوانەوە ئەكرێت وا خاوەنی ڕێبازی ئیشراقن[3]، یان ڕێبازی پۆزەتیڤیزم[4] كە بونیادو پێكهاتێكی مەسیحیانەی هەیە. هەر بۆیە بەلای مەسیحیەتی سەرەتاییەوە هەر كردەو ڕوداوێك پاساو و دانپیانانی خۆی لە تەورات و ئینجیلدا نەدۆزێتەوە ئەوا هەڵبەستراوو بوختانە، یاخود بریتیە لە خەیاڵبازی و وەهم. بەلاّم لێكۆڵینەوەكانی زانایانی ڕەگەزی مرۆیی ناچاری كردین چاو بەو كەلەپورەدا بخشێنینەوە كە لە دەلالەت و مانا ئەفسانەییەكانەوە وەرمان گرتبوو. ئەوش بریتی بوو لە پاشماوەكانی ئەو هێرشە توندەی وا مەسیحیەت دژ بە جیهانی كۆنی بێبڕوایی بەرپای كردبوو.

دواجار ویستمان لە بەهای ئەفسانە تێبگەین‌و بیناسین وەك ئەوەی لای كۆمەڵگا سەرەتاییەكان هەبووە. یان ئەو نەتەوانەی لەسەردەمە كۆنەكاندا ژیاون، مەبەست لەو كۆمەڵگا مرۆییانەی ئەفسانە لەلایان بناغەیەك بووە بۆ ژیانی كلتوری و كۆمەلاّیەتیان. بەلاّم هەر لە سەرەتاوە مەسەلەیەك هەیە زۆر سەرنجمان ڕائەكێشێت كە بەم جۆرە باسی ئەكەین:

لەو كۆمەڵگانەدا وەها پێویست بووە ئەفسانە تەعبیر لە حەقیقەتێكی ڕەها بكات، چونكە مێژوویەكی پیرۆزی بۆ ئەگێڕاینەوە، یان

پەیامێکی بۆ ئاشکرا ئەکردین سنوری مرۆڤی تێئەپەڕانــــد و ئەگەڕایــــەوە بۆبەربــــەیانی ســەردەمێکی مــەزن، کــە ســەردەمی ســەرەتا پیرۆزەکانــە (هــەمان ســەردەمی کــۆن)[5]. ئـیتر لەبەرئـەوەی ئەفسـانە واقعـی و پیرۆزیـش بـوو، کرایە نمونەیەك و بوو بە پێشڕەوێك و هەمیشە دووبـارە ئەکرایــەوە، پاسـاوی بـۆ هــەموو ئــەو کردەوانە ئەهێنایەوە کە مرۆڤ ئەنجامی ئەدا. بە مانایــەکی تــر ئەفســانە دەلالــەت لــەو مێــژووە ڕاستەقینە ئەکات کە ڕوداوەکانی لە سەرەتای زەمەنەوە ڕوی‌داوە و دەکرێت وەك نمونەیەك بۆ ڕەفتـاری مـرۆڤ وەربیگـرین. مـرۆڤ لـە کۆمـەڵگا دێرینەکانــــدا بەلاســــایی کردنــــەوەی کــــارە نمونەیــەکانی خوداوەنـدێك، یــان پاڵــەوانێکی ئەفسانەیی، یـان کاتێـك سـەرەڕۆییەکانی خـۆی ئەگێڕێتەوە خۆی لە زەمەنی جیهانی دائەبڕێت، زەمــەنێك کــە بەتاڵــە لــە پــیرۆزی، هــەر بۆیــە بەشێوەیەکی جادووگەرانە خـۆی گرێئـەدات بـە زەمەنی مەزنەوە کە زەمەنی پیرۆزە.

وەك ئــــەوەی کــــە دەبیــــنین مەســــەلەکە وەرگــــەڕانێکی گشــــتگیر دروســــت ئــــەکات لــــە بەهاکاندا. لە کاتێکدا کە زمانی باو تێکەڵی لە نێـوان ئەفسـانەو وەهـم و خەیاڵبازیـدا ئـەکات، ئـەوا تـەواو بـە پێچـەوانەوە مرۆڤـی کۆمـەڵگا کۆنەکان ئەو تەنها ئاماژەیان تیا بەدی ئەکرد کە ڕاست بێت بۆ شیکردنەوەی واقع.

زۆر دوانەکـەوتین لـە پوختـە کردنـەوەی ئـەم ئەنجامانــەی لــەو دۆزینەوانــەوە وەرمــانگرت، دواتــر بەشــێوەیەکی پلەبەنــد بــە ســوری و پێـداگیری نەماینـەوە لەسـەر ئـەو بۆچـونەی کـە پێـی وایـە ئەفسانە قسـە لەسـەر دۆزە مـەحاڵ و ئاسـتەمەکان ئـەکات، یـان ئەوانـەی لـە واقعـەوە دورن. ئێمـە هـەر بـەو بۆچـونەوە وەسـتاین کـە ئەڵێت ئەفسانە ڕەوتێکی بیرکردنەوە پێك دێنێت جیـاوازە لـە بیرکردنـەوەی خۆمـان. بـە هـەرحاڵ نابێــت حــوکمی پێشــوەختی لەســەر بــدەین و نابێــت وەهــا هەڵســوکەوتی لەگــەڵ بکــەین وەك ئــەوەی لادان و ناوێزەییــە. بــەڵکو دورتــر لەمــە ڕۆیشـتین، هەوڵمانـدا ئەفسـانە بهێنینــە ڕیــزی مێژووی گشتی فکری مرۆڤایەتیەوە، بەو پێیەی کــە شــێوازێکی زۆر ڕاســتگۆی گوزارشــکەری هــزری بــە کۆمەڵــە. هــەر بۆیــە هــزری کۆمەڵــەیی کەڵەکــــەبوی هــــەڵگیراو قــــەت بــــە تــــەواوی ناســــــڕێتەوە لــــــە کۆمــــــەڵگادا، چــــــەندە پێشـکەوتوویش بێـت ئـەو کۆمەڵگایـە — ئەمـە ئـەوەمان بیرئەخاتـەوە کـە جیهـانی مـۆدێرن تـا ئێســتایش بەشــێك لــە ڕەوتــی هەڵســوکەوتی ئەفسـانەیی تیـا ماوەتـەوە. بـۆ نمونـە ئـەبینین خــــەڵکی کۆمــــەڵگای مــــۆدێرن بەشــــداری هەنـدێك سـیمبوڵی ئەفسـانەیی ئەکـەن کـە وەك بەشـێك لـە پاشماوەکـانی سـەردەمە کۆنـەکان تەماشا ئەکرێت.

ئـەتوانین ئـەوە بسـەلمێنین کـە ئـەرکی ئـالأی نیشــــتمانی لەگــــەڵ ئــــەو هــــەموو ئەزمونــــە هەسـتیانەی لـە خـۆی گرتـووە، بـەهیچ جۆرێـك جیـاواز نییــە لــەو سـیمبولانەی لــە کۆمــەڵگا کۆنەکانـدا بەکارئـەهێنرا. بـەم جـۆرە بـەرەو ئـەو بۆچـونە ئـەڕۆین کـە ئـەڵێت مەسـەلەی بـەردەوام بوون لە نێوان جیهانی کۆن و جیهـانی مۆدێرنـدا مەسـەلەی بـەرباس نیـە لەسـەر ئاسـتی ژیـانی کۆمەلأیەتی، لە کاتێکدا جیاوازی گەورەی نێوان کـۆن و تـازە لـەلای زۆرینـەی ئـەو هاولأتیانـەی

کۆمەڵگای مۆدێرن پێك دێنن لە بیرکردنەوەی تایبەتیاندایە، لە کاتێکدا ئەم جۆرە بیرکردنەوە نائامادە و تاڕادەیەکیش سنوردار بوو لای خەڵکی کۆمەڵگا نەریتی و پێشینیەکان.

لێرەدا نامانەوێت هزری کۆمەڵەیی و ئەو بۆچوونانەی دەربارەی هەیە نیشان دەین، کێشەکە زۆر لەوە خاکی تر و سادەترە. بەم جۆرە ڕونی ئەکەینەوە: کە ئەفسانە داهێنانێکی بێناوەڕۆك نیە و لادانێك نیە لە واقعیەتی مەئلوفی مرۆڤی سەرەتایی، بەڵکو گوزارش لە شێوازێکی ژیان ئەکات لە جیهاندا. ئەتوانین لە بارەی ئەو چارەنوسە بپرسینەوە کەوا ئەفسانەکان لە جیهانی مۆدێرندا توشی هاتن؟ یان وردتر بڵێین ئەو شوێنگە گرنگەی ئەفسانە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا هەیبوو ئێستا بەچی پڕکراوەتەوە؟

بێگومان هەندێك بەشداری لە جیهانی ئەفسانەکان و سیمبوڵە کۆمەڵەییەکاندا، تا ئێستا لە جیهانی مۆدێرندا هەر کاری خۆی ئەکات. بەڵام ئەو ڕۆڵە سەنتراڵەی نەماوە کە ئەفسانە لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا هەیبوو. کۆمەڵگای مۆدێرن گەر بەراوردی بکەین بە کۆمەڵگای سەردەمە دێرینەکان وا دەرئەکەوێت بەتاڵە لە ئەفسانە. زیاتر لەمەیش هەندێك لە لێکۆڵیارەکان سورن لەسەر ئەوەی کەوا ئەو دڵەڕاوکێ و کەشتەنگیەی (ضیق) کۆمەڵگای مۆدێرنی گرتۆتەوە، هەموو ئەو قەیرانانەی توشی دێت، دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەفسانەیەکی تایبەت بە خۆیان.

ئەو کاتەی "کارل یۆنگ" یەکێك لە کتێبەکانی ناونا "مرۆڤی هەوڵدەر بۆ دۆزینەوەی خودی خۆی" مەبەستی ئەوە بوو جیهانی مۆدێرن – کە لە قەیراندایە لەو کاتەوەی بە قوڵی لە مەسیحیەت دابڕاوە – بە دوای ئەفسانەیەکی نوێدا ئەگەڕێت کە تەنها بوار بەخۆی بدات سەرچاوەیەکی نوێی ڕۆحی بدۆزێتەوە، ئەفسانەیەك لە ئێستایدا هێزی داهێنەرانەی بۆ بگەڕێنێتەوە(6).

لە ڕاستیدا جیهانی مۆدێرن بە ئەفسانە دەوڵەمەند نییە، لانی کەم لە ڕووە دیارەکەیەوە، بۆ نمونە ئەمڕۆ قسە لەسەر ئەو مانگرتنە گشتیانە ئەکرێت کە جەماوەر ئەبزوێنێت، وەك ئەوەی یەکێك بێت لەو ئەفسانە دەگمەنانەی کە خۆرئاوای مۆدێرن دایهێناوە، لە کاتێکدا مەسەلەکە پەیوەندی بە خراپ تێگەیشتنێکەوە هەیە بۆ ئەم دیاردەیە. ئەو بۆچونە گەشەی کرد کەپێی وایە مادام ئەم دیاردەیە ئەگاتە جەماوەرێکی فراوان دەکرێت بگۆڕێت بۆ ئەفسانە، هەر لەبەرئەوەی لە سیاقی مێژوودا جێبەجێ ئەبێت و دواتریش بەسەر دوارۆژدا دائەبڕێت. لە ڕاستیدا بەم جۆرە میتۆدانە ئەفسانە پێك ناهێنرێت. لەوانەیە مانگرتنی گشتی یەکێك بێت لە ئامرازەکانی تێکۆشانی سیاسی، بەڵام ئەمە پێشینەی ئەفسانەیی نیە، ئیتر ئەوەندە بەسە بۆئەوەی لە چوارچێوەی میتۆلۆجیای دووریخەینەوە.

بەڵام کۆمۆنیزمی مارکسیەت شتێکی جیاوازترە، با قسە لەسەر چارەنوسە مێژووییەکەی نەکەین و وازیش لەو پشتیوانیە فەلسەفییەی مارکسیەت بهێنین. بەڵکو لای بونیادی ئەفسانەیی کۆمۆنیزم بوەستین، لای ڕێبازەکەی و ئەو دواڕۆژ و کۆتاییە توندەی

نیشانی ئەدابن، لای ئەو بەڵێنانەی پێشکەشی ئەکردین و توشی ڕەواجێکی جەماوەری فراوان ئەبوەوە. بەبێ ڕەچاوکردنی بۆچونمان لەسەر مەبەستە زانستیەکانی مارکس، شتێکی دیارە خاوەنی مانفێستی کۆمۆنیزمی یەکێك لە ئەفسانە گەورەکانی پەیوەندیدار بە دوارۆژ و کۆتایی هاتن دێنێتەوە کە لە ئەفسانەکانی ئاسیای ناوینە. ئەمە ئەو ئەفسانەیەیە کە تایبەتە بەو دەورە فریادڕەسیەی کە دادپەروەر، یان پێغەمبەران، یان پیاوی ئاینی پیرۆز و مژدەدەری بێ گوناه.. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆیشماندا پرۆلیتاریا، پێی هەڵئەسێت. هەر بۆیە ئەو فریادڕەسەی بانگ ئەکرێت بۆ ئەوەی گۆڕان لە بونیادی ئەنتۆلۆجی جیهاندا بکات توشی ئازارو نەهامەتیەکی زۆر ئەبێت. لە ڕاستیدا ئەو کۆمەڵگا بێچینەی مارکس بانگەشەی بۆ ئەکرد و ئەوەیشی لێیەوە بە ئەنجام ئەهات لە نەهێشتنی گرژیە مێژووییەکان، ئێمە نمونەیەکی پێشوەختی باشتری ئەدۆزینەوە لە ئەفسانەی سەردەمی زێڕیندا کەوا بەپێی - کەلەپوری هەندێك میللەت - سەرەتاو کۆتایی مێژوویشی هەژمار کردبوو.

"مارکس" ئەو ئەفسانە بەناوبانگەی دەوڵەمەند کردبوو بە کەڵك وەرگرتنی لە ئایدۆلۆجیایەکی بەڵێندەر بەسەرفرازی لە هەریەك لە مەسیحیەت و جولەکەدا. لەلایەنی یەکەمەوە ڕۆڵێکی پێغەمبەرانەو فریادڕەسانەمان هەیە کە ئەدرێتە پرۆلیتاریا، لەلایەکی تریشەوە ململانێیەکی بێکۆتایی نێوان خێر و شەڕمان هەیە، کە ئەتوانین بەراوردی بکەین بە ڕوداوی مەسیح و دەجال کە خۆی ئەکات بە مەسیحی درۆینە.

ئاماژەیەکی تری "مارکس" دەبینین بۆ خاتری ڕێبازەکەی بەکاریهێنا، ئەویش ئەو هیوایە کە پێشتر مەسیحیەت و جولەکە بۆ خۆیان دروستیان کرد دەربارەی ئەو کۆتاییە توندەی وەك دوادوایی بۆیان دیاریکراوە. لەم بوارەدا مارکس جیاوازە لە زۆربەی فەیلەسوفەکانی تر کە خاوەنی ڕێبازی مێژووگەراین[7]. وەکو: کرۆچی[8]، ئۆرتیگا ئیکاسی[9] ئەوانەی کە بڕوایان وایە ئەو گرژیو ئاڵۆزیانەی مێژوو پێشکەشمان ئەکات بە ناوەڕۆك پێویستە بۆ ڕەوشی مرۆڤایەتی، دواجاریش ناکرێت بە تەواوی بڕەوێتەوە و پەرتەوازە بێت.

ئەو ئەفسانەی وا سۆشیالیستی نیشتمانی - مەبەست نازیەکانە - بەکاریان ئەهێنا جۆرێك لە کرچ و کاڵی پێوە دیاربوو کە هەر باس ناکرێت بە بەراورد بە مەزنی ئەو گەشبینیە فراوانەی ئەفسانەی کۆمۆنیزم لای شوێن کەوتوانی دروستی ئەکرد. ئەو حاڵەتەی نازیەکان ناگەڕێتەوە بۆ سنورداری ئەفسانەی ڕەگەزپەرستی بە تەنها، کە بەشێکی زۆری ئەوروپا خۆبەخۆیی قبوڵیان نەکرد، بەڵکو ئەگەڕێتەوە بۆ لاوازی میتۆلۆجیای جێرمەنی بەشێوەیەکی تایبەت، دەگەڕێتەوە بۆئەو نەزعە ڕەشبینیەی کە لە بنەڕەتەوە تیایەتی. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمە کەوتۆتە سەر سۆشیالیستی نیشتمانی کە ڕەنجی پێویست بدات لە پێناو ژیاندنەوەی میتۆلۆجیای کۆنی جێرمانیدا، لەم پێناوەیشدا کاری ئەکرد بۆ نەهێشتنی بەها

مەسیحیەکان بە مەبەستی هەڵگرتنەوەی ئسوڵە ڕۆحیەکانی ڕەگەزی جێرمەنی کە بریتیە لەو بێ بڕواییەی لە سەردەمە کۆنەکاندا لە باکوری ئەوروپادا هەبوو. لە ڕوانگەی دەرونزانی قوڵەوە هەوڵێکی وەك ئەو هەوڵی گەڕانەوە بۆ ئسوڵی ڕەگەزی جێرمانی وەکو بانگەشەی خۆکوشتنێکی دەستەجەمعی وایە. کە ئەمەیش دوادواییەکی توندی ئەبێت و پێشتر لەلایەن پێشینانی جێرمەنەوە وەك کاولبونی یەکجارەکی چاوەڕێ ئەکرا.

ڕاینارۆك ***Rignarok***[10]، یان ئەوەی کە کۆتایی جیهان بە کارەساتێك ئەبینێت. ئەو دوادواییەیە کە پێویستی بە شەڕێکە لە نێوان خوداوەندەکان و شەیتانەکاندا دروست ببێت و بە مردنی هەموو خوداوەندەکان و پاڵەوانەکان کۆتایی بێت، جیهانیش بەرەو لێڵی و هەرەمەکی بون ئەبات. دواتر جیهانێکی نوێ ئەژێتەوە لە نێوان شوێنەوارە کاولەکانی جیهانی کۆندا و جارێکی تر ئەگەڕێتەوە بۆ ژیانێکی نوێ. بەم جۆرە دەبینین پێشینانی جێرمەن لای خۆیانەوە ئاگایان هەبووە بەرامبەر ئەو ڕێبازەی کە دان بە خولی گەردونی و ئەفسانەی خوڵقاندنی جیهان و کاول کردنی بەشێوەیەکی بەردەوام دائەنێت. هەربۆیە جێگیربوونی میتۆلۆجیای کۆنی ئەوروپای باکور لە شوێنی مەسیحەت، بۆ پشتبەستنە بە دوادواییەکی ڕەشبینانە لە شوێنی ئەو دوادواییەی کە مەسیحیەت بە مژدە و بەڵێنی گەشبینانە دەوڵەمەندی کردبوو، کۆتایی جیهان بەلای مەسیحیەتەوە بەمانای تەواوبوونی مێژوو جارێکی تر ژیاندنەوەی لە هەمان کاتدا دێت.

ئەم هەڵوێستە بە مانا سیاسیەکەی لای ئەندامێکی شۆسیالیستی نیشتمانی بەم جۆرە دێت:

دوور بکەوەرەوە لە مێژووی کۆنی مەسیحی و "جولەکەی کۆن"، کاربکە بۆ ژیاندنەوەی باوەڕ لە قولایی دەرونتدا بە باپیرانی جێرمەن و پێشینانیان. دواتر خۆت ئامادە بکە بۆ جەنگێکی یەکلاکەرەوەی مەزن لە نێوان خوداوەندەکانی جێرمەن و ئەهریمەنەکاندا، لەو شەڕەدا کەوا پێشبینیە کۆنەکان قسەی لەسەر ئەکەن، خوداوەندەکانی جێرمەن و پاڵەوانەکان دەمرن و ئێمەیش لەگەڵیاندا. ئەو کاتە کاولبونی یەکجارەکی و گشتگیری دێت. بەلام جیهانێکی نوێ دوای کارەساتەکە لەدایك ئەبێت. ئێستا ئەپرسین ئەم بۆچونە تا ئەم ڕادەیە ڕەشبین بووە چۆن توانیویەتی مەسەلەی کۆتایی مێژوو لە خۆی بگرێت و لانی کەم هەستی توێژێکی فراوانی خەڵکی ئەڵمان گەرم بکات. ئەم جۆرە پرسیارانە گەلێك گرنگن، هەر ئەوە بەس نییە پرسیارەکان بخەینە بەردەم زانا دەرونیەکان و لێیگەڕێین.

لە بواری سیاسیدا لە دەرەوەی ئەم دوو ئەفسانەوە، کۆمۆنیزم و سۆشیالیستی نیشتمانی، دەبینین کۆمەڵگا هاوچەرخەکان هیچ ئەفسانەیەکی تری نەبینیوە بەم جۆرە بلاوبێتەوە. لەگەڵ ئەم جۆرە بۆچونەدا بەرەو ئەوە ئەڕۆین کە وەك ڕەفتارێکی مرۆیی ئەفسانە ببینین، لە هەمانکاتیشدا ڕەگەزێکی شارستانیەتی گەلانە، یاخود وەك ئەوە تەماشای ئەکەین کە لە کۆمەڵگا نەریتیەکاندا هەبووە. لە ڕاستیدا ئەفسانە لە سەر ئاستی

ئەزمونی تاکەکەسی ون نەبووە، بەڵکو لە ڕێگای خەونەکانـــەوە یـــان خەیاڵاتـــەوە خـــۆی دەرئەخاتـەوە، لـە ڕێگـای ئـارەزو و سـۆزەوە بـۆ شـتە تێپـەڕەکان، دواجـار بەرهەمـە ئەدەبیـەکان بـەو فراوانیـەی خۆیـەوە بـواری ئـەوەی پـێ بەخشـین بچـین بـۆ دۆزینـەوەی میتۆلۆجیـای — گـەورە و بچـوك — لـە چـالاکییە نەسـتی و نیـوە هەستیەکاندا لای تاکەکەس.

بـــەڵام زۆر گرنگـــە بەلامانـــەوە بـــزانین ئـــەو بابەتانـە چـیە لـە کۆمـەڵگای مۆدێرنـدا ئـەو شـوێنە سـەنتراڵەی گرتۆتـەوە کـە ئەفسـانە لـە کۆمـەڵگا نەریتیەکانـدا کـاری تیـا ئـەکرد. بە واتایـەکی تـر لەگـەڵ داننانمـان بـەو ڕاستیـەی کـەوا بابەتـە ئەفسـانەییە گـەورەکان هـەروا لـە کـاری خـۆی بەردەوامـە لـە قوڵاییـە تاریکـەکانی دەرونـدا. دەکرێـت ئـەم پرسـیارانەی خـوارەوە پێشچاو خەین.

ئایـــا ئەفســـانە بـــەو مانایـــەی نمونەیـــەکی ئایـدیالی ڕەفتـاری مرۆییــە تــا ئێســتا بەشـــێوەیەکی ژێرەوانکـــێ ماوەتـــەوە لەســـەردەمی ئێســـتاماندا. بـــۆ وەڵامـــی ئـــەم پرسیارەش ئەڵێین.

وا دیارە ئەفسانەیش وەکو سیمبوڵەکانی تر وایە، هەرگیز لە بواری چالاکیە دەرونیەکان ون نابێـت، بـەڵکو تـەنها شـێوە و روخسـارەکەی ئـەگۆڕێت و وا لـە خـۆی ئـەکات ئەرکـەکانی تەمومـــژاوی و نادیـــار بێـــت، هـــەر بۆیـــە دەسـتکردنمان بـە لێکۆڵینـەوە و بەدواداچـونی ئـەو تەمومژانـەی بـە ئەفسـانەکانەوە ئـەلکێن لەسەر ئاستی کۆمەڵایـەتی لەوانەیە زۆر بەکەڵك بێت بۆ زیاتر تێگەیشتن.

لـــەم بـــوارەدا چـــەند نمونەیـــەکمان لەبەردەستدایە: ڕون و ئاشکرایە کـەوا هەنـدێك لە جەژنەکان لە جیهانی مۆدێرندا دنیاین و لـە دەرەوەی هــەمو کەشـێکی پیرۆزیــەکانن، ئــەم جەژنانـــە تـــا ئێســـتایش بونیـــاد و ئەرکـــە ئەفسانەییەکانیان پاراستووە، لێرەدا ئاماژە بـۆ ئەو دڵشادیانە ئەکەین کە لەگەڵ هاتنی سـەری ساڵە نوێیەکاندا هەمووان دەگرێتەوە، یان ئـەو دڵخۆشـیەی دوای لـەدایکبوونی منـداڵ و دوای پێکهێنانی ماڵ و خانوو دروست ئەبێت، هـەموو ئەمانـە پێداویسـتیەکمان بـۆ ئاشـکرا ئەکـەن بەوەی کە مرۆڤ سـەرەتایەکی رەهـای ئـەوێت بـۆ ئەوەی تیایدا هەستێکی ناڕۆشن دروست بکات، تا ژیانێکی نوێ دەست پێئەکاتەوە[11] و بگاتـە ئەو حاڵەتەی بە تەواوی ئەژێتەوە.

جیـاوازی نێـوان ئـەم دڵخۆشـیانەو نمونـە ئەفسـانەییە کۆنەکـەی هەرچـەند بێـت — کـەوا ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ دوبارە بونەوە دەوریەکـەی خولڵقانـدن — گومـان ناکـەین لـەوەی کـە مـرۆڤ هەست بە پێداویستی ئێستایی کردنەوەی ئـەو دراما کۆنانـە ناکـات بەشـێوەیەکی هەمیشـەیی ئەگەرچـی زۆر لــە پیرۆزیەکانیشـی لەدەسـت دابێـت. نـاتوانین ئـەوە دیـاری بکـەین تـا چ ڕادەیەك مرۆڤی هاوچەرخ هۆشیارە بە ناوەڕۆکە میتۆلۆجیـەکانی نـاو ئـەو دڵخۆشـیانە. لێـرەدا مەسەلەیەکی سەرنج ڕاکێش دێتە بەردەممان کە بەم جۆرە نیشانی ئەدەین:

تـــا ئێســـتایش ئـــەو دڵخۆشـــیانە دەنگدانەوەیـەکی تەمومـژاوی و شـاراوەی هەیـە لـــە قـــوڵایی بونمانـــدا، ئەمـــە تـــەنها چـــەند نمونەیەکیەتی کە لەگەڵ خۆیدا ئەمانبات، بەڵام

ئەتوانێت کۆمەڵە بارودۆخێکمان بۆ ڕون کاتەوە کە گشتی و هەمەلایەنە. بەمجۆرە دەڵێین: هەندێك بابەتی ئەفسانەیی هەیە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان هەر ماوەتەوە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا و کاری خۆیان ئەکەن، بەڵام بە ئاسانی ناناسرێنەوە بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەری پرۆسەی بە عیلمانیکردنی درێژخایەنەوە. ئێمە ماوەیەکی زۆرە ئاگاداری ئەم مەسەلەیەین. بەم جۆرە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان دیاری دەکرێن بە سیفەتی مۆدێرن بونیان، چونکە هەنگاوگەلێکی دووریان بریوە لە بواری داماڵینی پیرۆزی لە ژیان و گەردوون. هەروەها گوزارش لەو تازەبوونەوە ئەکرێت لە جیهانی مۆدێرندا، لە ڕێگای جارێکی تر هەڵسەنگاندنەوەی ئەوەی وا پێشچاو خراوە لەسەر ئاستی دنیایی بۆ بەها پیرۆزە کۆنەکان.

گرنگە بزانین هەموو ئەو شتە ڕۆحیانەی لە جیهانی مۆدێرندا ماونەتەوە، تەنها بەشێوەی ڕوخسارێکی گشتی دەرئەکەوێت، بەشێوەی بەهایەك کە جارێکی تر لەسەر ئاستی ژیانی دنیایی ڕاڤە دەکرێتەوە. گەر ئەم ڕەوشە لە هەموو شوێنێك جەختی لەسەر کرایەوە ئەو اپێویستە ئەوە قبوڵکەین کە جیهانی مۆدێرن بەشێوەیەکی بنەڕەتی ناکۆکە لەگەڵ هەموو شێوەکانی مێژووگەرایی کە پێشتر هاتوون. بەڵام ئامادەیی مەسیحییەت بە تەنها ئەم گریمانەیە بە دوور ئەزانێت. بۆیە مەسیحییەت بە هیچ بارێکدا قبوڵی نیە دان بە ئاسۆیەکی بێ پیرۆزیدا بنێت بۆ گەردوون، کە ئەمەش ئاسۆیەکی تایبەتی هەموو کولتورێکی مۆدێرنە.

مەسەلەکە هەروا ئاسان نیە. ناتوانین خۆمان بە دوور بگرین لە قسەکردن لەسەر مەسیحیەت و ڕۆڵی لەبەرچاو نەگرین، مادام تا ئەمڕۆش زۆربەی جیهانی خۆرئاوا ئەڵێت من مەسیحیم. لێرەدا زۆر لەسەر ئەو ڕەگەزانەی وا لە ڕابردوودا بە ڕەگەزە ئەفسانەییەکان ئەناسران لە مەسیحیەتدا ناڕۆم، ئەم ڕەگەزانە هەرچۆنێك هەبن ماوەیەکی زۆرە شێوە و فۆرمێکی مەسیحیانەی وەرگرتووە، بەهەرحاڵ پێویستە لە ڕوانگەیەکی ترەوە سەیری مەسیحیەت بکرێت، ئەوە ناشاردرێتەوە کە ناوە هەندێك دەنگ بەرز ئەبێتەوەو ئەڵێت، جیهانی مۆدێرن ئیتر لە ئێستاماندا مەسیحی نیە. بەلای لێکۆڵینەوەکەمانەوە پێویست نییە خۆمان بەوانەوە خەریك کەین کە بە پێویستی ئەزانن — ئەفسانە داماڵن— لە مەسیحیەت بۆئەوەی ماهیەتە ڕاستەقینەکەی بۆ بگێڕنەوە.

هەندێکیان بە ڕێبازێکی جیاوازتردا ئەڕۆن، بۆ نمونە کارل یۆنغ پێی وایە قەیرانی جیهانی مۆدێرن، بەلای زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤی خۆرئاوایی بە هەموو قەوارەی خۆیەوە (سیمبوڵ و ئەفسانە)کانی مەسیحیەت ناژێنێتەوە، بەڵکو گۆڕاوە بۆ کۆمەڵێك وشە و کردەوەی لە ژیان بەتاڵ و لە کۆمەڵێك قاڵبی مەیشتودا دەرکەوتووە کە زۆر ڕوکەشە و هیچ پەیوەندیەکی بە ناخی مرۆڤەوە نییە، دواجاریش هیچ کەڵکێکی بۆ ژیانی دەرونی قوڵ نییە.

بەڵام ئێمە دەمانەوێت بە جۆرێکی تر کێشەکە بخەینە ڕوو: دەپرسین لەو کۆمەڵگا مۆدێرنانەی پیرۆزی لێداماڵراوە، یان فۆرمێکی

عیلمانیانــەی پــێ بەخشــراوە، تــا چ ڕادەیــەك مەسـیحیەت لـە ئاسـۆیەکی ڕۆحـی هاوشـێوەی ئاسۆی بـاوی کۆمـەڵگای سـەردەمە کۆنەکانـدا ئـەژی، ئـەو سـەردەمانەی ئەفسـانە تیایانـدا زاڵ بوو. بایەکسەر بڵێین مەسیحیەت ناچار نیە لـەم جــــۆرە بــــەراوردە بترســــێت، چــــونکە تایبەتمەندیــەکی دڵنیــایی تیایــە و گومــان هەڵناگرێت. دەگەڕێینەوە بۆ باوەڕ بەو مانایەی وتەزایەکە لـە وتـەزاکانی ئـەزمونی ئاین، بۆ ئـەو بەهایەی کە دەیبەخشینە مێژوو.

ئــەو هێرشــەی مەســیحیەت کردیــە ســەر جیهـانی ئـاینی فـرە خـودایی ئێسـتا بـووە بـە شتێکی کۆنی بێ ناوەڕۆك لـە ڕوی مێژوویـەوە، چونکە مـۆرکی ئـەو سـەردەمەی هـەڵگرتووە کـە لێیــەوە سەرچـاوەی گرتــووە. ئـیتر مەسـیحیەت سـەرەڕۆیی ئـەوە ناکـات دەسـت وەرداتـە هـیچ ئــاینێکی تــر، یــان هــەر ئاراســتەیەکی تــری لاهـوتی. لەگـەڵ ئـەم جـۆرە حوکمدانەشـدا بـە ڕەچــاوکردنی دۆزینــەوە تازەکــان: ئەفســانە ڕەوتێکـــی دیـــاریکراوی بـــوون پێـــك دێنێـــت. بەهەڵـەدا ناچـین گـەر بڵـێین: مەسـیحیەت وەکـو ئاینێك پێویستە لـە سنوری جیهانـدا ڕەفتـاری ئەفسانەیی بپارێزێت، لێرەدا زەمـەنی لیتـورجی وەبــیر دێنینــەوە [12] یــان بــۆ ڕەتکردنــەوەی زەمەنی دنیایی و کارکردن بۆ گەیشتنە زەمـەنی مــەزن، هــەمان زەمــەنی کــۆن بــۆ ســەرەتاکانی بنەڕەتی مەسیحیەت.

لـە بـارەی مەسـیحیەتەوە یەسـوعی مەسـیح کەســایەتیەکی ئەفســانەیی نیــە، بــەڵکو بــە پێچــەوانەوە ئــەو کەســایەتیەکی مێژوویــە. مــــەزنی ئــــەو لــــەو مێژووییبونــــە ڕەهایــــەوە سەرچـاوەی گرتـووە. بۆیـە مەسـیح هـەر ئـەوە نەبوو مرۆڤێك بێت (مرۆڤ بە گشتی) بەڵکو قایل بـوو بـەو ڕەوشـە مێژووییـەی ئـەو گەلـەی کـە لـە دامێنیـا لـەدایك بـوو. خۆیشـی بـە پێویسـتی نـەزانی پــەنا ببــات بــۆ کــاری سەرســوڕهێنەر بۆئــەوەی خــۆی لــەو مێــژوویی بونــە دەرکــات، ســـەرەڕای ئـــەو کـــارە سەرســـوڕهێنەرانەی ئەنجامیــدا لــە پێنــاو هــەموارکردنی ڕەوشــی مێـژوویی خـەڵکانی تـردا، ئـەو کاتـەی ئەبرسـی چـاك کـردەوەو کـاری کـرد بـۆ زیندوکردنـەوەی ئەلی عازەر لە مردنەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەزمونی ئاینی لای مەسیح پشت بە لاسایی کردنـەوەی مەسیح ئەبەستێت، بە واتای نمونەیەك کە دەبێت بکرێتـە پێشـەنگ، تـا ئەگاتـە ئیلـهام وەرگـرتن لـە ڕێبازەکـەی لـە ژیانــداو گەڕاندنــەوەی مــردن و ژیانەکــەی بــۆ شـــێوەی سروشـــتێکی ئـــاینی، لـــە ڕێگـــای خواپەرســـتی و ڕێورەسمەکانیـــەوە. ئەمانـــە هەڵئەسن بە هاوچەرخ کردنی مەسیح و شوێن کـەوتنی ئـەو کارانـەی کـە ئـەو لـە کـاتی خۆیـدا پێـی هەستاوە *ILLUD TEMPUS* ئـەو زەمەنـەی کە لەگـەڵ لەدایکبونی لـە (بیت لحم)ەوە دەست پێئــەکات و بــە بەرزبونەوەیشــی بــۆ ئاســمــان کۆتایی پێدێت.

ئێمــە ئــەزانین لاســایی کردنــەوەی کەســی نمونـەیی لـە دەرەوەی توانـای مرۆڤـە، دووبـارە کردنــەوەی هــەمان درامــا پێشــەنگ و نمونــەی بـاڵای ئـەوێت، دروسـتکردنی دابـڕانیش لەگـەڵ زەمــەنی دنیــایی خــاڵی لــە پــیرۆزی بــەهۆی کرانەوەیەکـەوە دەبێـت بگاتـەوە زەمـەنی مـەزن، کە نیشـانە بنەڕەتیـەکانی ڕەوشـتی ئەفسـانەیی

پێك دێنێت، یان ڕەوشتی مرۆڤی سەردەمە تێپەڕیوەكان، كەوا لە ئەفسانەدا سەرچاوەی بونی خۆی دۆزیەوە.

مرۆڤ هەمیشە خۆی وەها ئەبینێتەوە كە لەگەڵ ئەفسانەدا ئەژی، هەر لەبەرئەوەی بەشێوەی زنجیرەیی روداوەكان ئەبینێ یان لە كاتی گێڕانەوەی ئەو كارانەی كەسایەتیە ئەفسانەییەكان پێی هەستاون. هەر بەم مانایە بوو كیركگارد [13] داوای لە مەسیحیە رەسەنەكان ئەكرد لەگەڵ حەزرەتی مەسیحدا بن، بەلاّم تەنانەت گەر مرۆڤ مەسیحیش نەبێت بەو مانایەی كیركگارد مەبەستیەتی هەر ئەتوانێت هاوچەرخی حەزرەتی مەسیح بێت. هەر ئەبێت بەم جۆرەیش بێت، چونكە زەمەنی تایبەتی بۆ خواپەرستی لەكاتی نوێژ و جێبەجێكردنی سروتە ئاینیەكان و ئەركەكانیان ئەژێنێتەوە. بەهیچ شێوەیەك ئەمە درێژكراوەی دنیایی بوون نیە. ئەمە زەمەنی پیرۆزە تا ئەوپەڕی سنوری پیرۆزی، كە تیایاندا خودا بەرجەستە ئەبێت و ئەبێتەوە مرۆڤێك، ئەمە ئەو زەمەنەیە ئنجیلەكان قسەی لەسەر ئەكات.

مەسیحی لە كاتی خزمەتی ئاینیدا ئازارەكانی مەسیح نابینێت بە تەواوی، وەك چۆن مرۆڤ یادی هەر روداوێكی مێژوویی ئەبینێت كە هەموو ساڵێك زیندوو ئەكرێتەوە. بۆ نموونە 14ی تەموز یان 11ی نۆڤەمبەر، ئەمە یادی روداوەكە زیندو ناكاتەوە بەڵكو ئەیەوێت نهێنیەكی ئاینی چالاك بكاتەوە و جارێكی تر ئێستایی بوونی پێ ببەخشێت، بەلای مەسیحیەكەوە یەسوع ئەمرێت و جارێكی تریش لەبەردەمیا ئەژێتەوە، جارێكی تر هەر لەو كات و شوێنەدا [14] مەسیحی بەبۆنەی نهێنی ئازارەكانی مەسیحەوە یان زیندووكردنەوەی مردووەكانەوە، زەمەنی دنیایی ڕەت ئەكاتەوەو ئەكەوێتە دوای زەمەنی سەرەتایی پیرۆزەوە.

گرنگیەك لە پێداگریماندا نیە لەسەر ئەو جیاوازیانەی مەسیحیەت لە جیهانی فرە خودایی كۆن جیائەكاتەوە، ئەمە هێندە ڕۆشنی تیایە كە ناكۆكی قبوڵ ناكات، بەلاّم ماوەتەوە قسە لەسەر چیەتی ئەو ڕەفتارانە بكەین كە ئاماژەمان بۆ كردن.

زەمەن بەلای كەسی مەسیحیەوە وەك هەر كەسێكی تری كۆمەڵگا سەرەتاییەكان زەمەنێكی چونیەك *homogeneous* نییە، بەڵكو پێكهاتووە لە كۆمەڵە دابڕانێك كە بەشێوەی دەوری هاتووە، دابەشیان كردووە بۆ درێژبونەوەیەكی دنیایی كە دابەشكردن قبوڵ ناكات، تەنها زەمەنی پیرۆز دووبارە بونەوەی بێ كۆتایی قبوڵ ئەكات.

لەم وتەدا تێگەیشتین كە دووبارەبونەوە هیچ سنورێكی نییە بێئەوەی واز لە خودێتی خۆی بێنێ. كاتێك جەخت ئەكەینەوە لەسەرئەوەی مەسیحیەت بە پێچەوانەی ئاینە كۆنەكان چاوەڕوانی كۆتایی زەمەن ئەكات، ئەم قسەیە بۆ درێژبونەوەی دنیایی (بە واتای مێژوو) ڕاستە. بەلاّم پاشەكشەی پێناكرێت لەسەر ئەو زەمەنەی كە باوەڕدار لە جێبەجێكردنی سروتەكاندا ئەیباتە سەر، ئەوەی لەگەڵ بەرجەستە بوونی مەسیحدا دەست پێئەكات [15]، ئەو زەمەنەی كە بڕوای مەسیحی لەسەری ئەدوێت لەگەڵ كۆتایی مێژوودا پەرتەوازە نابێت.

ئەم مانایە ئاماژەمان بۆ کرد ئەوەمان بۆ دەرئەخات بە چ شێوازێك مەسیحیەت لە جیهانی مۆدێرندا هەر شوێن ڕەفتارە ئەفسانەییەکان کەوتووە، گەر ئێمە ئەرکی ئەفسانە و سروشتە ڕاستەقینەکەیمان لەبەرچاو گرت ئەوا وادەرناکەوێت مەسیحیەت شێوازی ژیانی مرۆڤە کۆنەکانی تێپەڕاندبێت. توانای ئەم تێپەڕاندنە و دوورکەوتنەوە لە ڕەفتارە کۆنەکانیشی نییە. ماوەتەوە بزانین لە سەردەمی ئێستاماندا چ شتێك جێی ئەفسانەی گرتۆتەوە لای ئەو کۆمەڵەی هیچ شتێکی لە مەسیحیەتەوە هەڵنەگرتووە جگە لە پەیامە مردووەکەی.

وادیارە مەحاڵە کۆمەڵگایەك بەوە بەهێز ببێت تەواو ئازاد بوبێت لە ئەفسانە، چونکە ئاماژەیەکی بنەڕەتی ڕەفتاری ئەفسانەیی ئەوەیە کە پشت بە نمونەیەکی مەزن ئەبەستن و بەردەوام دووبارەی ئەکەنەوە، ئەمە پێداویستیەکی قوڵی هەموو هەلومەرجی مرۆییە، سەرەڕای نیشانە گرنگەکانی تری کە لە هەوڵ و کۆششی مرۆڤ بۆ دابڕان لە پاشخانە دنیاییەکەی و کەوتنە دوای زەمەنی سەرەتایی کۆندا خۆی ئەبینێتەوە. بەم جۆرە زۆر زەحمەت نیە ئەو ئەرکانە بناسین وا ئەفسانە لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا هەیبووە، لە ڕێگای ئەوانەی وا ئەمڕۆ بە بەفێرکردن، پەروەردە و فێرکردنی ڕێنمایی کار ناویان ئەبات، ئەم قسانە لەبەر ئەو ئەفسانانە ڕاست نیە وا ئێستا پێوەرێك پێکدێنن، ئەو پێوەرانەی پێویستە بپارێزرێت، یان کۆمەڵێك نەریتی لە باپیرانەوە جێماوە، هەروەها لەبەر ئەو پرۆسەی گواستنەوەی ئەفسانە نیە — زۆربەی جارەکان بەشێوەی نهێنی ئەبێت[16].. کە هاوتای ئەو ئەرکەیە وافێرکردنی فەرمی پێی هەڵئەسێت لە کۆمەڵگای مۆدێرندا. بەڵکو لەبەرئەوەیە هاوشێوەبونی ئەرکی ئەفسانە لەگەڵ پرۆسەی فێرکردندا بەشێوەیەکی تایبەتی ئەوە ئەسەلمێنێت، گەر ئەسڵی شێوە نمونەییەکانی ڕەفتارمان لەبەرچاوگرت ئەوا پەروەردە لە ئەوروپای هاوچەرخدا ڕووبەرووی ئەبێتەوە.

لە زەمەنی کۆندا هیچ کەلێنێك لە نێوان مێژوو زانستی ئەفسانەکاندا نەبووە. هەر بۆیە کەسایەتیە مێژووییەکان هەوڵێکی زۆریان ئەدا بۆ لاسایی کردنەوەی نمونە سەرەتاییە کۆنەکە، ئەوەی وا لە خوداوەندەکان و پاڵەوانەکانەوە دەست پێئەکات. هەر لێرەشەوە کردار و ژیانی ئەو پاڵەوانانە ئەبووە کۆمەڵێك پێوەر کە بۆ ئەوە بشێت مرۆڤایەتی لەسەر بنەمای لەو جۆرە ژیانی خۆی ڕێك خات.

مێژوونوسی ڕۆمانی (تیت لیف)[17] کۆمەڵێك نمونەی دەوڵەمەندی ڕەفتاری پێشکەش کرد و داوای لە گەنجانی ڕۆمانیا کرد وەریگرن و قبوڵی بکەن، دوای ئەوەی بلوتارك[18] ژیاننامەی هەندێك گەورە پیاوی نوسیەوە. بۆ ئەوەی ببنە نمونە و پێشەنگ بۆ نەوەکانی سەردەمی ئێستا. جێی وەبیر هێنانەوەیە کە لەلایەنی ڕەفتاری و مەدەنیەوە فەزیلەت و سود و کەڵکی ئەو کەسایەتیە گرنگانە لە پێشکەشکردنی نمونەیەکی سەرکەوتوی ئەرەستۆکراتی بۆ پەروەردەی ئەوروپی بەردەوام بوو، بەتایبەتی دوای سەردەمی ڕێنسانس. بەو جۆرە تا کۆتایی

سەدەی نۆزدەهەم پەروەردەی نیشتمانی کەڵکی لە ڕێنماییەکانی نمونە سەرەتاییەکانی ڕەفتار وەردەگرت کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی کلاسیك. هەروەها ئەو نمونانە ئامادەییان هەبووە لە سەردەمە کۆنەکاندا، *in illo tempore* ئەو سەردەمانەی پڕ بوون لە ئمتیازات و دەسکەوت، کەوا دائەنرێت بەلای ئەوروپاوە هۆکارەکانی مەعریفە و زانستی تیا وەرگیراوە. لوتکەی رۆشنبیری یۆنانی – لاتینی.

لە ڕابردوودا گەڕان بەدوای چونیەکی میتۆلۆجیا و ئەو ڕۆڵەی وا پەروەردە پێی هەڵئەسا جێگەی سەرنجی کەس نەبوو، چونکە یەکێك لە خەسڵەتە جیاکارەکانی ئەفسانە ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتی جەخت ئەکاتە سەر دۆزینەوەی نمونەیەکی ئایدیالی کۆمەڵگایەك کەوا فەرامۆشکراوە. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەدا جۆرە مەیلێك ئەناسین کە بەشێوەیەکی گشتی دەشێت ناوبنرێت مەیلی مرۆڤانە. بە واتای گۆڕینی ژیانی مرۆڤ بۆ پێوەرو پێوانە، گۆڕینی کەسایەتی مێژوویی بۆ نمونەی سەرەتایی، کە تا ئێستا ڕوخساری ئەم جۆرە مەیلە لای نوێنەرە بەناوبانگەکانی عەقڵی مۆدێرن ئەبینین.

ئەندریە جید[19] ڕاستی کرد ئەو کاتەی وتی، گۆتە[20] بە تەواوی ئاگاداربوو لەو پەیامەی کە پێکهاتبوو لە پشتبەستن بە ڕێبازێك لە ژیاندا، تا بواری ئەوەی بداتێ نمونەو پێشەنگ بێت لە هەموو کارێکدا، هەر بۆیە هەمیشە تێئەکۆشا بۆ دۆزینەوەی ئەو نمونەیە. ئیتر ئەوە گەر لاسایکەرەوەی ژیانی خوداوەند و پاڵەوانە ئەفسانەییەکانیش نەبووبێت لە ژیانی تایبەتی خۆیدا، لانی کەم ڕەفتارەکانی ئەگێڕانەوە بەشێوەیەکی گشتی. بۆل ڤالێری[21] دەربارەی گۆتە ساڵی 1932 وتویەتی: ئەو بەلای ئێمەوە، ئێمەی مرۆڤ، یەکێك لە بالاترین هەوڵەکانە بۆ ڕۆیشتن بە ئاراستەی هاوشێوەبوون لەگەڵ خوداوەندا.

جگە لەمە لاسایی کردنەوەی نمونەی کۆن هەر بەهۆی ڕۆشنبیری فێرکارییەوە لە ڕێگەی قوتابخانەکانەوە نابێت. مرۆڤی هاوچەرخ ملکەچی میتۆلۆجیایەکی کاریگەری فراوان کراوە، لاسایی کردنەوەی کۆمەڵێك نمونەی ڕەفتاری خرایە بەردەست کە تەبا بوو لەگەڵ پەروەردەی فەرمیدا. ئەوەی وا لە جێبەجێکردنی ڕۆڵەکەی خۆیدا لە ماوەیەکی زۆر لە پێشترەوە لە کارکەوتووە. پاڵەوانەکان – ئیتر ئایا لە جیهانی خەیاڵدا بن یان واقع – نوێنەرایەتی ئەو نمونە ئەکەن، ڕۆڵێکی دیاریش ئەگێڕن لە پێگەیاندنی نەوجوانانی ئەوروپیدا. لە کەسایەتی ناو ڕۆمانە عاشقانەکاندا ئەیانبینین، لە پاڵەوانە جەنگیەکاندا، لە ناودارانی جیهانی سینەمادا.. هتد. مرۆڤ ئەو هەستە دایئەگرێت کەوا ئەم ئەفسانەیە لەگەڵ تێپەڕینی ساڵدا زیاتر دەوڵەمەند ئەبێت. هەروەها ئەو نمونە ئایدیالیەی ڕەفتاریش ئاشکرا ئەکات وا ڕەواجی میللی پێکی دێنێت بە کاریگەرییە وروژێنەرە بەردەوامەکانیەوە. ڕەخنەگران بە زۆری لای کۆپیەکی نوێ و وێنەیەکی تازەی دۆن جوان و پاڵەوانی شەڕەکان وەستاون. یان لای کەسایەتیە بەناوبانگەکانی جیهانی سیاسەت، لای عاشقە نائومێدەکان و شوێنکەوتوانی ئاینزای

ســـەگی[22]، یـــان شـــوێنکەوتوانی ڕێبـــازی پوچگەرا[23]. *Nihilism* یان لای شاعیرێکی بێ هیوای دڵتەنگ.

بێگومـان هـەموو ئـەو نمونانـە درێـژکراوەی میتۆلۆژیــــای کــــۆنن، هەڵســــوکەوتکردنیش لەگەڵیانــدا لـــە ئێســـتادا هـــەر دەلالـــەت لـــە ڕەفتــارێکی میتۆلــۆجی کــۆن ئــەکات، جێـــی ســـەرنجە کـــە خوێندنـــەوەو ڕووبەڕووبونـــەوەی نمونـە کۆنـەکان حاڵـەتێك لـە بـێ ئـۆقرەیی و بێزاریمـان بـۆ دەرئـەخات لـە پێنـاو گەیشـتن بـە (زەمـەنی مـەزن). ئیـدی ئـەو زەمەنـە هەرچـۆنێك بێـــت، ئایـــا ئـــەو زەمەنـــە ئەفســـانەییەیە وا ڕەنگدانـەوەی یەکـەم تیـا رویـدا، ئـەوەی کـە دەکەوێتە سەروی بوونەوە؟

شـــیکردنەوەیەکی ڕاســـت دەربـــارەی ئـــەو میتۆلۆجیا فراوانـەی لای مرۆڤـی مـۆدێرن هەیـە پێویستی بە نوسینی دەیان کتێب هەیە، چونکە ئەفســـانەو وێنـــە ئەفســـانەییەکان لـــە هـــەموو شـتێکدا دەرکـەوتوون، ئـەو کاتـەی شـێوەیەکی عیلمانی دوور لە پیرۆزی وەرگرت، یاخود پێگـە مەزنەکـەی دابـەزی و توشـی جۆرێـك لـە ونبـوون بوو. ئەمە هەر ئەوەندەی بەسە مرۆڤ چاوەکانی بکاتەوەو بیانبینێت.

پێشـــتر ئاماژەمـــان بـــۆ ئـــەو بونیـــادە ئەفسانەییەی ئاهـەنگ و بۆنـە دڵخۆشـکەرەکانی ســـەرەتای ســـاڵ کـــرد، یـــان دەربـــارەی ئـــەو جەژنانەی کە بۆ سەرەتاکانی ساڵ دەگێڕێت، تا ئێسـتایش هـەر ئـارەزوو (حـنين *Nostalgia*) بـۆ هـــەموو ســـەرەتاو دەســـتپێکردنێك ئـــەبینرێت، دواجار هیوایەك مرۆڤی گرتۆتەوە بەوەی جیهان تـــازە ئەبێتـــەوە، یـــان بـــە توانـــای دەســـت پێکردنـەوەی مێـژوو لـە جیهانێکدا کـە جارێکی تـر ئەژێتـەوە، لـەو جیهانـەدا کـە بـونێکی تـر ئەخولقێنێت.

ئـــەتوانین نمونـــە و بەڵگەنامـــەکانمان لـــەم بـوارەدا زیـاتر بکەینـەوە، هەرچـەندە ئەفسـانەی فیردەوسـی لەدەستچـوو تـا ئـەمڕۆش ماوەتـەوە وەك نمونـــەی نـــاو زهنیـــەتمان، لـــە ڕێگـــای وێنـــەکانی نـــاو دوورگـــەی فیردەوســـەوە، یـــان نمونـەکانی بەهەشـتی عەدەنـەوە، ئەمـەش چـەند زەمینەیـــەکی جیاکـــارە کـــە تیایـــدا هـــەم کـــات ئەســـــڕێتەوە و هـــــەم ڕەوڕەوەی زەمـــــەنیش ئەوەستێنرێت.

لەم سیاقەدا سەرنجمان بەرەو ئەمە ئەڕوات:

بەشیکردنەوەی هەڵوێستی مرۆڤی هاوچەرخ بەرامبـەر زمـان بەشـێوەیەکی تایبـەت دەتـوانین ئەو ونبون و ناڕۆشنبیە ئاشکراکەین کە بەسـەر ڕەفتــارە ئەفســانەییەکاندا هــاتووە. نابێــت لــە بیرمان بچێت کە یەکێك لە ئەرکە بنەڕەتیەکانی ئەفسانە بە دیاری کراوی, ئەوەیە کە هەڵئەسێت بە کردنەوەی دەروازەیەك تا مرۆڤ لێیەوە بگاتـە زەمەنی مـەزن. بەشێوەیەکی دەوریـش ئەگاتـەوە زەمــەنی یەکــەم، ئــەم مەســەلەیە لــەو ویســتەی مرۆڤدایـە بـۆ وازهێنـانی لـە زەمـەنی ئێسـتای، وازهێنــان لــەوەی وا بــە بــارودۆخی مێــژوویی ناوی ئەبەین.

نـــــەوەکانی بۆلیزیـــــا، بـــــە ئازادیـــــەکی سەرســـوڕهێنەرەوە بـــەرەو ســـەروەری ئەچـــن، هــەوڵێکی بێوچـان ئـەدەن بـۆ نکـوڵی کـردن لـە جدیەتی ئەو گەشتەیان، دواجاریش هەموو ئەو بوارانـــــەی بـــــۆ ئازادیـــــەکانی بـــــواری هەڵســـوکەوتکردن و ڕەهـــایی لـــە ڕەفتـــاردا

ئەیڕەخسێنن. بەڵام بەلای دەریاوانەکانەوە مەسەلەکە پەیوەندیدارە بە گەشتێکەوە کە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی پێی هەستاوە لە زەمەنە کۆنەکاندا. بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕێگەیەك نیشاندا ببێتە نمونەیەك و پێشڕەوێکیش دابهێنێت بۆ ئەوانەی دوای خۆی دێت، گەر مرۆڤ سەرەڕۆییەکی تایبەتی بکات، بەو مانایەی هێنانەوەی داستانێکی ئەفسانەییە کە هاوتای ژیانە لەگەڵ ڕابردوو شاردنەوەی ئەوەی لە ئێستادا هەیە.

ئەو تەنگانەیەی مرۆڤی گرتۆتەوە بەرامبەر زەمەنی مێژوویی هاوڕێیە لەگەڵ ئارەزوویەکی نارۆشن لە بەشداری کردن لە زەمەنێکی سەروەردا، زەمەنێکی سەرەتایی(*) و گشتی، هەندێك جار بەلای مێژووی ئەم ڕۆژگارەمانەوە دەلالەت لە هەوڵێکی نائومێد ئەکات لە پێناو تێکشکاندنی یەکانگیربوونی زەمەن. یان لە پێناو دەرچوون لە درێژبونەوەو گەیشتن بە زەمەنێك جیاواز بێت لەو زەمەنەی کە بوونی خۆی تیا سەرگەردان ئەبێت، ئا لێرەدایە بۆ هەر مرۆڤێك زەمەنێکی تایبەت هەیە.

لەم بوارەدا و بەشێوەیەکی تایبەت و بە ئاراستەیەکی باشتر مرۆڤ هەست بەوە ئەکات کە چارەنوسی ئەرکەکانی ئەفسانە لە جیهانی مۆدێرندا چی بەسەرهات. ئەتوانین بڵێین مرۆڤی مۆدێرن بە گەلێك ئامرازی چونیەك لەلای خۆیەوە تێئەکۆشێت بۆ دەرچوون لە (مێژووەکەی خۆی). هەوڵێکی زۆر ئەدات بۆئەوەی لە ڕیتمێکی زەمەنیدا بژی جیاواز بێت لەگەڵ زەمەنی ئاسایدا، گەر ئەمەی کرد ئەوا جارێکی تر ڕەفتاری ئەفسانەیی ئەگەڕێنێتەوە.

ئێمە باشتر لەم قسانە ئەگەین گەر بە وردی سەیری ئەو دوو ڕێبازە سەرەکیەمان کرد کە بەرەو (هەڵهاتن و لەدەست دەرچوون) ئەڕوات. مرۆڤ ئەمرۆ لە ڕێگای نمایشە شانۆیی و سینەماییەکانەوە، یان لە ڕێگای خوێندنەوەوە ئەیانبینێت.

نامەوێت لای پێشینەی ئەفسانەیی زۆربەی شانۆ و فیلمەکان بوەستم، هەروەها بنەڕەتی سروتی شەڕە قۆچی گاو پێشبڕکێی ئەسپ، یان یاریە وەرزشیەکان، هەمویان لەیەك خاڵدا یەکدەگرنەوە ئەویش ئەوەیە (لە زەمەنێکی چڕو پڕدا ئەنجام ئەدرێت)، ئەم زەمەنە زۆر توندە. ئەمە بەجێماوی پاشماوەی زەمەنی سیحری – ئایینی کۆنە، یان جێگرەوەیەتی *Alternative* دەکرێت بڵێین زەمەنی چڕوپڕ ڕەهەندی چۆنایەتی شانۆ و سینەمایش پێکدێنێت.

گەر هات و بونیادە سروتی و میتۆلۆجیەکانی تراژیدیا لە شانۆو فیلمی سینەمادا ڕەچاو نەکرا، ئەوا مەسەلەی گرنگ دەمێنێتەوە بەم جۆرە گوزارشتی لێئەکەین: هەردوو ئەم جۆرە لە دیمەنی شانۆیی و سینەمایی پەنا ئەبات بۆ زەمەنێکی جیاواز لە درێژکراوەی زەمەنی دنیایی و دوریش لە کەش و هەوای پیرۆزی، لە هەمان کاتیشدا ڕیتمێکی زەمەنی چڕ و شکاو بەکاردێنێت، کە لە دەرەوەی بەشداریە هونەری و ستاتیکیەکان زەنگێکی قوڵ دەزرنگێنێتەوە لە ویژدانی بینەردا.

لە پەیوەندیدا بە خوێندنەوەوە ئەوا مەسەلەکە جیاوازەو تایبەتمەندی خۆی هەیە. مەسەلەکە لە سەرەتاوە بونیادی ئەفسانەکان و

بنەڕەتیان لە جیهانی ئەدەبدا دەگرێتە خۆی. لەلایەکی ترەوە ئەو ئەرکە ئەفسانەییەی خوێندنەوە جێبەجێی ئەکات، لای ئەوانەی کە خۆراکی عەقڵی لێ دەستگیر ئەکەن. گەلێك جار گفتوگۆ لەسەر ئەفسانە و چیرۆکی سەیر و نامۆو داستان لە ئەدەبی مۆدێرندا کراوە. ئێمە ڕێگەمان بەخۆمان نەدا هەڵوەستەی لەسەر بکەین، لەم سیاقەدا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەین، ئەو تەنگانەو سەرەڕۆییەی کە پێویستە لەسەر پاڵەوان زاڵ بێتە سەریا، نمونەیەکمان پێش چاو ئەخات کە پاڵەوانە ئەفسانەییەکانی زەمەنی کۆن دایان هێناوە. لێکۆڵیارەکان ئاماژەیان بۆ زۆر بابەتی ئەفسانەیی کرد لە ناو ئاوە سەرەتاییەکان و لە دورگەی فیردەوسی و لە تێکۆشان بۆ کوڕاڵی پیرۆزدا[24]، لە خۆ حسابکردن بە گروپی سۆفیەکان یان پاڵەوانەکان. هەر بۆیە ڕاگەیاندنەکەیان بەردەوام چۆنیەتی هەژمونی ئەو بابەتانەی لەسەر ئەدەبی ئەوروپی مۆدێرن دەرخستووە، ماوەیەکی زۆریش نییە سوریالیزم هەنگاوێکی سەرسامکەری ناوە لە بەکارهێنانی بابەتە ئەفسانەییەکان و سیمبوڵە سەرەتاییەکان.

لە بارەی ئەدەبی میللی کاریگەر لەسەر جەماوەر، ئەوا بونیادە ئەفسانەییەکەی بەڕونی دیارە. هەروەها هەموو ڕۆمانێکی میللی ململانێی نمونەیی نێوان پاڵەوان و تاوانکار و خێر و شەڕمان نیشان ئەدات: ئەوە بەرجەستە کردنێکی مۆدێرنی شەیتانە، هەروەها گەلێك بابەتی تر ئەدۆزینەوە لە ئەدەبی میللی و لە ڕۆماندا کە لە بارەی کچێکی ستەم لێکراوەوە، یان خۆشەویستیەك کە فریای دوو عاشق ئەکەوێت، یان ئەو سەرپەرشتیارە نەناسراوەی کە هەزاران بە خێو ئەکات و دەپارێزێت، تەنانەت لە ڕۆمانی پۆلیسیشدا وەك چۆن ڕۆجیە کیلۆی دەریخست *roger cillois* کە چەند بە پری ئەفسانەی تیا دیارە.

ئایا دەتوانین ئەوە پێشچاو خەین کە تا چ ڕادەیەك شیعری لیرکی ئەفسانەی وەرگرتووە و بەردەوامە لە بەکارهێنانی ئاماژەکانیدا؟ وای دەبینین هەموو شیعرێك هەوڵێکە شاعیر لە پێناو جارێکی تر خوڵقاندنەوەی زمان ئەیدات. بە دەربڕینێکی تر دەڵێین، لە پێناوی سڕینەوەی زمانی باوی ڕۆژانە و داهێنانی زمانێکی نوێ، زمانێکی تایبەتی و تاکە کەسی، کە دواجار زمانێکی نهێنیە. سەرەڕای ئەمەش داهێنان لە شیعردا وەك داهێنان وایە لە زماندا، پێویستی بە ڕەتکردنەوەی زەمەن و مێژوی چڕبوەوەی ناو زمانیشە. کە تەماحی ئەوەی هەیە بگاتە دۆخی فیردەوسی سەرەتایی، ئەو کاتانەی داهێنان بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی (عفوی) دەکرێت، یان ئەو کاتانەی ڕابردوو هیچ ئامادەییەکی نییە، چونکە هەست کردن بە زەمەن بونی نییە، بەم جۆرە یادەوەریەك درێژبونەوەی زەمەنی لەخۆ بگرێت بونی نیە.

لە رۆژگاری ئەمرۆیشماندا لەم جۆرە قسانە ئەوترێت، بەلای گەورە شاعیرێکەوە ڕابردوو هیچ ئامادەییەکی نییە، شاعیر جیهان ئاشکرا ئەکات وەك ئەوەی شایەتێکی خوڵقاندنی گەردون بێت، یان هاوچەرخی ڕۆژی یەکەمی خوڵقاندن بێت. لە ڕوبینایەکی (وجه نظر) تایبەتی ترەوە ئەتوانین بڵێین شاعیری مەزن جارێکی تر دائەڕێژێتەوە، چونکە وای ئەبینێت

زەمەن و مێژوو هیچ بونێکیان نیە، ئەم جۆرە قسانە بەشێوەیەکی سەیر وەك ڕەفتاری سەرەتایی، یان ڕەفتاری مرۆڤی کۆمەڵگا نەریتیە کۆنەکان دەخرێتە بەر باس.

بەلای ئێمەوە ئەرکی میتۆلۆجیای خوێندنەوە گرنگە بەشێوەیەکی تایبەت، چونکە بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆمانی تیا ئەبینینەوەو دەمانخاتە بەردەم دیاردەیەکی چۆنایەتی تایبەتەوە بە جیهانی مۆدێرن، کە زۆربەی شارستانیەتەکانی ڕابردوو بێئاگان لێی. خوێندنەوە هەر ئەوە نیە جێگەی ئەدەبی زارەکی هەڵقولاو لە ژیانەوە دەگرێتەوە، ئەوەی تا ئێستایش لە گوندەکانی ئەوروپادا سەرنجی ئەدەین. بەڵکو جێگەی گێرانەوەی ئەفسانەکانیشی گرتۆتەوە کە لەسەردەمە کۆنەکاندا هەبوو، لەوانەیە خوێندنەوە لە بینینی شانۆیش زیاتر ببێتە هۆی دابڕان لە درێژبونەوەی زەمەن، (لەوێشەوە دەرچون لە زەمەن)، ئیتر ئایا مرۆڤ مەبەستی بوو کاتەکەی بکوژێت بە خوێندنەوەی ڕۆمانێکی پۆلیسیەوە، یان بچێتە ناو جیهانێکەوە کە زەمەنێکی نامۆی هەیە، جیهانێك کە هەر ڕۆمانێك بخوێنیتەوە نوێنەرایەتی ئەکات، خوێندنەوە لەم حاڵەتەدا کار لەسەر فەرامۆشکردنی مرۆڤی مۆدێرن ئەکات بۆ دەرەوەی ڕەوتی خۆی و وای لێئەکات لەگەڵ هەندێك ڕیتمی تردا بڕوات و هەندێك مێژووی تر بژی. بۆئەوە خوێندنەوە ڕێگایەکی ئاسان پێك دێنێت، بە واتای ئەوەی کە دەکرێت بە نرخێکی سنوردار ئەزمونی زەمەن ڕێك و هەموار بکرێتەوە بەلای مرۆڤی مۆدێرنەوە. ئەمە بەلای مرۆڤی مۆدێرنەوە ڕابواردنێکی تایبەتیە تا ئەوپەڕی مەدای خۆی و بواری ئەو خەیاڵەی بۆ ئەرەخسێت کە کۆنترۆڵی زەمەن ئەکات، خۆی لە ڕەوتێك دەرباز ئەکات کە مردن ئەنجامێکی حەتمیەتی.

ئەم بەرگریکردنە دژی زەمەن کە هەموو ڕەفتارێکی ئەفسانەیی ئاماژەی بۆ ئەکات و پێداویستیەکیشە لە قولایی هەلومەرجی مرۆییدا، بە شاراوەیی ئەیدۆزینەوە لای مرۆڤی مۆدێرن، بە تایبەتی لە ڕێگای ئەو کارانەوە کە بۆ ئارەزوو ڕابواردن ئەنجام ئەدرێت، ڕێك لەم بوارەدایە جیاوازی بنەڕەتی نێوان کولتورە مۆدێرنەکان و هەموو شارستانیەتەکانی ڕابردووی پێ ئەپێون. هەر کارێکی بەرپرسانە لە کۆمەڵگا نەریتیەکاندا بکرایە نمونەیەکی ئەفسانەیی تیا ئەهێنرایەوە کە سنوری مرۆڤی تێئەپەڕاند و دواجاریش لە سەردەمێکی پیرۆزدا ئەنجام ئەدرا. ئەو کار و پیشانەی کە مرۆڤ ئەنجامی داون، وەك بەشداری کردن لە جەنگ، عیشق، شەیدایی.. هەمووی لە پیرۆزیەوە هەڵئەقوڵێت. هەر ئەوەی کە مرۆڤ جارێکی تر ئەوە بژێنێتەوە کە پاڵەوان و خوداوەندەکان لە سەردەمە کۆنەکاندا کردویانە خۆی بۆ خۆی دەلالەت لە بەخشینی پیرۆزی بە بونی مرۆڤایەتی ئەکات، وەك سەربارێك بۆ پیرۆزی گەردون. ئەم مرۆڤە کە پیرۆزی بەدەستهێنا، بەڕووی (زەمەنی مەزن)دا کرایەوە، توانای ئەوەی لا دروست بوو تا دوا ڕادە ماندوو کەشتەنگ بێت. بەڵام ئەم پیرۆزیە مانایەکی زۆری هەبوو بۆیە مرۆڤ بەخاتر جەمی خۆی قبوڵی کرد. بە گوێرەی ئەم دەربڕینە ئیتر مرۆڤ لەلایەن زەمەنەوە پاکتاو ناکرێت.

تێکشکانی ڕاستەقینە لە زەمەندا، لەگەڵ داماڵینی پیرۆزی لە کار دەستی پێکرد. لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا ئەو هەستە دروست بووە لای مرۆڤ کە زیندانی ئەو پیشەی خۆیەتی وا ڕۆژانە پێی ئەژی. هەر بۆیە لە توانایدا نیە لە زەمەن دەرچێت، هەروەها لە توانایشیدا نیە کاتەکانی خۆی بکوژێت لە کاتی کارکردندا. ئەو کاتەی هەست بە شوناسی ڕاستەقینەی خۆی ئەکات و چێژی لێ وەرئەگرێت. ئیتر ئەم مرۆڤە هێندەی پێی بکرێت تێئەکۆشێت بۆ ئەوەی لە کاتی بێکاریدا لە زەمەن دەرچێت، ئالێرەدایە ئەو ڕێژە بەرفراوانەی ئامرازەکانی ڕابواردن و کات بەسەربردن هاتۆتە ئاراوە کە شارستانیەتی مۆدێرن دایهێناوە. بە دەربڕینێکی تر هەر لە بنەڕەتەوە مەسەلەکان بەجۆرێك ئەڕوات تەواو پێچەوانەی ئەوەی لە کۆمەڵگا کۆنە نەریتیەکاندا هەبوو، کە تا ڕادەیەك ڕابواردنەکان هیچ ئامادەییەکیان نەبوو، چونکە (دەرچون لە زەمەن) ئەو کات هەموو لە ڕێگای کاری بەرپرسانەوە ئەنجام ئەدرا. هەر بەم هۆیەشەوەیە کە ڕەفتاری میتۆلۆجی، لای زۆربەی ئەو کەسانەی بەشداری ڕاستەقینەی ئەزمونێکی ئاینیان نەکردووە. لە ڕێگای ڕابواردن و ئامرازەکانی زەوق و خۆشیەوە ئاشکرا ئەبێت. سەرەڕای چالاکیە سەرەتاییەکانی وەك: خەونەکان، خەیاڵ، نوستالیژیا، ئەم قسانە بە واتای ئەوە دێت (کە تێکشکان لە زەمەندا) هاوڕێی داماڵینی پیرۆزیە لە کارو لە هەموو ئەو ڕەنگدانەوانەی تریش لە هاتنە ژورەوەی تەکنۆلۆجیا بۆناو بونی مرۆیی دێت. هەروەها ئەمە دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئازادیەك کەوا بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕوپۆشکراوە. دەمێنێتەوە بڵێین کە ڕاکردن لەو تێکشکانە تەنها هەڵبژاردنی مرۆڤە کە بکرێت لەسەر ئاستی دەستەجەمعی، کە لە خوگرتن بە ڕابواردن و ئامرازەکانی کات بەسەربردندا خۆی دەبینێتەوە.

وادیارە ئەم تێبینیانە بۆ لێکۆڵینەوەکەمان بەسە، ناتوانین بڵێین کەوا جیهانی مۆدێرن بە تەواوی ڕەفتاری ئەفسانەیی ڕەتکردەوە، بەڵکو تەنها لە بواری کارکردنیدا ڕەنگی داوەتەوە، کەوا ئیتر ئەفسانە زاڵ نییە بەسەر کەرتە سەرەکیەکانی ژیاندا، بەڵکو لە هەندێك ناوچەی قولایی ناخدا، لە چالاکیە کۆمەڵایەتیە ناوەندیەکاندا، هەتا لەو چالاکیانەی بەرپرسانە ئەنجام ئەدرێت چەپێنرا.

ڕاستە ڕەفتاری ئەفسانەیی لە کاری خۆی بەردەوامە بە ڕوپۆشکراوی و ژێرەوانکیێ، لە ڕێگای ئەو ڕۆڵەوە پەروەردە ئەیگێرێت، بەلام پەروەردە بە دیاری کراوی بایەخ بە تەمەنی منداڵێتی و نەوجوانی ئەدات. جگە لەمەش ئەو ئەرکەی کە پەروەردەی قوتابخانە پێی هەڵئەسا پێشکەش کردنی نمونەیەکە بۆ ڕەفتار کە ئێستا لە قۆناغی لەناوچوندایە، چونکە پەروەردەی مۆدێرن کەوتە هاندانی خۆبەخۆی ئەفسانە لە دەرەوەی ژیانی ئاینی ڕاستەقینەدا وەك ئەوەی لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، پاڵپشت و دەستگیرۆییەکانی بۆ ڕابواردن و کات بەسەربردن بەشێوەیەکی تایبەت پێشکەش ئەکات، هەندێك جار لەسەر ئاستی دەستەجەمعی بەهێزێکی زۆرەوە لە فۆرمی ئەفسانەی سیاسیدا دەرئەکەوێت[25].

بەپێی هەمان ڕوانگە ئەڵێین، ڕۆژێك دێت کەوا تێگەیشتنی ئەفسانە یەکێك لە دۆزینەوە گرنگەکانی سەدەی بیستەم پێك دێنێت.

ئیتر مرۆڤی وڵاتانی خۆرئاوا سەروەری جیهان نین، ئێستا لە بەرامبەر خەڵکانێکی گفتوگۆکار ئامادەیە، نەك هەر ئەوەندەی دانیشتوانی وڵاتە تازە گەشەکردووەکان بێت، شتێکی باشە گەر بزانێت چۆن دیالۆگیان لەگەڵ ئەکات. دەکرێت دان بەوەدا بنێن دابڕان لە نێوان (جیهانی سەرەتایی دواکەوتوو) و دانیشتوانی وڵاتە خۆرئاواییەکاندا نیە. ئێستا مرۆڤ هەر بەوەوە ناوەستێت کە هونەری لای زنجییەکان (خەڵکی دورگەکانی وڵاتە کەناریەکان) بدۆزێتەوەو پێی سەرسام بن وەك ئەوەی سەرەتای بیستەم هەبوو. پێویستە جارێکی تر سەرچاوە ڕۆحیەکانی ئەو هونەرانە بدۆزینەوە لە ناو دەرونماندا. پێویستە بزانین و ئاگامان لەوە بێت کەوا ئەفسانە چەندە لە ژیانی مرۆڤی مۆدێرندا ماوەتەوە. یان ئەو پاشماوانەی کە هەڵگری خەسڵەتەکانی ئەفسانەن لە ڕەفتاری مرۆڤدا، کە ڕەفتارێکی پڕ لە کەش و هەوای ئەفسانەییە. بەو مانایەی گوزارش لە دڵەڕاوکێیەك ئەکات بەرامبەر زەمەن، کە لە قوڵایدا پێویستییەکی بارودۆخی مرۆییە.

## پەراوێزەکان

*مێرسیا ئەلیاد: لە دیارترین زانای ئەفسانە ناس و بیریارێکی بەناوبانگی سەدەی بیستەمە.

1-زۆلۆ: چەند خێڵێکن لە باشوری ئەفریقا نیشتەجێن و ژمارەیان دەگاتە حەوت ملیون کەس، لە ساڵی 1879 لە بەرامبەر بەریتانیەکاندا بەرگریان کردو دوریانخستنەوە لە وڵات، دواتر کەوتنە ژێر ڕکێفی بەریتانیاوە. ساڵی 1899 زۆلۆ بە زمانی بانتۆ قسە ئەکات کەوا نیوەی کیشوەری ئەفریقای باشور قسەی پێئەکات.

2-هزیود: شاعیرێکی یۆنانی سەدەی هەشتەمی پێش زاینیە، کۆمەڵە شیعرێکی هەیە بەناونیشانی (نەوەکانی خوداوەند) بە شیعری ڕێنمایی کار و فێرکاری بەناوبانگە.

3-ئیشراق: بێداربونەوەیەکی خودی و دەروشانەوەیەکی ناوەکی و دەرونیە کە ڕێگە بۆ تێگەیشتن لە شتە ڕۆحیەکان خۆش ئەکات، سۆفیگەرەکان کاری لەسەر ئەکەن.

4-ڕێبازی پۆزەتیفیزم: ڕێبازێکی فەلسەفیە و لە بیریاری فەرەنسی ئۆگست کۆنتەوە دەست پێئەکات، ئەم ڕێبازە لێکۆڵینەوەی میتافیزیکی ڕەتئەکاتەوە، پێی وایە تێبینیکردنی واقع و ئەزمون کردنی تەنها بنەڕەتێکە بۆ فێربوون و مەعریفە.

5- *in illo tempore* دەستەواژەیەکی لاتینیە بە واتای "لەو زەمەنە کۆنەدا" دێت.

6-میرسیا ئیلیاد لە پەراوێزەکەدا قسە لەسەر "جیهانی مۆدێرن" ئەکات، مەبەستیشی چینە کۆمەڵایەتیە چالاکەکانی دانیشتوی شارەکانە، کەوا ڕوخسارە سەرەتاییەکانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ڕێگای فێرکردن و پەروەردەی فەرمیەوە پێکهاتووە.

7-ڕێبازی مێژووگەرایی شێوازێکی فەلسەفیە و هەموو ڕوداو و دیاردەیەکی مرۆیی، بە تایبەتی لە بواری بیر و باوەڕ و بەهاکاندا ئەگەڕێنێتەوە بۆ ناو چوارچێوەیەکی مێژوویی.

دامێنی بایەخی ئەم یاسایانە بهێنینە پێشچاوی خۆمان. لێرەوە دامێنی چەمکی "حساب" لەگەڵ خودی چەمکی زانستدا بەیەك ئەندازە بڵاوە و لەهەر شوێنێکدا کە بکرێت هەلومەرجەکانی پۆلێك ئەزمون بەهۆی کۆمەڵێك پەیوەندی دیاریکراوەوە راڤە بکرێن و لێرەوە بە تەواوی دیاریبکرێن، "حساب" بەکاردەهێنرێت. کوندیاك کە ئەم چەمکە زانستیە گشتیەی بۆ یەکەمجار لە وتاری "زمانی حسابدا" بەرونی فۆرمەلە کرد، لە دەروونناسیەکەیدا هەوڵیدا نمونەیەکی دیار و بەکارهێنانێکی پڕ بەرهەمی ئەم چەمکە بەدەستەوە بدات. لەلای کۆندیاك کە لایەنگری چەمکی دیکارتی دەرونی نامادی و رۆحانیە، گۆمانێك لەوەدا نیە کە تێڕوانینی راستەوخۆی ماتماتیکی بۆ ئەزمونە دەرونیەکان مومکین نیە، چونکە بەکارهێنانی راستەوخۆی چەمکەکانی چەندایەتی تەنها لە جێیەکدا بایەخی هەیە کە خودی بابەتی پشکنین لە کۆمەڵێك بەش پێکهاتبێت و بکرێت بابەتەکە لەو بەشانە دروست بکرێت. ئەمکارەش تەنها لە بواری جەوهەرە جەستەیەکاندا قابیلی کردنە کە وەك بڵاوبنەوەی روت پێناسدەکرێت، نەك لە بواری جەوهەری بیرکەرەوە "قابیلی دابەشنەکردن". بەلام ئەم روبەروبونەوە بنەرەتی و نەگۆڕەی نێوان جەستە و دەرون، ناتوانێت رێگرێکی بەهێز بێت لەبەردەم بەکارهێنانی رووتی زانینی شیکاریدا. ئەم بەکارهێنانە، جیاوازیە مادیەکان فەرامۆش دەکات، چونکە بەهۆی ئەبستراکتی شێوەکەی و روکەشبونی ماهیەتی کارکردنیەوە، لە رووی ناوەڕۆکەوە بە هیچ گریمانەیەك سنوردار ناکرێت. تەنانەت گەر نەکرێ ئەزمونی دەرونی وەك ئەزمونی جەستەیی بۆ چەند بەشێك دابەشبکرێت، لە رووی خەیاڵەوە ئەم ئەزمونە بۆ رەگەزە پێکهێنەرەکانی شیدەکرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەوەندە بەسە فرەیی روکەشیانەی ئەم دیاردەیە لەناوبەرین، لەو رێگەیەوە کە دەریبخەین ئەم ئەزمونە خوڵقاوێکی بەردەوامی سەرچاوەیەکی هاوبەشی هەموو دیاردە دەروونناسیەکانە. کۆندیاك بۆ بەڵگاندن ئەو نمونە بەناوبانگە دەهێنێتەوە کە دەکەوێتە ناوەندی دەروناسیەکەیەوە. واتە گریمانەی پەیکەرێکی مەڕمەڕی دەکات و رونیدەکاتەوە چۆن ئەم پەیکەرە هێواش هێواش زیندوو دەبێتەوە و لەسەرخۆ ناوەڕۆکێکی رۆحانی دەوڵەمەندتر پەیدا دەکات، چونکە یەك بەیەکی هەستەکان، چۆنایەتیە تایبەتیەکانی خۆیان لەسەر مەڕمەڕەکە دەکێشن.

کۆندیاك هەوڵدەدات دەریبخات کە زنجیرەی بەردەوامی "کاریگەریەکان" و تەرتیبی زەمەنی دەرکەوتنیان، بۆ دروستکردنی کۆی ئەزمونێکی دەرونی و دروستکردنی ئەم ئەزمونە بەهەموو دەوڵەمەندی و ناسکیەکانیەوە، بەسە. ئەگەر ئێمە بتوانین ئەزمونی دەرونی بەمشێوەیە دروستبکەین، لە هەمانکاتدا ئەم ئەزمونەمان بەهۆی چەمکی چەندایەتیشەوە، راڤە کردووە. بەلام هەموو ئەو شتانەی ئێمە ناوی دەنێین واقعی دەروونی و بەو ناونیشانەشەوە ئەزموونی بکەین، لە بنەڕەتدا دوبارەکردنەوە و گۆڕانی جۆرێك چۆنایەتی دیاریکراو دەریەت کە لە سادەترین تێگەیشتنی هەستیدا هەیە. تێگەیشتنی هەستی سنوری نێوان مەڕمەڕی

بێگیان و بونەوەری زیندوە کە خاوەنی دەرون بێت. بەڵام هەر ئەوەندە لەم سنورە تێپەڕی، چیدی پێویستمان بە گریمانەی زیاتر یان داهێنانێکی لە بنەڕەتدا تازە نیە. ئەوەی ئێمە بەشێوەیەکی باو بە توانا "مەزنترەکانی" هزری ناودەبەین و لە بەرامبەر هەستدا دایدەنێین، لە بنەڕەتدا تەنها گۆڕانی رەگەزی سەرەکی تێگەیشتنی هەستییە. بیرکردنەوە و داوەریکردن بەشێوەیەکی گشتی، ویستن و ئیرادەکردن بەشێوەیەکی گشتی، هەموو تواناکانی خەیاڵ و هەموو داهێنانە هونەریەکان، ئەگەر لە رووی چۆنایەتیەوە تاوتوێبکرێن، هیچ شتێکی تازە و لە بنەڕەتدا جیاواز، بۆ ئەم رەگەزە سەرەکیە زیاد ناکەن. هزر نە شتێك دەخوڵقێنێ و نەشتێك دادەهێنێ، کاری هزر دوبارەکردنەوە و بینایە. بەڵام دەتوانێت لەم دوبارە کردنەوەیەدا دەسەڵاتێکی بەگشتی بێسنور لە خۆی پیشانبدات. ژیان دیاردەیەك تا هەر کوێیەك بووە پەرەپێدەدا، لە بێسنوری کات و شوێن تێدەپەڕێت، لەگەڵ ئەمەشدا لە دەرونی خۆیدا سەرقاڵی دروستکردنی شکڵی تازەیە. بەڵام هزر لە هەموو چالاکیەکانیدا تەنها سەرنج لە خۆی و "خەیاڵە سادەکانی" خۆی دەدات. ئەمانە کۆمەڵێك زەمینەی پتەون کە هەموو ئەو بینایەی هزر دروستی دەکات – چ لایەنە "دەرەکیەکان" و چ لایەنە دەرونیەکان – لەسەر ئەو دامەزراون و هزر هەرگیز ناتوانێت لەم زەمینە بچێتە دەرەوە.

هەوڵدانی کۆندیاك بۆ پیشاندانی ئەم مانایە کە واقعی دەرونی بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لە گۆڕان و گۆڕانکاری تێگەیشتنی هەستی سادە، لە کتێبی "لەبارەی هزرەوە" بەرهەمی هلۆسیۆس، بەردەوام دەبێت. کاریگەری ئەم کتێبە لاوازە و ناداهێنەرە، بەسەر نوسینە فەلسەفیەکانی سەدەی هەژدەدا بەمشێوەیە روندەکرێتەوە کە ئەم کتێبە رەگەزێکی سەرەکی بیرکردنەوەی ئەو سەردەمە بە رونیەکی پڕ ماناوە، ئاشکرا دەکات، و تەنانەت لەم ئاستەشدا زیادەڕەوی دەکات و وێنەیەکی پڕوپوچی ئەو بیرکردنەوەیە پیشاندەدات. لەم زیادەڕەویەی هلۆسیۆسدا سنورداریێتی ئەبستۆلۆجی و مەترسی شاراوەی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بە ئاشکرا دیارە. سنورداریێتیەکەی لە جۆرێك رەوتی بەیەك ریتم کردندایە کە دوور نیە نکوڵی لە دەوڵەمەندی هۆشیاری مرۆڤ بکات و بەجۆرێك بەرگی گۆڕینی لەبەرچاو بگرێت. بیرکردنەوەی شیکاری ئەم بەرگە گۆڕاوە لەبەر دیاردە دەرونیەکان دادەکەنێت، ئەم دیاردانە رووت دەکاتەوەو بەمکارەش چونیەکییان لە روتیدا، لە بری فرەیی روکەشی و جیاوازی دەرونیان، ئاشکرا دەکات. جیاوازییە روکەشی و جیاوازی بەهاکانیان لەناو دەچێت. لە ئەنجامدا لە بواری دیاردە دەرونیەکاندا چیدی ناکرێ باسی پلەی "مەزن" و "کەم" یان "بڵند" و "نزم" بکرێت. هەموو شتێك لە یەك ئاستدایە و لە رووی بەها و بایەخەوە، یەکسانن. هلۆسیس ئەم هێڵی بیرکردنەوەیە بە تایبەتی لە بواری ئەخلاقدا دەباتە پێشێ. مەبەستی سەرەکی ئەو لەناوبردنی هەموو جیاوازیە دروستکراوەکانە کە رێکەوتن دروستیکردوون و بە توندی هەوڵی پاراستنی دەدەن. لە هەر شوێنێکدا کە ئەخلاقی

كلاسيكى باسى پۆلێكى تايبەتى لە هەستە "ئەخلاقيەكان" دەكات، لە هەر شوێنێكدا ئەم ئەخلاقە جۆرێك "هەستى هاودەردى" رەسەن لاى مرۆڤ دەدۆزێتەوە كە بەسەر شەهوەتە جەستەيى و خۆويستيەكانى مرۆڤدا زاڵ دەبێت و كۆنترۆڵيان دەكات، هلۆسيوس هەوڵدەدات پيشانيبدات ئەمجۆرە گريمانيە لەگەڵ واقعى سادەى هەست و كردارى مرۆييدا، نايەتەوە. هەر كەسێك بێ پێشداوەرى لەم واقعە نزيك بێتەوە، دەبينێ ئەو دواليزمە روكەشيە راست نيە. هەميشە و لە هەموو شوێنێكدا هەمان وروژێنەرى چونيەك دەبينێ. دەبينێ هەموو ئەو چۆنايەتيانەى بە لێبوردن و گەورەيى و فيداكارى ناودەبەين، جياوازيان لەگەڵ ئارەزوە سەرەتاييەكانى سروشتى مرۆڤدا، لەگەڵ شەهوەتە "دزێوەكاندا"، تەنها لەناودايە نەك لە واقعدا. هيچ مەزنيەكى ئەخلاقى بڵندتر لەم ئاستە بوونى نييە، چونكە ئامانجەكانى ئيرادە چەند بڵنديش بن، و هەر بەهايەكى سەرو سروشتى سەرو هەستى كە ئيرادە وێناى بكات، ئەوا هەر مەيدانى كارەكەى هەمان بازنەى بەرتەسكى خۆويستى، زۆرويستن و لەخۆرازيبوونە. كۆمەڵگا لە سەركوتكردنى ئەم ئارەزووە سەرەتايانەدا سەرناكەوێت، بەڵكو تەنها بڵنديان دەكاتەوە و تا ئەو جێگەيەى كە كۆمەڵگا كاركردنى خۆى دەناسێت، ئەمە دوا ئاستى چاوەڕوانى يان تكايە كە كۆمەڵگا كاركردنى خۆى دەناسێت، ئەمە دوا ئاستى چاوەڕوانى يان تكايە كە كۆمەڵگا لە تاكەكەسى بكات. لێكۆڵينەوەى تيوريش دەبێت هەر لەم ديدەوە ئەنجامبدرێت.

بەبڕواى هلوسيۆس نە لە پۆلى بەها ئەخلاقيەكاندا پلەوپايەى سەرەكى هەيە، و نە وێنەى تيوريش خاوەن پلەى بونياديە. بە پێچەوانەوە هەموو ئەم جۆرە جياوازيانە بەهەمان بێلايەنى هەست، راڤەدەكرێن. هێزەكانى هەڵسەنگاندن و ناسين، خەياڵكردن و بيرەوەرى، تێگەيشتن و عەقڵ، بەهيچ شێوەيەك هێزگەلێكى رەسەن و تايبەتمەندى دەروونى مرۆيى نين. لێرەشدا ئێمە ديسان توشى هەمان هەڵەبووين. واتە وا دەزانين لە پلەى تێگەيشتنى هەستى، سەروتر رۆيشتووين، لە كاتێكدا تەنها روكەشى ئەم هەستەمان كەمێك گۆڕييوە. ئەو رەخنەيەى نكوڵى لەم گۆڕانە دەكات، لە جياوازى تيوريش دەگيرێت. دەكرێ هەموو كردارەكانى هزر بە هەڵسەنگاندن راڤە بكەين و هەڵسەنگاندنيش هيچ نيە جگە لە تێگەيشتن لە چونيەكى و جياوازى وێنا تاكانەييەكان. بەڵام ناسينەوەى چونيەكى و جياوازى، روداوى كردارى هوشيارى رەسەن، بە پێشگريمانە وەردەگرێت كە لەگەڵ چۆنايەتى هەستيدا لەيەكدەچێت، يان چونيەكە. " من داوەريدەكەم يان تێدەگەم كە لە نێوان دوو شتدا ئەوەى من ناوى دەنێم "قوڵ" كاريگەرى لەسەر من جياوازە لەو شتەى كە ناوى دەنێم "بست"، ئەو رەنگەش كە من ناوى "سورى" لێدەنێم كاريگەريەك لە چاوم دەكات جياواز لەوەى كە ناوم ناوە "زەرد". كەوابوو لێرەوە دەگەمە ئەو ئەنجامەى كە لەم حاڵەتانەدا هەڵسەنگاندن هەمان دەرككردنە". وەك دەبينين لێرەدا بيناى بەها ئەخلاقيەكان و بونيادى پلە لۆژيكيەكانى زانين، هەردوكيان وێران دەبن. هەردوو

بونیادەکە تەخت دەبن، چونکە وادەزانرێت کە تاکە بینای پتەوی زانین بریتیە لە هەست.

هەڵەیە گەر وا بزانین ئەو دیدە سەرەکیەی هلۆسیوس دەریدەبڕێ، ناوەڕۆکێکی نمونەیی فەلسەفەی رۆشنگەریە. ئەمە هەڵەیەکە زۆر رودەدات. هەروەها هەڵەیە ئەم دیدە بە نمونەی بیرکردنەوەی نوسەرانی "ئەنسکلۆپیدیا"ی فەرەنسا بزانین. چونکە توندترین رەخنەکان لە کاری هلۆسیۆس هەر لەم قوتابخانە فکرییەوە ئەنجامدرا، و سەرچاوەی ئەم رەخنانەش باشترین هزرەکانی ئەدەبیاتی فەلسەفی فەرەنسا بوون، وەك تۆگۆ و دیدرۆ. بەلاّم ناکرێت نکوڵی لە خاڵێك بکرێت کە ئەویش ئەوەیە لە کاری هلۆسیۆسیش وەك کۆندیاك، شێوازێکی تایبەت دەردەکەوێت کە خەسڵەتی تایبەت و دیاریکراوی سەرتاسەری سەدەی هەژدەهەمە. لێرەدا ئێمە رووبەرووی شێوەیەك بیرکردنەوەین کەدەستکەوتە پۆزەتیڤ و سنورداریە دەرونیەکانی، سەرکەوتن و شکستەکانی، وەك ئەوە وایە لە پێشەوە لە چارەی نوسرابێت.

### سەرچاوە

وەرگێرانی بەشێکی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە: (ارنست کاسیرەر: فلسفه روشن اندیشی. ترجمه: نجف دریابندری. انتشارات خوارزمی چاپ اول. تهران اسفندماه 1372.

# پزیشکانی ئەسینا سەرەتای زانستە پزیشکییەکانی یۆنان

ولیەم داڤیز

لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

کە بەناو شارەکەدا دەگەڕێن، ناتوانین سەرسام نەبین بەو پزیشکە بە شەوکەت و شیکانەی لەوێ هەن. ئەوانە پۆشاکی ڕێك و شیکیان پۆشیوە و سیمای تایبەتی خۆیانیان هەیە. لاوان هەروا لە خۆیانەوە گەورە نابن، بەڵکو سوپاس بۆ وەرزشگا و ژیانی ڕێکوپێکی وەرزش، بەهۆی وەرزش و شێوازی گوزەرانیانەوە، ئەوانە ژیانێکی تەندروست و سەرنجڕاکێش بەسەر دەبەن. لەوێ ژمارەی پیاوانی پیری تەندروست و لەشساغ زۆرە، ژمارەی ئەوانەی پەکیان کەوتووە زۆر کەمترە لە ژمارەی ئەو پەککەتووانەی لە کۆمەڵگا پێشکەوتووترەکانی دواتردا بەرچاو دەکەون[1]. وەلێ ئەسینایییەکانیش بونەوەری مردەن، ئەوانیش گیرۆدەی نەخۆشیی خراپ دەبن، بۆیە پزیشك ئەندامێکی بێسوودی ناو کۆمەڵگاکەیان نیە، گەرچی پلە و پایەکەی زۆر لەوە نزمترە کە لە سەردەمانی دواتردا بەدەستی دەهێنن.

کاری پزیشك و نەشتەرگەرەکانی یۆنان لە کارەکانی هۆمیردا بەرچاو دەکەوێت، بڕێك زانیاریی کردەیی بەرچاویان هەیە کە لە ئەزمونی سەخت و درێژخایەنەوە بەدەستهاتوون، بەشێوەیەکی بەرچاویش چەردەیەکی زۆر خورافە و شتی وایان تێکەڵ بووە. بۆ پزیشکان ئەوە کارێکی زۆر گرنگ بووە کە نزا و نیایشی گونجاوو ئەفسونە لە بارەکان بزانن بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە وا لە ئەپۆڵۆ بکەن نەخۆشەکان چاکبکاتەوە. وەك چۆن شارەزاییشیان هەیە لە ناسینی گژوگیا و برینپێچیدا بۆ ئەوەی زامەکان زیاتر هەو نەکەن. هۆمیر باسی ئەسکلیپیەس دەکات، کە لە سەردەمانی زوودا خواوەند نەبووە، بەڵکو چاککەرەوەیەکی شارەزا بووە. ئیتر هەتا لە کاتە مێژوویییەکانەوە بەرەو پێشەوە بێین، کاری پزیشکی ڕێکوپێکتر دەبێت. پایەی ئەسکلیپیەس بڵند دەبێتەوە تا دەبێتە خواوەندێکی ناسراو، وەلێ هەتا دەوروبەری ساڵی 420ی پێش زایین، یۆنانەکان بەشێوەیەکی ڕەسمی پەرستشیان بۆ نەکردووە. ئەو کاتەش ماوەیەکی درێژبوو لە ئەسینا

پیشـەی پزیشـکی و نەشـتەرگەری جێگایـەکی شایسـتەی لـە نێـوان زانسـتەکاندا وەرگرتبـوو. پیاوە نەخۆشەکان دەرفەتێکی باشیان هەبوو تا مامەڵەیـەکی چـاك لەگـەڵ نەخۆشـییەکانیاندا بکرێـــت و جادووگـــەر و جنۆکـــە بـــازە سەرسەختەکان ژیانیان لێنەدەسەندنەوە.

**مەزارەکانی چاکبوونەوەو میتۆدەکانیان**

لە ئەسیناو چەندین شاری دیکەی یۆناندا سـاناتاریای راسـتەقینە[2] هـەبوو، ئەمانـە پەرسـتگای تـەرخانکراو بـوون بـۆ خواوەنـدی چـاکردنەوە (بەگشـتی ئـەو خواوەنـدە ئەسکلیپیەس بوو، بەڵام هەندێجاریش ئەپۆڵۆ، ئەفرۆدایت، یان هیرا بوو). دەبێت نەخۆش شەو لە نـاو پەرسـتگادا بنوێـت، خواوەندەکـەش لـە خەونیدا سـەردانی دەکـات و پێـی دەڵێت چۆن چـۆنی چـاك دەبێتـەوە. دیـارە فـرت و فێـڵ و سـاختەکارییەکی زۆر لـە مەسـەلەکەدا هەیـە. کەشیشـە داناکـان زۆر شـت دەزانـن و دەتـوانن کاریگـەرییان لەسـەر نەخۆشـان هـەبێت و حاڵـەتێکی ئەندێشـەییان لا دروسـتبکەن و کـارێکی وەهـا بکـەن کـە نـەخۆش وابزانێـت لـە خەونیدا پێیوتراوە چیبکات[3]. وێڕای ئەوەش زۆر بەچـاکی نەخۆشـەکە قایلـدەکات کـە بـە دڵنیـایی چـاکدەبێتەوە، کەسـیش جگـە لـە خواوەند داودەرمانەکانی بۆ دیاری نەکردووە. بەڕاستی ئـەم چـاکردنەوە ئاوەزییـە شایسـتەی نرخاندنە. هەر لە پەرستگادا پزیشکی کارامەی لێیـە تـا خـەون "لێکبداتـەوە" و نەخۆشـیش دەرفەتی ئەوەی هەیە ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە بۆ چارەسەرکردن بە خۆشوشتن لە گەرماوەکان، خاوێنبوونەوە، ڕێجیمکردن، خۆ هەڵکێشان لـە ئـاوی کـانزایی، لـە ئـاوی دەریـا، هـەموو جۆرەکـانی مەشـقی هـێمن و سـووك، هتـد. بەشداریکردن لـە چارەسـەرەکانی نـاو پەرستگا، هیچ نیە جگـە لـەوەی ئـەو کەسە فریـو دەدرێـت. ڕێـی تێدەچـێت ژمارەیـەکی زۆر لـەو نەخۆشـە دێرینانە چاك بووبنـەوەو پێزانینی خۆیان بەوە دەربڕیبێـت کـە نـەزرێکیان کردبێـت و شتێکیان بە دیواری مەزارەکەوە هەڵواسیبێت[4]، زۆر جار ئـەو شـتە نیگـاری ئەندامـە نەخۆشـەکەی جەستەیان بووە کـە خۆشبەختانە چاکبۆتەوە، یـان بـە نوسـین باسـی سروشـتی ئـەو نەخۆشـییەیان کـردووە کـە تووشـی هـەناویان بـووە. ئەمـەش هانـدەرێکی باشـبووە بـۆ ئـەو نەخۆشـانەی دواتـر پێویسـتیان بـەوێ دەبێـت، چـونکە دڵنیـا دەبـن لـەوەی کـە زۆر حاڵـەتی هاوشـێوەی حاڵەتەکـەی ئـەوان چاکبوونەتەوە. بـەڵام سـەردانی پەرسـتگاکانی چـاکبوونەوە مەسرەفی گرانە و هەمووانیش باوەڕی تەواویان پێیـان نیـە، هۆکەشـی ئـەو نەخۆشانەیە کـە لـەو شـوێنانەدا چاکبوونەوەیان بـە نسـیب نـەبووە. کەواتـە بـا سـەرنجێك لـە کـاری یـەکێك لـە پزیشکەکان بدەین.

**ئۆفیسی پزیشکێکی ئەسینایی**

لە ئەسینا چەندین پسپۆڕی پزیشکی گشتی هـەن و کرێـی باشـیش وەردەگـرن، هەنـدێك شـوێنی وەکـو تیمارخانـەش هەیـە کـە تێیانـدا هەنـدێك حاڵـەتی ئاسـان بـێ بەرامبـەر چارەسـەر دەکـرێن. بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی پیـاوانی ئەسینا پێیان باشە پزیشکی تایبـەتی خۆیانیان

هەبێت[5]. بابچین بۆ ئۆفیسەکەی مسنۆن "پزیشکێکی پراکتیکیستی ناسراوە" بۆ ئەوەی پشکنینمان بۆ بکات. ئۆفیسەکە زیاتر لە دووکانێکی کراوە دەچێت لە بەشی پێشەوەی خانوویەکدا لە نزیکی ئاگۆرا، ئەویش دیسان وەکو سەرتاشخانە شوێنی هاتوچۆو حەوانەوەی خەڵکە. پزیشکەکە یەك یان دوو قوتابی لاوی لایە (لە قۆناغی مەشقکردندان بۆ ئەوەی ببن بە پزیشك)، هەروەها یەك دوو کۆیلەشی لایە بۆ کوتان و ئامادەکردنی داودەرمانەکان. جۆرەها کیسە و توورەکەی پڕ لە گژوگیای وشککراوەو شووشەی بچووکی پڕکراو بە دیوارەکاندا هەڵواسراون. لەبەردەمی دەروازەکەدا پەیکەرێکی ئەسکلیپیەسی شیفابەخش دانراوە، لەگەڵ پەیکەری هیپۆکراتێسی مەزن کە دامەزرێنەری راستەقینەی زانستی پزیشکییە لە یۆنان.

مینۆن خۆی ئامادەکردووە بچێت بە دەنگ نەخۆشێکی تایبەتییەوە، پیاوێکی قۆزە لە ناوەڕاستی تەمەنیدایە، سەرو سیمای سام و هەیبەتێکی زۆریان پێوە دیارە هیمەیشنەکەی بەری جوان نەخشێنراوە. ئەنگوستیلەیەکی لە پەنجەدایە نقێمەکەی لە گەوهەرێکی بەنرخ دروستکراوە، ردێنی بە جوانی قەڵەمکردووە، تازە خۆی شوشتووە و بۆنی سمڵ و مێخەکی لە خۆی داوە. ئەو بە رۆحێکی ئاسودەوە دەڵێت من کەسێکی سادەم، بەڵام نەخۆشە ساویلکەکانم پێویستیان بەوە هەیە بە هەیبەت و شان و شەوکەت بێمە بەرچاویان. مینۆن خۆی قوتابی هیپۆکراتێسی مەزن بووە[6]، نزیکەی هەموو پزیشکێکی خاوەن شۆرەت لە یۆنان خۆی بە قوتابی هیپۆکراتێس لە قەڵەمدەدات. مینۆن کەم تا زۆر لە پەرستگاکەی ئەسکلیپیەس خوێندوویەتی، لەوانەشە ئەندامی ئەو ستافە پزیشکییە بێت کە سەر بەو پەرستگایەن. هەروەها ئەندامی برایانی هیپۆکراتێسیشە، کە رێکخراوەیەکی نیمچە نهێنییە، پەیوەندی هەیە بە رێورەسمی ئەسکلیپیەسەوە، ئەوانە بە دڵشادییەوە شکۆدەبەخشن بە پسپۆڕییەکەی خۆیان و نهێنییەکانی هونەرەکەیان بە شاراوەیی رادەگرن.

## سوێندی پزیشکان

ئەو سوێندەی ئەم رێکخراوی برایانە خواردوویانە، سوێندێکی ماقووڵ و خانەدان بووە، ئەمە بەشێکە لەو کۆت و پێوەندانەی بۆ خۆیانیان دیاریکردووە:

(سوێند دەخۆم بە ئەپۆڵۆی پزیشك و ئەسکلیپیەس و هێگێیا "خاتونی تەندروستی"و پاناسێیا "خاتونی شیفابەخش" دایك و باوکم شەرافەتمەند بکەم، ئەوان فێری ئەم هونەرەیان کردووم، هەروەها منیش پابەندبم بەوەوە کە کوڕەکانی خۆم فێر بکەم، ئەوانەش کە دەبن بە قوتابیم، هەروەها ئەوانەی سوێندی پزیشکییان خواردووە، جگە لەوان کەسی دیکە نا. من ئەمکارە بۆ بەرژەوەندی نەخۆشەکانم دەکەم و ئەوپەڕی توانا و کارامەییشم بەکاردەهێنم، لە هەموو شتێکی ژاناوی و زیانبەخش چاکیاندەکەمەوە. تەنانەت ئەگەر داواشم لێبکرێت، هەرگیز ژەهر ئامادە ناکەم و بەکاری ناهێنم و ئامۆژگاریی کەسیش

ناکەم بەکاری بهێنێت. هیچ شتێکی تاوانکارانە بەرامبەری ئافرەت ناکەم. نیکی و شکۆداریی هونەرەکەم دەپارێزم. بۆ هەرکوێ بچم، خۆم بە دوور دەگرم بە خراپە و گەندەڵی دەپارێزم. ئەم سوێندە ناشکێنم، بەڵکو خواوەندان لە هونەرەکەمدا سەرمبخەن. ئەگەر سوێندەکەم شکاند، لەوانەیە چی خراپە بەسەرم بێت"[7].

### کارامەیی پزیشکی یۆنانی

کارامەیی مینۆن وەك پزیشك و نەشتەرگەر شتێکی بەرچاو و حاشاهەڵنەگرە. راستە، ئەو زانیارییەکی زۆر کەموکورتی دەربارەی زانستی توێکاریی هەیە، زانیارییە تیۆرییەکانی کاڵوکرچن، بەڵام مرۆڤێکی هۆشمەندە و زانیارییە پراکتیکییەکانی کەم نین. یاریدەدەرەکانی لە دەرمانخانە تایبەتییەکەیدا، بڕێکی زۆر داودەرمانیان ئامادەکردووە، ئەویش دەزانێت چۆن بە وریایی و لێهاتوویی بەکاریان بهێنێت. شارەزاییەکی بەرچاوی هەیە لە تیمارکردنی برین و وەرگەڕانی دەماردا، لە نمونەی ئەوانەی لە شەڕ و شۆڕ و پێشبڕکێکاندا روودەدەن. ئەو لەوە تێدەگات کە دایکی سروشت شیفابەخشێکی مەزنە، پێویستە یاریدەی بدرێت نەك کاری ناسازی بەرامبەر بکرێت، پێشی خۆش نیە هانا بباتە بەر دەرمانی توندوتیژانە، لە نمونەی خوێن لێهێنان و بەزۆر رشاندنەوە. دەتوانێت تالێهاتن و شتی دیکەی ئاسایی سەرکەوتووانە چارەسەر بکات. ئەو هێورکەرەوەی مۆدێرن یان ئەفیونی لا دەستناکەوێت، بەڵام چەند دەرمانێکی دیکەی لە گیا دروستکراوی لایە. دەتوانێت نەخۆشی ئاسانی چاو چاکبکاتەوە، دەزانێت کیفی زێڕین بۆ ددان دروستبکات. کەلوپەلەکانی نەشتەرکاری بەردەستی زۆر سەرەتایین. خۆی کەسێکی زۆر پاکوتەمیزە، بەلام هیچ دەرمانێکی دژی هەوکردن و بۆگەنکردن ناناسێت، بۆیە زۆرجار کە بانگهێشتی دەکەن بۆ ئەو نەخۆشییە هەناوییانەی پێویستیان بە نەشتەرگەریی قووڵ هەیە، دەستەپاچە دەبێت و دۆش دادەمێنێت و رازی نابێت دەستبکات بە هەڵدڕین، ئەگەر بیشیکات ئەوە بواری قوتاربوونی نەخۆشەکەی زۆر کەمە[8]. بە کورتی شارەزایی لە دەرمانکردندا لە نەشتەرگەریکردن زیاترە.

بەشێوەیەکی سروشتی، مینۆن خۆی بە باشترین خێزانەکانی ئەسیناوە خەریکدەکات و داهاتێکی زۆرباشی هەیە. پێیوایە توانستە لۆجیکی و رەوانبێژییەکانی هۆیەکن بۆ قایلکردنی نەخۆشەکانی و رازیکردنیان بە شێوازێکی تیمارکەران کە بەلایانەوە ناخۆشە. بۆ ئەم مەبەستەش بەشێوەیەکی ناڕەسمی چەند وانەیەکی لە ئایزۆکراتێسی هاوەڵی وەرگرتووە. هەندێك لە هاوچەرخانی مینۆن (کە هەستدەکەن ئەو لەوان زمانپاراوترە) رەوانبێژێکیان بەکرێگرتووە بۆ نەرمکردنی نەخۆشە کەللە رەقەکان، بۆئەوەی بە ئارگیومێنتی فریودەرانەی رەونەقدار رازییان بکەن بەوەی بەشێك لە جەستەیان ببڕنەوە[9].

دیارە نەخۆشە هەژارەکان بایەخێکی رۆشنبیریی ئەوتۆیان پێنادرێت، ئەوانەی لە عەیادەکەی مینۆن ئاپۆرایان بەستووە، ئەوان ناتوانن کرێی ئەوەی بدەنێ کە خۆی بەتایبەتی

برینپێچیان بۆ بکات، بۆیە دەخرێنە بەردەستی یەکێك لە شاگردە کەمتر کارامەکانی. کۆیلە دەرمــان تێکەڵکـــەرەکانیش دەرمـــان دەدەن بەوانــەی ســەر بــە چـینەکەی خۆیـانن، بـەڵام وادیارە یاسایەك هەیە کە ڕێگەنادات ئەوانە تەداوی پیاوە ئازادەکان بکەن.

## پزیشکە قۆڵبڕ و ئۆینبازەکان

بۆ بەدبەختی هەموو کەسێك ئەوەندە دانا نییە تاوەکو مینۆن کارامە و پسپۆڕ ببێت. وا دیارە یاسایەکی ئەوتۆش لە ئارادا نیە دژی ئەوانەی حەزدەکەن یان خۆیان وا پیشاندەدەن کە پزیشکن و لە خۆیانەوە دەستدەکەن بە فرۆشـــــتنی داودەرمــــــان و چارەســـــەر. دەرمانفرۆشـی دەسـتگێڕ لـە هـەموو چەشـنێك هــەن، هــی واش هەیــە کــە ســەرقاڵی شــتی پڕوپووچ و جادوگەرییە و خەریکی دەستبڕی و چاوبەســتن. لــە بــازاڕ دنیایــەك لــەو مرۆڤــە لەخشــتەبەرانە هــەن و گاڵتــەیان بــە هــەموو تەداوییەکی پسپۆڕان دێت. هەندێکیان لەوەش زیـــاتر دەڕۆن و قەشمـــەری بـــە زانـــین و لێهاتوویـــەکانی ئەسکلیپیەســـیش دەکـــەن. ئەوەتا پارچە شیعرێك دەڵێت:

مێنێدێمۆسی نەشتەرگەر وەك دەڵێن

وەك پەیکەرە مەڕمەڕە سپییەکەی زیۆس هیچی لە دەست نایەت

لای ئــەو جامبازانــە خــەوبینینیش شــتێکی مەترسیدارە:

دۆفانتێس لە خەونیدا هێرمێسی پزیشکی بینی ئیتر لەو خەونە کوشندەیە بێدارنەبۆوە.

هەرچـۆنێك بێـت وێـرای هەوڵـە نایابـەکانی مینـــۆن و نیەتـــە باشـــەکانی، تەندروســـتی باش سامانێکی گەورەیە و لای ئەسینایییەکان شــتێکی بــاوە. مەشــقی بــەردەوامی نــاو جیمنازیــا، خزمــەتی ناوبــەناو لــە ســوپا، نــەبوونی کــاری نــاو ئۆفیســی خــراپ بــۆ ماســولکەکان، کەشــوهەوایەك کــە لــە دەرەوە بـوون تێیـدا شـتێکی خۆشـە، ئەمانـە هـەموویان مایـەی تەندروسـتی چـاکی ئەسـینایییەکانن و قــــەرەبووی بەشــــێکی زۆری نــــەبوونی پزیشکییەکی چاکیان بۆ دەکەنەوە.

### پەراوێزەکان

1-بەڵگــەی کــەم بــەڵام قایلکەرانــە دەربــارەی تەندروستبوونی یۆنانییەکان لە ئەدەبەکەیاندا ئاماژەی پێکراوەو باس لە نەخۆشی ددان ئێشەش کراوە، کە نەخۆشییەکی باوە.

2-نێودارترینیـــان ئیپیـــداورۆس بـــوو، لـــەوێ بەشـێوەیەکی بەرچـاو نـەریتی ئەسـکلیپیەس تێبـینی دەکرێت.

3-لای ئەرســــتۆفانێس و پلوتــــۆس نوســــتنی چــاکبوونەوە لــەو پەرســتگایانەدا شــتێکە مایــەی گاڵتەجاڕی (چەند پەرەگرافێکی دیار لەم بارەیەوە لە: *Daviss "Readings in Ancient History," vol. I, pp. 258-261*) دا تۆمارکراوە.

4-بەشـــێوەیەك لـــە شـــێوەکان وەك ســـەردانی کاسـۆلیکەکان بـۆ مـەزارەکان وەهایـە، وەك مـەزاری لۆردێس کە ئەمڕۆ دەچن.

5–شتێکی تاڕادەیەك کەم دەربارەی ئەو پزیشکە میللییانە دەزانین، دەشێت ئەوانە بەشێوەیەکی سەرەکی لە گەلەکەشتی و سوپاکاندا کاریان کردبێت و جۆرەها نەخۆشییان چارەسەر کردبێت.

6–هێشتا زیندوو بوو، زۆر پیرببوو، لە سالّی 357ی پێش زاییندا لە تیسالی مرد و دەڵێن تەمەنی 104 سالّ بووە.

7–بۆ وەرگێڕانێکی کورتی ئەم سوێندە، بڕوانە: ***Smiths "Dictionary of Antiquities" (revised edition), vol. II, p. 154.***

8–وادیارە نەشتەرگەریی مەترسیدار بەشێوەیەکی گشتی لەلایەنی پزیشکێکی لۆکاڵەوە رەوانەی لای نەشتەرگەرێکی گەڕۆك دەکرا، کە ئەگەر کارەکە بەشێوەیەکی خراپ بەڕێوە بچوایە خۆی ونەدەکرد و لەناوچەکە نەدەما.

9–ئەفلاتون باسی ئەوە دەکات کە گۆرگیاسی رەوانبێژی نێودار جارجارە بەکرێدەگیرا. ئەم نەریتە یۆنانییە وەکو بەکارهێنانی کلۆرۆفۆرم (بەنج) وەها بوو.

### سەرچاوە

*WILLIAM DAVIS: A Day in Old Athens*

# مارتن هایدگەر

## لە نێوان (فەلسەفەی ئۆنتۆلۆژی) و (فەلسەفەی وجودی)دا

زەکەریا ئیبراهیم

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

"مارتن هایدگەر" بیرمەندێك نییە بە خوێنەرانی ئێمە نامۆ بێت، بە تایبەت دوای ئەوەی فەلسەفەکەی بووە جێگرنگی پێدانی زۆر لە توێژەرانی عەرەب و هاوکات لەم ماوەی دوایشدا هەندێك لە توێژینەوە فەلسەفیە گرنگەکانی، وەك: (فەلسەفەی چییە؟)، (میتافیزیکا چییە؟)، (هۆڵدەرلین و چییەتی شیعر)، وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی. ئەگەرچی تا ئێستاش کتێبی (بوون و کات) بە گەورەترین کاری فەلسەفی ئەو دەژمێردرێت، بەلام بێگومان زۆر لەو کورتە وتار و لێکۆڵینەوانەی دواتر بلاویکردنەوە، توانیان ئەو بەدحاڵیبوونە بڕەوێننەوە کە تەوقی فەلسەفەی ئەویان دابوو. دەکرێت بڵێین لەناو سەرجەم فەیلەسوفانی هاوچەرخدا، "هایدگەر" لە هەموویان قوڵتر و ڕەسەنترە. لەگەڵ ئەوەشدا فەلسەفەی ئەو رووبەڕووی هێرش و ڕەخنەی توند بۆتەوە، هاوکات دووچاری زۆر لە شێواندن و بەدحاڵیبوون هاتووە. "هایدگەر" تاوانبار کراوە بەوەی پێغەمبەری سۆزدارییەو بانگەشە بۆ (عەدەمیەت) دەکات و دوژمنی لۆژیك و زانستە، ئەمە لە کاتێکدا ئەوەی بەردەوام بیر کردنەوەی ئەوی داگیر کردبوو (کێشەی حەقیقەت) بوو.

هەرچەندە زۆربەی بەرهەمەکانی "هایدگەر" لە ڕووی فیکرییەوە تۆکمەیی و لە ڕووی تەعبیرەوە وردەکاری پێوە دیارەو زیادەڕۆیی تێدا نییە، بەلام هەندێك پێیان وایە فەلسەفەکەی لە ڕووی لۆژیکیەوە لاوازە و شێوەی خستنەڕووی ئاڵۆزو تەلیسماوییەو شێوازی دەربڕینیشی بەگرێ و گواڵە. ئێمە نایشارینەوە کە لەنوسینەکانی "هایدگەر"دا زاراوەی فەلسەفی زۆر ورد هەیە و هەندێ جاریش چەمکی تازە دادەتاشێت کە لە سەرچاوەی زمانی ئەڵمانیەوە وەریان دەگرێت، بەلام ئەو تەلیسم و ئاڵۆزیەی نەیارانی باسی

لێدەکەن بەر لە هەر شتێك دەگەڕێتەوە بۆ خراپی وەرگێڕانی دەقە فەلسەفەیەکانی. خوێندنەوەی دەقە ئەڵمانییەکەی بەسە بۆ ئەوەی ئەم بەهانە بێبناغەیە سەبارەت بە ئاڵۆزی و قورسی فەلسەفەکەی ئەو هەڵبوەشێنێتەوە.

گەربێتو "هایدگەر"بە دوو فەیلەسوفی دیکەی ئەڵمانی وەك "کانت" و "هیگڵ" بەراورد بکرێت، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە فەلسەفەی ئەو زۆر ڕونتر و ئاسانترە. لەم ڕووەوە یەکێك لە لێکۆڵیارە هاوچەرخەکان دەنووسێت و دەڵێت: (کاتێك هیگڵ دەخوێنینەوە، زۆر جار وا هەست دەکەین لە بەردەم دەهلیزەیەك وتەزای بێکۆتایدایین. تەنانەت وامان لێدێت هەست بکەین ئەم فەیلەسوفە دەیەوێت بە ئەنقەست خۆی ئاڵۆز بکات. بەڵام کاتێك هایدگەر دەخوێنینەوە، هەرگیز هەستی وا دامان ناگرێت: لەبەرئەوەی دەبینین چۆن دەکۆشێت تا بیروبۆچوونی خۆیمان پێبگەیەنێت. بە کورتیەکەی دەتوانین بڵێین ماندووبونی خوێنەر بە دەست هایدگەرەوە، دەگەڕێتەوە بۆ قورسی و ئاڵۆزی ئەو بابەتانەی ئەو دەیەوێت دەستی پێیان بگات)[1].

بەڵام هەندێك لە پۆزەتڤستە لۆژیك خوازەکان – بەر لە هەمووشیان ڕۆدۆلڤ کارناب – هەوڵیانداوە لە ئاستی "هایدگەر" کەمکەنەوە، بە بیانووی ئەوەی هەرچی ئەوەی ئەو نوسیویەتی سەفسەتەیەکی پوچ و بێمانایە. پۆزەتڤستیە لۆژیکیەکان کتێبی (بوون و کات) و بۆچونی "هایدگەر" یان لە مەڕ (عەدەم) بەو جۆرەی لە (میتافیزیکا چییە؟) خستبوویە ڕوو، بە کەرەستەیەکی لەبار دەزانی بۆ پاڵپشتی کردنی هێرش و پەلامارەکانیان لە دژی میتافیزیکا و تاوانبارکردنی میتافیزیکیەکان بەوەی، زاراوەگەلێك بەکاردێنن خاڵییە لە هەر مانا و ناوەڕۆکێك. "کارناب" لە کورتە وتارێکیدا بۆ ڕەخنەگرتن لە فەلسەفەی "هایدگەر" سەبارەت بە چەمکی (عەدەم)، هەوڵیدا ئەمە بسەلمێنێت و نیشانمانی بدات ئەوانە بۆچوون گەلێکی نەزۆك و بێمانان.. فەیلەسوفانی پۆزەتڤستی لۆژیکی بێئەوەی ڕەنجێکی زۆر بە خەرج بدەن، دەتوانن (بەتاڵی) فەلسەفەی میتافیزیکی بەوجۆرەی "هایدگەر" بەردەستی خستوین بسەلمێنن.

پۆزەتڤستە لۆژیکیەکان پێیان وایە هەرشتێك نەتوانرێت بە ڕونی و ڕەوانی گوزارشتی لێبکرێت، هەرزەگۆییەکی بەتاڵەو شایەنی ئەوە نییە دایبڕێژین! بەڵام گومان لەوەدانییە کە لە ئەزموونی ژیانی ڕۆژانەماندا (جێ و شوێنی شاراوە و نادیاری) وەها هەیە، شایستەی ئەوەیە فەیلەسوف لە سەری ڕاوەستێ و لێکۆڵیار کاتی خۆی بۆ بە خەرج بدات. "هایدگەر" سۆراخکردنی ئەم هەرێمە شاردراوەو نادیارانەی ژیانی ئینسانی، خستە ئەستۆی خۆی. هەر بۆیە هەندێك جار ناچار دەبێت زاراوەی نوێ دابتاشێت (جیاواز لەو تێرمانەی لە ژیانی ڕۆژانەماندا پێیان ڕاهاتووین)، ئەمەش لە پێناو تەعبیر کردن لەو جیهانە تازانەی فەلسەفەکەی سەرکێشانە پێی تێناون!

هەرچەندە ڕای گشتی بێپەروا لە هەوڵی ئەوەدا بووە ناوی "هایدگەر" لە لیستی فەیلەسوفانی بونخوازیدا ناونووس بکات، بەڵام

ئـــەو زیـــاد لـــە جارێــك ڕایگەیانـــدووە کـــە فەیلەســـوفێکی وجـــودی نییـــە. ســـەرەڕای کاریگـــەری "ســـۆرین کیرکێگـــۆرد"ی (ڕابـــەری فەلسەفەی نوێی بونخوازی) لەسەر "هایدگـەر"، بـەلاَم گومـان نییـە لـەوەی کـە تـەواوی هـەوڵ و کۆششـــی "هایدگـــەر" تـــەرخان بـــوو بـــۆ (ئۆنتۆلۆژیـــا)، ئـــەم کـــارەش پێچـــەوانەی هەوڵەکانی "کیرکیگۆرد" بوو.

هـەر ئەمـەش وای لـە توێـژەرێکی بـە توانـای فەرەنســی وەك "کــواریٚ" *Koyre* کــرد، چــەند توێژینەوەیەك بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان بکات و لــە گۆڤــاری (ڕەخنــە) *Critique*–ی فەرەنســیدا بلاَویــان بکاتــەوە. توێژینەوەکانیشــی تــەرخان بوون بۆ قسەکردن لەسەر (ئاراستەی فەلسـەفەی هایدگـــەر دژ بـــە بونخـــوازی – *Lanti existentialisme*). گومـــان لەوەدانییـــە کـــە جیاوازی بنـەڕەتی لـە نێوان "مارتن هایدگەر"و "ژان پـۆڵ سـارتەر"دا هەیـە. هــەر ئەمــەش وا دەکـات "هایدگـەر" خـۆی لـەو (بونخوازی)یـە بێبـەری بکـات کـە خـاوەنی کتـێبی (بـوون و عـەدەم) باسـی لێکردبـوو. بـەلاَم گـەرییَتو ئـەو (میتـۆدە فینۆمینۆلۆژیەمان) لەبەرچاو گرت کە هەریـەك لـە "هایدگـەر" و "سارتەر" پـەیڕەویان دەکرد، هەروەها گەر ئەوەشمان ڕەچاو کرد کە خودی "سارتەر" خۆشی مەبەستی دامەزراندنی ئاقارێکی ئۆنتۆلۆژی بووە، ئەوا دەتوانین بڵێین مێژوونووسـانی فەلسـەفە کـەم تـا زۆر بەهانـەی خۆیان هەبووە لـەوەی "هایدگەر"یان لـە لیستی فەیلەسـوفانی بونخوازیـدا نـاونووس کـردووە. ئەگەرچی "هایدگـەر" لـە زۆر بۆنـەدا باسـی لـەوە کـردووە کـە فەلسـەفەی ئـەو تایبـەت نییـە بـە (مـرۆڤ)، بـەڵکو ئـەوەی خولیـای فەلسـەفەی ئـەوە (کەینونە) یاخود (بوونی گشتی)یە.

بـەلاَم بێگومـان بەشـی زۆری کتـێبی (بـوون وکـات)، تایبەتـە بـە هێڵـە گشـتییەکانی بـوونی مـرۆڤ. سـەربارى هـەموو ئەمانـەش گـەرییَتو کاریگـەری گـەورە و گرانـی "هایدگـەر" لەسـەر فەیلەســـوفانی بونخـــوازی (لـــە پـــێش هەمووشـــیانەوە ســـارتەر) لەبەرچـــاو بگـــرین، دەتـوانین لـە نهـێنی ئـەوە حـاڵی بـین کـە بۆچـی مێـژوو نووسـانی فەلسـەفە سـورن لەسـەرئەوەی "هایدگەر" لـە لیستی فەیلەسوفانی بونخوازیدا تۆمـار بکـەن. دەکرێـت لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو شـــیکردنەوەی بـــۆ فەلســـەفەی "هایدگـــەر"ی دەکەین لە (بوون و کات)دا، بە درێـژی باس لـەم کێشە و ناکۆکیانە بکەین.

### ژیانی "مارتن هایدگەر"

"مـارتن هایدگـەر" سـاڵی 1889 لـە گونـدی مەســـکریش *Messkirch* لـــە (دارســـتانی ڕەش) هاتۆتــە دنیــاوە. لــە بنەماڵەیــەکی مەســیحی کاتۆلیـــك مەزهـــەب بـــووە. دایـــك و بـــاوکی دەیانویست بـە تیۆلۆژیـاوە خـەریك بێـت، بـەلاَم ئـەو ڕێگایـەکی دیکـەی هەڵبـژارد. سـەرەتاکانی ژیـانی بـە خوێندنەوەیـەکی چـڕوپڕی "تۆمـای ئـەکوینی" دەسـت پێکـرد، هاوکـات لـە قۆنـاغی لاویەتیشدا گرنگی بە فەلسـەفەی سکولائی دا و یەکـــەم وانـــەی فەلســـەفی لەســـەر دەســـتی بـــەناوبانگترین دوو بیرمەنـــدی قوتابخانـــەی (نیوکـــانتیزم) وەردەگرێـــت، کـــە بـــریتین لـــە: "وندڵباند" و *windelband* "ڕیگرت" *Rickert*.

"هایدگەر" لەم قوتابخانەیە دوو مەسەلەی گرنگ فێربوو: یەکەم/ جیاوازیکردن لە نێوان (زانستە سروشتیەکان) کە لەسەر لێکدانەوە دامەزراوە، لەگەڵ (زانستەکانی رۆح) کە لەسەر تێگەیشتن دروست بووە. دووەم/ گرنگی تاوتوێکردنی مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوا لە سەردەمی حەکیمەکانی پێش "سوکرات"ەوە تا ساتەوەختی ئەمڕۆ، لەگەڵ گرنگیدان بە کێشە سەرەکیە مەزنەکانی فەلسەفە، بەو پێیەی ئەوانە کێشەی جەوهەری و سەرمەدین. دواتر "هایدگەر" پەیوەندی بە زانکۆی فرایبۆرگەوە *Freiburg* دەکات و لەوێ لەسەر دەستی "ئەدمۆند هۆسێرل"ی ڕابەری ئاقاری فینۆمینۆلۆژی، دەخوێنێت و لەژێر سەرپەرشتی ئەودا ساڵی 1916 کارنامەی دکتۆراکەی دەربارەی تیۆری وتەزاو مانا لای "دۆنس سکۆت" *Duns scot* ئامادە دەکات. لەو کاتەوە "هایدگەر" بە قوڵی سەرگەرمی کەلەپووری فەلسەفی کۆن و تاوتوێکردنی تێکستی فەیلەسوفە کلاسیکیەکان دەبێت. لێرەوە دەتوانێت دیالۆگێکی سەرنج ڕاکێش لەگەڵ فەیلەسوفانی کۆندا دروست بکات، کەم تا زۆریش توانی کێشەکانی فەیلەسوفانی سەردەمی ئێستا و کێشەی فەیلەسوفانی کۆن پێکەوە گرێ بدات.

لێکچەرەکانی "هایدگەر"لە شاری فرایبۆرگ سەرکەوتنێکی بێ وێنەیان بەدەست هێناو، خەڵکی تامەزرۆی گوێ بیستی بۆچونە فەلسەفیە قوڵەکانی بوون و لە ناوەندە فەلسەفیەکاندا، وەك بیریارێکی ڕەسەن نێوبانگی پەیدا کرد. هێندەی نەبرد ساڵی 1923لە زانکۆی ماربۆرگ *Marburg* وەك مامۆستای وانەی فەلسەفە دەست بەکاربوو. ئیتر لەو ساتەوە خۆی بۆ قوڵبوونەوە لە کێشەی بوون و گرنگی دان بە زۆر مەسەلەی میتافیزیکی تر تەرخانکرد، تا لە ساڵی 1927 توانی بەشی یەکەم لە کتێبێکی گەورە بەناوی (بوون و کات) *Sein und zeit* بلاوبکاتەوە. ئەم کتێبە تا ئێستا هیچ بەشێکی تری لێ بلاونەکراوەتەوە! گرنگی ئەم کتێبە تەنها لە ڕەسەنی ئەو شێوازەدا نییە کە "هایدگەر" لە چارەسەرکردنی کێشە فەلسەفیە سەرەکییەکاندا گرتویەتیە بەر، بەڵکو هاوکات گرنگی لە هێنانی ئەو چەمکە نوێیانەشدایە کە لێکۆڵینەوە ئەنتۆلۆژیەکەی "هایدگەر" ڕێو شوێنی بوونی مرۆڤی پێئاشکرا کردووە و پەردەی لەسەر لاداوە.

ئەم شاکارەی "هایدگەر" هەر بەتەنها لەناوەندە فەلسەفیەکاندا دەنگدانەوەی نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی ناوەندی ڕۆشنبیران و خوێندەوارانیشی گرتەوە. بەمجۆرە دەرچوونی کتێبی (بوون و کات) بووە ڕوداوێکی گرنگ لەمێژووی فیکری فەلسەفی هاوچەرخدا. نەك تەنها لە ناو ئەڵمانیادا، بەڵکو لە سەرتاسەری دنیادا.

کاتێك "هۆسێرل" خانەنشین کرا، ساڵی 1929 "هایدگەر" لە جێی ئەو لە زانکۆی فرایبۆرگ بوو بە مامۆستای وانەی فەلسەفە. هەر لەو ساڵەدا سێ لێکۆڵینەوەی گرنگی بلاوکردەوە. یەکەمیان کتێبە گرنگەکەی بوو (کانت و کێشەی میتافیزیك). لەم کتێبەدا "هایدگەر" لێکدانەوەیەکی نوێ بۆ کتێبە

بەناوبانگەکەی "کانت" (ڕەخنەی ئەقڵی پەتی) دەکات. لێرەدا هێزی خەیاڵ دەکاتە بڕبڕەی پشتی مەعریفە و پێش هەریەك لە زەین ڕونی و تێگەیشتنی دەخات. ئەم کتێبە هەڵلآیەکی گەورەی لە ناوەندە فەلسەفیەکاندا نایەوە، ئەگەرچی هەندێك گازندەی ئەوەیان کرد کە دەیەوێت لە چوارچێوەی خولیا ئەنتۆلۆژیەکانی خۆیدا، فەلسەفەی "کانت" لێکبداتەوە.

دووەمین لێکۆڵینەوەی لە هەمان ساڵدا بەناوی (ما تعیە العلة) بوو، "هایدگەر" ئەم کارەی لەگەڵ خوێندکارەکانی دیکەی "هۆسێرل"دا پێشکەش بە مامۆستاکەیان کرد بە بۆنەی خانەنشین کردنیەوە، (هۆسێرل لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا خانەنشین کرا). لەم لێکۆڵینەوەدا "هایدگەر" بە تاوتوێکردنی کێشەی (بڵندەگی)یەوە *transcendence* خەریك بوو، هەروەها گرنگیشی دا بە باس و خواسی سروشتی (العلە) و، شیکردنەوەی چەمکی (جیهان) و دەستنیشانکردنی ئەو کۆڵەکانەی بوونەوەری لەسەر ڕاوەستاوەو ... هتد.

هەمان ساڵ "هایدگەر" باسێکی لە ژێر ناوی: (میتافیزیکا چییە؟) بلآوکردەوە، ئەم باسەشی بریتی بوو لە یەکەمین لێکچەری کە لە 24ی تەموزی 1929 وەرزی خوێندنی زانکۆی فرایبۆرگی پێکردبووەوە، بە بۆنەی دامەزراندنی وەك مامۆستایەك لەو زانکۆیەدا لە جێی "ئەدمۆند هۆسێرل". لەم باسەدا "هایدگەر" پرسیاری دەربارەی (عەدەم) و هەروەها باسی لە چەمکی (دڵەڕاوکە) کردبوو. هاوکات پەیوەندی (عەدەم)ی بە نایاندنەوە ئاشکرا کردبوو، هەر لەوێشدا بەرگریەکی ناڕاستەوخۆی لە میتافیزیکا کردبوو. کاتێك نازیەکان بوونە حوکمڕانی ئەڵمانیا، ساڵی 1933 "هایدگەر" کرایە بەڕێوەبەری زانکۆی فرایبۆرگ و بەم بۆنەیەوە، وتارێکی دەربارەی (هەلومەرجی زانکۆکانی ئەڵمانیا) پێشکەش کرد. بەلآم هێندەی نەبرد لە ساڵی 1934 دەستی لە کار کێشایەوە و وازی لە پۆستەکەی هێنا، واتە کەمتر لە ساڵێك لەو جێگایەدا مایەوە.

ولآتانی هاوپەیمان "هایدگەر"یان بە یەکێك لە لایەنگرانی نازیزم لە قەڵەمدا و دوای کۆتایهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی ڕێگەیان پێنەدا، لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا وانە بڵێتەوە. بەلآم سەرباری ئەوەش، نووسینەکانی بەگەرمی لەلایەن ئەوانەوە کە لە ئەڵمانیادا بە فەلسەفەوە خەریك بوون پێشوازی لێدەکرا و تەنانەت دوای جەنگ وەك سەردەمانی "هتلەر"، کاریگەری خۆی لەسەر خوێندکارانی فەلسەفە لە ئەڵمانیادا هەبوو.

لە ساڵی 1936 بەدواوە ئاقارێکی نوێ لە بیرکردنەوەی "هایدگەر"دا بەدیارکەوت، ئەویش لەو نووسینەیدا ئاشکرا بوو کە لە ژێر ناوی (هۆڵدەرلین و چیەتی شیعردا) بلآویکردەوە. لەم باسەیدا "هایدگەر" هەر بەوەندەوە نەوەستاوە چیەتی شیعرمان بۆ شیبکاتەوە و بیەوێت لە ڕێی چیەتی شیعرەوە لە چیەتی زمان بگات، بەڵکو هاوکات هەوڵیداوە ئەو جیهانبینیە فەلسەفیە قوڵەشمان بەر چاو بخات کە لە ناو تێڕامان و وردبوونەوەی شاعیراندایە. سەرسامی "هایدگەر" بە شاعیری ڕۆمانتیکی ئەڵمانی "هۆڵدەرلین"، گەیشتە ئاستێك دەست

بە تاوتوێکردنی هەندێك لە چامە شیعریەکانی بکات. لەم ڕووەوە لەسەر سێ چامەی "هۆڵدەرلین" دەنووسێت، ئەو نووسینانەش دوا بەدوای یەك لە ساڵانی 1941 و 1942 و 1944 دا دەکەونە بەردەستی خوێنەران. لەو قۆناغەدا "هایدگەر" چەند کتێبێکی فەلسەفی دەنووسێت، گرنگترینیان لێکۆڵینەوەیەکە لە ساڵی 1942، دەربارەی (تیۆری ئەفلاتۆن لە مەڕ حەقیقەت). لەگەڵ (چیەتی حەقیقەت) ساڵی 1943.

توێژەران بە شێوەیەکی تایبەت گرنگیان بە تیۆری حەقیقەت لای "هایدگەر" داوە، لە بەرئەوەی پێیان وابووە حەقیقەت پەنتی سەرەکی سەرجەم تێڕامانە فەلسەفیەکانی ئەوە. سەرەڕای ئەوەش تێبینی ئەوەشیان کردووە کە "هایدگەر" بەشێوەیەکی وجودیانەی ڕەسەن تەفسیری حەقیقەتی کردووە، بەو پێیەی حەقیقەت ئارایی – بوونە.

ساڵی 1947 (پەیامێك دەربارەی هیومانیزم) بڵاو دەکاتەوە و تیایدا وەڵامی هەندێك لەو پرسیارانە دەداتەوە کە "جان بۆفرێ"ی *Jean Beaufret* توێژەری فەرەنسایی ئاڕاستەی کردبوو. ئەم کتێبە ڕونکردنەوەی گرنگ لەسەر هەندێك لەو چەمك و زاراوانە دەدات کە "هایدگەر" بەکاریهێناون، بە تایبەت لە شاکارە بەناوبانگەکەیدا (بوون و کات).

هەروەها "هایدگەر" کتێبێکی دیکەی هەیە بە ناوی (دەروازەیەك بۆ میتافیزیکا)، ئەم کتێبە تەواوی ئەو لێکچەرانە لە خۆ دەگرێت کە لە کۆرسی دووەمی ساڵی خوێندنی 1935 لە زانکۆی فرایبۆرگ پێشکەشی کردوون. هاوکات کورتە لێکۆڵینەوەیەکیشی هەیە بە ناوی (فەلسەفە چییە؟)، ئەمە دەقی لێکچەرێکە ساڵی 1955 "هایدگەر" لە باکوری فەرەنسا پێشکەشی کردووەو ساڵی 1956 بڵاو کراوەتەوە، هەروەها ساڵی 1957 لەلایەن "جان بۆفرێ"وە کراوەتە فەرەنسی.

دوا بەرهەمەکانی "هایدگەر" بریتین لە: (*Holzwege*) کە بۆیەکەمجار ساڵی 1950 بە زمانی ئەڵمانی بڵاوبووەوەو پاشان ساڵی 1962 وەرگێڕدرایە سەر زمانی فەرەنسی. ئەم کتێبە گرنگیەکی تایبەتی هەیە، لەبەرئەوەی تاکە لێکۆڵینەوەیەکی "هایدگەر"ە سەبارەت بە (ڕەچەڵەکی کاری هونەری). هەر لە دووتوێی ئەم کتێبەدا چاومان بە چەند باسێکی تر دەکەوێت، دەربارەی (سەردەمی دید و بۆچوونی گەردونگەرایی) و چەمکی ئەزموون لای "هیگڵ" و دەستەواژە بەناوبانگەکەی "فردریش نیچە" دەربارەی مردنی یەزدان. هەروەها وتارگەلێکی تر دەربارەی پاساو و بەهای بوونی شاعیران و وتارەکەی "ئەنیکسیمندەرس" و.. هتد.

لە پاڵ ئەم کتێبانەدا "هایدگەر" وتارگەلێکی لە ژێر سەردێڕی: (مەبەستمان چییە لە بیرکردنەوە؟) بڵاوکردۆتەوە، ئەمەش بریتییە لەو لێکچەرانەی لە زانکۆی فرایبۆرگ و لە دوو ساڵی خوێندنی 1951 و 1952 پێشکەشی کردوون کە ساڵی 1959 لەلایەن هەریەك لە "بیکەر" *Becker* و "گرانڵ" *Granel* کراون بە فەرەنسی و لە چاپخانەی زانکۆی فەرەنسا لە چاپدراوە. ئەگەرچی "هایدگەر" ئەمڕۆ تەمەنی خۆی لە 79 ساڵێك دەدات[2]، بەڵام بەردەوام بە

رۆحێکـی گەنجانــەوە درێــژە بــە کاروچـالاکی فەلسـەفی خـۆی دەدات کـە جێگـەی سەرسامییە. هــەروەها تــا ئێســتاش فەلســەفەکەی بابــەتی لێکۆڵینـەوەی زۆرێـك لـە توێژەرانـە لەسـەرجەم وڵاتــانی دنیــادا. ئــەوەی دەســتی بــاڵای لــە ناساندنی فەلسەفەی "هایدگەر"دا هەیە و ڕۆڵی کارای لـە ناوبـانگ پەیداکردنیـدا بینیـووە، ئـەو چەند توێژەرە فەرەنسایینەن کە سەروەختێکە بە گواســتنەوەی بیروبۆچــوونەکانییەوە بــۆ ســەر زمـانی فەرەنسـی و لێکدانـەوەیی و پـەراوێز بـۆ نووسین و لێدوان لەسەری خەریکن.

"هنــــری کۆربــــان" *H.Corbin* لــــە ڕیــــزی پێشــەوەی ئــەو توێژەرانەیــە کــە وەرگێڕانێکــی بێغـەل و غەشـیان لـە بەرهەمـەکانی "هایدگـەر" خســتۆتە بەردەســت خوێنــەرانی فەرەنســایی، لەوانە: (میتافیزیکا چییە؟) و چەند بەشێك لـە کتێبی (بوون و کات) و چەند بەشێکی کتێبی (کانـت و کێشــەی میتافیزیــك) و (هۆڵــدەرلین و چــیەتی شــیعر) ســاڵی 1937. دوای ئــەوە وەرگێڕانـــی بەرهەمـــەکانی بۆســـەر زمـــانی فەرەنسی بەردەوام بوون، تاوای لێهات زۆربەی بەرهەمەکانی بگرێتەوە. هەروەها لـە هەریـەك لـە ئینگلتـەراو وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکاش چـەند لێکۆڵینـەوەو کتێبێکـی وەرگێڕدراونەتـە سـەر زمـانی ئینگلیــزی لەوانــە: لێکچــەری (فەلسـەفە چـییە؟) لەلایـەن "ولیـام کلۆبـاك" و "جین رایلد" و (پەیامێك دەربارەی هیومانیزم) لەلایــەن *Edger Lehnetr* وە. تـا ئێسـتاش بـە بـەردەوامی لێـرەو لـەوێ، هـەوڵی وەرگێڕانــی لێکچــەرو کتێبــەکانی دیکــەی "هایدگــەر" دەدرێت.

-ماویەتی-

**پەراوێزەکان:**

*1-w. Barrett: "Philosophy in the Twenti eth Century." N-Y.,Random House, vol.III, 1962, Introduction, pp,152-153.*

2-لێرەدا نووسـەر باس لـە تەمـەنی "هایدگـەر" لـەو ساڵەدا دەکـات کـە ئـەم باسـەی تێدا نووسـیووە، ئـەو ساڵەش ڕێکەوتی 1968. "هایدگەر" هەموو ژیانی 87 ساڵ ژیاوە (1889-1976). (وەرگێڕی کوردی).

**سەرچاوە:**

د. زکریـا ابـراهیم: دراسـات فی الفلسـفە المعاصـرة (الجزء الأول) دار مصر للطباعة، القاهرة.

# ئەندێشەی دادپەروەری

# لە فەلسەفەی (ئەپیکۆری) و ڕەواقیەکاندا

بەهرام مەحي

لە فارسییەوە: ڕەزا مەنوچەهري

داگیرکارییەکانی ئەسکەندەری مەکەدۆنی بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی سنورە جوگرافییە سیاسییەکانی جیهانی کۆن و لە هەمان کاتدا هۆی بڵاوبوونەوەی شێوازی ژیانی مۆڕاڵی و ڕۆشنبیری یۆنانی کۆن. خۆ فراوانکردنەکانی ئەسکەندەر بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی بەها ڕۆشنبیرییەکانی یۆنانی کۆن لە چەندین ناوچەی ئەو سەردەمەدا. ئەو شێوازانە لە تێڕامان، زانست و هونەر کە لە یۆنانی کۆندا بوونیان بوو و بە نێو گەلە جۆراوجۆرەکاندا بڵاوبوویەوە و پەرەیسەند ئیدی هێدی هێدی گرنگی و بەهای "نەتەوەی" ییان لە چوارچێوەی شارستانیەتێکی پشکوتودا کاڵبوونەوەو قۆناغێکی نوێ دەستییێکرد و لەو قۆناغەدا ئەو جۆرە بەهایە کە تایبەت بوو بە شێوازی رامان و ڕۆشنبیری یۆنانیەکانەوە بوون بە بەهایەکی گشتی مرۆڤایەتی و لە پانتاییەکی بەرفراواندا پێگەیەکی گرنگی بەدەستهێنابوو. ڕێبازی سیاسەت و سیستمی سیاسی ئەزمونکراو لە یونانی کۆندا بەرانبەر بە شێوازەکانی دیکەی دەسەڵات کە دەبوایە پێویستی ئامانجی بەڕێوەبردنی سیاسی کۆمەڵگا لە پانتاییەکی بەرفراوان و لە دەرەوەی سنورەکانی دەوڵەتشاردا دابینبکردایە, رووی لە کزی کرد. لەمڕووەوەیە ئەو قۆناغە نوێیە لە مێژووی هزردا بە چاخی (هلینیزم) دەناسرێت.

تەنها چەند دەیە پاش مەرگی ئەرەستۆ چەندەها سیستمی فەلسەفی نوێ دروستبوون، هەریەك لەو سیستمە فەلسەفیانە مۆرك و کاریگەری هلینیزمیان پێوە دیاربوو، هێدی هێدی بۆچوونەکانی ئەفلاتۆن و ئەرەستۆ پەراوێزکەوتن. ڕێچکەی ڕەواقیەکان، گومانکارەکان و ئەپیکۆرییەکان لە گرنگترین سیستمە فەلسەفیەکانی ئەو سەردەمە بوون. لە راستیدا دەتوانین بڵێین کە تێزە فەلسەفیەکانی ئەفلاتۆن و ئەرەستۆ زۆر دواتر گەشەیانکرد و

رووی راســـــتەقینەی خۆیـــــان ئـــــەزمونکرد. فەلســـەفەی ئــەفلاتۆن لــە هــزری (ئەفلاتۆنییــە نوێکانـــــدا) هاتــــەوە مەیــــدان کـــــە لــــە دوایــین ســەدەکانی چــاخی کۆنــدا دروســتبوو بــوون. فەلســـەفەی ئەرەســتۆ لــە چــاخەکانی ناوەڕاســتدا لــە نێــو هــزری (سکۆلاســتیك)یدا هاتــەوە مەیــدانی هــزر. لــەم بابەتــەدا و بــەپێی تێبینیـــەکانمان چـــەمکی دادپـــەروەری لـــە فەلســـەفەی ئەپیکۆریـــەکان و رەواقیەکانـــدا پێشــکەش دەکــەین کــە لــە چــاخی هلینیزمــدا هاتونەتە مەیدان.

### ئەپیکۆر و ئەندێشەی دادپەروەری

ئەپیکۆر کە بۆ خۆی بنیاتنەری قوتابخانەی ئەپیکۆرییە حەوت ساڵ پاش مەرگی ئەفلاتۆن چاوی بە ژیان هەڵێناوە. یەکێك لە پرسیارە گرنگـــەکان بـــۆ ئـــەپیکۆر ئـــەوەبوو، ئایـــا بەشێوەیەکی هەمەکی ماف لە نێوان مرۆڤەکاندا رێکەوتنە (پەیمانە)، یان مافێکی سروشتیش بوونی هەیە.

ئەپیکۆر دەربارەی خەسڵەتی ماف بڕوای بە پەیمان هەیە. بەپێی بۆچوونەکانی ئەپیکۆر و بــە پێچــەوانەی روانگــەکانی ئەرەســتۆ، مــرۆڤ بەشـــــێوەیەکی سروشـــــتی بوونـــــەوەرێکی کۆمەڵایــەتی نییــە، بــەڵکو بــوونی کۆمــەڵگا و سیســـتمی یاســـایی دیـــاریکراو پەیوەســـتە بــە بوونی پەیمان لە نێوان مرۆڤەکاندا.

لـــەم روانگەیەوەیـــە کـــە ئـــەپیکۆر بـــڕوای بــەوە نییــە کــە دادپــەروەری خــۆی لــە خۆیــدا بوونی هەبێت.

بــەڵکو (کــار یــان کــرداری) دادپەروەرانــە ئەوەیــە کــە بــەهۆی پەیوەنــدی لەگــەڵ سیســتمە یاســاییە دیاریکراوەکانــەوە کــە بــە رێگــەی پەیمانــەوە و لەلایــەن مرۆڤەکانــەوە نوســراوە مانــای دادپــەروەری لــە خــۆی بگرێــت. بــەپێی بۆچـــوونەکانی ئـــەپیکۆر، لـــە پەیوەندیـــەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا دادپەروەری بۆ هەموان وەك یەکــە، چــونکە ئــەو بابەتــە دەبێتــە هــۆی گونجانـــدن و پێکـــەوە ســـازان لـــە پەیوەنـــدی بەرامبەریانــەی کۆمەڵایەتیــدا، بــەڵام لــە هــەمان کاتــداو لــە کۆمــەڵگا جۆراوجۆرەکانــدا و لــە ژێــر کاریگـــــەریی هەلومـــــەرجی جیـــــاوازدا تێگەیشـــتنی جـــۆراو جـــۆر لەســـەر بابـــەتی دادپەروەری دروست دەبێت.

گــەر مــرۆڤ نــەك لەســەر بنــەمای سروشــتی خــۆی، بــەڵکو بــە نیــازی ســود وەرگــرتن و بەرژەوەندیخوازانەوە کۆمەڵگایەك دروستبکات ئیدی ئەو ئەنجامەمان وەردەگرت کە شتێك نییە ناوی یاسای بنەڕەتی دەوڵەت، (سروشتی) یان (دروست) بێت و پەیوەست بێت بە سروشتی مرۆڤەوە و بگونجێت لەگەڵ سروشتەکەیدا. لە کاتێکدا کە باس لە "هەق" و "ناهەق" دەکەین‌و بەشێوەیەکی رێژەیی باس لەو یاسا بنەڕەتیانە دەکەین کە لەسەر بنەمای پەیمان دروستبوون ناتوانین چاوەڕوان بین کە دادپەروەری رەها یان یاســایەکی ســەرتر لــە بــەڵێن و یــان ئیجــابی هــەبێت. ئــەوەی کــە رەوا بێــت پەیوەســتە بــەو یاســایەوە کــە هــەر وڵاتێــك بــۆ خــۆی رەچــاوی دەکــات. بــەمجۆرە دەتــوانین لــەوە بگــەین کــە بۆچوونەکانی ئەپیکۆر لە نوختەی بەرانبەر بە ئەندێشەکانی ئەفلاتۆندایە، چونکە لەم بوارەدا

ئەفلاتۆن لەم بڕوایەدایە کە دادپەروەری خۆی لە خۆیدا بوونی هەیە و ئایدیای دادپەروەری لە لوتکەی هەر چەشنە یاسادانانێکدا دادەنێت. بەڵام لە روانگەی ئەپیکۆرەوە ماف و یاساکان لەو جۆرە بابەتانە نین کە دڵخواز یان بە دڵی خودی مرۆڤەکان بێت، چونکە ئەوانە پەیوەستن بە بابەتێکی سەرتر لە خۆیان کە هەمان بابەتی خۆگونجانـدن و سـازاندنە بـۆ پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیەکان. بە مانایەکی دی ئەو جۆرە یاسایەی کەلەسەر بنەمای پەیمانە لە کاتێکدا دەتوانێت متمانە بۆ خۆی دەستەبەر بکات کە لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتیدا بێت، ئەگەر لە خزمـەت بەرژەوەنـدی کۆمـەڵگادا نـەبن ئـەو خەسڵەتەیان نامێنێت کە وەك نەریت و بەهای متمانەداری یاسایی بۆیان رەچاو دەکرێت. کەواتە بەهۆی گۆڕانکاری لە هەلومەرجەکاندا لە کارەکتەر و راڤە یاساییە گونجاوەکان لە هەمبەر کۆمەڵگادا بوونی خۆیان لە دەست دەدەن و لەو کاتەدا رەوا دەبێتە نارەوا.

وێڕای ئەوە ئەپیکۆر لەو بڕوایەدابوو کە دەبێت رەوا لە پەیوەندی بە هەوڵی تاك بۆ بەدەسـتهێنانی بەختـەوەری هەڵبسـەنگێنین، چونکە میکانیزمی رەوایی ئەوەیە کە (خودی رەوایی) ببێتە هۆی رێگری لە هەموو ئەو شتانە کە ئاسودەیی و بەختەوەری تاك بەرەو قەیران و هەڵـدێر دەبـەن. لـە کاتێکـدا دەتـوانین لـە تاکگـەرایی ئـەپیکۆری بگـەین کـە لـە رۆڵـی هـاوڵاتی لەسـەردەمی هلینیزمـدا بـە ئاگـا بـین، چونکە ئیدی لەو سەردەمەدا هاوڵاتیانی یۆنان رۆڵیـان لـە بـوارە سیاسـیەکانی دەوڵەتشـاردا نەدەگێڕا، بەپێی بەراوردکردن لەگەڵ ئەو رۆڵەدا کـە پێشـتر هاوڵاتیـانی یۆنـان لـە بـوارە سیاسیەکانی دەوڵەتشاردا لە ئەستۆیان بوو. ئەسـکەندەر و ئـەو دەسـەڵاتانەی دی کـە جێگایـان گرتـەوە هێـدی هێـدی هاوڵاتیـانی ئازادیان کرد بە کەسانی ژێر دەستەو گوێڕایەڵ. لـە باشـترین حاڵەتـدا چـاوەڕوانی لـەو دەسـەڵاتدارانە دروسـتکردنی هاوسـەنگی یـان بەخشـندەیی بـوو، نـەك جێبـەجێکردن و چەسـپاندنی دادپـەروەری. بـە رەچـاوکردنی تایبەتمەندیـەکانی بارودۆخی لەو جۆرە زۆرتر لـە تێبـینی و رێنوێنیـەکانی قوتابخانـەی ئەپیکۆری دەگەین کە باس لە خۆدورخستنەوە لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات و پەنا بردنـە بـەر مەیـدانی تایبـەت بـۆ گـەرەنتی و دەسـتەبەرکردنی ئاسـودەیی دەرونـی تـاك بـە پێویست دەزانێت.

### رەواقیەکان و چەمکی مافی سروشتی

لـە رووی مێژووییـەوە فەلسـەفەی رەواقـی قۆنـاغی جۆراوجـۆری تێپەڕانـدووە. فەلسـەفەی رەواقی لە قۆناغی درێژخایەنی هلینیزم تاکو ئیمپراتۆریای رۆما و پاشان تاکو چاخەکانی ناوەڕاسـت کاریگـەری بەجێهێشـتووە. بـەڵام لەوێڕا کە ئەو رێچکەیە لە پرۆسەی مێژوویی خۆیـدا گۆڕانکـاری زۆری بەسـەردا هـاتووە ناکرێت باس لەو بۆچوون و تیۆری گونجاو لەم رێبازەدا بکرێت. گرنگی قوتابخانەی رەواقی بۆ بابەتی دادپەروەری لە تێزەکانی ماف سروشتیدا شـاراوەیە. گـرنگترین سـەنتەر و چـەمکی فەلسەفەی رەواقی چەمکی "لۆگۆس"ە بەپێی

تێگەیشتنی ڕەواقیەکان چەمکی لۆگۆس نەك تەنها شوێنگەی هەموو شتێکە، بەڵکو بنچینەو بناغەی بەیاساکردنی ڕووداوەکانە. لە بەیاسامەندکردنی هەمەکیدا، نەك تەنها کەرەستە و ئامڕازەکان بەڵکو ناسنامەکەیان نادیارە، لەمڕووەوەیە کە بونیادەکانی ڕامانی تێگەیشتنی و ڕاستی لەگەڵ یەك دەگونجێن. کەواتە تێگەیشتن لە لۆگۆس کە وەك بنەمای سیستمێکی گەردوونییە نەك تەنها میکانیزمی ئەپستمۆلۆژیانە و میتافیزیکیانەی گرنگی هەیە، بەڵکو ئەو تێزە سەرباری ئەوەش توانای تێگەیشتنی پرۆسە و هۆکارەکان (هۆکاری پرۆسەکان) و ئامانجداربوونی سروشتیش دەستەبەر دەکات. لەوێڕا یان لەو شوێنەدا کە ئامانجەکان کاریگەری دادەنێن هەندێك مەبەست بوونیان هەیە کە دەبێت بەدیبێن. ئەوە بەو مانایە دێت کە سروشت بەپێی تێگەیشتنی ئامانجدا، وەك سیستمێکی ڕێکوپێك لێکدەدرێتەوە. خەسڵەتی ڕێسامەندبوونی گوتەزای ڕەواقیەکان دەربارەی سروشت لەسەر بنەمای میکانیزمەکانی فەلسەفەی ئەخلاق سەقامگیرە، ئەویش بۆ خۆی هەڵگری خەسڵەتی مافی سروشتیە. ڕەواقیەکان لەو بڕوایەدا بوون ڕێسای هەڵسوکەوتی ئەخلاقی لە چاوگەکانی ئاوەزی ڕەهاوە سەرچاوە دەگرن، چونکە ئاوەزی مرۆی بەشێکە لە ئاوەزی جیهانی و بەمجۆرە تاك لە سیستمی ئاوەزمەندانەی گەردووندا پشکی هەیە. کەواتە ئەگەر ئاوەزی تەندروستی هەر مرۆڤێك ڕەنگدانەوەی سیستمی گشتی گەردوون بێت دەتوانین ئەو ئەنجامە بەدەستبێنین کە ئەو داوا ئەخلاقییەی کە دەبێت بە تێگەیشتنێکی ئاوەزمەندانەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەین لەگەڵ یاسای گەردووندا دەگونجێت و لە دوایدا و بە گشتی لەگەڵ سروشتدا دێتەوە. بەمجۆرە تێزی مافی سروشتی ڕەواقیەکان ریشەی لە تێگەیشتنێکی ئاوەزیانەی لەم شێوەیەدا هەیە و دەتوانین بە بەراوردکردن و پێودانگی تایبەتی لەگەڵ ڕێسای گشتی ماف و ئەخلاقدا ڕاڤەیەکی دەربارەی سروشت لێ جیابکەینەوە.

لە ڕوانگەی ڕەواقیەکاندا و بە پێی هەمان مافی سروشتی مرۆڤ جگە لە پێگەی کۆمەڵایەتی یان ڕەگەزی، بەشێوەیەکی سروشتی وەکیەکن و بە بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی (ئەرەستو)وە بەهای مرۆڤەکان نە پەیوەستە بە پێوەری یۆنانی بوونەوەو نە پەیوەستە بە (بەربەر)یەتەوە، بەڵکو بەهای مرۆڤ بەپێی توانستی خودی تاك و تێڕوانینی خۆیی مرۆڤەکان دەستنیشان دەکرێت.

هەر لەم ڕووەوە بوو ڕەواقیەکان کۆیلەدارییان ڕەتدەکردەوە سەیری پێگەی ژن و پیاویان وەك یەك دەکرد. ئەمجۆرە تێڕوانینە ڕەواقییە دەرەنجامی جۆراوجۆر و بەرفراوانی لێکەوتەوە. سەرنجڕاکێشی قوتابخانەی ڕەواقیەکان بەرادەیەك بوو کە تەنانەت فەیلەسوفەکانی ڕەواقی لە نێو کۆیلەکان و پادشاکاندا سەریانهەڵداوە. بۆ نمونە "ئەپیکتت" فەیلەسوفێکی ڕەواقی بوو کە لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ژیاوە و سەردەمانێکی لە ژیانی بە کۆیلەتی تێپەڕیوە، یان "مارکوس ئاڤرلێڤس" قەیسەری ڕۆما لە سەدەی دووەمی زاینیدا لایەنگری هزری ڕەواقیەکان بوو و لەو

بڕوایەدا بوو کە دەبێت یاساکان لە وڵاتێکدا بۆ هەمووان بێت و دەبێت هەموان جگە لە رەچاوکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی ماف یەکسانیان هەبێت.

سیسرۆ *cicero* بیرمەند و یاساناسی ئیمپراتۆریای رۆما لە سەدەی دووەمی زاینیداو لە ژێر کاریگەری رامانی ماف سروشتی رەواقیەکاندا هەوڵیدەدا کە یاسا رۆمییەکان وەك ماف متمانە پێکراو بۆ کۆی کۆمەڵگای جیهانی بناسێنێت. سیسرۆ لە دووی پاساو هێنانەوە بوو بۆ رەوابوونی ئیمپراتۆریای رۆما و چەمکی "جەنگی دادپەروەرانە"ی *bellum iustum* بەکاردەهێنا بۆ رەواپێدان بە خۆ فراوانکردنەکانی ئیمپراتۆریای رۆما. دواجار ماناکانی ئەو چەمکە گۆڕانکاری بەسەرداهات و بووە بنەمایەك لە دادپەروەری مادیدا (ماتریالیستیدا). بەشێوەیەکی گشتی یاساناسی رۆمی چەمکی ماف سروشتی رەواقیەکانیان لەگەڵ بۆچوونی هاوبەشی هەموو گەلانی جیهان بۆ مافەکان، واتە مافە گشتگیرەکان بەیەك دەزانی. بەڵام بەڵگاندنەکانی ئەو یاساناسانە بەرامبەر بەم ستراتیژیە لە خاڵێکی گرنگدا رووبەرووی بنبەست بوون دەبویەوە، ئەو خاڵە گرنگە ئەوە بوو کە کۆیلەدارییان بە بەشێکی جیانەبوو لەو مافە گشتگیرانە دەزانی. چونکە بابەتی لەمشێوەیە جیاواز بوو لەگەڵ تێزەکانی ماف سروشتی رەواقیەکاندا کە لەسەر چەقی وەکیەکی لە نێوان مرۆڤەکاندا دروست ببوو. دەتوانین بە کورتی بڵێین گەرچی قوتابخانەی رەواقی جوڵەیەکی بەهێزی بۆ بیرۆکەی وەکیەکی لە نێوان مرۆڤەکاندا دروستکرد، بەڵام نەیتوانی بەشێوەیەکی جیدی دەزگای یاسایی کۆیلەداری هەڵوەشێنێتەوە.

سەرچاوە:

دوێچە ڤێلە

# دیموكراسییەكی خراپ زۆر باشترە لە تۆتالیتارییەتێكی باش

## گفتوگۆی رامین جەهانبەگلو لەگەڵ رۆبەرت داڵ

لە فارسییەوە: كارزان محەمەد

**ئاماژە:**

رۆبــەرت داڵ مامۆســتای كۆلیــژی زانســتە سیاســـــییەكان و لێكۆڵینــــەوە پراكتیكـــــی و سۆسیۆلۆجییەكان، ئەندامی ئەكادیمیای میللی زانســتەكان، ئەنــدامی ئەنجومــەنی فەلســەفەی ئــــەمریكا، ئەنـــدامی ئـــەكادیمیای هونــــەرو زانســتەكان و ئەنــدامی ئــەكادیمیای بــەریتانیاو ســــەرۆكی پێشـــووی ئەنجومـــەنی زانســـتە سیاســییەكانی ئەمریكایــە. بەرهەمــەكانی ئــەو بـــریتین لە:"سیاســـــەتی دەرەوەو كـــۆنگرە"، "سیاســــــەتی ئـــــابوری و خۆشـــــگوزەرانی (بــــەهاوكاری لەگـــــەڵ ئــــای. لینـــــدبلۆم)"، "پێشــەكییەك بــۆ تیــۆریی دیموكراســـی"، "(چ كەســانێك حكــومڕانی دەكــەن؟"، "دەســەڵات و خەڵكســـالاریی شـــاری ئـــەمریكایی" و "دوای شۆڕش؟"، "پلورالیزم"، "ئەندازەو دیموكراسی (بــــەهاوكاری لەگـــــەڵ ئای.ئـــــار. تافتـــــە)"، "مەســـــەلەكانی خەڵكســـــالاریی پلـــــورالیزم"، "پێشــەكییەك بــۆ خەڵكســالاریی ئــابوری"، " جڵــــــەوكردنی چـــــەكە ناوكییـــــــەكان" و "دیموكراسی و ڕەخنەكانی" و "گەشتێك بەرەو دیموكراســی" و "دەربــارەی خەڵكســالاری "یــە. ئەمــــەش بەشـــێكە لــــە گفتوگـــۆی (رامـــین جەهانبەگلو) لەگەڵ (رۆبەرت داڵ)دا

*********

***جەهانبـــەگلو: لەدەســـتپێكدا، ئەگـــەر دەكـــرێ دەربارەی بواری خوێندنتان و هــەروەها ئــەوەی كــە چ پاڵنــەرێك تـــۆی كـــردە ئارەزوومەنـــدی مەســـەلەی خەڵكسالاری و دیموكراسی، بدوێیت.**

داڵ: من لەساڵی (1915) لەئەیالـەتی ئـەیووا لــە ئــەمریكا لــەدایكبووم، بــاوكم پزیشــك بــوو.

کاتێك که من له منداڵێکی بچوك پتر نەبووم، ئەو بڕیاری دا کە شوێنەکەی بۆ ئەیالەتی ئالاسکا بگوازێتەوە. ئێمە لەشارۆچکەیەکی بچوك کە دانیشتوانەکەی نزیکەی (55)کەس بوو، نیشتەجێ بووین. ئەوێ وەك کۆمەڵگایەکی خزم وابوون کە نزیکەی هەموویان یەکتریان دەناسی. یەکێك لە ڕەگەزەکانی گەشەو پەروەردە لەوێدا، ئەوەبوو کە کوڕان دەبوایە لەهاویندا سەرقاڵی کارە جەستەیی و سەختەکان بن. من لەسەر ڕووی کەشتییەکان و یا لەڕێگەی ئاسندا کارم دەکردو داهاتەکەیم دەکردە بودجەی خوێندنی خۆم. دوای ئەوە، من چووم بۆ زانکۆی واشنتۆن کە نزیکترین زانکۆ بوو لەماڵی ئێمەوەو لەگەڵ ئەمەشدا (1000) میل لەئێمەوە دوور بوو. بۆ کورسی دکتۆرا، چووم بۆ زانکۆی ییل. لەهەمان سەردەمدا، ماوەی (3) سێ ساڵ لە واشنتۆن کارم کرد، لەبەرئەوەی نەمدەویست بچمە ژیانی ئەکادیمییەوە. لەڕاستیدا دەمەویست لە بەرنامەی (نیودیل)دا کاربکەم کە لەلایەن (ڕۆزفلت)ی سەرۆك کۆمارەوە خرابووەڕوو. بەڵام جەنگی جیهانی دووەم دەستی پێکردو من چووم بۆ خزمەتی سەربازی. لە فەرەنساو ئەڵمانیا جەنگام، پاشان ڕۆیشتم بۆ ئوسترالیا. لەناوەڕاستی جەنگەکەدا، بڕیارم دا کە ئەگەر بمەوێ شتێك لەدوای خۆم جێبهێڵم، دەبێ درێژە بەخوێندنەوەو نوسین لەبارەی هزرەکانمەوە بدەم. لەمڕووەوە، کە جەنگ کۆتایی هات من دووبارە چوومەوە بۆ زانکۆی ییل و هەوڵی پەیداکردنی کارێکم دا. لەوکاتەدا، خێزانم پێکەوەنابوو و دوو منداڵم هەبوو.

لە دەستپێکی قۆناغی خوێندنی ساڵی (1946)، کارێکی کاتیم وەك ڕاهێنەر لە خولێکی زانکۆدا دۆزییەوە. موچەیەکی کەمیان بەمن دەدا، بەڵام خۆشبەختانە کارەکەی من بوو بە هەمیشەیی و من بۆ هەمیشە لە زانکۆی ییل مامەوە. نزیکەی (50)ساڵە کە لەوێدا فێردەبم و وانە دەڵێمەوەو هەنوکە مامۆستای ڕێزلێنراو و میوانم لەو زانکۆیەدا.

ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ ئەم پرسیارەی تۆ کە چ شتێك منی هان دا بۆ لێکۆڵینەوەو نوسین دەربارەی خەڵکسالاری و دیموکراسی. پێموایە کە فاکتەرەکەی بگەڕێتەوە بۆ ژیانی من لەناو خەڵکی سادەی ئالاسکاو ئەو ئەزموونانەم کە لە سوپاو جەنگدا هەمبوو. هەستی ڕێزگرتنێکی قوڵ بۆ ئەو خەڵکە سادەیە لەمندا دروست ببوو کە چانسی خوێندنەوەو چوونە خوێندنگاو زانکۆیان دەستەبەرنەکردبوو. وابیرم دەکردەوە کە چینی کرێکار هیچی لەئەوانیتر کەمتر نییەو نزمتر نین. هەڵبەتە، ئەزموونەکەی تری من لە ڕەوتی جەنگی جیهانی دووەمدا فۆرمەڵەبوو و گەشەی کرد. مەترسییەك کە بوونی نازیزم بۆ دیموکراسی هەیبوو، لەدیدی خەڵکی هاونەوەی منیشەوە مەترسییەکی گەورە بوو کە بەشێوەیەکی گشتی هەرگیز وازی لەئێمە نەدەهێنا. لەبەرئەوەی دەمزانی کە ئەگەرەکانی ئەلتەرناتیڤ بۆ دیموکراسی هێندە ناسازن کە تەنانەت دیموکراسییەکی دەستوپێ شکاو زۆر باشترە لە ڕژێمێکی تۆتالیتار. لەمڕووەوە، بوونی خەڵکسالاری بۆ ئێمە، بەهایەکی بەرزی هەبوو. گەیشتمە ئەم بڕوایەی کە دیموکراسییەکی خراپ زۆر باشترە

له تۆتالیتارییەتێکی باش.کەواتە، ڕەنگە هەموو ئەم فاکتەرانە بووبنەهۆی ئەوەی کە من بایەخ بە خەڵکسالاری، لاوازییەکانی و خاڵە بەهێزەکانی بدەم و بیر لەمە بکەمەوە کە بۆ باشتربوونی ئەم خەڵکسالارییە، پێویستە چی بکرێت.

هەڵبەتە فاکتەرێکی تریش هەبوو بۆ ڕاکێشانی سەرنجی من بەرەو خەڵکسالاری. دوای ئەوەی خوێندنم تەواو کرد، لە (حیزبی سۆشیالیستی ئەمریکا)دا بووم بەئەندام، لەو سەردەمەدا (نۆرمان تۆمس) سکرتێری گشتی حیزب بوو, هەرلەوکاتەدا من یەکەمین کتێبم بەهاریکاری (ئاد. لیند بلۆم) کە ئابوریزان بوو، بەچاپ گەیاند. ناوی ئەم کتێبە (سیاسەت، ئابوری و خۆشگوزەرانی مرۆیی) بوو. من تێزی دکتۆراکەشم لەبواری (بەرنامە سۆشیالیستییەکان و سیاسەتەکانی خەڵکسالاری "دیموکراسی") نوسی و تیایدا، دیدگا فەلسەفییەکانی سۆشیالیستە شایستەو یۆتۆپیستەکانم خستەژێر توێژینەوەوەو هەوڵمدا بزانم کە ئایا ئەم فەیلەسوفانە لە تیۆرە خەڵکسالاری و دیموکراسییەکاندا پێگەیان هەیە یاخود نا. بەم ئەنجامە گەیشتم کە بازاڕ لەکاری خەڵکسالاریدا ڕۆڵێکی بنچینەیی هەیە. گەیشتمە ئەم بڕوایەی کە بازاڕە ئابورییە دەستبەسەرداگیراوەکان لەگەڵ خەڵکسالاریدا نەگونجاون.

گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە میللیکردنی پیشەکان، کارێکی خوازراو نییەو دوای ئەوە لە حیزبی سۆشیالیستدا دەستم لەکارکێشایەوەو کەنارم گرت. خودی حیزبی سۆشیالیستیش لە پەراوێزدا بوو و دوای داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن سوپای ئەڵمانیاوە، تێگەیشتم کە خۆپەراوێزخستن ڕێگاچارەی مەسەلەو کێشەکانی ئێمە نییە. بەم پێیە ئەم پەیوەندییەی نێوان خەڵکسالاری (دیموکراسی)و سیستەمی ئابوری هەمیشە بەشێك لە هزری منی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووەو هەروەها بەشێکی بەرچاوی لە توێژینەوە پراکتیکی و تیۆرییەکانی من بۆئەوە تەرخان کراوە.

***جەهانبەگلو: ئەگەر ئەمرۆ بمانەوێت خەڵکسالاری پێناس بکەین، پێویستە چۆن پێناسی بکەین و چۆن دەتوانین بڵێین کە خەڵکسالای مۆدێرن جیاوازە لە خەڵکسالاریی ئەسینایی؟.**

داڵ: پێویستە بڵێم کە من دوای ئەم هەموو ساڵە بۆ پێناسی خەڵکسالاری ، هێشتا وابیردەکەمەوە کە پێناسەکردنی، مەسەلەیەکی باس وروژێنەرە. پێشنیازم ئەمەیە کە ئاراستەیەك هەڵبژێرین کە بە دیدی من، پێداویستییەکانی پێناسێکی ڕازیمەندانە بۆ خەڵکسالاری ڕۆشن بکاتەوەو من بە بڕوای تەواوە دەست پێدەکەم کە بەر لە هەرشتێك، پێناسێکی گشتگیرانە بۆ خەڵکسالاریی دەبێ مێژووی ئەم زاراوەیەش لەخۆبگرێت.

بۆ نمونە، لەدیدی منەوە کارێکی بێهودەیە ئەگەر تۆ خەڵکسالاری بەشێوەیەك پێناس بکەیت ئەنجامەکەی وا بکەوێتەوە کە ئەسینایییەکان خەڵکسالار نەبووبێتن. ئەسینایییەکان زاراوەی (دیموکراسی) یان بەلایەنی کەمەوە بەشێوەیەك بەکارهێناوە کە هەنوکە ئێمە پێویستە

بەرێزەوە یادی بکەینەوە. بەڵام لەهەمان کاتدا پێویستە پێناسێکی خەڵکسالاری بکەین کە هەم لە ناوەرۆکی زاراوەی خەڵکسالاری و هەم لەناوەندو دامەزراوەکانی لەبەرچاوبێت.

یەکەم قسەی من ئەوەیە کە پێویستە بایەخێکی بنچینەیی بە هەموو مێژووی (خەڵکسالاری) بدرێت و هەموو ئەو پێناسانەی کە بۆی دەکرێت، پێویستە لەگەڵ ئەمدا گونجاو بن. خاڵی دووەم ئەوەیە کە پێویستە لەڕووی پێناسەوە، لەنێوان خەڵکسالاری وەك پرۆسەو خەڵکسالاری وەك سیستەمێك جیابکرێتەوە. زۆر لە تیۆریستانی سیاسی، گرنگی پێناسی خەڵکسالاری وەك نمونەیەکی باش یا نمونەیەکی ئایدیال لەبەرچاو ناگرن. لێرەدا من ڕام لەگەڵ چەمکی (نمونەی ئایدیال)ی ماکس ڤیبەردایە. ئێمە تەنانەت لەجیهانی فیزیکیشدا نمونەی ئایدیالمان هەیە. تیۆری گالیلە دەربارەی کەوتنەخوارەوەی تەنەکان لە بۆشاییدا نەسەلمێنرا، بەڵکو ناوبراو ئەم تیۆرییەی بەگریمانەی بوونی بۆشایی داڕشت. من پێموایە هەمان نمونەی ئایدیالی تەنها، بۆ چەمکی خەڵکسالاریش شیاوی گشتاندنە. بەمەرجی ئەوەی کە ئامڕازەکانیمان لەبەردەستدابێت. هەمان ئەم خاڵە ئایدیالیە، بۆ زۆر کەسیش مانایەکی دووهەمیشی هەیە. ئێمە سود لە چینێکی ئایدیال وەردەگرین بۆ هەوڵە ئامانجدارەکانی خۆمان و بۆ بەراوردکردنی، وەك نمونەیەکی گونجاو لەگەڵ جیهانی واقیعی و بووندا. چینی ئایدیال لەڕاستیدا سەرمەشقە بۆ گۆڕان و ڕیفۆرمی جیهانی ڕاستەقینەو نزیککردنەوەی بوونی واقیع لەنمونە خوازراوەکە.

بەمپێیە، تیپێکی ئایدیال پێویستە بەشێوەیەك بێت کە نەرێتە هەنووکەیی و ڕاستەقینەکان ڕەچاو بکات و لەگەڵیاندا بگونجێت. لێرەدا، وادێتەبەرچاو کە ڕێگەی دروست بۆ خەڵکسالاری ئەوەیە کە گروپێك لەخەڵك وێنابکەین کە لەدیدی سیاسییەوە بەیەکسان بزانن. بەم مانایەی کە لەدیدی سیاسییەوە، ئەرکی بەشدارییان لەبڕیارگەلێکدا لەئەستۆگرتووە کە بۆ ئۆرگانیزەکردنی کۆبوونەوەو ئەنجومەنەکانیان پێویستە.

لێرەدا، خاڵێکیتر خۆی دەردەخات، خەڵك بۆئەوەی خاوەنی خەڵکسالاری بن، پێویستە فرسەتی خستنەڕوو و دەربڕینی خۆیان و فرسەتی بەشداریان لە ژینگەی سیاسیدا هەبێت. ئەوان دەبێ فرسەتی چاودێریکردنیان بەسەر بەرنامەو بڕیاردانەکان و... هەبێت. من خاڵێکیتری ئەخلاقیشی بۆ زیاد دەکەم و ئەوەش ئەمەیە کە ئەو بەتەمەنانەی یاسا دەیانگرێتەوە، ئەرکە لەسەریان لە سیاسەتدانانەدا بەشداریی بکەن. لەم چەشنە هەلومەرجەدا دەکرێ بپرسین کە چ ناوەندگەلێك بۆ دیموکراسییەك پێویستن، لێرەدا ئێمە دەبێ دیموکراسی وەك جیهانێکی ڕاستەقینەی ناوەندە سیاسییەکان پێناس بکەین.

هەنوکە دەتوانین بچینە مەسەلەیەکی مەزنی مێژووی دیموکراسییەوە کە من لە توێژینەوەکەی خۆمدا وەك مەسەلەی ئەندازەو بەراوردی یەکەی سیاسی ناوم هێناوە. ئاڵوگۆڕ لە بەراوردی یەکەی سیاسیدا، کاریگەرییەکی

مەترسیداری لە ناواخنی دامەزراوەکاندا هەیە. بەهەمانشێوەی کە دەزانیت، بۆ پتر لە دوو هەزار ساڵ بنچینەترین ئاراستەی بەرگریکارانی حکومەتە دیموکراسیو کۆمارییەکان ئەمە بووە کە دیموکراسی دەبێ یەکەیەکی بچوکی سیاسیانەی هاوڵاتیان (ئەنجومەنێکی بچوکی هاوڵاتێتی وەك کۆماری ڤنیز) بێت کە تیایدا، هاوڵاتیان یەکتریان لەبەردەستدایەو کەمو زۆر بتوانن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری لە بڕیارداندا بکەن.

بەڵام لە سەدەی هەژدەهەمدا ڕوون بۆوە کە ئەم مۆدیلە بۆ بەدیموکراتیزەکردنی دەوڵەتی میللی ناکارایە. لەلای زۆرینەی تیۆریستان جگە لە ڕۆسۆ، ڕوون بۆوە کە خەڵکسالاریی ڕاستەوخۆ لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا کارا نییە. دوای ئەوە، ئەم تیۆریستە مۆدێرنانە دەرکیان بە زەروورەتی بوونی نوێنەرایەتی سیاسی کرد. لەئەنجامدا، ئێمە نوێنەرایەتییەکی تارادەیەك خەڵکسالارمان (وەك ئەنجومەنی بەریتانیای ئێستا) لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی دەنگدەردا هەبووە، بەڵام ڕوون بۆوە کە گەڕانەوە بۆ خەڵکسالاریی ئەسینا نامومکینە.

من (نوێنەرایەتی سیاسی مۆدێرن) وەك داهێنانێك دەبینم کە تیایدا، ناوەندەکانی ئەشرافەکانی لەخۆگرتووەو بۆ ئەنجومەنی هاوڵاتێتی گەشەیان پێداوەو لە ئەنجامدا حکومەتێکی خەڵکسالاریان لێ بنیات ناوە. بەمپێیە، بۆ تێگەیشتن لە خەڵکسالاریی، تۆ دەبێ ناوەندە سیاسییەکان سەرلەنوێ لە چوارچێوەی نوێنەرایەتی سیاسیدا پێناس بکەیتەوەو بزانیت کە ئەوان چیو کێ دەکەنە نوێنەر. ئێمە دەبێ بزانین کە تەنانەت ئەگەر لە سیاسەتە مۆدێرنەکاندا نوێنەرایەتیمان هەبێت، هەمووان لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە هەڵبژێردراون، بەرپرس و وەڵامدەرین. بۆ بوونی ئەو چەشنە بەرپرسیارێتییە، ئێمە پێویستمان بە بوونی ئازادی دەربڕینو توێژینەوەو ئازادیی کۆبوونەوە هەیە. هەموو مەسەلەی دیموکراسی ئەمەیەو من مەرجێکی نوێ بۆ ئەم پێشمەرجانە زیاد دەکەم کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا وادەهاتەبەرچاو گرنگی نییەو ئەویش بریتییە لەوەی کە هاوڵاتیان دەبێ پەیڕەوی لە یاساکان بکەنو لەهەمبەر ئەوەشدا خاوەنی هەموو جۆرە مافو سەرچاوەکانی پەیوەندیدار بە میللەتێکی خەڵکسالار بن. یەکەمین پرسیار کە ئێمە دەبێ لە خۆمانی بکەین ئەمەیە کە: سنووری ئەو شوێنە کوێیە کە بتوانین بڵێین ئێمە خاوەنی خەڵکسالارین یان نا.

من چەندین ساڵ لەمەوپێش هاتمە سەر ئەو بڕوایەی کە زاراوەی (خەڵکسالاریی فرەفەرمانڕەوایی) بۆ ئەم چەشنە حکومەتە نوێیانەی کە ئەمڕۆ لە جیهاندا فۆرمەڵە بوون، بەکاربهێنم تا جیاوازیان لەگەڵ چەشنەکانی تری دیموکراسیدا ڕوون ببێتەوە. فرەفەرمانڕەوایی (پۆلیارشی) لە ڕاستیدا سیستەمێکە هەموو ئەو ناوەندانە لەخۆدەگرێت کە من ناوم هێنان.

ئێستا ئەگەر بۆ ئەو مەسەلەیە بگەڕێینەوە، دەتوانرێ بوترێ کە ئەگەر گرووپێك لەو وڵاتانە لەبەرچاوبگرین کە دیموکراسیان هەیە، ئەوکاتە دەتوانین بوونی ئەم ناوەندانە لە وڵاتانی وەك ئەمریکا، کەنەدا، ئوستراليا، یابانو ئەوروپادا

ببینین. بەپێی ئەم جیاکارییە، دەتوانرێ وڵاتان بۆ دوو گروپ، واتا ئەوانەیکە تا رادەیەك ئەم ناوەندانەیان نییەو ئەو گروپەی کە بەکردەوە ئەم ناوەندانەیان هەیە، لە یەکتر جیایان بکەینەوە. بەهەمانشێوەی کە دەیبینیت، کاری پێناسی دیموکراسی بەبەراورد لەگەڵ (25) سەدەی ڕابردوودا، واتا ئەو کاتەی کە ئەرستۆ هەوڵی دەدا دیموکراسی ئەسینایی لەگەڵ چەشنەکانی تری حکومەتدا بەراوردی بکاتو هەڵیبسەنگێنێت، دژوارترو ئاڵۆزتر بووە.

***جەهانبەگلو: دەمەوێت بەرلەوەی بگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی دیموکراسی مۆدێرن ، دەربارەی دیموکراسی ئەسینایی پتر گفتوگۆ بکەین، لە بیرمە کە (مۆسیس فاینلی)ی مێژوونوسی یۆنانی دێرین لە کتێبەکەی خۆیدا (خەڵکسالاریی دێرین و نوێ) نوسیبووی کە لەلای ئەسینایەکان (ئازادی بە مانای حکومەتی یاساو بەشداریی لە پرۆسەی بڕیارداندا بووەو نەك هەبوونی مافێکی تەواو و بێکێشمەکێش). هەنوکە بە تێڕوانینی من، وادێتەبەرچاو کە بەلای مرۆڤە مۆدێرنەکانەوە، چەمکی (مافەکان) گرنگییەکی زیاتری لە (بەشداریی لە ژیانی سیاسی)دا پەیدا کردووە.**

دالْ: ئامارەت بۆ خاڵێکی سەرنجڕاکێش کرد، پێموایە یەکێك لەو ڕێگایانەی کە هزرەکانی ئێمەی بەهەر هۆیەکەوە بێت کامڵ کردووە، ئەوەیە کە هەرکام لەم ناوەندە بنچینەییانەی خەڵکسالاریی مۆدێرن، ئەگەر بە وردییەوە بنۆڕین، گرەنتی مافن. بۆنمونە، ئازادی دەربڕین، مافگەلێك دەخاتە ئەستۆی سیستەمی دادوەرییەوە کە ئیلتیزامێکی جێبەجێکردنی هەیەو ئەو دەبێ ئەم مافانە پراکتیزە بکات. پێکهێنانی حیزبە سیاسییەکانیش مافێکە. هەڵبەتە لەلای نوێگەراکانو مۆدێرنیستەکان مافەکان بەمانای فرسەتەکانیشە. ماف بەبێ فرسەت لە ڕاستیدا ماف نییە. بەڵام لە دوورنمایەکی توندترەوە، ماف بەمانای سەرچاوەکانیش دێت.

هاوڵاتیانی کۆمەڵگایەکی خەڵکسالار دەبێ خاوەنی کۆمەڵە سەرچاوەیەك بن. دەبێ بزانین کە کۆمەڵە سەرچاوەیەکی وەك: زانیارییو فێرکردن لە بەشە سەرەکییەکانی خەڵکسالاریی بوون. دەستگەیشتنی هاوڵاتیان بەم سەرچاوانە، یەکێکە لە ئەرکەکانی دەوڵەتی خەڵکسالار. لەمڕووەوە، من بەم ئەنجامە گەیشتووم کە خەڵکسالاریی مۆدێرن جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ خەڵکسالاریی دێریندا هەیە. ناوەندە سیاسییە پێویستەکان بۆ خەڵکسالارییو یاخود سیستەمە (فرەحکومڕانییە نوێیەکان) بەتەواوەتی جیاوازن. لە ڕاستیدا جیاوازی لەنێوان ئەم دوو سیستەمەدا، هەرئەمەیە.

***جەهانبەگلو: بەهەمانشێوەی کە تۆ خۆت لە شوێنێکدا نوسیوتە، ڕەنگە گرنگترین جیاوازی لەنێوان دیموکراسی مۆدێرنو دێریندا ئەوە بێت کە خەڵکسالاریی دێرین (بەهاکان لەیەکتر جیا نەبوونەتەوە) و لەئەنجامدا خۆشگوزەرانو بەختەوەریی وابەستەی شایستەییو فەزیلەتو دادپەروەریی بووە.**

دالْ: پێموایە کە ژیانی سیاسی ئەسینا بەبەراورد لەگەڵ هزرە فەلسەفییەکانیدا، لێکدابڕانێکی پتری هەبووە. بەتێڕوانینی من، یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ژیانی مۆدێرن،

لــــەبارەی زیــــادبوونی بەراوردکارییــــەکان و بەرفرەیی و فرەچەشنی ئەنجومەنەکان لەوەدایە کە ئێمە دەبێ تێبگەین لە جیابوونەوەی مەزنی بەرژەوەندییــــەکان و (یــــا بەرژەوەندییــــە ئەقڵانییــەکان). بــەم مانایــەی کــە هەرکەسـێك سـەبارەت بـە خـۆی و ژیـانی دەوروبـەری خـۆی چـۆن بـیری لێدەکاتـەوە، ئـەم مەسـەلەیە خـۆی هەقیقـەتێکی ئـاڵۆز بـۆ تیۆریسـتانی سیاسـی مــۆدێرن دروســت دەکــات. پێموایــە کــە یۆنانییـەکان بەبـەراورد لەگـەڵ ئێمـەدا خـاوەنی سەقامگیریی و دڵنیاییەکی پتر بوون و سەرەنجام ئێمە ئێستا دەربارەی فەزیلەت و بەختەوەریی بە جۆرێـك دەپـەیڤین کـە هـەر مرۆڤێکـی لـۆژیکی و ئاقڵمەنـد دەتوانـێ قبـوڵی بکـات. بـە تێڕوانینـی مـن، لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەم بـەملاوە، لەگەڵ بوونی کەسانێکی وەك نیێتچە، ئێمە ئیتر نــاتوانین هەســت بــە دڵنیــایی بکــەین. هــەر پێناســــێك بــــۆ بەختــــەوەریی، نــــاکۆکی دەوروژێنێــــت، بــــەڵام مومکینــــە لــــە ڕووی فەلسـەفییەوە هەقیقـەت بێـت و ئێمـە نـاتوانین لەبەرچاوی نەگرین. ماناکەشی ئەمەیە کە ئێمە سیاسـەتێکی گشـتیانەمان نییـە کـە بتـوانرێ لـە هەنـدێ لـە مانـا فەلسـەفییە ئەبسـتراکتەکاندا بـە باشــترین شــێواز دەربکــەوێت. مــن بــیر لــە پرۆسـەیەك دەکەمـەوە کـە خـەڵك سـەبارەت بـە بڕیاردانە ڕەواکان خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن، ئەو پرۆسەیەی کە بە یاریدەی ئەو، تۆ دەگەیتە کۆدەنگ و لە هەمان ڕێگاوە ئەم کۆدەنگییە لە تێڕوانینــــی ئەخلاقییــــەوە قبــــوڵ دەکرێــــت، بەڕاستی ئەمە گرنگە. من پێموایە کە پرۆسەی خەڵکسالاریی چ وەك نمونەیەکی باشترو چ وەك گەمــــەی ناوەنــــدە خەڵکســــالارەکان، تــــەنها پرۆسـەیەکە کـە تیایـدا، ئێمـە لەهەمبـەر بەڵێنـە ڕاســـتەقینەکان کۆدەنگییـــەکی لۆژیکیانـــەمان هەیــە. ئێمــە نــاتوانین بڕۆینــە دەرەوەی ئــەم چوارچـــێوەیەو دیموکراســـی بـــە پێـــوەری ئایدیایەکی ئەبستراکت، هەڵبسەنگێنین.

**سەرچاوە:**

سایتی ڕۆشنگەریی

# گفتوگۆ لەگەڵ ریچارد رۆرتی

لە ئینگلیزییەوە: کارزان کاوسێن

رەنگە ریچارد رۆرتی بەناوبانگترین فەیلەسوفێك بێت کە لە ژیاندایە لە نەریتی پراگماتییدا و یەکێکە لەو بیرمەندانەی ئەمرۆکە زۆرترین گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت. ئەو مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی ستانفۆرد، (فەلسەفە و ئاوێنەی سروشت–1979)، (بەدەستهێنانی ولاتمان: بیرکردنەوەی چەپڕەو لە سەدەی بیستەمی ئەمریکادا–1998)، (ئایندەی دین بە هاوبەشی لەگەڵ جیانی ڤاتیمۆ–2005) لە نموونەی کتێبەکانی ئەون. ئەمەی خوارەوە دەقی گفتوگۆیەکی جیانکارلۆ مارچێتی–یە لەگەڵ رۆرتییدا دەربارەی ئایدیا و هیواکانی.

**+چی بووە هۆی ئەوەی کە تاووتوێی فەلسەفە بکەیت؟**

–کاتێك کە هەرزەکار بووم، ئەفلاتوون و نیتشەم دەخوێندەوە و بیرم لە کێشەکانی نێوانیان دەکردەوە، پێم وایە کە ئەم رێگەیە باوە بۆ سوود وەرگرتن لە فەلسەفە و رێکەوت کە من بچم بۆ زانکۆیەك کە تیایدا فەلسەفە زۆر بەرەودار بوو و لە هەموو کۆرسەکاندا دەوترایەوە، بۆیە رێچکەیەکی زۆر سروشتی بوو بۆ ئیش لەسەرکردن.

**+لە ماوەی خوێندندا کێ بەشێوەیەکی تایبەت کاریگەری لەسەر تۆ هەبوو؟**

–جۆرەها مامۆستا لە زانکۆی شیکاگۆ: لیۆ شتراوس، چارلز هارتشتۆرن، کە خوێندکاری وایتهێد بوو و دۆلف کارناپ کە بە تەواوی خەڵکانی جیاواز بوون.

**+ بەشێوەیەکی تایبەت کام فەیلەسوفە پەسند دەکەیت و بۆچی؟**

–پێم وایە ئەو فەیلەسوفەی من بە شێوەیەکی زیاتر پەسندی دەکەم ویلیام جەیمز–ە. ئەو هەرگیز هەستی گاڵتەجاری لە نووسینەکانیدا بزر نەکرد. ئەو دەینووسی چونکە چێژی لێوەردەگرت. وزەیەکی شادی لە کارەکانیدا هەبوو کە من ئاواتم بوو بتوانم لاسایی بکەمەوە.

**+دەتوانم پرسیار بکەم کە تۆ چۆن دەنووسیت؟ ئایا زۆر بە نوسینەکانتا ئەچیتەوە؟**

-رەنگە نەك وەکو پێویست. ئاسایی رەشنووسێك ئامادە دەکەم و پاشان دووەم رەشنووس و ئینجا لەماوەی چەند هەفتەیەك یا چەند مانگێکدا پاکنووسی دەکەم.

**+با بچینە سەر فەلسەفە. دەتوانی پێم بڵێیت چ شتێك نمایشی وێنەی پراگماتیزمی تۆ دەکات؟**

-ئەوەی کە من لە خوێندنەوەی پراگماتیستە کلاسیکەکان بەدەستی دەهێنم تەنیا ئەو بیرۆکەیەیە کە هیچ وەسفێکی نایاب نییە و بۆیە خاڵێکی زۆر نییە لە پرسیارکردندا، " ئایا رێگەی وتوێژی ئێمە دەربارەی شتەکان بابەتییە یا خودیی؟" من پراگماتیستەکان وەکو خەڵکانێك دەبینم کە باشترین کار ئەنجام دەدەن بۆ دەرباز بوون لە جیاکردنەوەی خود/بابەت.

**+بە چ شێوازێك رێچکە پراگماتیزمەکەی تۆلە هی هیلاری پوتنام جیا دەبێتەوە؟**

-دڵنیا نیم. پوتنام شتێکی دەوێت کە پێی وتووە حەقیقەتی جددی یا گرنگ. من نازانم لەو فرەیزەدا "گرنگ" چی دەگەیەنێت. ئەو جۆرێك لە پەیوەندی دەوێت کە من چیتر بە پێویستی نابینم ، بەلام نازانم ئەمە چ جۆرە پەیوەندییەکە.

**+لە زۆرێك لە کتێبەکانتدا خۆت بە قەرزاری رووناکبیریی دۆناڵد داڤیدسۆن دەزانیت. تۆ لە ژمارەیەك خاڵدا لەگەڵ داڤیدسۆن کۆکیت. دەتوانیت بڵێیت خاڵی هاوبەش و جیابوونەوەت لەگەڵ داڤیدسۆندا کامەیە؟**

-پێم وانییە لەگەڵ داڤیدسۆندا ناکۆك بم لە هیچ پرسیارێکی فەلسەفی بایەخداردا. پێم وایە جیاوازی نێوانمان لەوەدایە کە بە بۆچوونی ئەو پرۆژەی تایبەتکردنی تیۆرەیەك بە مانا بۆ زمان گرنگە و منیش بۆچوونی کۆچکردوو ویتگنیشتاین-م هەیە کە دەڵێت رەنگە وانەبێت. میشێل دومێت دەڵێت ئەگەر ویتگنیشتاین راست بووایە ئەوا پێویست بوو ئێمە واز لە تیۆرەی سیستەماتیکی مانا بهێنین. من خۆشحاڵم کە وازی لێبهێنم و داڤیدسۆن نا. بەلام ئەمە کتومت جیاوازییەکە نییە. وەکو بڵێی جیاوازییەکە لە بایەخداندایە.

**+ئەگەر تۆ جینالۆجیایەکی پراگماتیزم و پراگماتیزمی نوێ گەڵاڵە بکەیت پێگەی داڤیدسۆن، پوتنام و خۆت لە کوێدا دیاری دەکەیت؟**

-باوەرم وایە کە من و پوتنام هەمان کاردانەوەمان هەیە بەرانبەر پۆزەتیڤیزم. ئێمە لەلایەن خەڵکانی وەکو دەبلیو ڤی ئۆ کوینە و مۆرتۆن وایت هاتووینەتە سەر ئەو قەناعەتەی کە شیکار و دەستکرد، چاوەدێریی و تیۆری، راستی و بەها شیاوی جیاکردنەوەی گەورە نەبوون و جۆن دێوی راست بوو لە هەوڵدانیدا بۆ رزگاربوون لەم جیاکارییانە. پێم وایە داڤیدسۆن لە من و پوتنام رەسەنترە. بۆیە بڕوام وایە کارەکەی ئەو لە فەلسەفەی زماندا, وەکو ئەوەی رۆبەرت براندۆم وایە، کە چەمکێکی نوێی پێداوین دەربارەی پەیوەندی نێوان زمان و جیهان. خۆم و پوتنام وەکو ئەو وانە کردارییانە دەبینمەوە کە لە جۆن دێوی-یەوە وەرگیراون لە کاتێکدا کە داڤیدسۆن و براندۆم رێچەیەکی نوێیان شکاندووە.

**+بەشداری ئیمێرسۆن لە پراگماتیزمدا چییە؟**

-دڵنیـا نـیم. ئیمێرسـۆن نووسـەرێکی سەرلێشـێوێنەر و ناتەبایـە, تـۆ دەتوانیـت تـا رادەیـەك هـەر شـتێکت بوێـت لـە ئیمێرسـۆن بەدەستی بێنیت. ئاشکرایە کە ئەو بۆ نیتشە و بـۆ جـەیمز مانایـەکی زۆری هـەبووە. ڕەنگـە وا دابنرێـت کـە ئەمـەی جـەیمز و نیتشـە بەشـێوەیەکی بـاو هەیانـە لـە ئیمێرسـۆنەوە وەرگیراوە، بەڵام زۆر قورسە کە هەموو شتێك بە ئیمیرسۆنەوە ببەستیتەوە.

**+چ شتێك تایبەتە لەمەڕ ئاکارەکانی پراگماتیست؟**

-پـێم وانییـە پراگماتیسـتەکان ئاکـاری تایبـەتیان هـەبێت. ئـەوان، گـەر تـۆ بتـەوێت، میتـا-ئاکاری تایبـەتیان هەیـە. بۆیـە ئـەوان لـە لێکهاوێرکردنی ئـەخلاق و وریـایی(*prudence*)دا ڕاڕان. ئیمانوێـل کانـت هێشـتا گـەورەترین کاریگەرییـە لەسـەر فەلسـەفەی ئـەخلاقی ئەکادیمی. تۆ ئەگەر کانت بخوێنیتەوە، ئەوا بیر لـە ئـەخلاق دەکەیتـەوە وەکـو شـتێکی تایبـەت، وەکـو دیاردەیـەکی جیـا کـە بـە گشـتی جیـاوازە لەگەڵ هەر شتێکی تر لە کەلتووردا. جۆن دیـوی کتێب لـە دوای کتێـب دەینووسـی کـە دەیگـوت ئێمـە پێویسـتمان بـە جیاکردنەوەیـەکی گـەورە نییـە لـەنێوان ئـەخلاق و هـەر شـتێکی تـردا، تەنانـەت پێویسـتمان بـە جیاکارییـەکی گـەورە نییـە لـەنێوان ئـەخلاق و وریاییـدا. ئەمانـە هـەمووی پرسـێکن بـۆ شـیکارکردنی ئـەو کێشـانەی کـە لـە پەیوەندییـەکانی نێـوان مرۆڤەکانـدا سـەرهەڵدەدەن. کاتێك ئـەم کێشـانە تونـد دەبـن ئێمـە پێیـان دەڵـێین کێشـە ئەخلاقییـەکان، کـاتێکیش تونـد نـابن پێیـان دەڵـێین کێشـە بـە حـەزەرەکان. ئەمـە زیـاتر پەیوەنـدی بـە چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـانەوە هەیە کە لە نێوان مرۆڤەکاندا ڕوودەدات. وەکو کانت پێی وابوو، جیاوازی نێوان ئەقڵ و سۆز، یـاخود ئـەقڵ و هەسـت، یـاخود پێشـینە و پاشینە، یاخود فەلسەفی و ئەزموونی و هیتر. لە بنەڕەتدا ئەوەی جۆن دیوی کردی بۆ فەلسەفەی ئـەخلاق تـەنیا بـۆ دەربـازبوون بـوو لـە کانـت. باوەڕم وانییە کە پراگماتیستەکان بەشدارییەکی تریان هەبێت بۆ ئەخلاقیات.

**+ پراگمـاتیزم دەتوانێـت چـی پێشـکەش بـە دانیشتووانی گوندی گەردوونی(گڵۆباڵ) بکات؟**

-ئامۆژگارییـەکی فەلسـەفییمان پێدەدات بـۆ کـەلتوورێکی بەعـەلمانیکراو، کـەلتوورێك کـە تیایـدا ئەمـەی نیتشـە پێیـدەوت " هـەموو جێنشـینەکانی خـودا" بـوونی نـەماوە و هـەر کەسـە بـۆ خۆیـەتی. مـن ئەمـە وەکـو وێنەیـەکی هیومانیزم دەبینم.

**+بێگومان پراگمـاتیزم لـە سـاڵی 1870 وەکـو بزاڤێکی فەلسەفی دەسـتی پێکـرد، ئـەو کاتـەی کـە تیۆرەی بنەچـەی جۆرەکـان-ی داروین لـە هـەموو شـوێنێك ڕەنگدانـەوەی هـەبوو. بـە ڕای تـۆ داروین بەشداری لە پراگماتیزمدا چۆن بوو؟**

-داروین تـەکانێکی دایـە بـەر پراگمـاتیزم، تێبـینی بکـە،کاتێك کـە تـۆ پێویسـتت بـە ڕوونکردنەوەیـەکی سـەروو ئاسـایی نییـە بـۆ هۆشـی مـرۆڤ یـاخود بەشـێوەیەکی جیـا بـۆ تواناکانی مرۆڤ. لەبری ئەمە، تۆ دەتوانیت وەکو ئـاژەڵی زیـرەك مرۆڤـەکان وێنـا بکـەیت . ئـەو ئەرکێکی نویَ بـە فەیلەسـوفەکان دەسـپێرێت و پراگماتیسـتەکان لـەناو ئـەو خەڵکانـەدان کـە هەوڵیاندا ئەو تەحەدایە بەهێز بکەن کە داروین

گەلاڵـەی کردبـوو. بـە بۆچـوونی مـن داروویـن هانــدەرێکی گــرنگ بــوو بــۆ پێشــکەوتنی پراگماتیزم، بەلام ئەمە جیاوازە لەوەی کە بڵێیت بەشداری هەبووە.

**+با بێینە سەر کتێبە تازەکەت، فەلسـەفە و هیـوای کۆمەڵایەتی. مەبەستت چییە لە هیوای کۆمەڵایەتی؟**

–ئـەو هیوایـەی رۆژێـك دێـت کـە مرۆڤـەکان دەتـوانن وەکـو ئەنـدام گـەلێکی سەربەسـت و یەکسـانی کۆمەڵگایـەکی گلۆبـاڵ بـیر لـە خۆیـان بکەنـەوە و پێویسـت بـەوە نابێـت کـە لەیـەکتری بترسن.

**+چ شتێك دیموکراسییەکی بـاش دێنێتەکایـەوە و چۆن دەتوانین بیناسینەوە؟**

–تەنیا رێگە ئاساییەکان: ئایا حاکمەکان لە دەرەوەی گوشاری سیاسیدان؟ ئایا رۆژنامەکان ئازادن لە بلاوکردنەوەی هەرشتێك کە بیانـەوێت یــان لــە ژێــر کــۆنترۆڵی دەزگاکــان یــاخود سیاسەتمەدارانداز؟ ئایا هەڵبژاردنـەکان ئازادن؟ ئایــا ئاســتی خوێنــدنی هاولاتیــان بــایی ئەوەندەیـە کـە توانایـان پێبـدات بـۆ نرخانـدنی کێشــە سیاســییەکان؟ ئایــا کــۆنترۆڵ لەلایــەن دەوڵەمەندەکانــــەوە بەســــەر هەژارەکانــــدا سـەپێنراوە بـەجۆرێك کـە بیانترسێنێت و دەنگ بە دەوڵەمەندەکان بدەن لە بەرژەوەندی خۆیان؟و حاڵــەتی تــریش. لێــرەوە ئێمــە ئــەزموونی بەرچـاومان هەیـە لـە وتـنی ئەمـەدا کـە کـام حکومەتانە دیموکراتن و کامانەش نا.

**+رات چییە لەمەڕ سیاسەتی ئەمریکا؟**

–پێم وایە کە ئێمە خزاوینەتە ژێر کۆنترۆڵی باڵی راست لە ئەمریکا. خەریکە کۆمارییەکان لە کۆنگرێسدا بالادەست دەبن. ئەوەی کە ئێمە بە راســــتی ئایینگــــەرا نــــاوی دەبــــەین، فەندەمێنتاڵیستە مەسیحییەکان خەریکە زیاتر و زیاتر پارتی کۆماری رکێف دەکەن. بۆیـە من وای دەبیـنم کـە تەقەلایـەکی بـەردەوام دەبێـت لەلایـەن کۆمارییەکانـەوە بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی (*New Deal*)، بۆ دەربـازبوون لـە دەوڵـەتی ریفاه، بــۆ وەرگــرتنی پــارەی زۆرتــر و زۆرتــر بــۆ دەوڵەمەنــدەکان. مــن زۆر رەشــبینم بەرانبــەر سیاسەتی ئەمریکا.

**+بە تێڕوانینی تۆ ئامانجی فەلسەفە چییە؟**

–لـە راستیدا ئەمـە شتێك نییـە کـە ئامـانجی هەبێت. پێم وایـە ئەمـە کردەیـەکی کۆمەڵایەتییە بۆ پاراستنی ئاراستەکانی گۆڕان لە کەلتووردا و هەوڵــدان بــۆ چــاککردنی شــێوازەکانی قسـەکردنمان لـەپێناو بـە هەنـد وەرگـرتنی ئـەو شتە نوێیانەی روویانداوە. لە سەدەی حەڤدەدا، فەیلەسوفەکان هەوڵیاندا گالیلۆ و نیوتن بهێننە نـاو وتوێـژی رووناکبیران. لـە سـەدەی هـەژدەدا هەوڵیاندا داروین بهێنن. لـە سـەدەی بیستەمدا ویســتیان فرۆیــد بهێــنن. کــەلتوور گــۆڕان دەپارێزێت و ئێمـە بـە "فەیلەسوفەکان" دەڵێین ئەو خەڵکانـەی کە هـەوڵی گونجاندنی پێویست ئـەدەن بـۆ دەسـت و پەنجـە نـەرم کـردن لەگـەڵ گۆڕانەکاندا.

**+بە شێوەیەکی کەسی فەلسەفەکردن لای تۆ چـی دەگەیەنێت؟**

–بـاوەڕ ناکـەم چـالاکییەك هـەبێت بـەناوی فەلسـەفەکردن. چـالاکی خوێندنـەوە هەیـە، ئـەو کتێبانـە هـەن کـە بـە کتێبـی فەلسـەفی ناویـان دەبەین و بیریان لێدەکەینەوە. رێك وەکو ئەمـەی کە رەخنـەگری ئـەدەبی ئـەو کەسـەیە کە جۆری

دیاریکراوی کتێب دەخوێنێتەوە و هەوڵدەدات وایان لێبکات لەگەڵ یەکتریدا بگونجێن، کەواتە فەیلەسوف ئەو کەسەیە کە کتێبی تر دەخوێنێتەوە بۆ چاککاری پێویست و هەوڵدەدات بیانگونجێنێت.

**+ئامانجی سۆراخکردن چییە؟**

-وابزانم ئەمەی کە پوتنام بە پەرەسەندنی مرۆیی ناوی دەبرد, لەلایەکەوە دەتوانیت بڵێیت چارەسەرکردنی کێشەکان کە زۆر زانیاری بەخش نییە. یاخود ئەتوانیت بڵێیت زیادکردنی خۆشبەختی مرۆیی، ئەمەش زۆر زانیاری بەخش نییە. سۆراخکاریی زۆر لەوە گشتگیرترە کە ئامانجێکی دیاریکراوی هەبێت.

**+کارەکانی تۆ وەکو لادانێك لە ڕێچکەی ئەفلاتون دەخوێنرێنەوە. چی وای لە تۆ کرد کە لە ئەفلاتون لابدەیت و ڕوو بکەیتە جەیمز و دێوی؟**

-بە ڕاستی نازانم. ڕەنگە ئەوە بێت کە نارێکی لە دیدی ئەفلاتوندا دەربارەی ئەمەی کەی لە سۆراخکاری دەچێت و لاوازیی لە تێگەیشتنی ئەمەی کە چۆن دەکرێ یەکێك ئەو دڵنیاییەی هەبێت کە ئەو پێی وابوو دەشێت هەیبێت. هەروەها هەستێك هەبوو لەمەڕ ئەوەی کە تێکەڵ و پێکەڵییەکی میتافیزیکی زۆر هەیە لە تێگەیشتنی ئەفلاتون بۆ شتەکان.

**+بە بۆچوونی تۆ هەڵوەشاندنەوە چییە؟**

-شتێك نییە بەناوی هەڵوەشاندنەوە(*Deconstruction*). من ڕێزێکی بێ پایانم بۆ دێریدا هەیە. بەلای منەوە ئەو کەسایەتییەکی خەیاڵی فەلسەفەی سەدەی بیستەمە. بەڵام من هەرگیز ئەو توانایەم نەبووە لەوە تێبگەم کە هەڵوەشاندنەوە چییە. بە بۆچوونی من دێریدا کەسایەتییەکە وەکو نیتچە کە خوێندنەوەکانی بۆ فەلسەفەی ڕابردوو و دیاردەی کەلتووریی هەموو کاتێك سەرنجڕاکێش و هاندەرن. بەڵام من پێم وانییە بتوانیت بڵێیت لە بارێکدا کە نیتچە میتۆدێك یا بەرنامەیەکی پێدابن، دێریداش هەروا. کاتێك خەڵکی دەڵێن دێریدا میتۆدێك یا بەرنامەیەکی داهێنا پێی دەوترێت هەڵوەشاندنەوە، من هەرگیز بەتەواوی دڵنیا نیم ئەوان چییان لە مێشکدایە.

**+هەندێ لە ڕەخنەگران، بە خراپ تێگەیشتن لە کارەکانت، تۆمەتبارت دەکەن بە پۆست مۆدێرنێکی ڕێژەیی، وەڵامت چییە بۆ ئەم تۆمەتە؟**

-من تەنیا ئەو داوایەت لێدەکەم کە پێم بڵێی من بۆچی پۆست مۆدێرنێکی ڕێژەیی نیم. من دڵنیا نیم لەوەی کە تاوەکو ئێستا مانایەکی ڕوون درابێتە زاراوەی " ڕێژەگەرایی پۆستمۆدێرن". باوەڕم وایە کە ئەگەر هیچ مانایەك بدات ئەوا ئەمەیە کە ڕێژەگەرە پۆستمۆدێرنەکان بڕوایان وایە کە تاکە وەسفێکی ڕاست هەیە بۆ ئەو ڕێگە ڕاستەی کە جیهانی لەسەرە، بەم مانایە من پۆستمۆدێرنێکی ڕێژەییم. پێم وایە هۆکاری ئەمەی کە ئەم حاڵەتە پێی دەوترێت ڕێژەگەرایی ئەمەیە کە ئەو خەڵکەی باوەڕی وایە کە شتێك نییە کە جیهان لە خۆیدا وا بیر بکاتەوە کە هەموو وەسفەکانی هەموو شتێك بەرهەمی هەوڵی ستایشکردنی پێداویستی و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤن. ئەو پێداویستی و بەرژەوەندییانە دەگۆڕێن، کەواتە مانای ئێمە بۆ ئەمەی کە گرنگە، لە زۆر ڕووەوە، لە گۆڕان بەردەوام دەبێت. "ڕێژەگەریی"

بــــەلای منـــەوە وشـــەیەکی راســـت نییـــە. لەوانەیە "*fallibilism*" باشتر بێت. باوەر ناکەم وشـــەی "پۆســـتمۆدێرن" هـــیچ مانایـــەکی روونـــی هـــەبێت، بۆیـــە هەوڵـــدەدەم خـــۆمی لـــێ بەدوور بگرم.

**+لە مـاوەی چـەند سـاڵی رابـردوودا وتوێـژێکی زۆر هەبووە لەسەر ریاڵیزم و ئەنتی ریـاڵیزم. لـە کـام رێگـــا بـــە کەڵکـــەدا دەتـــوانین ئـــەم بەرەگیرییـــە کۆنترۆڵ بکەین؟**

−بـە بۆچـوونی مـن ریـاڵیزم ئـەو دیدەیـە کـە دەڵێت تـەنیا تاکە رێگایـەك هەیـە بۆ ئەمـەی کە جیهـان بەشـێوەی واقیعـی لـە خۆیـدا هەیـە. بـەم مانایـە مـن ئـەنتی ریاڵیسـتم. بـەڵام لای مـن وا باشترە کە بڵێیت کێشەکە لـەنێوان ئـەو خەڵکەیـە کـە پێیـان وایـە هەنـدێ لـە وەسـفەکانی جیهـان ئیمتیـــازی بـــە پەیوەندییـــەك داوە کـــە پێـــی دەوترێـت لەیەکچـوون و ئـەو خەڵکـەش کـە وا بیرناکەنـەوە. هـەروەها وا باشـترە لـە سـۆنگەی ئامادەیی و غیابی تیـۆرەی حەقیقـەتی رایەڵەوە وەســـف بکرێـــت نـــەك لـــە ســـۆنگەی ریـــاڵیزم لەبەرانبەر ئەنتی ریاڵیزمدا.

**+لە زۆر وتاردا تۆ بەڵگـە بـۆ کۆمەڵگەیـەکی بـێ چین، بێ کاست و یەکسان ئەهێنیتەوە. بە چ رێگایەك ئەتوانین هاریکاری بکەین بۆ درکپێکردنی ئەو جـۆرە دیموکراسییە کۆمەڵایەتییە ؟**

−باوەر ناکەم ئەمە مەسەلەی هاریکاری بێت ئەوەنـدەی شـکاندنی دەسـەڵاتی دەوڵەمەنـد و بەهێزەکانـە. لـە وڵاتەکـەی منـدا پێویسـتمان بـە رێکخسـتنی شـتەکانە بۆئـەوەی دەوڵەمەنـدەکان نەتوانن بـەرتیل بدەنـە یاسادانەرەکان و نـەتوانن ئـاپۆرەی میـدیاکان بـە ئـارەزووی کاندیـدەکان بـــــوروژێنن. شـــــتگەلێکی زۆری تایبـــــەت، پراکتیکی و دوور ودرێژ هەیە بۆ جێبەجێکردن. بەڵام جارێکی تر دەڵێم هیچ شتێکی نوێم نییە بۆ وتـن. دیموکراسـی کۆمەڵایـەتی لـە ئـەمریکا رووبەرووی هەمان ئەو کێشانە دەبێتەوە کە هـەر بزاڤێکی چەپرەو هەمیشە رووبەرووی بووەتـەوە لە وڵاتانی تردا.

**+رۆڵی رووناکبیران لە ئەمریکا چییە؟**

−تـــا ئـــەو جێیـــەی کـــە ئـــەوان رۆڵێکـــی سیاسییان هەیـە، بریتییـە لە هۆشیارکردنەوەی هاوڵاتیان لـە بارەی دیموکراسییەوە، لـە بارەی مەترســـییەکانی ســـەر دیموکراســـی. لـــەو وڵاتانەشـدا کـە دیمـوکرات نـین هەوڵدانیانـە بـۆ کارکردنە سەر ئەو خەڵکانەی کە گوڕان بـەرەو دیموکراسی ئەنجام دەدەن.

**+هەڵسەنگاندنی گشـتی تـۆ چـییە بـۆ بەشـداری بیرمەندانی فێمینیست؟**

−بـــە بۆچـــوونی مـــن فێمینیـــزم بزاڤێکـــی کۆمەڵایـەتی زۆر سـەرکەوتوو بـووە، یـەکێك لـە باشترین ئەو شتانەی کە لە خۆرئاوا روویداوە. لـە وڵاتەکـەی منـدا تـەواوی پێگـەی ژنـان لـە کۆمـــەڵگادا وەکـــو لـــە 40 ســـاڵ لەمەوبـــەر جیـــاوازترە. بـــەڵام پـــێم وانییـــە فەیلەســـوفە فێمینیسـتەکان شـتێکی تایبـەتیان کردبێـت لـە شـــێوازی ئەبســـتمۆلۆژیای فێمینیزمـــدا یـــا میتافیزیکـــای فێمینیزمـــدا یـــاخود ئاکـــاری فێمینیزمدا. ئەوان تەنیا شتێکیان گەڵاڵەکردووە کە دێریدا پێی دەڵێت "*Phallogocenterism*" لە بـیری فەلەسـەفی نەریتییـدا. ئەمـە بەشـدارییەکی راسـتەقینەیە، بـەڵام ئەمـە بنـەمای دیدگایـەکی فەلسەفی نوێ نییە.

**+دەبێت فێمینیستەکان باوەشیان بۆ کام کێشە پراگماتیستییە نوێیانە بکەنەوە؟**

–نازانم. دڵنیا نیم لەوەی کە هیچ کارێك مابێتەوە بۆئەوەی لە تیۆرەی فێمینیزمدا بکرێت. فێمینیزم بە شێوەی سیاسی سەرکەوتنێکی کاریگەر بووە بۆیە قورسە بزانین تیۆرەی فێمینیزم بۆچی پێویستە. وا هەست دەکەم کە خەریکە تیۆریستە فێمینیستەکان کار لەسەر کەمێك دووبارە کردنەوە و لەسەر رۆیشتن دەکەن، بەڵام بە راستی نازانم کە ئایا کارەکانیان ئەوە دەهێنێت کە بڵێیت باشە یاخود نا.

**+پێت وایە زۆربەی پێشکەوتنە گرنگەکانی فەلسەفەی زمان لەو فەیلەسوفانەوەیە کە بە دەروونناسی و دەروونشیکاری کاریگەرن؟**

–وای نابینم کە هەوڵی لاکان بۆ هێنانی دەروونشیکاری و فەلسەفەی زمان بە ئاقاری یەکتردا کارێکی سەرکەوتوو بووبێت. هەندێ جار کە تۆ دوو رووبەری کەلتووری یاخود دوو دیسپلین لە پەنا یەکەوە دابنێیت ئەوا هەردووکیان رۆشنایی ئەخەنە سەر یەکتر. بە بۆچوونی من لە هەوڵەکەی لاکان لە سینتێز(ئاوێتەبوون) ( *synthesis* ) دا هەموو ئەوەی کە بەرهەم هات بریتی بوو لە فەلسەفەیەکی خراپی زمان و دەروونشیکارییەکی خراپ. ئەگەر تۆ بیر لە سایکۆلۆجیا ئەکەیتەوە ، نەك وەکو دەروونناسی، بگرە وەکو ئەمەی کە ئێمە لە ئەمەریکا پێی دەڵێین زانستی کۆگنەتیڤ(تێگەیشتن)(*Cognitive Science*) ، روون نییە کە ئایا ئەمەی کە زانا کۆگنەتیڤییەکان دەیکەن گرنگی پیادەکردنی فەلسەفی هەیە یان نا.

**+کەڵکی دەروونناسی بۆ فەلسەفە چییە؟**

–زۆر نییە، بەڵام جارێکی تر رەنگە ئەمە لە نەزانی خۆمەوە بێت، هەرگیز نەمتوانیووە ئەوە ببینم کە خەڵکانی وەکو چۆمسکی و فۆدۆر باوەریان وابوو سایکۆلۆجی چی بۆ دەکرێت، چ بۆ فەلسەفە یاخود کەلتوور بە گشتی.

**+لە دوای 35 ساڵ یەکەمین کتێبت، وەرچەرخانی زمانەوانی، چۆن ئەبینیت؟**

–باوەرم وایە یەکێك لەو شتانەی کە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی شیکاری کردیان رازی کردنی فەیلەسوفەکان بوو بەوەی کە، وەکو ئەوەی کە دومێت داینا، فەلسەفەی زمان یەکەمین فەلسەفەیە. ئەو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر ئێمە تیۆرەیەکی سیستەماتیکی مانامان نەبێت ئەوا ناتوانین کاری فەلسەفی بکەین. پێدەچێت ئەم هێڵەی بیرکردنەوە هەڵە بێت. لەلایەکی ترەوە جێگۆرکێی ئەزموون بەهۆی زمانەوە لە کاری خەڵکانی وەکو سێلارس یاریدەدەر بوو بۆ رازی کردنی خەڵکی کە ئەگەر تۆ بتوانیت قسە لەسەر هەڵسوکەوتی زمانەوانی بکەیت ئەوا بە راستی پێویست نەبوو کە دەربارەی ئەزموون یا ئاگایی بدوێیت. ئەمە هەنگاوێك بوو بەرەو پێشەوە.

**+ئایندەی فەلسەفە چۆن ئەبینیت؟**

–ئەمە بە تەواوی پێشبینی نەکراوە، پیاوان و ژنانی خەیاڵی مەزن دێن و هەموو کەسێك سەراسیمە دەکەن. ویتگنشتاین و هایدگەر وێنا ناکرێنەوە. ئەوان چەمکی ئێمەیان بۆ فەلسەفە گۆڕی. هەروەها کانت و هیگڵیش. کەس

پێشبینی کانت یاخود هیگڵی نەکردووە. لە سەدەی بیست و یەکەمدا ڕەنگە دوو کەسایەتی خەیاڵی هەبن، بەڵام هیچ دەربارەی ئایندەی فەلسەفە نازانین تاوەکو نەزانین ئەم دوو کەسە کێن.

**+تۆ یەکێکیت لە سەرەکیترین ڕەخنەگرانی فەلسەفەی شیکاری...**

–من خۆم وەکو ڕەخنەگرێکی فەلسەفەی شیکاری نابینم. من نەریتی شیکاری لە فەلسەفەدا وەکو بەرهەمهێنانی کارێکی لە ڕادەبەدەر بەنرخ دەبینم. بەبێ ئەم نەریتە نەدەبووینە خاوەنی داڤیدسۆن یاخود براندۆم. لەلایەکی ترەوە، من ڕەخنەگری ئەو هەوڵە هەژموونییەم کە لەلایەن هەندێ فەیلەسوفی شیکاری ئەدرێت– بەو بانگەشەیەی کە خەڵکانی شیکاری بە شێوازێکی ڕاست کاری فەلسەفی دەکەن ، یاخود هەندێ جوانی تایبەتیان هەیە کە فەیلەسوفانی ناشیکاری نیانە.

**+ئایندەی فەلسەفەی شیکاری چۆن دەبینیت؟**

–یەقینم وایە کە خەڵکان بەردەوام دەبن لە خوێندنەوەی کارناپ، کوینە، داڤیدسۆن، براندۆم و ئەوانیتر. بەم مانایە، ئاشکرایە کە فەلسەفەی شیکاری ئایندەیەکی دەبێت. بەڵام وەکو ئەوەی کە یەکێك لە ساڵی 1830 پرسیاری کرد، " ئایا هیچ ئایندەیەك هەیە بۆ ئایدیالیزمی ئەڵمانی؟" دەتوانرێ پێشبینی ئەوە بکرێت، یا لانی کەم هیوای ئەوە بخوازرێت کە هەموو کەسێك بەردەوام دەبێت لە خوێندنەوەی کانت و هیگڵ ، بەڵام ڕەنگە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەوان بۆ کانت و هیگڵ زیاتر لەوە بچێت کە ئێمە ئێستاکە پێی دەڵێین " فەلسەفەی شیکاری". ئەو سوودەی لەو کەسایەتییانە دەکرێت دەکەوێتە سەر ئەوەی کە بلیمەتەکانی داهاتوو کێن.

**+پێت وایە کام کێشە یاخود دیدی فەلسەفییانە بە شێوەیەکی دیاریکراو بە تەواوی کۆن بوون؟**

–بەڵێ، هیوام وایە هەوڵی ئەو جۆرە فەلسەفەیەی کە بڵێین زمانی فەلسەفەی سروشتی ئیمتیازی وەرگرتووە، چونکە ئەمە پێت دەڵێت کە شتەکان بە ڕاستی چۆنن، وەکو ئەو هەوڵەی بڵێیت کە زمانی ئایین ئیمتیازی وەرگرتووە چونکە پێت دەڵێت ئەمەی کە شتەکان بە ڕاستی چۆنن، خەریکە هەرەس دێنێت . هیوام وابوو کە ئەو جۆرەی فەلسەفە کە دەڵێت " ئەمە دوایین کۆنتێکستە کە تیایدا دەبێت هەموو شتێکی تر دابنرێت" وایلێبێت کە ببێتە قسەیەکی پێکەنینهێن.

**+دەتەوێت لە هەزارەی سێیەمدا کام دیدی فەلسەفی بگەیەنیت؟**

–پێم وایە کە ڕۆڵی زانستی زمان جێگیرە. باوەرم وایە کە فەیلەسوفان لە ئایندەدا زۆر کەمتر و کەمتر لە سەر هۆش یا ئەزموون و ئاگایی و زۆر و زۆرتر لە سەر فەرهەنگۆکە وەسفییەکان بدوێن. لانی کەم هیوام وایە ئەمە کێشەکە بێت.

## لێکدانەوەی زاراوەکان:

*Pragmatism*: قوتابخانەیەکی فەلسەفییە کە کۆبەندێك ڕێگای بیرکردنەوەی جیاواز دەگرێتەخۆ. لەلایەن گەلێك قوتابخانەی فکری و بۆ ماوەیەکی زۆر بەکارهێنراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پراگماتیزم وەکو

زاراوەیەك بەهۆی نەبوونی تایبەتمەندیی قووڵتر بیّ مانا بــووە. زۆربـــەی ئـــەو بیرمەندانـــەی کـــە خۆیـــان بـــە پراگماتیسـت لەقەڵـەم دەدەن ئامـاژە دەکـەن بـە جـۆرە رایـەڵێك لەگـەڵ دەرەنجامـە کرداریـی یـاخود کاریگەرییـە واقیعییـــەکان وەکـــو پێکهێنـــەرە زینـــدووەکانی مانـــا و حەقیقەت.

*New Deal*: ئەم زاراوە گشتییە بۆ ئەو پلان و بەرنامە جیاجیایانــە بــەکاردەهێنرێت کــە دەوڵــەتی (فــرانکلین رۆزڤێلـت) گەلاڵـەی کـرد بـۆ بووژاندنـەوە و باشـکردنی ئـــابووری نەتـــەوەیی و دڵنیـــایی کۆمەڵایـــەتی بـــە دوای قەیرانی 1930 لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

*Fallibilism*: ئەو رێچکەیەی کە دەڵێت ناتوانریّ هیچ شتێك بە دڵنیاییەوە بزانرێت، واتە هیچ زانیارییـەك نییـە کە قـەت بـە هەڵـەدا نەچێت ((*infallible*))، هەرچـەندە وەکـو زانیاری دەمێنێتەوە.

*Phallogocenterism*: یـاخود بەشـێوەیەکی بنـەرەتی *Logocenterism* ، ئەم زاراوەیـە لەلایـەن جاك دێریـداوە لـە رەخنـــــــەی تیـــــــۆریی و هەڵوەشـــــــاندنەوەدا بـــەکارهێنراوە ئاماژەیـــە بـــە ئامـــادەیی بیرکردنـــەوەی خۆرئـاوایی بـۆ بەسـەنتەرکردنی هـەر تێکسـت یـاخود گووتارێك لەناو لۆگۆس (وشەیەکی گریکی یە بە مانای وشــە، ئــەقڵ، گیــان دێــت) و *Phallus* ئــادابی نێرینــەیی دەنوێنێت.

*Synthesis*: وشــەیەکی گریکــە کۆنەکانــە، بــە واتــای لێکدانی دوو یا چەند ئایتمێکی پێش دروستبوون کە لـە ئەنجامدا شتێکی نوییانْ لیّ دروست دەبێت.

* جیانکــارلۆ مارچــێتی پرۆفیســۆری یاریــدەدەری فەلســەفەیە لــە بەشــی زانســتە فەلســەفییەکانی زانکــۆی پێروجیـا لـە ئیتاڵیـا. ئـەو سەرنووسـەری ( *Ratio et superstito*)یە.

## سەرچاوە:

*Philosophy Now Magazine, 2003*

# بۆ دەنووسم؟

تێری ماکمیلان

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

مــن بەویســتی خــۆم نەمویســتووە ببمــە نووسەر.. هەرگیز. وەك منداڵێك.. تاكە خەونی من ئەوە بووە كە لەناو خانوویەكدا بژیم هەوای ســارد و گەرمەكــەی بــە كــەیفی مــن بێــت، ئاودەســتخانەیەكی تــازە بابــەتی تێــدابێت كــە سیفۆنەكەم ڕاكێشا پاك ببێتەوە. دایكم هەمیشە دەیخســتە دڵمــەوە كــە مــن مەرجــە تــا زانكــۆ قۆناغــەكان ببڕم: بــێ منــەمن و ئەگــەر و ئــاخر و بــەلاّم و.. بیــانوو هێنانــەوە، تێیگەیانــدم كــە مەحاڵە بهێڵن منداڵێكی خۆم لە باوەش بگرم تا من كۆلێژێك لە كۆلێژەكان تەواو دەكەم. هەر لە سۆنگەی ئەوەوە، مـن زۆر دەترسـام پەیوەنـدی لەگـەڵ كچـێك یـان خانمێـك ببەسـتم و بـیر لـە جوتبـوون بكەمـەوە، بـە تایبـەتی لـە قۆنـاغی ئامادەییدا، (دیـارە هـەموو برادەرەكـانی مـن لـە كەیف وسەفای خۆیان نەدەكەوتن)، هـەر بۆیـە مـن هەمیشـە سـەرگەرمی خوێندنـەوە و موتـالاّو دەرس و دەور بـووم. یەكـەم كارێـك كـە دەسـتم كـەوت ڕێكخسـتنی كتێـب بـوو لـە یـەكێك لـە كتێبخانەكانی شارەكەم، سەعاتی بە دۆلارێك و بیســت و پێــنج ســێنت، لــەو ڕۆژگــارەدا دەنێــو سەدەها كتێب خۆم ون كرد.

ئـیتر لێـرەوە خەونـەكانی مـن گـەورە بـوون و حـەزم بـە فـڕین دەكـرد.. فڕین بـۆ دونیایـەك كـە دەكەوێتــە دەرەوەی خــۆم. ئــیتر گەشــتی مــن گەشـتێك بـوو ڕووەو هـەموو دونیـا. مـن لەگـەڵ نووســەرێكی وەك "ئامیلیـا ئێرهـارت" دەفـڕیم، لەگـەڵ خوشـكانی بـرۆنتێ دادەنیشـتم، لەگـەڵ شــاعیرێكی وەك "ڕۆبــرت فرۆســت" ســواری گالیســكە بەفرینــە دەبــووم و بەســەر بــەفردا دەفـڕین. لەگـەڵ "ثـورو"دا بـۆنی گیـاو گـوڵ و ســەوزاییم دەكــرد و دەســتم لێــدەدان. "جــۆن شـتاینبێك"ی ڕۆمـاننووس مـنی فریـودا بـەو چیرۆكەی كە هیچ مشكێكی تێدا نییە. "جەیمز بالدون" منی ترساند كە بۆ یەكەمجار دەموچاوە ڕەشەكەیم لەسەر بەرگی یەكێك لە ڕۆمانەكانیدا بینی، من پێشتر وامدەزانی "جۆن شتاینبێك" ڕەش پێستە. من لە خۆمم دەپرسی: ئاخۆ لە چ

زەمانێکـــــەوە ڕەش پێســــتەکان دەســــتیان داوەتە قەڵەم؟

پاشان بە پەند و وتە پڕ لە حیکمەتەکانی "بارتلێت" ئاشنابووم، کە مێشکە ساواکەمی ئـاو دەدا چـونکە وەك فەرهـەنگێکی پـڕ لـە بیروبۆچـوونی جـوان دەهاتـە بەرچـاوم لەمـەڕ دەیەها بابەت و مەسەلەی جۆراو جۆر کە من بۆ خـۆم زۆر جـار پـاڵ دەکـەوتم و بـیرم لێیـان دەکـردەوە، دەکەوتمـە نـاو دەیـەها خـەیاڵ و تێڕامان، بەڵام هـەرگیز کەسم دەست نەدەکەوت کـە سـەبارەت بـەو شـتانە لـە مێشـکمدا بـوون گفتوگۆ بکەم. مـن ئەوسا نەمدەزانی کە تـەواو ئـیتر مـن مـەحکومم بـە تـەنیایی چـونکە کـەس نـەبوو ئـەو خـەیاڵ و ختوورانـەی لەگەڵـدا بـەش بکەم و هاوبەشی ئەو دنیایەم بێت، یان دەکرێت مـن کەسـم شـك نـەبردبێت کـە گـوێ بـەو خـەم و خولیایـەی من بدات و بەلایـەوە گـرنگ بێـت من بیر لە چی دەکەمەوە و چ هەستێکم هەیە.

بەڵام هـەر لـەو سـەروبەندەدا بوو کە چوومە کۆلێژ و ئاسۆی خوێندنـەوە و تێڕامـانم فراوانتر بوو. ڕۆژێکیـان کوڕێك کە هاوکلاسی خۆم بوو کـارێکی کـرد کـە بـووە مایـەی دڵشـکانم، هەرچەندە من هەنووکە ناوی ئەو دۆستەم لە یاد نەماوە، لـە بەشـی نـاوخۆو لـە ژوورە چکۆلەکەی لەسەر پێخەفەکەی خـۆم دانیشـتبووم بـۆ مـاوەی چوار سەعات چووبوومەوە ناو خۆم، لە شێوەی فاریزەیـەك دەچـووم، نەمـدەتوانی بجـوڵێم (گەرچی هەوڵیشم نەدەدا)، پاشان هەستم کـرد کە خوێن لە هەموو دەمارەکانی لەشمدا شەپۆل دەدات، دەگاتـە کەللـەم و دەتەقێتـەوەو دەپـژێت، قەڵـەمبازێکم دا بێئـەوەی بـزانم بـۆ کـوێ دەڕۆم یـان بـەنیازی چـیم، دەسـتم بـرد بـۆ قەڵـەم و دەفتـەرێك و کەوتمـە نووسـینی چـەندین وشـە بەدوای یەکدیدا: یـەك، دوو، سـێ.. دە لـە ئان و سـاتێکی کورتـدا، ئـەو کاتـە فریـای ئـەوە نەدەکـەوتم بـزانم چـی دەنووسـم چـونکە زۆر خێراو لە ناکاو ڕوویدا، هەستم بە خۆم نـەکرد تـاوەکو هەناسـەم سـوار بـوو، چـوار لاپـەڕەم پـڕ کـردەوە، هەناسـەیەکی قـووڵم هەڵکێشـا، هەناسـەی حەوانـەوە بـوو لـە تـاو هیلاکـی، بـەڵام کت و پڕ هەستم کرد چاکترم، بەڵام دوای ئەوە ترسام چونکە نووسین و ڕیزکردنـی وشـەکان لـە شیعر دەچوو، بەڵام چونکە لەمەوبەر هـەرگیز بـۆ نووسین خـۆم تـاقی نـەکردبۆوە، بڕوام نـەدەکرد ئەو چوار لاپەڕەیە هی من بێت.

سەرەتای من ئاواهی بوو.

ئـەو بابەتـەی کـە نووسـیم مـنی ڕزگـار کـرد. چـونکە بـوو بـە زمـان و کاردانەوەیـەکی مـن بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەو مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکانی دەوروبـەرم، ئـەو شـتانەی کـە دەبوونـە مایـەی شڵەژانم، یـان غـەمگینیان دەکردم، یان ئەوەنـدە ئـازار بـەخش بـوون کـە جگـە لـە نووسـین ڕێگایـەکی دیکـەم شـك نـەدەبرد بـۆ ڕوو بەڕووبوونەوەیان. ئاواهی ئارام و دڵنیا دەبووم.

نووسین بووە پەناگام. هەوڵی من ئەوە نەبوو کە لە پشت وشەکانەوە خۆم بشارمەوە، نووسین بۆ من هەڵکۆڵینێك بوو قووڵ بـەناو دڵـی خۆمـدا بـەو نیـازەی کـە ڕاسـتی و حەقیقـەت بدۆزمـەوە. سەرەڕای ئەوەش.. نووسین بۆ من تاکە ڕێگایەك بـوو کـە بتـوانم توانـاو هێـزی خـۆمی لەسـەر بونیـات بنـێم، هێزێك کە یارمـەتیم بـدات لـەوەی کـە بتـوانم بـۆ هـەر هەڵوێسـتێك توانـای ئـەوەم

هەبێت زاڵبم، بتوانم بۆ هەر گرفتێك چارەسەرم هەبێت، یان بەلایەنی كەم تێیبگەم. وا مەزەندە دەكەم و دەتوانم بڵێم نووسین جۆرە پشوو درێژییەكی پێبەخشیم كە بێ درۆ پێشتر و لە ژیانی رۆژانەمدا هەرگیز وا ئارام و پشوو درێژ نەبووم. نووسین فێری ئەوەی دەكردم كە بوەستم. فێرببووم سەرنج و تێبینییەكانم بنووسمەوە. نووسین پەناگاو پەرستگایەكی پێبەخشیم كە هەست بكەم لە ناویدا داڵدە دراوم، ئارامگەیەك كە من هەرگیز لەناو ئەو ڕاكە ڕاكەی ژیانەدا دەستم نەدەكەوت، ژیانێك پڕ لە ئەرك و چالاكی كە من بۆ خۆم تا بینەقاقام تیایدا نوقم ببووم.

بێجگە لەوەی كە من بۆ خۆم كەسێكی خۆپەرستم، پتر خەریكی دونیای خۆمم و زۆر پڕكار و سەرقاڵم. بەڵام نووسین یارمەتی دام كە ئەو خۆپەرستی و خۆ خەریك كردنەم كەمتر بێتەوە. وای لێكردم ئەوەندە لەناو خودی خۆمدا نوقم نەبم و هاوسۆزی خەڵكی بم و پتر بەزەییم بەوانی دیكەدا بێتەوە. لە ڕاستیدا من بۆ هەمیشە لە ئاسمان دەپاڕامەوە كە وام لێبكات هەست بەوانی دیكە بكەم: سۆز و میهرێكی پترم پێبەخشێت تاوەكو من بە هەموو كەسێكی ببەخشم پاشان تێگەیشتم كە هەموو كەسێك هەست و سۆزی لە دڵدا هەیە، گەرچی من بۆ خۆم هەندێك جار گومانم هەبوو، هەڵبەتە زۆرن ئەوانەی كە وا هەست دەكەن كەس نییە تێیان بگات و هەست بە دەرد و كێشەكانیان بكات، گوایە كەس نازانێت دۆستەكەی تەنیشتی لە چ بارێكی ناهەمواردا ژیان بەسەردەبات. من زۆر بەسادەیی دەڵێم ئەوە ڕاست نییە. ئێمە پڕین لە خورپە و كسپە و میهر و سۆز و مەڵۆ.

دیسانەوە.. من مرۆڤێكم حەزم بە سووسەكردن و نهێنی زانین و دركاندنییەتی. من گەرەكمە بزانم كە بۆچی هەندێك كار و كردەوە هەن حەزیان پێدەكەم و دەمەوێ تێبگەم كە بۆچی كەسانێك هەن گێل و بێ خێرن، بۆئەوەی پتر لە مەرامی خۆم نزیك ببمەوە.. من گەرەكمە فێری ئەوە ببم كە چۆن چۆنی بچمە ناو دڵ و دەروونی خەڵكی.. بە واتایەكی دیكە ژێر پێستی. نووسین بۆ من دەروازەی چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە بوو.

گەر من لەوە تێگەیشتبام كە چی دەكەم و هەستم چۆنە، هەتا گەر بە نیوە ناچڵیش بووایە، لەوانەیە كاتی خۆم بە نووسین بە فیڕۆ نەدەدا. بەڵام من خۆم مەراقم پیس و كوشندەیەو زۆر حەز لە گەڕان و پشكنین و زانینی نهێنییە. هەندێك جار حەز دەكەم بترسێم، من زۆر نیگەرانی ژیان و گوزەرانی خەڵك و دونیام، بەلامەوە گرنگە بایەخ بەوانی دیكە بدەم. حەز دەكەم بزانم كە خەڵكی دەوروبەرم خۆش دەگوزەرێنن. من گەرەكمە ئەوە پیشانی خەڵكی بدەم كە تێبگەن ئەو كاتەی كە هەڵە دەكەین چی ڕوودەدات، ئەو كاتەشی كە كارێكی ڕاست و دروست دەكەین.. چی دەگوزەرێت، چونكە وەك دەڵێن: تۆ هەرچییەكی بكەیت و نەكەیت، شتێك هەر ڕوودەدات، من دەمەوێت بزانم كە كارەسات و ڕووداوەكان دێن.. ئێمە چۆن چۆنی ڕووبەڕوویان دەبینەوە — وەك دەڵێن ئەو كاتانەی دەكەوینە سەرچەقۆ.

من گەرەکمە لە هەموو شتەکانی ژیانی ڕۆژانەمان ورد ببمەوە، بەورد و درشتییەوە. من دەمەوێت کەسێکی خاستر بم، دەمەوێت زۆربەی کات هەست بەوە بکەم کە حاڵی من چاکە و باشم، کە وانەبم.. دەمەوێت تێبگەم بۆ وانیم. نووسین هەموو ئەو شتانەم پێدەبەخشێت.

چیخۆف وتوویەتی – "مرۆڤ تەنها ئەو کاتە باشتر دەبێت کە تۆ یارمەتی بدەیت خۆی ببینێت و تێبگات لە چی دەچێت". ئا ئەوەیان هەوڵی منە ئەو کاتەی من پۆرتریتی ژن و پیاوانی "ئەفریقی – ئەمریکی" دەخەمە بەرچاوان ئەو کاتانەی ڕەفتاری خەراپ و ناشیرین دەنوێنن.

من سەرگەرمی ڕەسمکردنی چەندین وێنەو تابلۆم، جۆرەها وێنەی ڕاستەقینەی خۆمان، هەر جووڵە و ڕەفتار و هەڵسوکەوتێك كە من بەم چاوانە دەیبینم و تۆماری دەکەم. من گەرەکم نییە جلە پیسەکان بە تەنافەوە هەڵبخەم.. نەخێر.. هەرگیز، من تەنها گەرەکمە وا لە کەسەکان بکەم هەریەکەو دەست بداتە ئاوێنەیەك و بۆ ماوەیەکی درێژ لە خۆی ڕابمێنێت. زۆربەمان بیر لەو کارو کردەوانە ناکەین کە پێیانەوە خەریکین، ئێمە بە تەنها کاروکاردانەوەمان هەیە. زۆربەمان قووڵ بیر لەو هەموو مەسەلە و شتە گەورانە ناکەنەوە کە لە مەترسیدایە، زۆربەمان کەمتەرخەمین و داناچڵەکێین.

نووسین یارمەتیم دەدات پتر پێبگەم و گەشە بکەم مادام لە توخمی مرۆڤم و ئاژەڵ نیم، گەشتی من بەرەو کەماڵە. هەموو کردەو هەوڵی من ئەوەیە کە نووسین، دواجار وەك پرۆسەی کارکردن، وام لێدەکات ڕووبەڕووی هەڵەکان و لاوازی خۆم ببمەوە، ڕووبەڕووی هێز و توانای خۆم کە دواجار پتر یارمەتیم دەدات لە خۆم تێبگەم، گەر ڕاستگۆیانە بدوێم –ئەوکات– دەڵێم: نووسین وەئاگاهێنان و ڕابوون و بانگەوازی هەستانەوەیە. من خۆم توانیم ببم بە دکتۆری خۆم و توانیم دەردەکانی خۆم تیمار بکەم. چونکە کەس نییە وەك خۆم من بناسێت، گەر من جوانکاری خۆم بەڕێوەببەم کە نووسینە، من ئاسان دەتوانم دڵی خۆم بخەمە ناو سینگی پاڵەوانەکانم تاوەکو بە تەواوی هەمان هەست و نەستی ئەوانم هەبێت، بەو جۆرە بیر بکەمەوە کە ئەوانی تێدا دەژێین و بیر دەکەنەوە، ئەو کاتەی دەتوانم هەمان ژیان بژیم و ڕۆڵ ببینم، هەر بۆ نموونە، گەر من ڕۆڵی درۆزنێکی گەورە ببینم، بە واتا پاڵەوانەکەم هەمیشە درۆیان بکات و خووی پێوە گرتبێت، مەرجە منیش وەك لە درۆکردندا وەستابم، وەك نووسەریش دەبێت بیزانم و تێبگەم ئەو کارەکتەرەم بۆ درۆیان دەکات ئەو کاتەی کە دەیەوێت بەرگری لە خۆی بکات، جا چ ژن بێت و چ پیاو، ئەوسا من ڕاستە ڕێگەی خۆم دەدۆزمەوە، چونکە من ناتوانم سەبارەت بە کەسێك بنووسم کە وەك مرۆڤ ڕێزی نەگرم و پێی سەرسام نەبم، بەتایبەتی لە ژیانی ڕاستەقینەی خۆیدا، بەڵکو مەرجیشە تێیبگەم. نووسین فێری کردم کە هەر لە خۆمەوە دادگایی کەس نەکەم. من زۆر جاران سەبارەت بەو کەسانە دەنووسم کە مەرج نییە من دڵم بیانگرێت و پەسەندیان بکەم، کەسانێك کە شتی وا دەکەن من بە خەونیش نزیکی ئەو کارو

کردەوانە ناکەوم، هەر بۆیە هەوڵدەدەم کە لە زۆر هەست و نەست خۆم بەتاڵ بکەمەوە بە جۆرێك کە لە بوون و چەشنی بیرکردنەوەی خۆم بچمە دەرێ. دەکرێت ئەم دۆخە شاگەشکەم بکات، زیندووم بکاتەوە، ئازادم بکات، سەرمەست و سەرسام، بەڵام دەکرێت ئازار بەخشیش بێت وەکو دۆزەخ.

لەوانەیە من پیاوێکی سەیر و سەمەرە و نائاسایی بم، بەڵام من گەرەکمە بزانم مرۆڤ کە دەمرێت هەست بە چی دەکات. دڵشکان مانای چییە. بۆچی بە دەستی ئەنقەست خەڵکی ئازاری یەکدی دەدات؟ بۆچی ئەو خەڵکە درۆ دەکەن؟ بۆچی فڕو فێڵ و فریودان باوە؟ ئەوە چ جۆرە کەسێکە و چ دڵ و دەروونێکی هەیە کە دەتوانێت کەسێکی دیکە بکوژێت و شەویش بێ خەم بخەوێت؟ دەمەوێت بزانم ئاخۆ پیاوێك هەست بە چی دەکات ئەو کاتەی لە ژنەکەی هەڵدەدات؟ باشە ئەو ژنە بۆ بەو ستەمە قایلە و ماڵەکە جێناهێڵێت؟ ئاخۆ ژنان چۆن بە تەنیا ئەو ستەم و ئازارە دەچێژن و چاوپۆشی لێدەکەن؟ ئەی مندالآن چۆن فێری ڕق دەبن؟ ئەی دایك و باوکانیان؟ کە دەڵێین ئەم دایك و باوکە چاکن مەبەستمان چییە؟ ئاخۆ هەست و نەستت چۆنە ئەو کاتەی تەمەنت دوازدە ساڵە و کەچی هەست دەکەیت لە ڕووی سێکسییەوە تەواو نیت و هەم خۆت نێربازی و هەم بەدوای نێربازێکدا دەگەڕێیت. بۆچی هەندێك کەس هەرگیز ناتوانن بەخشندە و لێبوردەبن؟ ئاخۆ گەرمن کەسێکی کینە لە دڵ بم تاوەکو کەی دەتوانم ئەو ڕقە هەڵبگرم؟ ئەی بۆچی هەندێك لە خەڵکی ناسك و خۆش مەشرەف و خۆشەویستن، پتر لەوانی دیکە هەست دەکەن بەرامبەر ڕووداوەکانی دەوروبەریان بەرپرسیارن.. لەوانی دیکە خەمخۆرترن؟

من دەتوانم لەسەر ئەم پرسیارو دۆخەی خۆم نەوەستم و هەر بڕۆم – بەڵام کرۆکی قسەکانم لەوەدا چڕ دەکەمەوە کە من بەوپەڕی ئاگاهی و هوشیاریمەوە بڕیارم نەدابوو ببمە نووسەر. هەرگیز بۆ پارە کۆکردنەوە نەهاتوومەتە پای نووسین. دیارە بۆ ناوبانگیش ئەوەم نەکردووە.. هەرگیز. کێ دەزانێت؟ کێ تەواو ئاگادارە و دەزانێت بۆ وادەکات؟ من وا هەست دەکەم کە ئەو هونەر و پیشەیە منی هەڵبژارد. ئەوە وشەکان بوون منیان کرد بە خاوەنی زۆر شت.. جگە لەوەی کە هەبووم، من هەنووکە دڵنیام و داڵدەدراوم. نووسین تاکە شوێنێکە بۆ من کە لەوێدا دەتوانم خۆم بم و هەست بکەم کەس نییە دادگاییم بکات، سەرزەنشتم بکات و فەرمانم بەسەردا دەربکات. هەڵبەتە بۆ خۆم حەز دەکەم لەوێدا بم.. لەناو نووسین.

**سەرچاوە:**

*Chicken Soup for the Writers Soul*
*Jack Confield*
*Mark Victor Hansen*
*Bud Gardner*
*Deerfield Beach, Florida*
*2000*
*Pages(41-45)*

# خەونەکانم دەفرۆشم

گابریل گارسیا مارکیز
لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

سەر لە بەیانییەك، سەعات نۆ، لە بالکۆنی ئوتێل ریڤیرا هاڤانا، لەبەرخۆرە درەوشاوەکەدا بەرچایمان دەخوارد. لە خوارمانەوە، شەپۆلی هاتوچۆی ماشین بە درێژایی دیواری کەنارەکە لەگەڕدابوو، سەر پیادە ڕێکەیش هەر جمەی دەهات لە ماشینی راوەستاو. یەکێك لە ماشینەکان بەر دیواری ئوتێلەکە کەوت، دەنگی پێداکێشانەکە هەر لە دەنگی تەقینەوەی دینامیت دەچوو، هەموو ئەوانەی لە بیست قاتی ئوتێلەکەدا بوون ڕاچەنین و هەراسیان لێ هەڵگیرا، دەرگا شووشەییەکەی دەرەوە ورد و خاش بوو، گەشتیارانی ناو هۆڵەکە لەگەڵ موبیلەکاندا بە حەوادا چوون و هەندێکیان وردە شووشە برینداری کردن. بێگومان شەپۆلەکە زۆر گەورە بوو، چونکە لەسەر شەقامە دوو سایدیەکەوە، بە نێوان دیواری کەنارو ئوتێلەکەدا تێپەڕیو هێند بە هێز بوو کە هەموو شووشەکانی شکاند.

کوبابییە سادەو ڕەندەکان، هاوکاری ئاگر کوژێنەوەکانیان کرد،بە کەمتر لە شەش سەعات هەرچییەك لەو ناوە کەوتبوو کۆیان کردەوە, ئەو دەرگایەی رووی لە دەریا بوو کردیانەوە و دەرگاکەی تریان داخست. هەموو شتەکان جارێکی دی وەك خۆیان لێهاتەوە.

بە درێژایی ئەو بەیانیە کەس نیگەرانی ئەو ماشێنە نەبوو کە بە دیوارەکەوە نووسابوو. چونکە خەڵکی وایان دەزانی یەکێکە لەو ماشێنانەی کە لە پیادە ڕێکەدا وەستابوو. بەڵام کە بە سلنگ بەرزیان کردەوە، لاشەی ژنێکیان بینی کە کەمەربەندی دڵنیایی لەپشت ستێرنەکەوە هێشتبوویەوە. لێدانەکە ئەوەندە بەهێز بوو کە ئێسکێکی ژنەکە بە ساغی نەمابووەوە، دەموچاوی وێران و پێڵاوەکەی دڕاوو جلەکانی پارچەپارچە بوون. ئەڵقەیەکی ئاڵتونی شێوە مار بە دووچاوی زمڕوتەوە لە پەنجەیدا بوو. پۆلیس بەو ئەنجامە گەیشتن کە ژنەکە کارەکەری باڵیۆزی تازەی پورتوگال و

ژنەکەی بووە. دوو هەفتە لەوەوبەر لەگەڵیاندا هاتۆتە هاڤانا. ئەو سەرلەبەیانیە، بە سواری ماشێنێکی تازەوە بەرەو بازاڕ هاتووە.

کە هەواڵەکەم لە رۆژنامەدا خوێندەوە ناوی ژنەکە چ یادەوەریەکی لا جێنەهێشتم، بەلاَم ئەڵقەی شێوە مارو چاوی زمرووتی کونج کۆڵی لا دروست کردم، چونکە نەمزانی ئەڵقەکە لە کام پەنجەیدا بووە.

ئەم هەواڵە بۆ من گەلێك گرنگ بوو، چونکە لەوە دەترسام هەمان ئەو ژنە بێت کە لە یادم ناچێت و هەرگیز ناویم نەزانی، ئەڵقەیەکی وەك ئەم ئەڵقەیە لە پەنجەی دۆشاو مژەی دەستی ڕاستیدا بوو. تەنانەت ئەوسای لە ئێستای نائاساییتر بوو.

من ئەم ژنەم سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە ڤیەنا، لە مەیخانەیەکدا کە خوێندکارانی ئەمەریکای لاتین هات و چۆیان دەکرد بینی. لەوێ سویس و پەتاتەو بیرەی دەخواردەوە. من سەرلەبەیانی ئەو رۆژە لە رۆماوە گەیشتبووم. تا ئێستایشی لەگەڵدا بێت من هەستێکی خێرام بەرانبەر بە سنگ و مەمکە بەرجەستەکەی کە لە گۆرانی بێژی ئوپێرا دەچوو تێگەڕا، هەروەها ئەو کلکە ڕێویەی کردبووی بە یەخەی چاکەتەکەیداو، ئەو ئەڵقە شێوە مارەی لە پەنجەیدا بوو, هەمووی ئەمانەم لە یادە، بە ئەسپانیەکی چەوت و چێڵ قسەی دەکرد و زانیم تاقە ژنێکی نەمساویە کە لە پشت مێزە درێژە دارینەکەوە دانیشتبوو. وەلێ من هەڵە بووم، ئەو لەدایکبووی کۆلۆمبیا بوو، لە سەردەمی منداڵی و لە نێوان هەردوو جەنگەکەدا بۆ خوێندنی مۆسیقا و ئاواز هاتبوو بۆ نەمسا. تەمەنی سی ساڵێك دەبوو، بەلاَم باش نەمابووەوە، چونکە دەموچاوی نەدەچووە دڵەوەو پێش وەخت قوپا بوو، وەلێ مرۆڤێکی سەرنج ڕاکێش و سەرسامکەربوو.

ڤیەنا هێشتا شارێکی سەڵتەنەتی کۆن بوو، شوێنە جوگرافیەکەی لە نێو دوو دنیای جیاوازی دوای جەنگی دووەمی جیهاندا، کردبوویە مۆڵگای مامەڵەی بازاڕی ڕەش و سیخوڕی نێو دەوڵەتی. من شوێنێکی لەوە تەریکترم بۆ ئەو هاولاَتیەی خۆم کە لەو مەیخانەیەی خوێندکاراندا نانی دەخوارد، شك نەدەبرد. ئەو لەبەرخاتری کۆلۆمبیەکان دەهاتە ئەوێ، لەو ژیانە سەختەی ئەوسادا ئەمەندەی پارە هەبوو کە حسابی هەموو هاوڕێکانی سەر مێزەکەی دەدا. هەرگیز ناوی ڕاستەقینەی خۆی نەدەوت، ئێمە بەردەوام بەناوێکی ئەڵمانیەوە کە باش نەدەوترا بانگمان دەکرد. ئێمەی ئەمریکای لاتینی کە لە ڤیەنا دەژیاین ناوی (فروفریدا)مان لێنابوو. من تازە ناسیبووم، کە زۆر بە تەوسەوە لێم پرسی:

چۆن هاتوویتەتە ئەم دنیایەوە کە لەگەڵ ولاَتەکەی خۆتدا جیاوازە و گەلێك دوورە.

زۆر زوو وەلاَمی دامەوە.

"من خەونەکانم دەفرۆشم"

لە ڕاستیدا ئەمە تاقە پیشەی ئەو بوو.

ئەو سێیەم منداڵ بوو لە یانزە منداڵ، کچی خاوەن پیشانگایەکی دەوڵەمەند بوو لە کاڵداس. هەر کە زمانی گرت، لە خێزانەکەیەوە فێری ئەو نەریتە جوانە بوو کە پێش بەرچایی بەیانیان، هەموویان خەونەکانی شەویان دەگێڕایەوە. واتا لەو کاتەوە کە سرووش لە

مرۆڤــدا بــەناوازەترین شــێوە دەرســکێت. لــە تەمەنی حەوت ساڵیدا خەونی بینی کە لافاو یەکێك لە براکانی برد، دایکی، کە بڕوای بە خورافات بوو، هەرچەندە کوڕەکەی عاشقی مەلەکردن بوو، بەڵام ڕێگای چۆم و مەلەی لێ گرت. بەڵام فروفریدا پێشتر بە ڕێگای خۆی بانگەشەی بۆ پێشبینیەکەی کردبوو.

فروفریدا وتبووی: "مانای خەونەکەم ئەوە نییە کە براکەم لە ئاودا بخنکێت، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە نابێت لێو لە شیرینی بدات"

بۆ منداڵێکی تەمەن پێنج ساڵ نەخواردنی شیرینی گەلێك ناجۆر بوو. چونکە نەیدەتوانی ڕۆژانی یەك شەموان بێ خواردنی شیرینی بەسەربەرێت. دایکی کە بڕوای بە خەونی کچەکەیبوو مەسەلەکەی بەهەندگرت و شیرینی لە کوڕەکەی قەدەغەکرد. بەڵام هەر ئەوەندەی بۆ چرکەساتێك ئاگای لێ بڕا، منداڵەکە بە نهێنی پارچەیەك شیرینی خوارد، شیرینیەکە لە گەرووی گیراو خنکاندی.

فروفریدا بڕوای نەدەکرد بەو توانا و بەهرەیەوە بتوانێت بژی، تا زستانی سەختی ڤییەنا بە تەنگی هێنا. ئەوسا لە یەکەمین ماڵدا کە ویستی بژی و داوای کاری کرد، کە لێیان پرسی دەتوانێت چی بکات تەنیا ئەوەی پێوتن کە: "من خەون دەبینم" ژنی خاوەن ماڵ خۆشیی لە شێوازی وتنەکەی هات و بە پارەیەکی کەم کە تەنیا بەشی خەرجیی ڕۆژانەی دەکرد داینا، وەلێ ژوورێکی جوان و سێ ژەم خواردنی بۆ بڕیەوە. بەتایبەتی نانی بەیانیان کە خێزانەکە دادەنیشتن و دەیانویست لە ئایندەی نزیکی هەریەکەیان ئاگاداربن: باوکەکە پسپۆڕی کاروباری دارایی بوو. دایکەکە ژنێکی ڕووخۆشی عاشق بە موسیقا بوو. تەمەنی دوو منداڵەکەیان یانزە و نۆ ساڵان بوو.

هەموو ئەندامانی خێزانەکە مەزەبی و بڕوایان بە خورافات هەبوو، بۆیە گوێیان لە قسەکانی فروفریدا دەگرت و بڕوایان پێ دەکرد. بەتایبەتی کە ئێستا تاقە ئەرکی ئەو پەیبردنە بە چارەنووسی ڕۆژانەی خێزانەکە لە ڕێی خەونەکانیەوە.

فروفریدا بۆ ماوەیەکی دورودرێژ، بە تایبەتی لە ساڵانی جەنگدا کە ڕاستیەکان لە کابووسەکان ترسناکتر بوون، باش کارەکانی ئەنجام دەدا، تەنیا ئەو بوو هەموو بەیانیەك بڕیاری دەدا هەر کەسەو لەو ڕۆژەدا چ کارێك بکات و چۆنی بکات. تا وای لێهات بڕیارەکانی بەڕەهایی وەردەگیران و، دەسەڵاتی لەناو خێزانەکەدا ڕەت نەدەکرایەوە، بێ ڕەزامەندی ئەو بچووکترین کار نەدەکرا.

ئەو کاتەی من لە ڤییەنا بووم خاوەن ماڵەکەی مرد، ئەو جوامێریەی کردبوو کە بەشێك لە سامانەکەی دابوو بە ژنەکە، بەو مەرجەی فروفریدا تا دەمێنێت خەون بە منداڵەکانیەوە ببینێت. من بۆ ماوەی زیاد لە مانگێك لە ڤییەنادا مامەوە.

لە هەلومەرجێکی زۆر ناهەمواری نەبوونیدا بەشداریی خوێندکارەکانی ترم کرد، چاوەڕێی بڕێك پارەبووم بەدەستم بگات و هەر نەگەیشت. سەردانەکانی فروفریدا بەدەست و دڵی کراوەوە بۆ ئەو مەیخانەیەی ئێمە بە مەمرەو مەژی نانمان تیا دەخوارد وەك جەژن وابوو. شەوێك

کە بیرە مەستی کردبووین، بوێرانە بە گوێیدا چرپاندم.

"تەنیا بۆ ئەوە هاتووم پێت بڵێم کە دوێنێ شەو خەونم بە تۆوە دیوە، دەبێت زۆر زوو ڤییەنا بەجێبهێڵیت و تا پێنج ساڵی تر نەگەڕێیتەوە بۆ ئێرە". ئیتر بواری بۆ نەهێشتمەوە، قسەکەی هێند دڵکارانە وت کە من هەر ئەو شەوە سواری دوا شەمەندەفەری رۆما بووم و ئەویم بەجێهێشت. وتەکەی هێند کاری تێکردم کە لەوەودوا خۆم بە کەسێك دادەنا لە کارەساتێکی حەتمی کە دەبوو بەهۆی تیاچوونم رزگارم بووەو تا ئێستایش رێم نەکەوتۆتە ڤییەنا.

پێش رووداوە ناخۆشەکەی هاڤانا، جارێکی دی بە رێکەوت فروفریدام لە دۆخێکی رازئامێزدا لە بەرشلونە بینیەوە. ئەمە لە رۆژێکدا روویدا کە پاپلۆ نیرۆدا لە سەفەرێکی دوورو درێژیدا، بۆ نیشتەجێبوونێکی کاتی، بۆ یەکەمجار لە دوای جەنگی ناوخۆوە، هاتبوە ئیسپانیا، بەیانیەکیان نیرۆدا بە مەبەستی کڕینی کتێبی چاکی دەستی دوو کتێبخانە کۆنەکانی لەگەڵدا گوزەراندین. کتێبێکی زۆر کۆنی بەرگ دڕاوی شیرازە هەڵوەشاوی کڕی، نرخێکی وای دایە کە دوو قات بەرانبەر بەو مووچەیە بوو کە مانگانە لە سەفارەتی ڕانگۆن وەریدەگرت. نیرۆدا لە نێوماندا وەك فیلێکی نەخۆش بە رێگادا دەڕۆشت، هەر شتێکی بدیبایە بە کون پشکنیەکی منداڵانەوە بۆی دەچوو، چونکە لە دیدی ئەودا دنیا بێجگە لە گەمەیەکی نابووت کە ژیانی دروست دەکرد چیتر نەبوو.

من کەسم نەدیوە بە ئەندازەی نیرۆدا لووتکەیەکی رۆشنگەری بێت. لەبەرئەوەی زۆرخۆر و خاوێن بوو، تەنانەت بێ حەزی خۆیشی لەسەرەوەی مێزەکەدا دادەنیشت، ماتیلدەی هاوسەری، بەروانکەیەکی لە ملی دەکرد کە زیاتر بۆ سەرتاشخانە دەشیا تا سەر مێزی خواردن. وەلێ ئەمە تاقە رێگایەك بوو بۆ ئەوەی هەموو گیانی نەبێت بە سوس. ئەو رۆژەی ڕستورانتی کارڤالیریاس[1]، رۆژێکی ئاسایی ژیانی ئەو بوو. لێزانانە سێ قرژاڵی چاکی پارچە پارچە کردو خواردی، هەر لەو کاتەدا چاوی لە قاپەکانی تر بریو لە هەر یەکێکیانی چەشت، وەك بیەوێت گوێچکە ماسیە ئاساییەکانی گالیسیا[2] و گوێچکە ماسیە پێست ڕەشەکانی کانتابریا[3] و کوللە دەریاییەکانی ئالیاکانتە[4] و خەیارە ئاویەکانی کوستابراڤا[5] کە مشتەری زۆریان هەیە، بخوات. لەو ماوەیەدا وەك فەرەنسیەکان، بێجگە لە باسی خواردنی خۆش باسی هیچی تری نەدەکرد. بەتایبەتی قرژاڵی پێش مێژووی شیلی کە زۆری حەز لێ بوو. لە ناکاوێکدا دەستی لە خواردن کێشایەوە، قژی چاك کرد و لەسەرخۆ پێی وتم:

"یەکێك لە پشتمەوەیە و تەماشام دەکات"

کە سەیری پشتیەوەم کرد زانیم ڕاست دەکات. سێ مێز لەولاترەوە، ژنێکی بوێر بە کڵاوێکی کۆن و ملپێچێکی ئەرخەوانیەوە هێدی هێدی نانی دەخوارد و لە ملی دەڕوانی. زوو بیرم کەوتەوە، پیرو قەڵەو ببوو، هەمان ئەو فروفریدایە بوو بە ئەڵقە شێوە مارەکەی پەنجەیەوە. ئەویش لەگەڵ نیرۆداو ژنەکەیدا بە

هەمان کەشتی لە ناپولیەوە گەیشتبوو. وەلێ لەناو کەشتیەکەدا یەکتریان نەدیبوو، داوەتمان کرد تا بێتە سەرمێزەکەمان و قاوە بخواتەوە، هانم دا باس لە خەونەکانی بکات و سەری شاعیرەکەمان بەسووڕبێنێت. نیرودا زۆر گوێی پێنەدا، چونکە هەر لە سەرەتاوە ڕایگەیاند کە ئەو بڕوای بە ئەفسانەی خەون نییە.

نیرۆدا وتی: "تەنیا شیعر دەتوانێت لە نهێنی بزانێت"

دوای نانی نیوەڕۆ و پیاسەیەکی ناچاری بەرامبلاسدا[6]، من و فروفریدا خۆمان دواخست تا باس لە یادەوەریەکانمان بکەین بێئەوەی کەس گوێی لێمان بێت. فروفریدا وتی هەرچیەکی لە نەمسا هەبوە فرۆشتوویەتی و لە شاری پورتوی[7] پورتوگالدا شوێنێکی چەپەکی پەیدا کردووە، ماڵەکەی بریتییە لە کۆشکێکی گەورە بەسەر گردێکەوە کە بەسەر ئۆقیانوسدا دەڕوانێت و هەموو وڵاتانی ئەمریکای باشووری لێوە دیارە. هەرچەندە بە ڕاشکاوی ئەمەی نەوت، بەڵام لە قسەکانیەوە دەردەکەوت کە بەهۆی خەونە بەردەوامەکانیەوە، توانیویەتی هەرچی سامانی مشتەریەکانی ڤییەنا هەیە لە دەستیان دەربێنێت. بەڵام ئەم مەسەلەیە منی سەرسام نەکرد، چونکە من هەمیشە باوەڕم وابوە کە خەونەکانی بێجگە لە فڕوفێڵێک بۆ ژیان بەسەربردن چیتر نەبوون و ئەمەیشم پێ وت. پێکەنینێکی ناجۆری کرد و وتی: "تۆ هەمیشە لووت بەرزیت" و ئیدی هیچی تری نەوت، چونکە هەموو ئەوانی تر وەستابوون و چاوەڕێی نیرۆدایان دەکرد، لەو کاتەدا نیرۆدا بە زمانی ڕەمەکی چیلی لەگەڵ تووتیەکانی رامبلا دی لوس پاخاروسدا[8] هێشتا قسەی تەواو نەکردبوو.

کە کەوتینەوە قسە فروفریدا باسەکەی گۆڕی و وتی: "بەڕاست، تۆ ئیتر دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ڤیەنا"

بیرم کەوتەوە کە سیانزە ساڵ لەوەوبەر من و ئەو یەکترمان دیبوو، بۆیە سەرسەختانە پێم وت: "تەنانەت ئەگەر خەونەکانت لای من ڕاستیش نەبن، بەڵام بە هیچ جۆرێک ناگەڕێمەوە".

لە سەعات سێدا ئەومان بەجێهێشت، بۆئەوەی نیرۆدا بگەیەنینە ماڵەوە و خەوی خۆشی نیوەڕوانی لێبکات کە جێگا و ڕێگای باشمان بۆ ئامادەکردبوو. دەبوو دۆخێکی هێند تایبەت دروست بێت لە ئاهەنگی چا خواردنەوەی ژاپۆنیەکان گرنگتر بێت. دەبوو هەندێك لە پەنجەرەکان بکرێنەوەو هەندێکی تریان دابخرێن، بۆئەوەی هاوکێشەیەك لە پلەی گەرمادا دروست بێت و ڕووناکی لە شوێنێکی تایبەتیەوە بێتە ژووری و بێدەنگیەکی تەواو ئەو ناوە لەخۆ بگرێت.

نیرودا زۆر زوو خەوی لێکەوت، وەك منداڵ، دوای دە دەقیقە هەستا کە ئێمە هەرگیز چاوەڕێی ئەوەمان نەدەکرد. هاتە ژووری میوان و هێشتا نیشانەی سەرینەکە بە ڕوومەتیەوە دیاربوو.

نیرۆدا وتی: "من خەونم بەو ژنەوە بینی کە خەون دەبینێت"

ماتیلدەی ژنی داوای لێکرد بیگێڕێتەوە.

وتی: "خەونم بینی کە ئەو ژنە خەونی بە

منەوە دەدی"

وتم: "ئەمـــە لـــە چـــیرۆکەکانی پـــۆرخیس دەچێت"

بە نیگەرانیەوە لێی ڕوانیم و وتی:

"بۆ ئەو شتی وای نووسیوە"

وتم: "ئەگەر نەیشی نوسیبێت ڕۆژێك هەر دەینووسێت، ئەمە یەکێکە لە کێشەکانی"

کـــە ســـەعات شەشـــی ئێـــوارە ماڵئـــاوایی لێکـــردین و ســـواری کەشـــتی بـــوو، لـــە پشـــت مێزێکەوە بە تەنیا دانیشت، بە مەرەکەبی سەوز دەستی بە شیعر نووسین کرد، ئاسایی لە کاتی پێشکەشـــکردنی کتێبەکانیـــدا وێنـــەی گـــوڵ و ماسی و باڵندەی دەکێشا. کە بانگەوازی ئەوە کرا "ئەوانەی بۆ ڕەوانەکردن هاتوون دابەزن" مـن بـەدوای فروفریـدا گـەڕام، سـەرئەنجام کـە ویستمان بێ خواحافیزی لێکردنی بڕۆین، لەو شـوێنەدا کـە گەشـتیارەکانی تیـا وەسـتابوون بینیمانـــەوە. ئـــەویش وەنـــەوزێکی دابـــوو. فروفریـدا وتـی: "مـن خـەونم بـە شـاعیرەکەوە بینی"

بـــە سەرســـامیەوە داوای گێڕانـــەوەی خەونەکەیم لێکرد.

وتی: "لە خەونمدا شاعیر خەونی بە منەوە دەبینی"

سەرسـامیەکەم ئـەوی پەشـۆکاند و وتـی: "چاوەڕێی چی بویت؟ هەندێك جار لە نێوان ئەم هەموو خەونانەدا، مرۆڤ خەونێك دەبینێت کە هیچ پەیوەندیەکی بە واقیعەوە نیە"

دوای ئەوە نەمبینیـەوە، یـان هـەر فەرامۆشـم کرد، تا ئەو کاتەی هەواڵی ئەو ژنەم بیست کە لـە کارەسـاتەکەی ڕیڤـیرا هاڤانـادا گیـانی لـە دەست داوەو ئەڵقەیەکی شێوە ماری لە پەنجەدا بووە. دوای چەند مانگێك، لە میوانداریيـەکی سیاســـیدا، بەرێکـــەوت تووشـــی بـــاڵیۆزی پورتوگالی هاتم، نەمتوانی بەر لە دوودڵیەکەم بگـرم و هـەواڵی ژنەکـە نەپرسـم، باڵیۆز زۆر بـە گەرمی و بەرز ڕاگرتنەوە لەبارەیەوە قسەی کرد و وتی: "تۆ نازانیت ئەم ژنە تا چەند لەسەروی مرۆڤـــی ئاســـاییەوە بـــوو، ئەگـــەر بزانیـــت چیرۆکێکی لەسەر دەنووسیت" هەر بە هەمان ئـــاواز و وردەکاریـــە سەرســـووڕهێنەرەکانەوە لەســـەر قســـەکانی ڕۆشـــت. بێئـــەوەی ســـەرە دەزوویەکم پیشان بدات تا من بەئامانجێك بگەم.

لە دواییدا بە ڕاشکاوانە لێم پرسی: "باشە ئەو چ کارێکی دەکرد؟"

نائومێدانە وتی: "هیچ، خەونی دەبینی".

-مارتی 1980-

**پەراوێز:**

*1-costabrava*
*2-Ramblas*
*3-oporto*
*4-carvallerias*
*5-galicia*
*6-cantabria*
*7-alicante*
*8-Rombla de los paiaros*

**سەرچاوە:**

کۆمەڵە چیرۆکی: "سفر خوش، اقای رئیس جمهور" نووسینی گابریل گارسیا مارکیز، وەرگێڕانی بۆ فارسی احمد گلشیری ل211-220".

# دوو قەسیدەی ژاك پرێڤێر

لە فەرەنسییەوە: سمكۆ ناكام

(1)

## باربارا

لە یادت بێ باربارا
ئەو رۆژە بێووچان بەسەر برێستدا ئەباری
تۆیش دەم بە خەندە
گەش و شاد و چۆراوگە بەستوو
بەبەر بارانەكەدا ئەرۆیشتی
لە یادت بێ باربارا
بێوچان بەسەر برێستدا ئەباری
منیش لە شەقامی سیام تووشت هاتم
تۆ زەردەخەندە گرتبوویتی
منیش هەروەها
لە یادت بێ باربارا
تۆیێ كە نەمئەناسیت
تۆیێ كە منت نەئەناسی
لە یادت بێ باربارا
هەرچۆنێ بێ ئەو رۆژەت لە یاد بێ
لە یاد مەكە
پیاوێ لە ژێر گوێسەبانەییێكدا خۆی داڵدە دابوو
هاواری ناوی تۆی كرد
باربارا
تۆیش بەبەر بارانەكەدا بەرەو لای ئەو راتكرد
چۆراوگە بەستوو گەش و شاد
خۆت فرێدایە باوەشیەوە
ئەمەت لە یاد بێ باربارا
لێم مەگرە ئەگەر بە (تۆ) لەگەڵتدا ئەدوێم
من بە هەموو ئەوانەی خۆشمئەوێن ئەڵێم تۆ
گەرچی لە جارێ زیاتریش نەمدیبن
من بە هەموو ئەوانەی یەكتریان خۆشئەوێ ئەڵێم
تۆ
گەرچی نەشیانناسم
لە یادت بێ باربارا
لە یادی مەكە
ئەو بارانە ئارام و كامەرانە
بەسەر دەموچاوی كامەرانتدا

بەسەر ئەو شارە کامەرانەدا
ئەو بارانە بەسەر ئەو شارە کامەرانەدا
ئەو بارانە بەسەر دەریادا
بەسەر جبەخانەکەدا
بەسەر کەشتیی "ویسان"دا
ئاخ باربارا
چ بەدفەرییێکە جەنگ
ئاخۆ ئێستا چیت بەسەرهاتبیٚ؟
لە ژێر ئەو بارانی ئاسنەدا
بارانی گڕ پۆلاو خوێنەدا؟
ئەی ئەوەی ئاشقانە
تۆی لە باوەش نابوو
ئایا مردووە؟ سەروشوێنی وونە؟ یا هێشتا
زیندووە؟
ئاخ باربارا
بێووچان بەسەر برێستدا ئەباریٚ
بە هەمان تەرزی جاران ئەباریٚ
بەلاٚم هەمان بابەت نییە و تازە هەموو شت
ژاکاوە
ئەمە بارانی پرسەی سامناك و ماتەمینییە
هەمان گێژەنی ئاسن و پۆلاو خوێن نییە
تەنها هەورن
کە وەك سەگ ئەتۆپن
سەگانیٚ کە بەسەر برێستدا
ئاو ئەیانبا
ئەچن لە دوور داڕزێن
لە دوور زۆر لە برێست دوور
کە تەنها هیچ جیٚ ئەمێنیٚ
* * * * * *

(2)

## پیاسەکەی پیکاسۆ

لەسەر قاپێکی خڕی فەخفووریی واقیعی
سێویٚ دانراوە
بەرامبەری
نیگارکێشێکی واقیع
بێهوودە هەوڵئەدا نیگاری سێوەکە بکێشیٚ
چۆنە ئاوا
بەلاٚم سێوەکە خۆی نادا بە دەستەوە
ئەویش قسەی خۆی هەیە بیکا
زۆرزانە
سێوەکە
لەناو قاپە واقیعیەکەیدا
بە دەوری خۆیدا ئەسووڕێتەوە
بیٚ ئەوەی نیازی خۆی ئاشکرا کا
لەسەرخۆ و بیٚ ئەوەی لە جێی خۆی ببزویٚ
هەروەك دۆقی گیز کە خۆی ئەگۆڕیٚ بە لەمپای
گاز
چونکە دژ بە خواستی خۆی پۆرترێتی ئەکێشن
ئاوایش سێوەکە
خۆی ئەگۆڕیٚ بە مرەبا
ئەوسا
نیگارکێشە واقیعیەکە
لەسەرخۆ لێی ئەبیٚ بە واقیع
کە سەر و سیمای سێوەکە لە دژێتی
ئینجا وەك هەژاری بەدبەخت
وەك دەسکورتی داماو کە لەپڕ کەوتۆتە بەر
قەپی سا هەر کۆمەڵێکی

چاکەکەر و خێرخوازی سامبەخشی چاکەکردن
و خێرخوازیی سامبەخشین بێ
نیگارکێشە واقیعیە بەدبەختەکە
لە پڕ ئەبێتە نێچیری جێی بەزەیی
بە لێشاو تێهەڵکێشکردنی لە ژمارە نەهاتووی
بۆ چوون
سێوە سووڕ دەرەکە دارسێو کێش ئەکا
بەهەشتێ سەر ئەرز و حەواو ئادەمیش
مەسینەی ئاودان، کەڵەکی بەر باخەکان،
پارمانتییێ و پلیکانە
کەنەدا، هیسپێدریکان، نۆرماندی، مزرەسێوو
شەکرەسێو
ماری یاریی لە پێدەست و سوێندی شەربەتی
سێو
خەتا بنەڕەتییەکەو
بنەڕەتەکانی هونەر
سویسرا بە ولیام تێڵەوە
تەنانەت ئیسحاق نیوتنیش
کە چەند جارێ لە پیشانگای دنیایی هێزی
راکێشاندا خەڵاتکراوە

نیگار کێشە دەسەپاچەکە مۆدێلەکەی لەبەرچاو
وون ئەبێ و خەوی لێ ئەکەوێ
ئەوسا پیکاسۆ کە بەوێدا تێئەپەڕێ
وەك بە هەموو شوێنێکدا ئەچێ
هەمیشە هەروەك لە ماڵی خۆی بێ
سێوەکە، قاپەکە و نیگارکێشە خەوتووەکە
ئەبینێ
چ خوازێ بێ وێنەی سێوێ بکێشرێ!
پیکاسۆ ئەڵێ و سێوەکە ئەخوا
سێوەکەیش پێی ئەڵێ سوپاس
ئینجا قاپەکە ئەشکێنێ و
بەدەم خەندەوە ئەڕوا
نیگارکێشەکەیش چەشنی دانێ
لە خەوەکانی هەڵکەنراوە
خۆی بە تەنها ئەبینێتەوە لەبەردەم تابلۆ
ناتەواوەکەی و،
لە ناوەڕاستی قاپە شکاوەکەیدا
دەنکە سامناکەکانی واقیعدا

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم
# نامەکانی چیخۆف و ئۆڵگا کنیپەر

له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**چیخۆف**

**11ی ژانیوەری**

**"نیس"**

هەی ژنی دڵرەق و کێوی، یەك سەدە تێپەڕیوەو نامەیەکی تۆم پێنەگەیشتوە. ئەمە یانی چی؟ من کە ئێستا نامەکانمت بەرێك و پێکی بۆ دەنێرم ئەگەر بە دەستت نەگەیشتبن تۆ بەرپرسیاریت هەی بێ وەفاکەم.

ئەگەر ڕۆژانی داهاتوو دەریا لە چەپۆکاندا نەبێت دەچم بۆ ئەفریقا (...) زۆر نامێنمەوە، تەنیا دوو هەفتە، ئێرە بەردەوام هەوایەکی هاوینەی بێ وێنەی هەیە، گەرم، گوڵ، ژن، پاسکیل. بەلأم بۆ من زیاتر لە تابلۆیەکی رەنگکراو دەچێت تا وێنەیەك.

نامەم بۆ بنووسە تووتەڵەکەم، تووتەڵە قژ سوورەکەم، ئەمە ئەوپەڕی بێ مانایییە کە نامەم بۆ نانووسیت. خۆزگا پێت دەوتم شانۆگەری "سێ خوشکەکە" چۆن دەڕوات. هێشتا هیچت لە بارەیەوە بۆ نەنووسیوم. هەر هیچ. مەگەر تەنیا لە بارەی پرۆڤەکانەوە کە ئەمڕۆ پرۆڤە هەبوە یان نا. تۆ پێویستت بە قامچی کوتانێك هەیە (...)

تووتووەکەت.

******

**کنیپەر**

**11ی ژانیوەری**

**موسکۆ – یەکی بەیانی**

ئازیزترینم، گلەیی ئەوەم لێ دەکەیت کە نامەی منت پێنەگەیشتووە! بەلأم من بەردەوام نامەت بۆ دەنێرم، هەموو ڕۆژێك یان ڕۆژە نا ڕۆژێك. بۆ چ بۆڵە بۆڵم بەسەردا دەکەیت؟من

ئـەمڕۆ زۆر مانـدووم، کـاکم لەگـەڵ ژن و کچـە چـکۆڵەکەیان تـا بیسـت و پێنجـی مـانگ لێـرە دەبن و دوای سێ هەفتـە دەڕۆن بۆ پـتروز بـورگ. دوێـنێ پـەردەی چـوارەمم خوێنـدەوە، ئـەمڕۆ بــەیانی زوو لــە زۆر بلێییــە خۆشــەکەی "ئادۆشکا"[1]ی پێـنج سـاڵان بـە ئاگاهـاتم (...) پــەردەی ســێیەممان دووجــار پرۆڤــە کــرد "نمیروڤـیچ" پرۆڤـەکانی بینی و هەنـدێك شـتی لێگــۆڕین "ستانسلاڤسکی"لەســـەر شـــانۆ هـەمووومانی بـە جـۆش هێنـاو هـەراو زەنایـەکی مـەزنی نایـەوە. وەلـێ "نمیروڤـیچ" پێشـنیازی ئەوەی کرد کە ئەگەر هـەراو زەناکـە لـە دەرەوەی سەرشانۆکە بێت و سەرشانۆ جۆرە ئارامیـەك لـە خــۆ بگرێــت بــەهێزتر دەردەچــێت. هــەموو ئەکتـەرەکان بـە چـاکی رۆڵـی خۆیـان دەبیـنن و ئومێـدی ئـەوە هەیـە نمایشـەکە سـەرکەوتو بێـت.دوێنێ "ستانسلاڤسـکی" زیـاد لــە دوو ســەعات قســەی لەگەڵــدا کــردم، مــنی وەك ئەکتەرێك هەڵسەنگاند و وتی لە ماوەی ئەم سێ ساڵەدا رۆڵـم زۆر دیـوەو هـیچ کاتێـك لـە شـەوی یەکـەمی نمایشـدا خـۆم بـاش ئامـادە نـەکردوە. تـەنیا لـە دوای نمایشـی پانزەهەمەوەیـە کـە.. و شتی تریش.

قسەکردن لەگەڵیدا زەحمەتە (...) نمیروفیچم نەبینی. بەڵام بەیەك دوو قسەی تێك چووم کە بە "سانین"ی وت ئەوانەی دەوروبەرت وێرانیان کردوویت بۆیە دەتەوێت بڕۆیت بۆ ئەفەریقا؟!!

هـەواڵی سەرسووڕمێن بوو،کۆترەکـەم تـووڕە مەبـە کـە زوربـەی نامـەکانم خـراپ دەنووسـم. مەسـەلەی "سـێ خوشـکەکە" خەریکـە تـەواو پێــــدەگات. پرۆڤــەکانی، جــل و بــەرگی، نمایشــەکانی دوا نیـوەڕوانی (...) بـۆ رۆڵــی پـەردەی چـوارەم دەبێـت تـەواوی کـاتمی بـۆ تەرخان بکەم.

قسـەی بـێ مانـا مەکـە کـە مـن عاشـقم و تـۆم لەیادکردوە.ئەگــەر نیــازێکی وایشــم هــەبێت ئێســـتا کـــاتم نیـــە ئـــەی ئـــانتونیوی دانـــاو دەبەنگەکـەی خـۆم، (...) کـەی بڕیارتـە یەکـدی ببینین و لە کوێ؟ (...)

ئۆلگا

* * * *

کنیپەر

13 ژانیوەری

مۆسکۆ 2ی نیوەشەو

دیسـان شـەوەو دیسـانەوە درەنگـە و وا مـن نامەت بۆ دەنووسم ئەی هەرە ئازیزم. سوپاس گوزارم کە لە یادت نەکردووم و بەردەوام نامەم بۆ دەنێریت. نامەکانت ژیانم بۆ خۆشتر دەکەن. باشە، با وردە وردە دەست پێ بکەم:

"ستانسلافسکی" داوای لێکـردم لـە بـارەی پـەردەی چـوارەمەوە پرسـیارت لـێ بکـەم. ئایـا دەتوانین واز لـە هـەڵگرتنی تـەرمی "توزنباخ"[2] بهێـنین؟ چـونکە ئـەو کـارە بـە تـەواوی سـەر شانۆکە سەرقاڵ دەکات و ئارایشتی هەر "سێ خوشــکەکە" تێــك دەدات. لەلایــەکی تــرەوە لەبەرئـەوەی سـەر شـانۆکەمان زۆر فـراوان نییـە، ئـەو کـارە دەبێتـە هـۆی لـەرزینی دیکۆرەکـە، ئێستا ئەو بەشەمان پرۆڤە نەکردوە. توخوا زوو وەڵامـم بـدەرەوە و دوای مەخـە، دیـارە کاتێـك تەرمێك دەهێننە ماڵەوە خوشکەکان ناتوانن هەر ئاوا ئاسایی دابنیشن, تۆ ئەڵێی چی؟

سبەینێ سەعات دوانزە یەك ژەمی پرۆڤەی سێ پەردەیە، واتا دەبێت من زوو لە خەو هەستم. ئەم "ترام ترام[3]"ەیش کێشەی بۆدروست کردووین. "نمیروڤیچ" باوەڕی وایە کە ئەم نیشانانە دەبێت وەك ئاوازی شەیپور و لەگەڵ ئاماژە و جووڵەدا بکرێت.. ئەگەر بە تەنیا هەر ئەو دوو وشەیە بڵێین بێ گیان دەردەچێت و کەس تێی ناگات. لەم بارەیشەوە باری سەرنجی خۆتم بۆ بنووسە (...) هەر ئێستا لە شانۆوە گەڕاومەتەوە، ئەوەدو نۆهەمین نمایشی "فیودور"مان هەبوو. ئێستا سەعات دووی دوای نیوەشەوە.دەبێت "سێ خوشکەکە" لە هەوەڵەوە تا کۆتایی بخوێنمەوە، زۆر کەم پەردەی یەکەم و دووەمم پرۆڤە کردووە، ئەو ماوەیە هەمووی نەخۆشبووم "نمیروڤیچ" لە بارەی وەرزی تازەی شانۆوە قسە لەگەڵ ئەکتەرەکاندا دەکات "سانین"وتی بڕیارە چوارسەد ڕۆبڵم بۆ زیاد بکەن من تەماع کارنیم، بەڵام بە ویژدانەوە بەپێی ئەو کارەی من دەیکەم ئەو بڕە پارەیە زۆر نییە.بە تایبەتی کە من لەوانی دی زیاتر پارە بە جل و بەرگ دەدەم. بەهەرحاڵ هەوڵ ئەدەم بەڕێوەبەرایەتی بەوە قانع بکەم کە خۆیان جل و بەرگ بکڕن. پاشان دەبێت خۆم بەوە دڵخۆش بکەم کە بۆ وەرزی ئایندە ڕۆڵی تازەم نیە. باشە بابزانین چۆن دەبێت (...)

**ئۆلگاکەت**

خاڵە ساشا "سێ خوشکەکە"ی خوێندەوە، وتی ئەم کارە لە کارە هەرە چاکەکانی تۆیە.

* * * *

**چیخۆف**

**14ی ژانیوەری**

**"نیس"**

ئەکتەری ئازیز، نیگەرانم، یەکەم لەبەر ئەوەی کە نووسیوتە نەخۆش بوویت، دووەم لە "روسیکی ڤید"[4]دا خوێندمەوە کە نمایشی "خاڵ ڤانیا" وەستاوە، بۆ؟ بۆ خانمە ئازیزەکەم؟ نەخۆشیت؟کە نەخۆشیت بۆ ئاگاداری خۆت نابیت؟ بۆ بەملاو بەولادا هەڵپەتەو بەیانیان تاحەوت ناخەویت؟ دەبێت زۆر ئاگاداری تەندروستی خۆت بیت. بەردەوام نامەکانتم پێ دەگات. بۆ لە بارەی "سێ خوشکەکە"وە هیچ نانووسیت، نمایشنامەکە چۆن دەڕوات؟ هەر دەربارەی "سانین" و "مایرهولد" دەنووسیت و کەمێك گومانم پەیدا کردووە کە کارەکەم بێ نرخ بێت. کە "مایرهولد"یش هات بۆ ئێرە حەوسەڵەم نەما، هەستم دەکرد نمایشنامەکە بە تەواوی شکستی هێناوەو ئیدی هیچ بۆ شانۆی هونەری نانووسم.

بە کورتی حاڵم خراپ بوو، وا ئێستا هاتوومەتەوە سەرخۆم (...) هەرە ئازیزەکەم، لە ناو پۆپۆرەکەو لە جەزائیرەوە هەموو ڕۆژێك نامەیەکت بۆ دەنووسم. بۆ ئەوەی هەمیشە لە یادتدا بم.

سکرتێری کۆنسوڵگەری هات بۆ لام بۆیە نەمتوانی نامەت بۆ بنووسم. ئەو کاتەی کە ئەو لێرە بوو نامەکەت بە دەستم گەیشت. هەموو نامەکانتم پێ دەگات، بەڵام ڕۆژە نا ڕۆژێك و

هەنـدێك جـار كـەمتریش، نانووسـیت، باشـە، خودات لەگەڵ (...)

تووتووەکەت.

کۆنە پزیشك و شانۆ نووسی کات پەرت

* * * *

**کنیپەر**

**15 ژانیوەری- مۆسکۆ**

لـە دوانامەکەتـدا زۆر لـەوە دڵگرانیـت کـە بـۆ نامەت بۆ نانووسم.

وەلێ دەبێت دیسانەوە پێت بڵێم کە تەنانەت نێـــوان نامـــەکانم دوو ڕۆژیـــش ناخایـــەنێت. تەنانـەت دەتـوانم بڵـێم ڕۆژێکیش ناخایـەنێت، نـــازانم نامـــەکانم چـــیان بەســـەردێت، ڕەنگـــە بەدەسـتی بـەڕێزێکی تـر بگـەن. مـن ناونیشـانی سـەر زەرفەکـە بـە تـەواوی دەنووسـم. هێشـتا ناتوانم لە بارەی شانۆگەریەکەوە هیچ بنووسم، چـونکە هـەر لـە پرۆڤـەی سـەرمێزداین. دوێـنێ پـــەردەی دووەممـــان بـــە جلـــەوە پرۆڤـــە کـــرد، هەرچەندە هێشتا زۆری ماوە بەڵام هەموان لێی ڕازی بوون. دەربارەی نمایشەکە هیچ ناوترێت. بینـەران زۆر بـە پەرۆشـەوە تەماشـای دەکـەن. بەراسـتیی مامۆسـتایەکی دەگمـەنیت. زۆر لـە "مایرهۆڵـــــد" ڕازی نـــــین "ئانـــــدریڤا" و "ساڤینسـکایا" باشـن. هـەروەها "لوژسـکی و ڤیشنیڤشـکی"یش. هێشـتا "ستانسلاڤسـکی" نەهاتۆتـە کاسـتەکەمانەوە[5]. دەربـارەی دەوری "مارشـــا"م دوێـــنێ بـــە دورو درێـــژی لەگـــەڵ "نمیروڤـیچ"دا قسـەم کـرد "ستانسلاڤسـکی" دەڵێـت مـن زۆر درامیانـە دەور دەبیـنم. جـارێ دەورەکـــە تـــەواو ســـەقامگیرنەبوە. مـــن لـــە نوختەیەکـدا لەگـەڵ "نمیروڤـیچ"دا جیـاوازیم هەیە ئەویش دان پێدانانی ماشایە لە پەردەی سـێیەمدا. مـن دەمـەوێت پـەردەی سـێیەم بـە تووڕەییـەوە دەورەکـەم ببیـنم، ئەمـە مانـای دان پێـدانانێکی کاریگـەر و دراماتیـك و نالـەباری بارەکەیـــە کـــە تاڵێکـــەی لـــە چـــێژی خۆشەویستیەکەی زیاترە "نمیروڤیچ" دەیەوێت عەشقەکە ئەمەندە باڵا بێت لەگەڵ هەموو شتە ناخۆشـەکاندا ڕێگـا لـە دان پێدانانەکـە بگرێـت، پـــەردەی دووەم پـــڕە لـــەو خۆشەویســـتیە. بـــۆ "نمیروڤیچ" پەردەی چوارەم لووتکەیـەو بـۆ من پەردەی سێیەم وایە، ڕای تۆ چۆنە؟ "نمیروڤیچ" پێشـنیازی ئـەوە دەکـات کـە: "ماشـا" لـە ژێـر لێوەوەو بە ڕوویەکەوە کە بە تـەواوی هەستەکە دەربیڕێـت، هەسـتی دەروونـی "فورشـنین"[6] بـەردەوام بێـت. ڕێکخسـتنی سەرشـانۆ بـۆ ئـەم کـارە زۆر گرنگـە مـن لـەوە دڵنیـا نـیم کـە "ستانسلاڤسـکی" دەرەقـەتی بێـت. ڕەنگـە ناچـاربین بـە گـۆڕینی. ئـەو جـارێکی تـر دەپرسـێت، ماشـا پرسـیاری لـێ دەکـات (بـێ ئـەوەی لـە ژێرلێـوەوە بیڵێـت) وەلـێ تەماشـای ناکات و دەستەوستان ڕووبەڕووی ڕادەمێنێت. بـە کـورتی دەمـەوێت بڵـێم کـە دەبێـت لـەوە دڵنیابین ئایا بینەر لە مەسەلەکە تێدەگات یان نا، دەبێت گەلێك ڕێگا تاقی بکرێتەوە. (...)

* * * *

**چیخۆف**

**17 ژانیوەری- نیس**

خۆشەویسـتەکەم نیگـەران مەبـە، نامـەکانت زۆر بەســـەلامەتی دەگەنـــە ئێـــرە، بێگومـــانم

یەکێکیشـیان لەناونەچـوە، سوپاسـت دەکـەم تووتەڵەکەم، ئەگەر هەر بەو جۆرەی کە خۆت نوسیوتە نامەی کورت ئەگەر زۆریش نەبێت لە تۆوە بەدەستم بگات باکم نیە. تۆ کارت زۆرە و سەرت قاڵە، هەرچەندە وا دەزانم نمایشنامەکە بۆ ئەم وەرزە ناخرێتە سەر شانۆ، بەڵام لە پترۆزبورگ (...) من باشم. بە نیازین بچین بۆ جەزایر بەڵام بڕواناکەم بەم زوانە رێك بکەوێت چونکە دەریا زۆر نائارامە. بۆ نموونە ئەمڕۆ زریانە، خەڵکێکی زۆر دێن بۆ لام و ناهێڵن کار بکەم و دەمارم ورد دەکەن، کە تووڕە دەبم ئیدی توانـای نووسـینم نامێنێـت دوای جـەزایر دەمەوێت ڕاست بگەڕێمەوە بۆ یاڵتا (...)

عالیجەنابی هزرمەندت ئانتوان

*****

کنیپەر

$18$ی ژانیوەری

موسکۆ – یەکی دوای نیوەشەو

دوا نامەی $15$ی ژانیوەری.

ئانتوان، هەرە ئازیزەکەم، بۆ نامەی خەمگین و نائومێدانـە دەنووسـیت؟ بـۆ ئاوێنـەی دڵـت تۆزی لێنیشتووە؟ (...) کۆترەکەم خەم لە دڵت دەربکە، ئازیزم، خۆشت ناوێم؟ ئێمە بەم زوانە پێك دەگەین، دوێنێ تەلگرافێ پیرۆزبایم بۆ ناردیـت (بـە بۆنـەی لـەدایك بوونتـەوە) لـە بەڕێوەبەریـەتی پۆسـتە بپرسـە، وەلـێ دوای نیـوەڕۆ وەڵامـێکم پێگەیشـت کـە: چـیخۆف نەناسراوە و ئادرەسەکە تەواو نیە. دەزانیت چۆن بووە؟ لە بیرم چوو بوو ناوی ئوتێلەکە بنووسم، نەفرەتم لە خۆم کرد، بەڕاست لەو باوەڕەدای کـە ئەکتـەر $17$ی ژانیـوەری لەبیرچوبێتەوە؟ تۆ خۆت لەبیرت بوو؟ لە بارەی نمایشـنامەکەوە پرسـیوتە؟ بیرکردنەوەیـەکی گەوجانەیـە ئەگـەر وابزانیـت سـەرناگرێت. کارێکی زۆر نایابە و هێشتا تەواومان نەکردوە و هـەموو شـتەکان بـاش دەڕۆن، تـەنیا "مایرهولد"ە کە لە نمایش کردنەکەدا زۆر باش نییە و "سانین"یش هێشتا نەکەوتۆتە سەر ریتمی خۆی. ئەمڕۆ لەسەر پەردەی دووەم کاری باشمان کرد، لەوە زیاتر لەو بارەیەوە نانووسم چونکە هێشتا لە هەمووی دڵنیا نیم. تۆ ناتەوێت لەسەر ئەو شتانەی کاریان تیا دەکەیت زۆر بدوێیت، منیش نامەوێت زۆری لەسەر بڕۆم، ئازیزەکەم لە من پەست و نیگەران مەبە.

عەسری ئەمڕۆ "نمیروڤیچ" و من لە ڕۆڵی "ماشا"دا کاری چاکمان کرد. ئیتر بۆ من هەموو شتەکان باش بەڕێوە دەچن. ئەو ڕۆڵەم زۆر زۆر خۆش دەوێت و ڕۆڵ شوێنی دەوێت کە خۆی تیا بکاتەوە، وانیە؟

من دیمەنی دان پێدانانەکە بە دەنگی بەرز نمایش ناکەم، بەڵام ئەگەر بتوانم هەستێکی بەهێزی دەروونی و خۆشی تیا دروست دەکەم. لەودیمەنـەدا تاڕادەیـەك بێجگـە لـە چـاو هـیچ جووڵەیـەکی تری تیا نیە.. ئای دەمەوێت وەك ئەکتەرێك زۆر بڵێم و تۆ گێژ بکەم. لە پەردەی دووەمدا "نمیروڤیچ" جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە "ڤرشنین" و "ماشا" تەنیا نەبن و ئەو هەستە بگەیەنن کە یەکتریان دۆزیوەتەوەو هەست بە چێژی خۆشەویستی دەکەن (...)

دیکۆرەکە جوانە، شەقامێکی باریکی بێوێنە کە لە هەردوو بەریەوە درەختی سەروو هەیە.

خانوویەکی تێدایە بە هەیوانێکی فراوانەوە کە ئەفسەرەکان پیایدا تێدەپەڕن و "ماشا"و "ڤرشنین" لەوێدا لە یەکتری جیادەبنەوە، لە دوادیالۆگمدا ئەگەر بە پێویستم زانی کەمێکی لێ لابدەم هیچ خەوشی هەیە؟ هیچ فەرق دەکات؟ من شێوازی "ماشا"م لە دوا پەردەدا پێ خۆشە. دەورێکی زۆر نایابە، ئەگەر خراپی بکەم ئیدی تەواو لە خۆم نائومێد دەبم (...)

ئازیزەکەم، من خراپ نیم، ئەگەر خۆم ماندوو نەکەم و باش بخەوم، واتا شەش حەوت سەعاتێك بتوانم بخەوم چاك دەبم، دەتوانم بێ خواردن بژیم بەڵام بێ خەو نا. ئایا هەندێك جار خەوم پێوە دەبینیت، (...) لە ئەفەریقا هەموو رۆژێك نامەم بۆ بنووسە، بێ دواکەوتن، تەنانەت ئەگەر کارت یان چەند دێرێکیش بێت. ئەگەر ئەم کارە نەکەیت نیگەرانت دەبم.

ئۆلگاکەت

**پەراوێزەکان:**

*1-Adochko*

*2-tozenbakh*

3-"ترام ترام" پەرلەیەکە لە نێوان "ماشا" و "ڤیرشینین"دا لە شانۆگەریەکەدا بەجێدەهێنرێت.

*4-Russkie ved*

5-ستانسلاڤسکی پێش دە رۆژ دەوری ڤیشنیڤسکی وەرگرت.

*6-Vorshnin*

**سەرچاوە:**

کتێبی دلبند عزیزترینم.

ل 112-119

# دوونامەی مەکسیم گۆرکی بۆ: ئەنتوان پاڤلۆڤیچ چیخۆف

نیژنی نووگورد

لە فارسییەوە: حەمە رەسووڵ حەسەن پوور

(1)

ئـەنتوان پـاوڵۆڤیچ! نامەکـەت زۆر سـەرنج راکـێش بـوو. ئـەوەی دەربـارەی وشـەی بیـانی وتووتـە، راسـتە: مـن بـە سـانایی نـاتوانم لـە وشـەکانم دەریـان باوێـژم. جگە لەمە ترسان لە رووداری و بێباکبوون بەربەستی کارەکەمە. هەر بۆیـە هەمیشـە وا دێتـە بەرچـاو دووچـاری هەڵەشـەیی بم و کارەکەشم بە باشی بە ئەنجام ناگەیەنم. لەوەش خەراپتر ئەوەیە کە بە داهاتی نووسینی بابەتی ئەدەبی بەرێدەچم و ئیشێکی دیکە نازانم.

من بۆ خـۆم فێری شت بووم و تەمـەنم سی ساڵە، بـڕواش ناکـەم باشـتر لـەوەی ئێسـتا هـەم ببم و خوا بکات لەم پلەیەدا بمێنمەوە. پلەیـەکی گـرینگ نییـە بـەڵام بـۆ مـن کافییـە و بەگشـتی هێندەش مرۆڤێکی سەرنج راکێش نیم.

رەوشـی تـۆ جیـاوازە، بـەهرەی بەرچـاوت تێدابـەدی دەکرێن. ئـەم وتەیـەت کـە حەزناکـەی بابـەت بـۆ شـانۆ بنووسـی ناچارم دەکـا چـەند وشەیەك سەبارەت بەو کەسانەی سەرنج دەدەنە شانۆنامەکانت، بنووسم. بۆ وێنـە دەڵێن "خاڵـە وانیا" و "باڵندەی دەریایی" شێوەیەك هونـەری درامای نوێیە کە تێیدا ریالیسم تا پلەی ئیلهام و سیمبول لە بیرو مێشکتدا بەرەو سەرچووە. بە بـوونی خـۆم ئـەوەی ئـەوان دەیڵـێن بـە تـەواوی راستە. کاتێك شانۆنامەکەتم بینی بیرم لـە ژیانی بە باداچووی خۆم کردەوە. بیرم لـە هـزرو بیری پـروو پـووچ و ژیـانی بـە کۆڵـە مـەرگی خـەڵکی و زۆر شـتی گرنگـی دیکـە کردەوە.باقی دراماکـان خـەڵکی لـە راسـتیەکان دوور دەکەنـەوەو بـەرەو فەلسـەفەی گشـتییان رادەکێشـن، دراماکـانی تۆش رێك ئەم کارە ئەنجام دەدەن.

بـەڵام ببـوورە! قسـەی زۆرم کـرد. ئەگـەر شـانۆنامە نانووسـی و بـە نووسـینی داسـتانەوە

سەرقاڵ دەبێ ئێمە زەرەر ناکەین. تا ئێستا لە ئەدەبیاتی روسیادا هیچ نووسەرێك لە چەشنی تۆ نەبووە و ئێستا تۆ بەرزترین سیمای وڵاتی ئێمەی. مووپاسان ئامادەیە شتی نوێ وەربگرێت و من زۆرم خۆشدەوێ. بەڵام تۆم زیاتر خۆشدەوێت. من بە تەواوی نازانم ئافەرینی خۆم بەنیسبەت تۆوە چۆن بەیان بکەمو وشەیەکی شیاو بۆ دەربڕینی هەست و سۆزی خۆم بە نیسبەت تۆوە نادۆزمەوە. بڕوا بکە لە ناخی دڵمەوە دەڵێم تۆ زۆر بە توانای. خۆشبەختیت بەردەوام بێت.

ئایا بۆ نووسینی بابەت لە "ژێزین[1]"دا داواکاریت ئاراستە کراوە؟ ئەگەر داواکارییەکەیان پەسەند بکەی زۆر باش دەبێت. تکایە رەزامەندی خۆتیان پێ رابگەیەنە!.

مرۆڤێکی جێگەی سەرنج بەناوی "پووسە"وە لە گۆڤاری ژێزین دا کاردەکات، ئەو داوای لێکردووم بابەت بنووسم و منیش رەزامەندیم دەربڕیوە. "کۆرۆلینکۆ"ش دەناسم. ئەوانیتر بەراست جێگەی سەرنج نین.

بەنیازم لە سێن پوترز بۆرگدا ژیان بەسەربەرم. ژیانی شاری قەرەباڵغ حەز لێ نییە. بەر لەوەی دەست بە نووسین بکەم مرۆڤێکی سەرگەردان بووم. جگە لەمە هەرچی زووتر ئەم شارە جێدەهێڵم چونکی هێندێك بە نەخۆشی ئازارە باریکە (سك)ەوە دووچارم.

م. گۆرکی

کۆتایی کانونی یەکەمی 1898

(2)

زۆر سەرنج راکێشە کە ئێمە هاوکات نامەمان بۆ یەکتری نووسیوەو نامەکەی تۆ زۆر جوانە.

دەزانی، هەرگیز لە بیرو خەیاڵمدا ناگونجێت کە لێو نیکۆلا یۆڤیچ تۆلستۆی رایەکی ئەوتۆی بە نیسبەت منەوە هەبێت[2]!. کارێکی باشت کرد کە سەبارەت بە گۆرکی لەگەڵیدا دوای و نامەشت بۆ گۆرکی نووسی!. ماوەیەکی زۆر بوو حەزم دەکرد بزانم رای تۆلستۆی بە نیسبەت منەوە چییە و لە زانینەکەی دەترسام. ئێستا پەی پێ بردنەکەی بۆ من وەك دڵۆپە هەنگوینێکە لە بەرامبەر جامێك ژەهری شۆکیراندا. لە هەردووکتانم چیشت پێویستی زیاترم نییە.

حەزدەکەم نووسراوەکەی ڤیلینسکی.. کە لە گۆڤاری "سێرڤیرنی ڤتێك"ی ژمارەکانی "تشرینی یەکەم" ئەیلوول و کانوونی دووەمدا چاپکراوە بخوێنییەوە. لە پاش ئەوە "فرانکۆ" و "گالیسیان" لە رۆژنامەدا بابەتیان لە سەرت نووسیوە، دەڵێن تۆ خامەیەکی سەرنج راکێشت هەیە. وێنەیەکی بابەتەکەیان بۆ ناردووم ئەگەر حەزدەکەی تاکوو بۆتی بنێرم، بەڵام بۆ خۆم ناتوانم بێم بۆ مۆسکۆ چونکی پۆلیس زانیویەتی شەوێك لە مۆسکۆ ماومەوەو جارو جەنجاڵی وەڕسی خستووە. پێم وانییە گرینگ بێ چونکی ئەوەی پێوەندی بە خۆمەوە بووە جێبەجێ دەبێ[3]. لەوانەیە بۆ شوێنێکی دیکەم بەڕێ نەکەن. لە خەراپترین حاڵەتدا بۆ ماوەی

دوو ســاڵێك دوورم دەخەنــەوە بــۆ "ڤۆڵگــدا" یاخود "ڤیاتكا".

لەوەی بەر لە چوارەمی مانگ نەمتوانی بێم بۆ مۆسكۆ هێندەی نارەحەت و دڵڕەنجاوم كە خەریكە بگریم. نازانی ژیان لە ژێر چاوەدێری پۆلیسدا چەندە سامناكە! پۆلیس بانگت دەكا، لە ماڵەكەت دادەنیشێ، ئەركە قێزەونەكەی ئازارت دەدات، بۆیش بە قەدەر تۆ ناخۆشە، ئەو بۆی هەیە هەرچی حەزی لێ بێت سەبارەت بەو پرسیارت لێ بكات: كێ هات بۆ دیدەنیت؟ لە كوێوە هات؟ بۆ كوێ چوو؟ بۆچی؟!. بەڵام چونكی دەزانێ درۆی دەگەڵدا دەكەی توورە دەبێ و تۆش توورە دەبیت. بەڵام ئەوە كافییە.

تەنانەت بیركردنەوە لەوەی كە بێم بۆ مۆسكۆ و بچم بۆ بینینی شانۆی "باڵندەی دەریای" نارەحەتم دەكات. هیچ شتێك لە دونیادا ناتوانێ لە شانۆدا لەلای تۆ دامبنێ. ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەی ئەوەیە هەمووان بكەیە دەرەوەو بە تەنیا دابنیشی و شانۆیەكە چاولێبكەی، تەنیا شتێكی گرینگ ئەوەیە بە تەواوی تەنیابی.

بەڵام ئەنتوان پاولۆڤیچ ی ئازیزا تكایە سەبارەت بە رای خۆت لەمەر شانۆیەكە نامەم بۆ بنووسە. بێزەحمەت ئەمكارەی بكە! گرینگ نییە شانۆنامەكە هی خۆتە، بۆم بنووسە و پێم بڵێ داخوا حەزت لێكرد؟ كامە بەشەت زۆر بەلاوە باشبوو؟ بێزەحمەت ئەمكارەی بكەو پێم بڵێ داخوا دووربینییەكەت چی بوو؟ وا دێتە بەرچاوم تۆ بە چەشنێك سەیری باڵندەی دەریایی دەكەی هەروا بزانە كەسێكی دیكە نووسیویەتی و لە ناخەوە دەتبزوێنێ.

شتێكی دیكە ئەنتوان پاولۆڤیچ! داخوا بە نیازی هاتن بۆ نیژنی نیت؟ ئێستا ئێرە بە رووبارە پڕ لە ئاوەكەیەوە زۆر قەشەنگە.

وەرە، من ژووری زۆرم هەن و تۆ دەتوانی لای ئێمە وەمێنی. هاوسەرەكەم ژنێكی كورتەباڵا، سادەو میهرەبانە. ئەو لەلایەنگرانی تۆیە و كاتێك پێم وت تۆ تەنیا بێ گوناح بووی. تەنانەت چاوی بۆت پڕبوون لە ئەسرین. وەرە بۆ لامان ئێمە وەك ئەندامێكی بنەماڵەكەمان رێزت لێدەگرین. چاوەڕوانت دەبین. كاتژمێرەكەش بێنە[4]. جوان نییە خۆم بیرت بخەمەوە بەڵام بلا ناجوانیش بێت! تەنیا ناوەكەت لەسەر چوارچێوەكەی هەڵكەنە، بۆچی؟ تەنیا لەبەرئەوەی پێت سەرسامم.

م. گۆركی

28ی شوباتی 1899

**پەراوێز:**

1-ژیزین ناوی گۆڤارێكی ئەدەبی، زانستی و بە تایبەتمەندی دیموكراسییەوە بوو كە لە نێوان ساڵانی 1895-1901 دا لە سێن پوترز بۆرگ دەردەچوو.

2-ئەنتوان چیخۆف لە نامەی رێكەوتی 25ی نیسانی 1899دا گۆركی ئاگادار كردبوو كە: "سێ رۆژ بەر لە ئێستا چاوم بە ل.ن. تۆلستۆی كەوت و زۆر ئافەرینی تۆی كردو وتی تۆ نووسەرێكی بە توانای".

3-گۆركی ساڵی 1891-1892 ئەو كاتەی لە تفلیس بوو بە هۆی ئەندامەتی لە تاقمی شۆرشگێڕی ئەو شارەدا دەستبەسەر كرابوو.

4-چیخۆف پێشتر بەڵێنی دابوو بە گۆركی كاتژمێرێكی بە هەدیە بداتێ.

**سەرچاوە:**

"نامەهای ماكسیم گوركی" ترجمە حسین نیر، لاپەرەكانی 31-32



# مێژووی فەلسەفە لە سەدەی بیستەمدا

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

***Philosophes et philosophies***
***Du xxe Siecle***
***Gug petitdemange***
***Seuil- Paris, 2003***
***p.505***

نوسەری ئەم کتێبە "گنی بیتیدو مانگ"ە، کە پسپۆڕە لە مێژووی فەلسەفەی هاوچەرخدا و پێشتر چەند کتێبێکی بلاوکردۆتەوە، لەوانە: (پۆڵ ڕیکۆر – مۆراڵ و بەرپرسیاریێتی). لەم کتێبە نوێیەیدا باس لە مێژووی فەلسەفە دەکات لە سەدەی ڕابردوودا و چەندین مەزنە فەیلەسوفی وەك: (واڵتەر بنیامین و میرلۆپۆنتی و قوتابخانەی فرانکفۆرت و هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ و یۆرگن هاپرماس و جاك دێریدا و پۆل ڕیکۆر و.. هتد)، بەسەر دەکاتەوە. هەر لە سەرەتای کتێبەکەدا "بیتیدومانگ" دەڵێت: (ئەم تێکستانە لە کاتی جیاجیادا نوسراون و پاشان لە دوو توێی کتێبێکدا کۆکراونەتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانی دەستی پێبگات). لەناو ئەوانەدا کۆمەڵە تێکستێکی دەربارەی قوتابخانەی فرانکفۆرت تێدایە، بابزانین نوسەر لە بارەیەوە چی دەڵێت؟ دەڵێت: (قوتابخانەی فرانکفۆرت ساڵی 1923 دامەزرا، کاتێك کارل گرۆنبرگ پەیمانگای توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لە زانکۆی فرانکفۆرتدا دامەزراند. ئەو توێژەرانەشی پەیوەندیان پێوەکرد، لە ناوەندە لیبرالی و مارکسیەکانەوە دەهاتن، وەکو ئەوەی لە بەرهەمی هەندێ بیریاری وەك کارل کۆرشدا دەردەکەوێت، بە تایبەت کتێبی: مارکسیزم و فەلسەفە – 1920. یاخود جۆرج لوکاش و کتێبی مێژوو و هۆشیاری چینایەتی – 1923. بێگومان ئەمانە سەرقاڵی هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و سیاسیە هەستیارەکانی ئەڵەمانیاش بوون).

هەر لە درێژەی قسەکانیدا، نوسەر دەڵێت: (کەسانێکی تر پەیوەندیان بە قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە کرد کە زۆر لە دامەزرێنەرەکەی بەناوبانگتر بوون، ئەمانە لە زانکۆدا سەرقاڵی نوسین و ئامادەکردنی کارنامەی دکتۆرا بوون لە فەلسەفەدا، لەوانە هۆرکهایمەر کە تێزەی دکتۆراکەی دەربارەی ئیمانوێل کانت بوو. وەکی دەشزانرێت هۆرکهایمەر لە نێوان ساڵانی 1895-1973 دا

ژیاوە. هەرچی ئەدۆرنۆشە 1903-1969، ئەوا تێزەی دکتۆراکەی دەربارەی هۆسێرل و فەلسەفەی فینۆمینۆلۆژی بوو. لە گرنگترین ئەو کتێبانەی لەلایەن ئەم قوتابخانە بەناوبانگەوە بلاوکرایەوە، کتێبێکی هاوبەشی نێوان هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ بوو بەناونیشانی دیالەکتیکی ئەقڵ. پاشان هۆرکهایمەر هەر بەخۆی کتێبێکی دیکەی بەناونیشانی پایانی ئەقڵ، بە چاپ گەیاند. شایەنی باسە هەڵکشانی نازیزم لە ئەڵەمانیا ئەندامانی ئەم قوتابخانەیەی ناچار کرد، چاو بە چەمکی ئەقڵدا بگێڕنەوە، بەتایبەت ئەقڵی ڕۆشنگەری. پرسیاری سەرەکی ئەوان ئەمە بوو: ئەقڵی ڕۆشنگەری چۆن ڕێگەیدا لە ئەوروپادا، نازیزم و فاشیزم بێنە ئارا؟ ئەی ئەقڵی ڕۆشنگەری دەمارگیری ئایینی کڵێسای مەسیحی لەناونەبرد؟ ئەی ئەو ئەقڵە ئێمەی لە دڕندایەتی و بەربەریەت قوتارنەکرد، بۆ ئەوەی لە بەهەشتی شارستانیەت بەهرەمەندبین؟ ئەی کەواتە چۆن ڕێگەی بە بەربەریەت دا، جارێکی تر و لەسەر دەستی هتلەر و مۆسۆلۆنی و هاوشێوەکانیان بگەڕێتەوە؟. ئەمە ئەو پرسیارە گەورە بوو کە مەزنە فەیلەسوفانی قوتابخانەی فرانکفۆرتی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو.. لەسەروبەندی جەنگی دووەمی جیهانیدا، ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە ناچاربوون ئەڵەمانیا جێبهێڵن و ڕووبکەنە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەوێش لە زانکۆکاندا دەستیان بە لێکۆڵینەوە کرد، بەڵام دوای تەواوبوونی جەنگ گەڕانەوە بۆ ئەڵەمانیا و لە ئەمریکا نەمانەوە، تەنها هربرت مارکۆزە نەبێت.

شایەنی وتنە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و بە تایبەتیش "ئەدۆرنۆ" و "هۆرکهایمەر"، ڕەخنەیەکی توندیان ئاڕاستەی ئەقڵی خۆرئاوا کرد، نەك بە مەبەستی وێرانکردنی، بەڵکو ڕەخنەی ئەوان لەوێوە سەرچاوەی گرتبوو کە دەرهەق بەو شارستانیەتەی لە سەرەتاوە متمانەی خۆیان پێبەخشی، دوچاری نائومێدی هاتن. ئەمانە ڕەخنەیەکی توندیان لەو ئەقڵە گرت بە مەبەستی ڕزگارکردنی. واتە هەریەك لەم بیریارانە هەڵنەخلیسکانە ناو تەونی عەدەمیەت، وەك ئەوەی هەندێك بیریاری دی تێیکەوتن.

بە بۆچونی ئەم قوتابخانە فیکرییە، ئەقڵی ڕۆشنگەری شتێکی دەگمەن و تایبەت نییە لە مێژوودا وەکو ئەوەی مەزندەی دەکەین، بەڵکو بریتیە لە قۆناغێك لەو قۆناغانەی بەرەو پێشچونی ئەقڵ کە بەر لە هەزاران ساڵ دەستی پێکردووە و سەدەی هەژدەهەمیش تەنها چرکەساتێکە، بەڵام گرنگ و سەرەکیە. لە سەدەی هەژدەهەمدا ئەقڵ زۆر گەشەیسەند و بە بڕوا بەخۆبونێکی زۆرەوە هاتە مەیدان و خزمەتێکی بێوێنەشی بە مرۆڤایەتی کرد، کاتێك لە دەست کۆتوبەندی سەدەکانی ناوەڕاست و ئەقڵیەتە دۆگما و تاریکەکەی ڕزگاری کرد. بەڵام لەلایەکی ترەوە دەبینین، ئەقڵ ڕۆشنگەری لە ڕاستە ڕێگای خۆی لایدا و بوو بە ئەقڵێکی ماتماتیکی هەلپەرستی پراگماتی. واتە ئەم ئەقڵە لەسەر دەستی بۆرژوازیەت و پاشان سەرمایەداریش، لە ئەقڵێکی ئازادیخوازەوە وەرگۆڕا بۆ ئەقڵێکی دەسەڵاتخواز و کۆنترۆڵکەر. بە بۆچونی "هۆرکهایمەر" و "ئەدۆرنۆ"ش، دوو فاقێتی مۆدێرنە لێرەدایە، کە لەیەك کاتدا هەم

پۆزەتیڤ و هەم نێگەتیڤیشە. یان ڕاستر بڵێین سەرەتا پۆزەتیڤ بوو، پاشان گۆڕا بۆ نێگەتیڤ.

دواتر فەیلەسوفی فەرەنسایی "میشێل فۆکۆ" هەمان ڕێگای "هۆرکهایمەر" و "ئەدۆرنۆ"ی گرتەبەر و کەوتە ڕەخنەگرتنێکی توند لە مۆدێرنەی خۆرئاوایی. بەڵام ئەم ڕەخنەگرتنە وەکی هەندێك پێیان وابوو، بەو مەبەستە نەبوو مۆدێرنە تێکوپێك بدات یان دەستبەرداری ئەقڵی ڕۆشنگەری بێت. نەخێر، چونکە "فۆکۆ" لە کۆتایی ژیانیدا لێکچەرێکی گرنگی لە کۆلیژ دی فرانس پێشکەش کرد، دەربارەی دوو تێکستە بەناوبانگەکەی "کانت"، ڕۆشنگەری چییە؟ شۆڕش چییە؟ تیایدا باس لەوە دەکات کەوا هەردووکیان سەرەتایەکی تازە لە مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا دێننە ئاراوە. پاشان "فۆکۆ" دەڵێت: (تەواوی کارەکانم بریتین لە درێژەدان بە پرۆژەکەی کانت، ئەو پرۆژەیەی ئەقڵی ڕەخنەیی لە خۆرئاوادا دامەزراند). لێرەوە نابێت سڵ لە ڕەخنەکردنی ئەقڵ یان ئاشکراکردنی کەموکوڕییەکانی ڕۆشنگەری بکەینەوە، چونکە کارێکی وا ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە لە ئەقڵ و ڕۆشنگەری پەشیمان بوینەتەوە یاخود دەستبەرداریان دەبین، بەڵکو بەو مانایە دێت کە بەردەوام لەبەرفراوانکردنی چەمکی ئەقڵدا بین و هەرکاتێك پێویستی کرد ئاڕاستەی ڕێك بکەینەوە. چونکە ئەقڵ پێدراوێکی جێگیر و نەگۆڕنییە، بەڵکو لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخدا بەرەو پێش دەچێت و گۆڕانی بەسەردا دێت.

دوای ئەم سەرەتایە، نوسەری ئەم کتێبە "بیتید و مانگ"، فەسڵێك بۆ باسکردنی فیکری "یۆرگن هاپرماس" تەرخاندەکات، "هاپرماس" میراتگری قوتابخانەی فرانکفۆرت و قوتابی "ئەدۆرنۆ"یە. وەکو ئاشکراشە ئەم فەیلەسوفەی لە ئێستادا یەکێکە لە بەناوبانگترین بیریارانی خۆرئاوا، شوێن پێی مامۆستاکانی هەڵگرت و هاوکات لەوانیشی تێپەڕاند. بەر لە چەند ساڵێك "هاپرماس"کتێبێکی قەوارە گەورەی بەناوی: (تیۆریای ئەقڵی کۆمنیکاسیۆنی) بڵاوکردەوە و تیایدا تیۆریایەکی تازە دەربارەی ئەقڵ فۆرمەلە دەکات. بەجۆرێك تیۆریاکانی "کانت" و "هیگڵ" و قوتابخانەی فرانکفۆرت بەجێدێڵێت. ئەم تیۆریایە بە کەڵکی کۆمەڵگا دیموکراسیە مۆدێرنەکان دێت، لەبەر ئەوەی ئەو کۆمەڵگایانە بڕوایان بە دیالۆگی ئازاد و سەربەخۆی نێوان تاکەکان هەیە.. لە ڕێی ئەقڵی کۆمنیکاسیۆنیەوە دەتوانین بگەینە کۆدەنگییەك لەسەر بڕیارێکی هاوبەش.. پێویستە دیالۆگ و گفتوگۆش دووربێت لە هەموو زەبر و زۆر و ناچار کردنێك. هیچ کەس و لایەنێك بۆی نییە فشار بۆ لاکەی تر بێنێت و بۆچونەکانی خۆی بسەپێنێت، بەڵکو دەبێت تەنها بە هێنانەوەی بەهانەی ئەقڵانی ئیکتیفا بکات. ئەوەی بتوانێت قەناعەت بە کەسانی تر بهێنێت بەهۆی چەکی ئەقڵەوە، ئەوا دەتوانین بڵێین شەڕەکەی بردۆتەوە.

لێرەوەو لای "هاپرماس" ئەقڵ گرنگی بەخود نادات، بەڵکو بابەت شوێن بایەخی ئەوە. واتە ئەقڵ وەکو ئەقڵی فەردی نەماوەتەوەو بۆتە ئەقڵێکی دەستەجەمعی. ئەقڵی کۆمنیکاسیۆنی لە ڕێگای زمان و دیالۆگکردنی تاکەکانەوە، فۆرمەلە دەبێت. بەپێی تیۆریاکەی "هاپرماس"یش، زمان – هەرزمانێك– هەڵگری وزەو توانای

ئەقڵانییە و تەنها لە ڕێی دیالۆگی دیموکراسی ئازادیشەوە، گەشە دەکات و خۆی بەیان دەکات. ئەمە کورتەیەکی خێرای تیۆریاکەی "هابرماس"ە. وەکو ئاشکرایە "جان مارك ڤێری" توێژەر، بە زمانی فەرەنسی کتێبێکی قەوارە گەورەی بۆ "هابرماس" تەرخانکرد و بە گرنگترین سەرچاوەیەك دادەنرێت کە بە زمانی فەرەنسی نوسرابێت. ناونیشانەکەشی بەمجۆرەیە: (هابرماس – مۆراڵی کاری کۆمنیکاسیۆنی).

لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە "هابرماس"، ئەو دیدگا ڕەشبینەی فەیلەسوفانی قوتابخانەی فرانکفۆرتی دەرهەق بە ئەقڵی ڕۆشنگەری، بەڕاست نەدەزانی. چونکە بە بڕوای ئەو جگە لە ئەقڵ و ڕۆشنگەری، ئەلتەرناتیڤی ترمان بۆ ئەقڵ و ڕۆشنگەری نییە. کەواتە نابێت متمانە بە ئەقڵ نەکەین، سەرەڕای هەموو ئەو ماڵوێرانیەش کە لەسەر دەستی فاشیزم و نازیزم دوچاری شارستانیەتی نوێ بوو. چونکە دواجار شارستانیەت سەرکەوت، نەك بەربەریەت و وەحشیگەری. ئەقڵانیەت بردیەوە نەك نائەقڵانیەتی "هتلەر". کەواتە "هابرماس" وریاماندەکاتەوە لە شوێن پێهەڵگرتنی ئاقارە نائەقڵانیەکان لە فیکردا. ئەمەش ئەو ئاقارانەن کە لە فەلسەفەی "نیچە"وە سەرچاوە دەگرن و بووە مایەی سەرهەڵدانی فەیلەسوفە نهلیستەکان لە فەرەنسا. بە بۆچوونی "هابرماس" نیچەویزم بەرەو نهلیستیمان دەبات، لەبەرئەوەی "نیچە" زیاد لە پێویست ڕەخنەی ئەقڵ و حەقیقەتی کرد.

لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا، نوسەر باس لە سێ فەیلەسوفی دیکە دەکات، ئەوانیش:

"سپینۆزا و کانت و دێریدا"ن. یەکەمیان لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا ژیاوە دووەم لە سەدەی هەژدەدا و سێیەمیش لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. سەبارەت بە "سپینۆزا"، نوسەری ئەم کتێبە دەڵێت: (ئەوەی سەیرە ئەوەیە سپینۆزا ئەو شکۆ زانستیەی دەسگیر نەبوو کە فەیلەسوفە مەزنەکانی تر لێی بەهرەمەندبوون و چنگیان کەوت، بەڵام سەرکەوتنی بیروبۆچوونەکانی و بەردەوامبونی بەدرێژایی سەدەکان، گەورەترین وەڵامە بۆ ئەو دژایەتیکردن و هەوڵی شێواندنەی لە ماوەی ژیانی و پاش لە دنیا دەرچوونیشی، ڕووبەڕووی بووەوە.. ئەمە ئەگەرچی فیکری ئەو خاوەنی ئەو سیحر و ئەفسونە نییە، کە عادەتەن لە فیکری گەورە بیریارانی وەك: کانت و هیگڵ و نیچە و هایدگەر و فۆکۆدا، هەیە.. هەندێك پێیان وایە، هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سپینۆزا بە ئاستێکی وا خۆی لەناو دیواری ئەقڵانیەتێکی تەسك و ئەستوردا گیرداوە، کە خەریکە هەناسەی لەبەردەبڕێت و دەیکوژێت. وەکو ئاشکراشە، سپینۆزا لە سەرەتادا قوتابی دیکارت بووە. دیکارتیش باوکی فەلسەفەی ئەقڵانییە لە فیکری ئەوروپیدا. بە بۆچونی ئەو پێویستە هەموو شتەکان ملکەچی ئەقڵ بن، چونکە ئەو بڕوایەکی بێسنوری بە ئەقڵ هەبوو.

هەریەك لە مالبرانش و لایبنتزیش، قوتابی دیکارت بوون).

مێژوونوسی فەلسەفە "مارسێل گیرۆ" پێیوایە:

(سپینۆزا سەر بە عارفەکانی ئەقڵە! چونکە لە قوللەیەکی بەرزدا لەگەڵ ئەقڵدا دەژیا و بێحەد بە خۆشەویستی ئەقڵدا ڕۆچوو بوو.. سپینۆزا لە ئەقڵدا وزەیەکی وای دەبینی کە روناکی خۆی بەسەر جیهاندا پەخشدەکات و رۆشنی دەکاتەوە. هەروەها پێیوابوو یاساکانی فیکر هەمان یاسای واقیعن و ئەقڵیش بریتییە لە ڕۆحی ژیان. مرۆڤ بەر لەوەی مەعریفە ئازادی بکات، بوونەوەرێکی کۆیلە و نەزان بوو، بەلاّم لە ڕێی مەعریفە و ئەقلاّنیەتەوە لەو دۆخە ناهەموارە ڕزگاری بوو. سپینۆزا یەکێك بوو لەوانەی دژایەتیەکی زۆری خورافەو نەزانی و جادوبازی دەکرد. ئەو وەك پرۆژەیەکی ڕادیکالی سەیری فەلسەفەی دەکرد، کە هەوڵی ئازادکردنی مرۆڤ دەدات لە دەست وەهم و میتۆلۆژیا.. مرۆڤیش کە لە سەرەتادا فەلسەفەی ئەقلاّنی ڕەتدەکاتەوە، لەبەرئەوەیە نایەوێت لەو ئەفسانە و خەیاڵپلاّوانە قوتاری بێت).

دەربارەی "ئیمانوێل کانت"یش، "بیتیدو مانگ" دەڵێت: (کانت پێی وابوو خۆرئاوا لەبەرئەوەی دوو سەدە ئەزموونی ئەقلاّنیەتی کردووە، گەشتۆتە ئاستی تێربوون و کەڵەکەبوونی ئەقلاّنیەت، بۆیە دەبێت ئەم میراتیە شەن و کەو بکەین، وەك چۆن پێشتر ئەقلاّنیەکان هەمان پرۆسەیان لەگەڵ تیۆلۆژیای مەسیحیدا ئەنجامدا.. واتە دەبێت ڕەخنە لە ئەقلاّنیەتی میتافیزیکی بگرین، وەك چۆن ئەم ئەقلاّنیەتە تیۆلۆژیای ئایینی پێش خۆی ڕەخنە کرد و شوێنی گرتەوە.. ئەرکی کانت ڕەخنە بوو.. ئەو پێیوابوو ئەقلاّنیەت بۆتە چوارچێوەیەکی دۆگماتیستی وشك و هەڵە و نابەجێیەکانی خۆی بەسەر ئەقڵدا دەسەپێنێت، وەك چۆن لە ڕابردوودا ئەقڵی تیۆلۆژی دۆگمەکانی خۆی بەسەر ئینساندا فەرز دەکرد).

"کانت" پرۆژە ڕەخنەییەکەی بەڕەخنەگرتن لە ئەقڵی میتافیزیکی دەست پێکردو، بەرهەمی ئەو هەوڵەشی، نوسینی یەکێك لە کتێبە بەناوبانگەکانی لێکەوتەوە، بەناوی: (ڕەخنەی ئەقڵی پەتی). "کانت" پێیوابوو: (مرۆڤ تەنها دەتوانێت درك بەو شتانە بکات کە لە ڕێی ئەزموونی عەمەلیەوە دەیانبینێت و هەستیان پێدەکات.. بەلاّم ئەوەی دەکەوێتە سەر و هەست و ئیدراکەوە، ئەوا ئەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پەی پێبەرێت). ئەمە وایکرد "کانت"، ئەرکی دیاردە هەستپێکراوەکان بە ئەقڵ بسپێرێت و نەهێڵێت پڕکێشی ئەوە بکات خەریکی تاوتوێکردنی پشتی دیاردەکان بێت. لەم سەروبەندەدا دەستەواژە بەناوبانگەکەی دەڵێت: (لە پێناو بواردان بە ئایین، سنورێکم بۆ زانست دانا، چونکە لەو شوێنەدا کە سنوری فەلسەفە و ئەقڵ کۆتایی دێت، سنوری ئیمان و غەیب دەست پێدەکات). بەمجۆرە دەبینین "کانت" فەلسەفەیەکی ئەقلاّنی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد، ئەم فەلسەفەیەش شایەنی سەردەمی "نیوتن" و دۆزینەوەکانی زانستی نوێ بوو.. فەلسەفە دوای "نیوتن" نابێت هەمان ئەو فەلسەفەیە بێت کە بەر لە "نیوتن" لە ئارەدا بووە.

لە مێژووی نوێی خۆرئاوادا هەرچی جارێك تیۆریایەکی زانستی نوێ سەریهەڵدابێت، فەلسەفە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.. بۆ نمونە دوای "دارون" و دۆزینەوەکانی لە بواری بایۆلۆژیادا، فەلسەفەی پەرەسەندن هاتە ئارا، هەروەها پاش "ئەنشتاین" و تیۆریا ڕێژەییەکەی، فەلسەفەیەکی تازە بەدەرکەوت کە شایەنی ئەو

دۆزینــــــەوە زانســــــتیە مەزنــــــەبێت. بــــــەمجۆرە دەبیــنین پەیوەندییــەکانی نێـوان فەلســەفە و زانسـت پەیوەندیــــەکی تۆکمــــە و کــۆنکرێتی بـــووە و هــەر کاتێـــــــك زانســـــــت پێشـکەوتبێت، فەلسـەفەش بە هەمان شێوە بەرەو پێش چووە. بەڵام دەبێت ئەوەش بـزانین کـە ئـەوەی فەلســەفە بـە دەسـتی دێنێـت، زانسـت توانـای بەدیهێنانی نییە، ئەم قسەیە پێچەوانەکەشی ڕاستە. کەواتە لـە نێوان زانســت و فەلســەفەدا پەیوەندیــەکی دیالــەکتیکی هەیــە، بــەڵام هەریەکەیان کایەی تایبەتی خۆی هەیە و نایبەزێنێت.

**سەرچاوە:**

بیان الکتب، ڕۆژی 2005/2/16.



## کتێبی دۆستۆیفسکی ..

## پاڵتۆی پەیامبەری 1871-1881

جوزیف فرانك

لە عەرەبییەوە: فەرهاد

بنکەی بلاّوکردنەوە: چاپەمەنی زانکۆی برنستون 2003

نووسەری کتێبەکە پرۆفیسۆر جوزیف فرانکە کە مامۆستای ئەدەبی بەراوردکاریە لە زانکۆی برستون. هەروەها مامۆستای ئەدەبی سلاڤیە لە زانکۆی ستانفورد. یەکێکە لە گەورە مامۆستایانی ئەدەبی جیهانی لە ئەمریکا. لەسەر ژیاننامەی دۆستۆیفسکی کۆمەڵێك خەلاّتی وەرگرتووە.ئەم کتێبە (کە 784 لاپەڕەی قەبارە گەورەیە) بەشی پێنجەم و کۆتایی ئەو ژیان نامەیەیە کە تا ئێستا بیّ وێنەیە. هەندێك وای دەبینن کە کتێبێکی لەو جۆرە, چ وەك قەبارە یان وردەکاری و قووڵ بوونەوە لە لێکدانەوەدا لەسەر دۆستویفسکی نەنووسراوە. هەر لەسەرەتاوە نووسەر دەڵێت کە ئەگەر یەکێك پێش ئەنجامدانی ئەو کارە لێی بپرسیایە: ئایا دەیەوێت خۆی بخاتە ناو پرۆژەیەکی وا گەورەوە، وەلاّمی دەدایەوە: بێگومان نا، چونکە ئەو وای دەزانی تاقە کتێبێك لەسەر دۆستویفسکی دەنووسێت، ئەو لەو باوەڕەدا نەبووە کە دەچێتە ناو پرۆژەیەکی دوورودرێژی فیکری و ئەدەبیەوە. ئەو چاوەڕوانی ئەوە نەبوە پێنج بەرگ کتێب بنووسێت کە هەر بەرگێکی سەدان لاپەڕەی پڕ لە خۆ بگرێت. ئەمە بەراستی قۆناغێکی درێژ و زەحمەتە لە دنیا گەورەکەی ئەدەبی رووسیدا.

نووسەر دەڵێت بایەخدانی بە دۆستۆیفسکی لەو کاتەوە سەرچاوەی گرت کە کەوتە خوێندنەوەی فەلسەفەی بوونگەرایی فەرەنسی. رۆمانی (یاداشتەکانی ژێر زەوی) دۆستویفسکی کارێکی سەرەکی بووە بە نیسبەت جان پۆل سارتەر و ئەلبێر کامۆ وە، هەروەها کاراکتەری رۆمانەکانی کە نووسەر دروستی کردوون، وەك کاراکتەری ڕاسکۆڵنیکۆف لە رۆمانی "تاوان و سزا"دا و کاراکتەری کیریلوف لە رۆمانی "نەگبەتەکاندا" بەلاّم لە دواییدا تێگەیشتنی بۆ دۆستویفسکی جیاواز بوو لە تێگەیشتنی بوونگەرا فەرەنسیەکان. وەلیّ دۆستویفسکی تەنیا بە نیسبەت بیرمەندە فەرەنسیەکانەوە

گرنگ نەبوە، بەڵکوو هایدگەری فەیلەسووفی ئەڵمانی بەناوبانگ زۆری بایەخ پێدراوە. ڕاڤەیەکی وای کارەکانی کردووە کە لەگەڵ فەلسەفەکەیدا بگونجێت.

نووسەر لە بەشی پێنجەمی کارە گەورەکەیدا زیاتر لەسەر ژیانی تایبەتی دۆستویفسکی دەوەستێت لە دەساڵی دوایی تەمەنیدا (1871-1881) ئەویش ئەو ساڵانەیە کە سێ کاری گرنگی بڵاوکردەوە: لاوانی بێ ئەزموون، ڕۆژانەی نووسەرێك، پاشان کارە هەرە ناوازەکەی، برایانی کارامازۆف.

با کەمێك لەسەر "ڕۆژانەی نووسەرێك" بوەستین.

نووسەر ڕای وایە کە ئەم کتێبە بریتییە لە پوختەی بیری دۆستویفسکی، دۆستویفسکی لەو کتێبەدا هێرش دەکاتە سەر خۆراوا خوازەکانی ڕووس. واتا ئەوانەی هەوای خۆراوا لێیداون و بە شارستانیەتی ئەوروپا ساکاون. ئەمە بۆ؟ لای دۆستۆفسکی وایە کە ئەوانە دەیانەوێت ڕووسیا بکەن بە پاشکۆی خۆراوا بێئەوەی ئاگاداری ڕەسەنایەتی خودی روسیا و تایبەتمەندیەکانی بن.

لەگەڵ ئەوەدا کە دۆستویفسکی لەگەڵ هەوادارانی خۆراوادا نەبووە، هێرشی کردۆتە سەر ئەوانەی کە کوێرانە دوای شەپۆلی سلاڤیەت کەوتوون و خۆیان تەواو بە کلتوری روسی ئەرتودوکسیەوە بەستۆتەوە و ڕقیان لە خۆراوا بوە، بۆ؟ چونکە ئەوانە روسیا دەکەنە ئەفسانەیەك کە بێجگە لە خۆی پەیوەندی بە هیچ شتێکی ترەوە نەبێت.

لە ڕاستیدا دۆستۆیفسکی لەو نێوانەدا ڕێگای ناوەندی گرتبوو. نە ڕێبازی کۆیلایەتی بۆ خۆراواو، نە کۆیلایەتی بۆ ڕابوردووی خۆیان. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە دەمارگیرەکانی هەردوولا ڕقیان لێی دەبێتەوە. بەلای دۆستویفسکیەوە تەنیا گەلە سادەکەیە کە رووسیا بەرەو سەرفرازی دەبات، چونکە تا ئەو کاتە شارستانیەتی ئەوروپا کاریگەریی زۆری لەسەر نەبوەو بڕوای بە ڕەسەنایەتی خۆی هەیە، بڕوایەکی پاك و بێگەرد بە مەسیح.

جوزیف فرانك قسەکانی خودی دۆستویفسکی لەسەر گەلی ڕووسی و بیروباوەڕەکانی وەك بەڵگە دەخاتە بەرچاو. نووسەری گەورە دەڵێت: "هەندێك وای بۆ دەچن کە گەلی روسیا نازانێت ئینجیل چییە، هەروەها ڕاسپاردەکانی کتێبی پیرۆز نازانێ کە گەوهەری باوەڕی ئێمەن، بەڵێ ئەمە ڕاستە، بەلاّم ئەم گەلە دەزانێت مەسیح چییەو لە قولاّیی دڵیدا دای دەنێت، چونکە گەل بۆ بڕوا بوون پێویستی بە ڕووناکبیرییەکی فراوان نیە گەل بڕوایەکی خۆڕسکی هەیە و ئەمەیش بەسە، گەلی ڕوسیا نزیکە لە مەسیحەوە، چونکە بە قووڵی لە مانای ئازار تێدەگات، گەلی ئێمە حەزێکی زۆری بە ئازارە، هەر ئەوەیشە کە لە مەسیحی نزیك دەکاتەوە".

پاشان دۆستویفسکی لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێت: گەلی ڕووسی تەنیا لە ڕەنج و ئازاردا دڵی خۆش دەبێت، بڕوام وایە ئەو پێویستیە روحیەی کە زۆر بە قووڵی لە مرۆڤی ڕووسیدا ڕەگی داکوتاوە، پێویستی ڕەنج و ئازارە لە هەموو جێگایەك و لە هەر چرکەساتێکدا، ئەو پێویستیەیش هەرگیز دوایی نایەت.

لە دیدی دۆستویفسکیەوە مرۆڤی رووسی بەردەوام ڕقی لە خۆیەتی، بێزارە و بە چاوی سووکەوە تەماشای خۆی دەکات. بۆیە وایە چونکە لە مانای حەسانەوە و ئاسوودەیی دەرونی بێبەشە، لەبەرئەوەیش کە ئازار چێژە و دوو دڵە، لای خوداوەند خۆشەویستە. تەنانەت سەرخۆشیی مرۆڤی ڕووسی، هەژاریە زۆرەکەی درۆ و دزیەکانی, نابێت بمانترسێنن، چونکە بەرئەنجامی سروشتە توندڕەویەکەیەتی کە تامابێت لەگەڵیدایە، مرۆڤی رووسی هەر بە سروشت دەست بڵاوە، بەلاف و گەزافەو توندڕەوە. وەك هەر زیندەوەرێکی بریندار بە ئازارەوە دەژی. ئەمەیش بەڵگەی سووکی و لەناوچوونی نیە، بە پێچەوانەوە بەڵگەی ئەوەیە کە پەیامە ڕوحیەکەی لە سەرەتاتکێدایە و هەر دەبێت سەرفراز بێت. ئێمەیشی لەگەڵداین، چونکە روناکی لە خوارەوە دێت، واتا لە گەلەوە.

کۆمۆنیست و سوشیالیستەکان بڕوایان وابوو کە دۆستویفسکی بەم قسەیە بانگەشە بۆ شۆڕشێکی میللی دەکات. وەلیٚ لە ڕاستیدا دژی ئەو جۆرە شۆڕشە بوو کە ئەوان مەبەستیان بوو بەلایەوە گەلی رووسی دەنگێکە لە دەرەوەی مەزەبی ئورتودۆکسی و رژێمی تزاری.

نووسەری کتێبەکە لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێت: دۆستویفسکی ڕای وایە کە گەل ناتوانێت هاوکێشە سایکۆلۆژیەکەی خۆی رابگرێت تەنیا لە رێگای ئەو رژێمەوە نەبێت، چونکە تزار لە گەل دروستبوەو ئارتودوکسیەتیش وا لە ڕوسیادا بنجی داکوتاوە کە مەسیح بوە بە پاڵەوانێکی نەتەوەیی بە نیسبەت رووسیەکانەوە، ئەو کەسەیش ئاگاداری مەسیحیەتی ئارتودۆکسی نەبێت ئاگای لە هەقیقەتی گەلی روسی نیە و نایشزانێت چی لە ناخیدایە، پەیمانی گەلی ڕووسی تەنیا لە سنووری وڵاتی روسیادا نیە بەڵکو و هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. گەلی ڕووس تەنیا روسیا رزگار ناکات بەڵکوو رزگارکەری هەموو دنیایە. پاشان دۆستویفسکی دەڵێت: ڕۆحی روسی لە رۆحی ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی جیاوازە، ڕۆحێکی نەرم و نیانە و دراوسێکانی وەك خۆی خۆش دەوێت، ئەو داواکاری یەکیەتێکی گەردوونی و برایەتیەکی گشتی هەموو مرۆڤایەتیە. چونکە مرۆڤی ڕووسی راستەقینە تەنیا بۆ بەختەوەری روسیا هەوڵ نادات، بەڵکوو بە دوای بەختەوەری هەموو مرۆڤایەتیەوەیە. لێرەدا گەورەیی و جوامێری گەلی رووس دەردەکەوێت، ئەو بە پێچەوانەی گەلانی ئەوروپاوە خۆپەسەند نیە، دۆستۆیفسکی رەخنە لە شارستانیەتی مادی ئەوروپای خۆراوا دەگرێت کە دەستبەرداری ئاین و روحانیات بوە, دەڵێت روسیا بەردەوام هەڵگری مەشخەڵی باوەڕە بۆئەوەی رابەری مرۆڤایەتی بکات.

دۆستویفسکی لە دوا ساڵانی ژیانیدا ببوو بە پێشەوایەکی رۆحی و ئیلهام بەخشی گەنجانی روسیا. رۆمانەکانی لە هەموو لایەك بڵاوبوبوەوەو ناوبانگیشی گشت لایەکی داگیرکردبوو. لە هەموو لایەکی روسیاوە نامەی بۆ دەهات، جارێك وتی: سەدان نامەم لە گەلی روسیاوە پیٚ گەیشتووەو شتگەلێك فێربووم کە پێشتر نەمدەزانی، نەمدەزانی ئەم هەموو خەڵکە زۆرە هاوبیری منن.

پاشان نووسەری کتێبەکە لەسەر یادی پوشکین دەوەستێت کە زۆربەی ئەدیبە گەورەکانی روسیای کۆکردەوە. مەزنی

دۆستۆیفسکی بە تایبەتی لە دوای رۆمانی برایانی کارامازۆفەوە دەرکەوت کە وەك نووسەرە گەورەکانی ئەوسای روسیا لە بابەتی تورگنیف و تولستوی ناوبانگی دەرکرد. بەڵام میهرەبانی یادکردنەوەی شاعیری گەورە پوشکین کە شارەوانی موسکۆ سازی کرد، هەلێکی چاکبوو بۆ دەرکەوتنی گەورەیی دۆستویفسکی و دەسەڵاتی بەسەر ئەدەبی روسیدا. لەو بۆنە گەورەیەدا دۆستویفسکی هەموو وێناو بیری خۆی لە بارەی ئەدەبی روسی و ئایندەی روسیاوە دەخاتە روو. ئامادەبوونی دۆستویفسکی لە مۆسکۆ زۆر گرنگ بوو، بۆ ئەوەی بەرگری لە دروشمی "روسیای ئەورووپی"دا بکات لە بەرانبەر دانیشتواندا کە سی ساڵ بوو لە پێناوی ئەو دروشمەدا تێدەکۆشا.

ناوەندی ئەدەبی روسی لەو کاتەدا دەکولا، هەر لەناو خۆیدا ببوو بە دوو بەشی سەرەکیەوە بەشی سلاڤیە توندڕەوەکان کە زۆر پێیان لەسەر نەتەوەی رووسی دادەگرت. هەروەها بەشی هەوادارانی خۆراوا کە دەیانویست لەناو شارستانیەتی ئەورووپادا بتوێنەوە. بۆ بەلاداخستنی کێشەکە ئەم دووپارتە لەسەروبەندی شەڕێکی گەورەی خۆ بە خۆدا بوون: واتا بەلاداخستنی شوناسی روسیا کە ئایا خۆرهەڵاتیە یان خۆراوایی؟ ئەورووپاییە یان ئاسیایی؟ تۆرگنیفی ڕۆماننووس پێشەوای هەوادارانی ئەورووپا بوو. لە ڕاستیدا ئەو زوربەی تەمەنی لە دەرەوەی روسیا ژیا بوو، لەبەرئەوەی ئۆرۆستوکراتیەکی دەوڵەمەند بوو، لە ئەورووپای شارستانیەتدا دەژیا، واتا لە ئەڵمانیا یان لە فەرەنسادا، شەیدای کچە گۆرانی بێژێکی فەرەنسی ببوو کە بەردەوام بۆ هەموو شوێنێك دوای دەکەوت. بیروباوەڕی تەنیا لەوەدا کۆکرابوەوە کە: روسیا وەك ئەورووپای خۆراوا ببێت بە ولاتێکی شارستانی و لە دواکەوتوییە هەمیشەییەکەی رزگاری بێت.

لە یادی سەدساڵەی لەدایکبوونی پوشکیندا ئەم پرسیارە هاتە گۆڕێ: ئایا پوشکین شاعیرێکی نەتەوەیی بوە کە توانیویەتی بلیمەتیی نەتەوەکەی بەرجەستە بکات یان نا؟

نووسەر دەڵێت یەکەم رۆژ تورگنیف قسەی کرد کە پێشەوای هەوادارانی خۆراوا بوو، هەوادارەکان هەموو لە دەوری کۆببوونەوەو چەپڵەیان بۆ لێدەدا. پێدەچوو ئاهەنگەکە ببێت بە شەڕە دەنووکی نێوان تورگنیف و دۆستویفسکی.

لە بارەی پرسیارەکەوە تۆرگنیف وتی: ناتوانم بڵێم پوشکین تەنیا بلیمەتی رەگەزیی روسی بەرجەستە کردووە. بەڵام نایشتوانم ئەمە رەتبکەمەوە. ئەم قسەیەی تۆرگنیف هێند لە خواربوو کە هەستی خەڵکەکەی نەوروژاند و وتاری ئەو رۆماننووسە گەورەیە نائومێدی کردن.

لە پڕێکدا، پیاوێك، کە لەبەر شەکەتی و شەقی زەمانە هەر لە تارماییەك دەچوو، چوە سەر شانۆ، ئەو کەسە دۆستویفسکی بوو. وتارێکی بێ وێنەی خوێندەوە کە تەواو دۆخەکەی بۆ خۆی کۆنترۆڵ کرد، دوژمنەکان لە پێش دۆستەکاندا سەریان بۆ دانەواند، خەڵکەکە لەگەڵ بیستنی وتاری گەورە نووسەری روسیادا، بە پەرۆشەوە کەوتنە هاوار و گریان. دۆستویفسکی پێی وتن پوشکین بۆیە توانیویەتی گیانی نەتەوەی رووس بەرجەستە بکات چونکە

توانیویەتی بلیمەتی گەلانی دی بمژێت، پوشکین روسیە، چونکە نەزعەیەکی گەردوونی تیایە و هەموو مرۆڤایەتی خۆش دەوێت. پوشکین لە هەندێك بەرهەمیدا ئیسپانیە، لە هەندێکی تریدا ئینگلیزی و لە هەندێك لە شێوەکانیدا ئەڵمانیە و لە هەندێکی تریدا عەرەبە. پوشکین تایبەتمەندیەکە لە رێگای بەجیهانی بوونەکەیەوە، یان بەجیهانی بوونەکەی لە رێگای تایبەتمەندیەکەیەوە، پوشکین روسیایەو هەموو مرۆڤایەتیشە.

کە دۆستۆیفسکی لە وتارەکەیدا گەیشتە ئەو بڕگەیە ئامادەبوەکان بۆی کەوتنە سەرزەوی. خەڵکەکە چەپڵەیان لێ دەدا و هوتافیان بەناوی دەکێشا، لاوەکان دەیانویست لێی نزیك بکەونەوە بۆ ئەوەی دەستی ماچ بکەن یان هەر هیچ نەبێت دەستیان بەریبکەوێت، چونکە دۆستۆیفسکی پەیامبەری ڕووسیای نوێ بوو.

SARDAM No. 47&48 2006



# کورتەیەك لە ژیانی سامۆئیل بیکێت

ئامادەکردنی لە عەرەبییەوە

هەورامان وریا قانع

لە 13 نیسانی ساڵی 1906 لە ناوچەی (ڤۆسکرۆك)ی نزیك پایتەختی ئیرلەندە (دبلن) هاتوەتە دنیاوە، "ولیەم"ی باوکی مەساح بووە، "ڕوی" دایکی پێش ئەوەی شوبکات کاری پەرستاری کردووە، برا گەورەکەی ناوی "فرانك"بووە، ئەو توندوتیژییە ئاینیەی دایکی بەرامبەر ئەم دوو کوڕەی نواندویەتی، وایکردوە "بیکێت" لەقوڵایی ناخیدا توڕەبونو ڕقو بێزارییەکی زۆری بەرامبەر بە تیۆلۆژیا و هەروەها بەرامبەر بە دایکی، تاماوەیەکی درێژ هەبێت.

"بیکێت" لە هەمان ئەو قوتابخانەیەدا خوێندویەتی کە "ئۆسکار وایڵد"تێیدا خوێندویەتی، ساڵی 1923 چووەتە زانکۆی (ترنتی) کە لەو سەردەمەدا زانکۆیەکی بەناوبانگ بووە لە دبلن، لەم زانکۆیەدا هەردوو زمانی فەرەنسیو ئینگلیزی خوێندووە، ساڵی 1927 بەکەلۆریۆسو ساڵی 1931 ماستەری لە هونەردا وەرگرتووە، دوو ساڵ لە فەرەنسا زمانی ئینگلیزی دەڵێتەوە، هەر لەوێ "جێمس جۆیس" دەناسێ کە دواتر دەبێتە یەکێك لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی، ئەو قسەیە ڕاست نییە کە دەڵێ "بیکێت" بووەتە سکرتێری "جۆیس"، هێندە هەیە "بیکێت" بووەتە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی "جۆیس"، "جێمس جۆیس" لەبەر ئەوەی چاوی بەتەواوی کزببوو، بۆیە بۆ نوسینەوەی کارە ئەدەبییەکانی، ناچار پەنای دەبردەبەر ئەدیبە لاوەکان، لێرەوە "بیکێت"یەکێك بووە لەو ئەدیبە لاوانەی یارمەتی نوسینەوەی کارە ئەدەبییەکانی "جێمس جۆیس"ی داوە، "بیکێت" تاڕادەی پەرستن سەرسام بووە بە "جۆیس"، تەنانەت لە شێوازی جگەرە کێشانو خواردنەوەی مەیدا لاسایی "جۆیس"ی کردۆتەوەو هەمان ئەو پێڵاوانەشی لەپێکردووە کە "جۆیس"لەپێیکردوون، ئەم سەرسامبونو نزیکبونەوەی "بیکێت"لە "جێمس جۆیس"، بووەتە هۆی ئەوەی کچەکەی "جۆیس" کە ناوی "لۆسیا"یەو نەخۆشی نەفسی لەگەڵدا بووە، حەز لە "بێکیت"بکات. "بیکێت" پێش مردنی بە ماوەیەکی کەم، هەستا بە سوتاندنی هەموو ئەو نامانەی لەگەڵ "لوسیا"دا ئاڵوگۆڕیان کردبوو، لە

ئەرشیفەکەی خۆیدا تەنها یەک وێنەی "لوسیا"ی هێشتەوە کە لەکاتی سەماکردندایە.

"بیکێت"سالی 1930 یەکەم کۆمەڵە شیعری بڵاوکردەوە، ئەم کۆمەڵە شیعرەی لەژێر کاریگەری نوسینەکانی فەیلەسوف گەورە "رێنیە دیکارت"دا نوسیوە، "بیکێت" تاکو کۆتایی ژیانی لەژێر کاریگەری ئەم فەیلەسوفە مەزنەدا بووە، "بیکێت"جگە لە نوسینی شیعر، چەندین شیعری ئیتالی و فەرەنسی وەرگێڕاوە، ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە، ڕەنگە "بیکێت"یەکەم کەس بوبێت هەندێ شیعری شاعیرانی سوریالی فەرەنسی، وەک "ئەندرێ بریتۆن"و "پۆل ئێلوار"ی وەرگێڕابێت بۆ زمانی ئینگلیزی، هەروەها کۆمەڵێ شیعری"ڕامبۆ"و شاعیر ئتیالی "ئۆجینیۆ مۆنتالی" وەرگێڕاوە. "بیکێت"لە پیریدا سەبارەت بەو قۆناغەی ژیانی، قۆناغی وەرگێرانی شیعری شاعیرەکان، دەڵێ: (لەو سەردەمەدا من گەنج بوومو لە توانامدا نەبووە خۆم هیچ بکەم، بەم کارەم ویستومە شتێك ئەنجام بدەم). "بیکێت"بەهۆی نوسینی شانۆنامەی (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا) ناوبانگێکی زۆر پەیدا دەکات، سەبارەت بە چۆنیەتی نوسینەوەی شانۆنامەی لە چاوەڕوانی گۆدۆدا دەڵێ: (لە ماوەی چوار مانگو بە قەڵەمێکی ڕەساسو لە یەکێك لە دەفتەرەکانی قوتابخانەدا نوسیم)، ئەم شانۆنامەیە بۆ یەکەمجار لە سالی 1953 لە هۆڵی شانۆیی (بابیلۆن) لە پاریس نمایشکرا.

"بیکێت"سالی 1938 لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیدا بە شەقامێکی پاریسدا پیاسەدەکات، لەناکاو سواڵکەرێك بێهیچ هۆیەك چەقۆیەك لە "بیکێت" دەدا، چەقۆکە هێندەی نامێنێ بگاتە سەر دڵی، "بیکێت" دوای ئەوەی لەو برینە چاکدەبێتەوە، بە مەبەستی زانینی هۆی ئەو دەستدرێژییە، دەڕوا بۆلای سواڵکەرەکە کە لە زینداندایەو لە هۆکاری ئەو کارەی دەپرسێ، سواڵکەرەکە لە وەڵامدا دەڵێ: (گەورەم داوای لێبوردنت لێدەکەم.. نازانم لەبەرچی ئەو کارەم کرد).

ئیدی "بیکێت" دوای ئەوەی گوێی لەم وەڵامە دەبێ، لە سواڵکەرەکە خۆشدەبێ، بەڵام لەو چرکەساتەوە لە مەغزای ئەو قسەیەی سواڵکەرەکە تێدەگات، لەو قسانەوە لە کاریگەری ڕێکەوت و کاری سەرەڕۆیانە لە ژیانماندا تێدەگات. ڕەنگە ئەم ڕوداوە هۆکارێك بوبێت بۆ گەڵاڵەبونی ئەو تێڕوانینە بێهودەییەی کە بۆ جیهان هەیبوو، وەك زانراویشە "بیکێت" پێشەنگی شانۆی بێهودەیی و ناماقوڵە.

سالی 1969 پاداشتی نۆبل وەردەگرێ، "بیکێت" لەوکاتەدا لەگەڵ ژنی دووەمی "سوزان" لە تونس دەبن، ژنەکەی کاتێ هەواڵی وەرگرتنی پاداشتەکە دەبیستێ دەڵێ: (وای لەو کارەساتە!)، چونکە واتێگەشتبوو وەرگرتنی ئەو پاداشتە، هەموو شێوازی ژیانیان هەڵدەگێڕێنێتەوە کە لەسەری ڕاهاتبوون، دەڵێن "بیکێت" بۆ ئەوەی نەڕوات پاداشتەکە وەربگرێ، لە یەکێ لە گوندەکانی تونسدا خۆی دەشارێتەوە، ڕاستە "بیکێت" ڕازی نەبوو بڕوات پاداشتەکە وەربگرێ و لەباتی خۆی هاوڕێ و بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی "جیرۆم لاندۆن"ی نارد، لەگەڵ ئەوەشدا "بیکێت" دواجار سوپاسی ئەکادیمیای

سويدى كرد. "بيكێت" هاوڕێكەى ڕاسپاردبوو سەرجەم بەهاى پاداشتەكە كە دەيكردە نزيكەى 73 هەزار دۆلار، بۆ هونەرمەندە موحتاجەكان خەرجبكات.

"بيكێت" ساڵى 1989 دواى مردنى هاوسەرەكەى، دەيگوێزنەوە بۆ خەڵوەتگەيەكى پيرى، ئيدى لەو خەڵوەتگەيەداو لە 22 دێسەمبەرى هەمان ساڵدا كۆچى دوايى دەكات، لە دوامانگەكانى ژيانيدا بەهۆى نەخۆشييەوە نەيتوانيوە قسەبكات و زمانى لەگۆ كەوتووە، لەگەڵ هاوسەرەكەيدا لە گۆڕستانى (مۆنبرناس) لە پاريس نێژراون، لە نزيك گۆڕە سادە و ساكارەكەى هەردوكيانەوە، بە تاقى تەنها دارێك ڕواوە، وەك ئەو دارە تەنهايەى لە شانۆگەرى (لە چاوەڕوانى گۆدۆدا) هەيە.

**سەرچاوە:**

www.Elaph.com

25ى مايۆى 2006



# فەیلەسوفی پۆست مۆدێرنە

جان فرانسوا لیوتارد

لە عەرەبییەوە: سەردەم

*Jean- francois lyotard*
*Simon malpas*
*Routledge – London, 2006-11-08*
*p.179*

نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "سیمون مالباس"، مامۆستای فەلسەفە و ئەدەبی هاوچەرخە لە زانکۆی مانچستەر لە ئینکلتەرا. لێرەدا کورتەیەکی مێژویی گشتیمان دەربارەی کەسایەتی فەیلەسوفی فەرەنسی "جان فرانسوا لیوتارد" و بەرهەمەکانی پێشکەش دەکات. وەکو ئاشکرایە "لیوتارد" ناوبانگی بە فۆرمەلەکردنی تێرمی پۆست – مۆدێرنە دەرکرد لە زمانی فەرەنسیدا و ئەم تێرمە دواتر لە تەواوی ناوەندە رۆشنبیری و هونەریەکاندا بلاو بووەوە.

لە دەستپێکی ئەم کتێبەدا نوسەر دەڵێت: (ئەم فەیلەسوفە بە یەکێك لە گەورە فەیلەسوفانی فەرەنسای قۆناغی دوای جان پۆڵ سارتەر دادەنرێت و زۆر جار لە ریزی فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرندا پۆلێن دەکرێت، واتە لەگەڵ میشێل فۆکۆ و جیل دولۆز و جاك دێریدا دا ناوی دێت).

"لیوتارد" ساڵی 1924 لە شاری ڤێرسای لەدایك بووەو ساڵی 1998 لە تەمەنی 74 ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. لە سەرەتای تەمەنی لاوێتیدا خواستی ئەوەبوو ببێتە قەشە یان نیگارکێش یان مێژوونوس، بەڵام دواجار فەلسەفە هەڵدەبژێرێت و بۆ ئەم مەبەستەش دەچێتە بەشی فەلسەفە لە زانکۆی سۆربۆن. لەوێدا و لە پۆلەکانی خوێندندا دەبێتە هاوڕێی کەسانێك کە دواتر کێشی خۆیان دەبێت، لەوانە: "جیل دیلۆز، فرانسوا شاتەلی، میشێل بوتۆر". دوای ئەوەی بڕوانامەی (مەترین) لە فەلسەفەدا وەردەگرێت، ساڵی

1950 ڕوو لە ولاتی جەزائیر دەکات و وەکو مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی قستەنتینە دەستی کردووە بە وانە وتنەوە. لەم شارەدا لەگەڵ چەپڕەوەکاندا تێکەڵ بە کاروچالاکی سیاسی دەبێت، لە دژی پارتی کۆمۆنیزم و مارکسیزمی دەوڵەتی و دەبێتە ئەندامی گۆڤاری (سوسیالیزم یان بەربەریەت). ساڵی 1955-1966 دەبێتە لایەنگری گەلی جەزائیری کە خەباتی لە پێناو ئازادیو سەربەخۆیدا دەکرد. ساڵی 1976 نامیلکەیەك بە ناونیشانی: (هەلومەرجی پۆست مۆدێرن) بلاودەکاتەوەو دەست بەجێ نێوبانگێکی زۆری نێودەوڵەتی بۆ پەیدا دەکات.

دوای چوار ساڵ گرنگترین و گەورەترین کتێبی خۆی بەناونیشانی (ناکۆکی بە چاپ دەگەیەنێت، بەلام کەس گرنگیەکی ئەوتۆی پێ نادات، تەنها چەند کەسێکی پسپۆر نەبێت. لە ساڵی 1984 لەگەڵ "جاك دێریدا" پەیمانگای نێودەوڵەتی بۆ فەلسەفە لە پاریس دادەمەزرێنن. پاشان پلەی شەرەفی لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەمریکادا پێ دەبەخشرێت. ساڵی 1996 بۆی ئاشکرا دەبێت دوچاری نەخۆشیەکی کوشندەبووە کە شێر پەنجەی خوێنە، بەلام سەرەڕای ئەوە لەسەر نوسین و توێژینەوەکانی بەردەوام دەبێت و بە کتێبێك دەربارەی "ئەندرێ مالدۆ" هەموان سەرسام دەکات. سەروەختێك لە ساڵی 1998دا ماڵئاوایی لە ژیان کرد، کتێبێکی تەواو نەکراوی لەسەر قەشە "ئۆگەستین" لە دوای خۆی بەجێهێشت.

لە بروسکەیەکی ماتەمیدا بەبۆنەی مردنەکەیەوە، "لیون ژۆسپان"ی سەرەك وەزیرانی ئەوسای فەرەنسا دەڵێت: بێگومان لیوتار یەکێکە لە هەرە کەسایەتیە گرنگەکان لە فەلسەفەی هاوچەرخی فەرەنسیدا، لەسەر ئاستی شەخسیش کەسێکی زۆر ڕۆح سوك و جەنتڵمان بوو).

لە دوو تویی ئەم کتێبەدا نوسەر ئەم پرسیارە دەکات: (لیوتار مەبەستی لە فەلسەفەی پۆست مۆدێرنە چی بووە؟ بۆچی ئەم تێرمە ئەوەندە تەشەنەی سەند و ناوبانگی پەیداکرد، کە خەریك بوو تێرمی مۆدێرنە بسڕێتەوە؟). بۆ وەلامدانەوەی ئەم دوو پرسیارە دەڵێت: (فیکری هەردوو سەدەی نۆزدەو بیست و ئەو پراکسیسە زانستیەی هاوشانی بوو، زۆر بە مەسەلەی ئازادی مرۆڤ و هەلومەرجی تەواوی مرۆڤایەتیەوە خەریك بوو. ئەم مەسەلەیەش لە سەدەی هەژدەهەمدا فۆرمەلە بوو کە فەلسەفەی ڕۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسی بە خۆیەوە بینی. بێگومان پرۆژەی فەیلەسوفان لەو سەردەمەدا پرۆژەیەکی جوان و دانسقە بوو، خواستیان ئەوە بوو پێشکەوتنی مەزن لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیا و هونەرو ئەدەب و ئازادی سیاسیدا بەدی بێت. چونکە پێیان وابوو ئەمە دەبێتە مایەی ڕزگارکردنی مرۆڤ لە دەست نەزانی و هەژاری و ستەمی سیاسی و هاوکات دەبێتە مایەی بەختەوەری مرۆڤ و دروستبونی هاولاتی ڕۆشنگەر ئەویش بەهۆی قوتابخانەو خوێندنی مۆدێرنەوە، هاولاتیانێك کە بتوانن خۆیان خاوەن بڕیار بن و چارەنوسی خۆیان دیاری بکەن. بەشێوەیەکی گشتی ئەمە پرۆژەی ڕۆشنگەری بوو. پرۆژەیەك کە مەبەستی ئەوە بوو مرۆڤایەتی لە قۆناغی تاریکی و دەمارگیری

ئاییني دەربکات و بەرەو قۆناغی لێکبوردن و رۆشنگەری و بەدیهێنانی گەشەی ئابووری بەرێت).

لەم پرۆژە پانوپۆڕەوە، تەواوی ئاقارە سیاسییەکانی دووسەدەی رابردوو دروست بوون، بێجگە لە ئاقاری فێندەمێنتالیزمی مەسیحی و ئاقاری نازیزم. مەبەستمان لە کۆی ئەو ئاقارە سیاسیانەش ئەمانەیە: لیبرالیزمی سیاسی و لیبرالیزمی ئابووری و ئاقاری مارکسیزم و ئاقاری ئانارشیزم و ئاقارە سوسیالیستیەکان و.. هتد.

ئەو ناکۆکی و جیاوازیەشی لە نێوان ئەم ئاقارانەدا دروست بوو، ئەگەر زۆر توندو تیژیش بووبێت، بەلاّم لە بەرامبەر ئەو تاکە ئامانجە مەزنەی پرۆژەی رۆشنگەری هەولّی بۆ دەدا، شتێکی ئەوتۆ نەبوو. کەواتە تەواوی ئەم ئاقارانە کۆکن لەسەریەك ئامانج، بەلاّم جیاوازیان لەو ئامرازانەدا هەیە کە بۆ گەیشتن بەو مەبەستە

دەیگرنەبەر. ئەم بەها بەرزانە لە کۆمەڵگە پیشەسازییە پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆدا، توشی داڕمان هاتوون و پاشەکشەیان کردووە.

توێژی سیاسەتمەداران لە فەرەنسا و شوێنانی دیکە، تا ئێستاش ڕوکەشانە دەرگیری ئەو بەهایانەن و دەیانەوێت وامان نیشان بدەن کە لە پێناو رزگاری گەورەی مرۆڤدا کاردەکەن، بەلاّم کەس باوەڕی بەمە نەماوە. ئەو برین و شۆکانەی پرۆژەی مۆدێرنە لە دوو سەدەی ڕابردوودا دروستی کردن، بووە مایەی لە کەدارکردنی ئەم پرۆژەیە و لەدەستدانی ڕاستگۆیی خۆی. لە پاش ئەمەدا "لیوتارد" گومان لە خودی ئایدیای پێشکەوتن دەکات و پێیوایە ئەوەی زەمینەی بۆ جەنگە گەورەکان خۆشکرد، پێشکەوتنی زۆری زانستی و پیشەسازی و تەکنۆلۆژی و ئابووری و سیاسی بوو.

ئەم پێشکەوتنە بیشومارە بوو وایکرد، جەنگە جیهانییەکان بقەومێت و کەلێنێکی گەورەشی لە نێوان ولاّتانی باکوری دەوڵەمەندو باشوری هەژارو دواکەوتوودا دروستکرد، هەر ئەویش فرێی داینە ناو سەردەمی فاشیزم و نازیزم و کۆمۆنیزمەوە: واتە سەردەمی تۆتالیتاری ستەمکاری ڕەهاوە. کەواتە کاتی ئەوە هاتووە لە پرۆژەی مۆدێرنە بچینەدەر کە بووە مایەی هێرۆشیماو ناکازاکی و هۆلۆکۆست و جەنگە کۆلۆنیالیەکان.

بەمانەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە "جان فرانسوا لیوتارد"، زۆر بەرامبەر پرۆژەی مۆدێرنە ڕەشبین بووە و تەنها لایەنە نێگەتیڤەکانی دەبینێت، بەلاّم لایەنە پۆزەتیڤەکانی فەرامۆشدەکات. کەلێنی گەورەی ناو تیۆریاکەشی لێرەدایە.

"لیوتارد" هەڵە و لادانەکانی مۆدێرنە لە دوو سەدەی ڕابردوودا دەبێنێت، بەلاّم ئەو هەموو پێشکەوتنە نابێنێت کە بەدەستی هێناوەو بۆتە مایەی دروستکردنی تەواوی ئەو شارستانیەتەی ئەمرۆ لە ئارەدایە. لەم سەروبەندەدا "لیوتارد" رۆشنگەری بە پرۆژەیەکی یۆتۆبیستی خەیاڵی وەسف دەکات، کە لەسەر بەردی ڕەقی واقیع تێکشکاوە.

تەنانەت ئەو ئایدیۆلۆژیانەشی لە سەدەی نۆزدە و بیستدا لە ئارەدابوون، وەك: لیبرالیزم و سوسیالیزم و مارکسیزم، بە حیکایەتی مەزن ناویان دەبات و پێیوایە لە ئێستادا سەردەمی ئەو حیکایەتانە بەسەرچووە. ئەو ئایدۆلۆژیانە ئامانجێکی بەرزیان هەبووە، کە

ئـــەویش مـــۆبیلیزەکردنی جـەماوەر بـووە، بۆئـەوەی مـرۆڤ لەسـەر ئـەم زەویـە بەختـەوەربێت، بـەڵام بـە بۆچـــونی "لیوتـــارد" ســـەرکەوتوو نـــەبوون و شکسـتیان خـواردووەو لـە ئێستاشدا ئێمە باجی ئەو شکسـتە دەدەیـن. هەنـدێك ئەم بۆچونەی "لیوتارد" بە دروست نازانن و دەڵێن: ئەگەر کۆمۆنیزم پیربـوو بێـت و شکسـتی خواردبێـت، خـۆ لیبرالیزمـی دیموکراسـی بەردەوامـە و شکسـتی نـەهێناوە، بگـرە لـە ئێسـتادا زۆر لـە جـاران تۆکمەتر و بەهێزترە و چاوەڕێی لێدەکرێت تەواوی جیهان بگرێتەوە، ئەگەرچـی بەدەســت زوڵــم و ســتەمێکی کۆمەڵایــەتی گــەورەوە دەناڵێنێت.

**سەرچاوە:**

بيان الكتب، 2005/11/24.

